

# بیرەوەرییەکانم

فاروق مەلا مستەفا

بەرگی یەکەم

شوباتی ٢٠١٧

## دەربارەی دەزگای دواڕۆژ بۆ ڕووناکبیریی و ڕاگەیاندن

دەزگای دواڕۆژ بۆ ڕووناکبیریی و ڕاگەیاندن کە بە فەرمانی وەزاریی ژمارە (١٧٧٤٣) لە ٢٠١٥/٨/٢٤ مۆڵەتی کارکردنی لە حکومەتی هەرێمی کوردستان وەرگرتووە، پڕۆژەیەکی درێژخایەنی کاریگەرە، هەوڵی دروستکردنی ڕای گشتی و بڵاوکردنەوەی هوشیاریی و بەرزکردنەوەی ئاستی تێگەیشتنی دەستەجەمعی و بەهێزکردنی کەرتی تایبەت دەدات لەناو ژیانی گشتی کۆمەڵدا.

دواڕۆژ وەک پڕۆژەیەکی گشتگیری ڕووناکبیریی، خزمەتکردنی بیری پێشکەوتنخوازی مرۆڤدۆستانەی کردووەتە ئامانج لە ڕێگەی نوسین و وەرگێڕان و توێژینەوەی زانستیانەی بابەتە هزری و فەلسەفییەکان و کاری ڕاگەیاندنی هاوچەرخەوە.

## خوێنەری بەڕێز سڵاو ..

زۆر دەمێکە پڕۆژەی وەرگێڕان و چاپکردن و بڵاوکردنەوەی کتێبە هەڵبژاردەکان بە نرخێکی رەمزیی یەکێک بووە لە ئاواتە گەورەکانم بۆ دەستەبەرکردنی سەرچاوەی رۆشنبیری و فیکری و زانستی بۆ خوێنەری کورد. خۆشبەختانە لە ماوەی یەک ساڵ تەمەنی دەزگای دواڕۆژدا زنجیرەیەک کتێبی دانسقە و بەنرخ خراونەتە بەردەست ئێوەی بەڕێز کە درێژکراوەی هەوڵەکانی پێشوومانە لە ساڵانی نەوەدەکاندا و پڕۆژەیەکی هێمن و درێژخایەن دەبێت بەو هیوایەی کە بە هاوکاریی هەموو لایەک بتوانین خزمەتێکی بچوکی کتێبخانەی کوردی بکەین بە باشترین کتێب و زۆرترین بەرهەمی وەرگێڕدراوی زمانە زیندووەکانی جیهان.

فاروق مەلا مستەفا
دامەزرێنەری دەزگای رووناکبیریی دواڕۆژ
١٢ی تشرینی دووەمی ٢٠١٦

# پێڕست

## بەشی چوارەم
## ژیانی ناوخۆی حیزب



## بەشی پێنجەم
## له بەغداوە بۆ کوردستان.. بەرەو پێشمەرگایەتی

**بەشی شەشەم**

**هەتا دەستپێکردنەوەی شۆڕش**

## بەشی حەوتەم
## ساڵانی شاخ



## بەشی هەشتەم
## دەربارەی هەرەسی شۆڕشی ئەیلول

**پێشکەشە بە:**

- یەکەمین مامۆستا و رابەرم.. باوکی خۆشەویستم، مەلا مستەفای سەفوەت
- هاوژین و هاوسەرم، پەخشانی مستەفای موفتی
- جگەرگۆشەکانم، زینۆ، زەریا، زرنگ و زنوێر

## پێزانین

لە نووسینەوە و ئامادەکارییەکانی ئەم بیرەوەرییانەدا هاوڕێی ڕووناکبیرم د. شێرکۆ عەبدوڵڵا و پاساری کوڕی هەڵکەوتووی هاوکار و یارمەتیدەرم بوون.. پڕ بە دڵ سوپاسیان ئەکەم.

# سەرنج

لەوکاتـەوەی کـە فەیلەسـوف و فەرماندەی سـەربازی، زەینـەفۆن، لـە کۆتـایی سەدەی پێنجەمی پێش زایین ئەو دیمەن و ڕووداوانەی لە کتێبەکەیدا (ئاناباسـیس) تۆمار کـرد کـە لـەکاتی گەڕانـەوەی لەشـکرە دە هـەزار سـەربازییەکەی یۆنانـدا لـە خۆرهەڵات بینینی و ڕووبەڕوویان بووبووەوە، ئـیتر ژیاننامـە و گەشـتنامە بوونەتـە لقێکی گرنگی سەرچاوەکانی مێـژوو کـە خۆشـبەختانە خەریکـە لای ئێمـەش بـرەو پەیدا دەکات.

دیـارە لـە تەمـەنێکی دیـاریکراودا (بیرەوەرییـەکان) دەبنـە گـەورەترین و گرانبەهاترین سامانی ئەو مرۆڤـە، بەتایبـەت ئەگـەر ئـەو بیرەوەرییانـە تـەنها هـەر ژیانی تایبەتی نەبن و پەیوەندییان هەبێت بـە ژیـانی گشـتیی کۆمەڵـەوە لـە بـوارە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکاندا.

خوێنەری هێژا ..

ئەوی ڕاستی بێت دەمێکە هاوڕێیان و دۆستان داوای نووسینی بیرەوەرییـەکانم لێ دەکەن و خۆیشم بە ئەرکێکی گرنگـی دەزانم نـەك تـەنیا لەبەرئـەوەی یادگـاریی بـەنرخ و خۆشەویسـتن لـە ناخمـدا، بـەڵکو لەبـەر ئـەوەش کـە دەکرێـت ئـەو بیرەوەرییانـە وەك بەڵگەنامـەی مێـژوویی سـوودیان لێ ببینرێـت بـە تایبـەت بـۆ ڕوونکردنەوەی زیاتری دۆخی سیاسیی و ژیانی ناوخۆی حیزبـی شـیوعیی عێـراق و ململانـێ گـەرم و بـەهێزەکانی ئـەو سـاڵانەی کـە خـۆم ڕۆڵێکـی بەرچـاوم تیایانـدا هـەبووە و لـە نزیکـەوە ئاگـاداری زۆر بابـەت و مەسـەلەم، هـەم لەسـەر ئاسـتی کوردستان و هەم لە عێراقیشدا بەگشتی.

هەروەها بیرەوەرییە هەمەڕەنگەکانی ساڵانی ١٩٦٨ – ١٩٧٥ی ژیانی پێشمەرگایەتیی کوردستان و خەباتی نهێنی و خۆشاردنەوەی ئەو ساڵانە بەشێکی گرنگن لە ئەزموونی خۆشی و شارەزایی ژیانم کە هەمووی جێگای سەربەرزیی و شانازیمن.

خاڵێکی دیکەی پاڵنەرم بۆ نووسینی ئەم بیرەوەرییانە روونکردنەوەی چیرۆکە سەرکەوتووەکانی بواری بازرگانی خۆمە کە هیوادارم یارمەتیدەر و رێ نیشاندەر بن بۆ نەوەی نوێی وڵاتەکەم و ئەو پەیامەیان لەلا بەرجەستە بکات کە کۆڵنەدان و پشوودرێژی و بەرنامەی راست و دروست زامنی سەرکەوتنی هەموو پرۆژەیەکە.

لەم بیرەوەرییەدا، ئەوەندەی زەین یارمەتیدابم هەوڵم داوە بەسەرهات و رووداوەکان بەوپەڕی ئەمانەت و راستگۆییەوە بگێڕمەوە و لە ناوهێنانی کەس و لایەنەکانیشدا دروشمی هەمیشەییم ئەوەیە کە هەتا دەکرێت جەخت لە خەسڵەتە جوان و باش و ئەرێنییەکان بکرێتەوە.

خوێنەری ئازیز .. ئەمەی بەردەستتان بەرگی یەکەمی بیرەوەرییەکانمە و عەمر باقی بێت لە ئایندەیەکی نزیکدا بەرگی تریشی بەدوادا دێت.

هیوادارم ئەم کتێبە بتوانێت ئەو مەبەستانە بەدەست بهێنێت کە لە پێناویاندا نوسراوە ..

**فاروق مەلا مستەفا**

## لەبری پێشەکی

فاروقی مەلا مستەفا

لە تێکۆشەرێکی شۆڕشگێڕی جەنگاوەرەوە

بۆ سەرمایەدارێکی لێهاتووی نوێخوازی خێرخواز



حسێن عارف

من ناسیاوی و هاوڕێیەتیم لەگەڵ کاك فاروقدا ئەگەڕێتەوە بۆ پتر لە نیو سەدە، و بە درێژایی ئەو ماوەیە پەیوەندیی هاوڕێیەتیمان لەیەکتر دابڕانی تێنەکەوتووە، بەردەوام لەیەکترەوە نزیك بووین و ئاگامان لەیەکتر بووە. فاروقی مەلا مستەفای سەفوەتی حاجی مەلا رەسوڵی دێلێژە، کەسایەتییەکی سەرکەوتووە لە ژیانیدا، سەرکەوتووییەکەشی دەرەنجامی لێوەشاوەیی و بەهرەدارییەتی وەك دوو سیفەتی تایبەتی کەسایەتیی خۆی کە لەگەڵیاندا پەروەردە بووە و نەشونمای کردووە و پێگەیشتووە، کە من مێژووەکەی ئەکەم بە دوو کەرتەوە: کەرتی یەکەمی

تێکۆشەرێکی شۆڕشگێڕی جەنگاوەرە لە پێناوی نەهێشتنی چەوسانەوەی مرۆڤ لەلایەن مرۆڤەوە، دابینکردنی خۆشی و بەختیاری و ئاسوودەیی بۆ هەر مرۆڤێك کە دێتە ژیانەوە هەتا ئەوکاتەی لە ژیان دەرئەچێت، بە یەکسانی و بەبێ جیاوازیکردن لە نێوانیاندا. لە کەرتی دووەمیدا بە ژیری و زانایی و دیسان بە کۆششی جەنگاوەرانەی خودی خۆی، ئەبێتە سەرمایەدارێکی لێهاتووی نوێخوازی خێرخواز.

لە کەرتی یەکەمدا، ئەوەتا هەردووکمان قوتابیی ناوەندی و دواناوەندیین و لەگەڵ قوتابیانی ئەندام لە یەکێتیی قوتابیانی سەر بە حیزبی شیوعیدا، ئەچین بۆ سەیران بۆ (چەقڵاوە)ی ئەوبەر تانجەرۆ، لەوێ کۆمارێك بەپێی بیروباوەڕەکەی خۆمان دائەمەزرێنین و، بە درێژایی ئەو رۆژە هەم سەیرانکارین و هەم حوکمڕانی کۆمارێکین لەو بابەتەی بە ئاواتییەوەین.

ئەوەتا لە بەغدا قوتابیی زانکۆین و، هەردووکمان ئەندامی لیژنەی باڵای هەموو رێکخستنەکانی قوتابخانەکانی ناوەندی و دواناوەندی و زانکۆی بەغداین (مەهدی ئەلحافز)ی پەرلەمانتار و وەزیری پلاندانانی حکومەتی دوای رووخانی سەدام و بەعس ئەندامی لیژنەیە لەگەڵماندا.

ئەوەتا من لە کۆلێجی ئەفسەرانی ئیحتیاتم و، ئەو ئەندامێکی مەکتەبی سەربازیی حیزبە و، دێت و ئاگادارم ئەکات کە خۆم و هاوڕێکانم لە ئامادەباشیدا بین، بۆ ئەگەری رووداني راپەڕینێکی چەکداری، بەنیازی دەستگرتن بەسەر دەسەڵاتدا لە عێراق.

ئەوەتا بەهۆی لەیەکچوونی بیروباوەڕمانەوە، هەردووکمان وەك دوو کادری چالاك، خۆمان لە ریزی حیزبی شیوعی (قیادەی مەرکەزی)دا ئەبینینەوە.

ئەوەتا دوای دەستپێکردنەوەی شۆڕشی ئەیلول لە ئازاری ١٩٧٤دا، لە دۆڵی باڵەکایەتی ئەو وەك سەرکردەیەکی (ق. م) و من وەك ئەندامێکی دەستەی بەڕێوەبەری یەکێتیی نووسەران، یەکتر ئەبینینەوە و هاوڕێیەتییە دێرینەکەمان بەردەوامە.

ئەوەتا کاتێك کە شۆڕشی ئەیلول بەهۆی ڕێکەوتنەکەی ٦ی ئازاری جەزائیرەوە شکست ئەخوات، ئەو و حیزبەکەی و چەند کەس و لایەنێکیتر، بڕیاری بەردەوامیدان بە شۆڕش ئەدەن، منیش بڕیاری مانەوە لەگەڵیدا لە چیا ئەدەم، بەڵام هەوڵەکە سەرناگرێت.

سەبارەت بە کەرتی دووەمیش، هەر لەسەرەتاوە ڕەنگدانەوەی کەرتی یەکەمی پێوە دەرئەکەوێت. ئەو کاتەی دەستبەرداری حیزبایەتی ئەبێت (حیزبایەتی نەك سیاسەت)، ئەو ڕێگای سەرکەوتوویەی لەم بوارەشدا گرتە بەر کە بواری ئابووریکاری بوو. لەمیشیاندا بە لێزانی و بەهرەمەندی و بە شارەزایی و زیرەکی خۆی بە سەرێك و کورد وتەنی بە ڕەنجی شانی خۆی بە سەرێکی تر، پلە بە پلە هەوراز ئەبڕێت و ئەگاتە ئەو لوتکەی هێز و توانایەی کە لە بوارەکەدا هەیەتی. ئەو سامانەکەی ناکاتە نەختینە (کاش) و، لە قاسەی تۆکمە و بانقەکاندا بیخەوێنێت. ئەو ئەیخاتە قەبەڵی پڕۆژەی خزمەتگوزاریی سوودبەخشی مۆدێرنی ئەوتۆوە، کە خەڵکی شارەکەی بەتایبەتی و گەل و وڵاتەکەی بەگشتی پێویستیان پێیان هەیە. پڕۆژەکانیش بەبەر چاوەوەن و لە حەشاردا نین. نموونەی ئەو پڕۆژانە کە هەنگاو بە هەنگاو ڕوو لە گەشەکردن و فراوانبوون ئەکەن، پڕۆژەی مریشك بەخێوکردن و دانانی قەسابخانەی ئۆتۆماتیکیی سەربڕینی مریشك و سەیرانگای گەشتوگوزار و بازاڕ و تەلاری جوان و، تا ئەگاتە سێ شاکارەکەی: مۆبایلی ئاسیاسێڵ و شاری پزیشکی و ئوتێلە پێنج ئەستێرەییە نموونەییەکەی. ئەمانە و چەندانیتر کە هەم شارەکەی وەك دیاردەی شارستانیی مۆدێرن پێ ئەڕازێنێتەوە و هەم هەلی کار بۆ هەزاران کەس ئەڕەخسێنێت، کە هەزاران خێزان بەخێو ئەکەن. بەم پێیە ئەکرێت بڵێین شاری سلێمانی لە کات و ساتی خۆیدا بوو بە خاوەنی سەرمایەدار و ئابووریناسێکی وەك فاروقی مەلا مستەفا.

وەکیتر فاروق سەرمایەدارێکی دەستکراوە و خێرخوازە. ئەم، کەسان و کۆمەڵانی خەڵکی هەژار و کەمدەرامەت و کۆمەڵە و ڕێکخراو و لایەنە

خێرخوازەکانیش لە سامانەکەی بێبەش ناکات. لە خێزانی شەهیدانی حیزبەکەی پێشوویەوە دەست پێئەکات کە مووچەیان بۆ ئەبڕێتەوە و، ئینجا کەسوکار و خزمانی هەژاری خۆی و، ئینجا هاوڕێکانی دوور و نزیکی و قوتابییە هەژارەکانی زانکۆ و کەسانی نەدیوو و نەناسیاوی داخوازانی یارمەتی و، دواجار کەسوکاری شەهیدانی پێشمەرگە بەگشتی، کە ئەوەتا لە کۆبوونەوەیەکی دەوڵەمەندانی خێرخوازی کوردستاندا کە بۆ کۆکردنەوەی پیتاك بۆیان سازکراوە و لە تەلەفزیۆنەوە پیشاندەدەرێت، ئەبینین یەکێك ئەڵێت پەنجا ملیۆن لە منەوە و ئەویتر سەد ملیۆن و یەکێکی تر پێنجسەد ملیۆن، بەڵام ئەوەتا ئەڵێت: لە منەوە (٣) ملیار دینار پێشکەشە.

بەڵێ فاروقی مەلا مستەفا چەندە تێکۆشەرێکی شۆڕشگێڕ و جەنگاوەر بوو، هێندەش سەرمایەدارێکی لێهاتووی نوێخوازی خێرخوازە، مرۆڤێکی سەغی تەبیعەتی ئەوتۆیە کە سامانەکەی ئەخاتە خزمەتی خۆی و خەڵکەوە، نەك بە پێچەوانەوە. بەم بۆنەیەشەوە ئەمەوێت ئاماژە بە حاڵەتێکی هاوشێوە بدەم. لە پەنجاکان و شەستەکانی سەدەی رابوردوودا، سەرمایەدارێکی فەرەنسایی بووبووە ئەندامی حیزبی شیوعیی فەرەنسا و، دەزگاکانی راگەیاندن بە ملیۆنەرە سوورەکە ناویان ئەبرد. ئایا ئەشێت ئێمەش فاروق بە ملیۆنێرە سوورەکەی کوردستان ناوببەین؟

# ژیاننامەی مرۆڤێك كە ئامانجە پیرۆزەكانی لە ژیاندا دیاری كرد و سەركەوتووانەش شوێنیان كەوت



فاروق مەلا مستەفا، ئەندازیار ماجید عەلاوی

**بیرەوەرییەك لە نووسینی: ماجید عەلاوی**

**نامەوێت باسی فاروق وەك تێكۆشەرێكی سیاسی بكەم كە جێ پەنجە و رابوردوویەكی شەرافەتمەندی لەسەر رێبازی حیزبەكەی و وڵاتەكەی بەجێ هێشت. هەروەها ناشمەوێت وەك بزنسمانێك باسی بكەم كە لە سەركەوتندا گەیشتە كۆمەڵە لوتكەیەك خەڵكی دیكە پێیان نەگەیشت، چونكە ئەمە مەسەلەیەكە زۆر كەس دوور و نزیك بینویانە، بەڵام پێم خۆشە ئاماژە بۆ ئەو هۆكارە بنەڕەتییانە بكەم كە ئەم سەركەوتنانەیان دروست كرد دوور لە لێكدانەوە سواوەكانی كە ئەڵێن بەخت و پەیوەندییەكان هۆكارن.**

ئەو هۆكارانەش بریتین لە تێڕوانین و بەهرەی نائاسایی لە دیاریكردنی ئامانج و سووربوون لەسەر شوێنكەوتنی. مەبەستم لە ئامانج هەر ئامانجێكی هەڕەمەكی نییە، ئەو هەستە ناسكەیە كە لەناو رستێكی ئالۆزكاوی بژاردە و ئاسۆكاندا ئامانجە ناوەندییەكە و ئاڕاستە بنەڕەتییەكە دیاری دەكات و لە سیاسەت و بیرمەندیدا پێی دەگوترێت دیاریكردنی ئامانجە ستراتیجییەكە و ملكەچكردنی هەموو بژاردە تەكتیكییەكان بۆ بەدیهێنانی ..

ئەم بەهرەیەی فاروق لە چالاكییە سیاسییەكانیدا و لە دنیای بازرگانیدا بەرجەستە بووە. لێرەدا چەند ئیستگەیەك بە نموونە دەهێنمەوە.

ئیستگەكان

ئیستگە:

یەكەمین دیدارم لەگەڵیدا سەرەتاكانی ساڵی ١٩٦٧ بوو لەگەڵ (ئیبراهیم عەلاوی) برامدا لە نەخۆشخانەی راهیبات لە ژوورێكدا كە بێجگە لە قەرەوێڵەیەك هیچی تری تێدا نەبوو. ئەو چوارمشقی لەسەر قەرەوێڵەكە دانیشتبوو پاش ئەوەی نەشتەرگەرییەكی بۆكرابوو. پاش گفتوگۆكردن لەگەڵ ئیبراهیمدا لەسەر چەند مەسەلەیەكی تایبەت بە دۆخی گرگرتوی حیزب و ململانێكانی ناوی لەو قۆناغە هەستیارەدا یەكەمین تێگەیشتنم لە فاروق ئەوەبوو كە هەستم كرد لەبەردەم كەسێكدام كە بڕوای بە كردەوە هەیە و خاوەنی بڕیارە، متمانەی بە خۆی زۆرە و لەبەرامبەرەكەشیدا متمانە دروست دەكات، بە روونی ئامانجەكە دیاری دەكات بێ ئەوەی لە وردەكاری وێنەكەدا نوقم ببێت.

ئیستگە:

دوای ئەوە بە ماوەیەكی كەم و لە هەمان ساڵدا چەند كۆبوونەوەیەكی كۆمەڵێك كادیری حیزب من و فاروقیان پێكەوە كۆكردەوە كە دواتر ئەو كۆمەڵەیە پێی گوترا تیمی كادیر (فریق الكادر). گفتوگۆ و مشتومڕەكان گەرم بوون دەربارەی قەیرانی ناوخۆی حیزب و ململانێكان و چۆنێتی رزگاركردنی حیزب لە ئاڕاستە

راســتڕەوە پاكتاوخوازەكــە و لــەخۆگرتنی خــەباتی چــەكداری و پێویســتییەكانی خۆئامادەكردن بۆی و پێگەی ئەو خەباتە لە سیاسەتی حیزبدا. قسەكەری یەكەمی هەموو كۆبوونەوەیەك هاوڕێ نەجم بوو (ئیبراهیم عەلاوی) سەركردەی ئەم كۆمەڵە، راســتەوخۆ دوای ئــەو شــەهید خالیــد ئەحمــەد زەكــی بــوو، لــە روونكردنــەوە و كۆمێنتداندا بەهۆی كەسایەتی خۆی و سەرمایە هزرییەكەی و پەیوەندییە نـاوخۆی و دەرەكییەكانی بە لایەنە جیاجیاكانی ناكۆكییەكانی ئەو سەردەمەی حیزبـەوە – كە دەرگای گفتوگۆش دەكرایەوە، هاوڕێ صـادق (ئـەمین ئەلخـەیون) هـەوڵی دەدا تیمەكە رابكێشێت بۆ كـاری چـەكداری (بـەو پێیـەی كـە كـاری چـەكداری)یـە و لـە دەرەوەی چوارچـێوە سیاسـییەكانی كـە دەیخاتــە دەرەوەی بناغـەكانی سیسـتمە هزرییەكەی حیزبمـان و چـالاكیمان. گریمانـەی ئـەوەی دەكـرد كـە هـەر خـۆی كـە لەڕووی تیۆری و پراكتیكییەوە سەركردایەتی رەهای ئەو كارە بگرێتـە ئەسـتۆ بـەو پێیەی شارەزای ژینگەی هۆڕەكانە (زۆنگاوەكان) كە خۆی تیایدا پـەروەردە بـووە .. هـاوڕێ فـاروق یەكـەمین وەڵامـدەرەوەی بـەهێزی ئـەوبوو لـەڕێی رسـواكردنی بیرۆكە سەركێشەكانییەوە .. و (ئەمین)ی دەشوبهاند بە (خولە پیزە) كە رێگرێكی بـەناوبانگ بـووە. فـاروق پابەنـدی ئامانجـە بنەڕەتییەكـە بـوو. لەسـەر حیسـابی ستراتیج نوقمی تەكتیك نەدەبوو، وە بەڕاستی سیمبولی رووبەڕووبوونەوە و دابـڕان بوو لەگەڵ ئەمین خەیون و هێڵە سەركێشە نەهلیستییەكەی.

ئیستگە:

پـاش رێككەوتنەكـەی جـەزائیر كـە سـەدام لەگـەڵ شـای ئێرانـدا بەسـتی و ئـەو هەرەسەی كە بەدوایدا هات، فاروق بەوپێیەی كـە بەرپرسـیاری مەیـدانیی قیـادەی مەركەزی بوو لەوكاتەدا ئەوپەڕی هـەوڵی دا سـەركردایەتی شـۆڕش رازی بكـات كـە لەسەر ئامانجە سەرەكییەكەی خـۆی رابگرێـت و درێـژە بـدات بـە شـۆڕش لـە رێـی پشت بەسـتن بـە توانـا ناوخۆییـەكان بـێ ئـەوەی گـرەو لەسـەر هۆكـاری دەرەكـی بكات. كاتێكیش لە هەوڵەكەیدا شكسـتی هێنـا، ئامانجـە روون و ئاشـكراكە لـەلای

فاروق تەنها رزگارکردنی ئەو شتانە بوو کە دەتوانرێت رزگار بکرێن و ئەمانەتەکە بپارێزرێت و تەواوی بەرپرسیارێتییەکە بگرێتە ئەستۆ لە بری هەموو هاورێکانی لە گۆڕەپانەکەدا ئەمەش بە سوود وەرگرتن لەو بارودۆخەی کە هاتبووە پێشەوە و نەیدەهێشت دەزگا ئەمنییەکان زۆر زیادەڕەوی بکەن لە توندوتیژییدا. لەمەدا فاروق لە ئاست چاوەڕوانییەکاندا بوو وە ئەمانەتەکەی پاراست، بۆیە دوژمن پێش دۆست رێزی دەگرت.

ئیستگە:

بارودۆخی ژیانی رۆژانەی ئاسایی لە ناوەڕاستی حەفتاکاندا بەرجەستەبوونێکی دیکەی رۆحیەتی دیاریکردنی ئامانج و سوور بوون لەسەر بەدیهێنانی ئەو ئامانجەی ئاشکرا کرد ئەمجارە لەسەر ئاستی کەسی و دوور لە مەراقە گشتییەکەی سیاسەت. ئەوە بوو من و هاوڕێم فوئاد ئەلئەمیر لە دەوروبەری ساڵی ١٩٧٦دا کە سەردانی سلێمانیان کرد، فاروقمان بینی (فاروقی عاشق) لە شەڕێکی سەختدایە بۆ بەدەستهێنانی ئەو ئافرەتەی کە خۆشی دەوێت، سەرەڕای هەموو کۆسپ و ئەگەرەکان سەرکەوتنی بەدەست هێنا لە کاتێکدا کە ئەو تەگەرە و رێگریانە هەموو کەسێکی دیکەیان سارد دەکردەوە ئەگەر وەکو فاروق سوور نەبوایە لەسەر خەبات و کۆڵنەدان بۆ بەدیهێنانی ئامانجە دیاریکراوەکە.

ئیستگە:

فاروق لە ژیانی رۆژانە و کاری پیشەییدا درێژەی داوە بە هەمان رۆحییەت کە بریتییە لە روون و ئاشکرایی ئامانجە سەرەکییەکە و بەدواداچوونی. فاروق ئەو ئامانجە ئابوورییە گەورانەی دەبینی کە ئێمە نەماندەبینی و هەر ئەو پێداگری لێ کردین و قەناعەتی پێهێناین کە بچینە کێبڕکێی وەرگرتنی مۆڵەتی یەکێك لە سەربڕینگاکەی مریشك کە لە ناوەڕاستی ساڵانی هەشتاکاندا بە شێوەیەکی سنووردار ئاشکرا کرا و دەست و پێوەندەکانی رژێم لە رێگەی کەسانی نزیکی ئەو رژێمە هەموویان ماشییە وە جگە لەوەی سلێمانی کە دوور بوو لە مەبەستەکانی

ئەوان. فاروق هێندە دووربین بوو کە بە دەستی بەتاڵەوە دانوستانی کرد لەگەڵ لایەنی بەرپرسی ناو حکومەت بۆ ئەوەی هەموو مۆڵەتەکانی پێکەوە وەکو پاکێجێك دەست بکەوێت و ئەگەر بهاتایەتەدی دەستکەوتێکی زۆر گەورە دەبوو بە هەموو پێوەرێك.. ئەوەی فاروقی دەجوڵاند لەم مەسەلەیەدا بەرچاو روونی ئەوبوو کە ئاسۆکانی ئەو ئامانجە ئابوورییە گەورەیەی دەبینی و متمانەی هەبوو بە هەستی راستگۆی خۆی و بەوەی کە دەتوانێت سەرکەوتووانە مامەڵە بکات لەگەڵ وردەکارییەکانی دواتردا سەبارەت بە دابینکردنی پارەی پێویست بۆ پڕۆژەکە. راستگۆیانە قسە بکەم دەبێت بڵێم ئێمە هاوڕێ و هاوبەشی ئەو هیچمان متمانە و جورئەتی چوونە ناو سەرکێشی وامان نەبوو. فاروق هۆکاری بزوێنەری پرۆژەی سەربرپینگای بازیان بوو لە سەرەتایەوە هەتا کۆتایی پرۆژەکە کە بە هەموو پێوەرێك سەرکەوتووترین و باشترین پرۆژەی لەو جۆرە بوو. شانبەشانی ئەمەش فاروق دەستیکرد بە دارشتنی پلانی پێویست بۆ فراوانکرنی ئەو پرۆژەیە کە پاشهاتەکانی سەرکێشییەکەی سەدام لە کوەیت وەستاندی. ئەمانەش هەموویان لە بارودۆخێکدا بوون کە دەستگا ئەمنییەکان رۆژانە بە ناشرینترین شێواز دوامان دەکەوتن و دەیانترساندین.

ئیستگە:

فاروق لەو کەمایەتییە دەگمەنە بوو کە ژیانی خۆی خستە خراپترین مەترسییەوە کاتێك کە لە کۆڕەوە گەورەکەدا سلێمانی بەجێ نەهێشت لە دژە هێرشەکەی هێزە هاربووەکانی رژێم کە کردیانە سەر پارێزگا راپەڕیوەکانی دژی سەدام پاش ئەوەی لە کوەیت دەرکرا. فاروق بەرگەی هەموو مەترسییەکانی گرت لەکاتێکدا کە ژیان و ماڵەکەی وەکو دەڵێن لەسەر دەستی عیفریتێکدا بوو، ئەمەش لە پێناو پاراستنی داراییە هاوبەشەکانی سەربرپینگاکە کە ئەو متمانەپێکراو بوو وە لە شوێنێکی ئەمیندا کەل و پەلەکانی شاردەوە و دوورا و دوور چاودێری لێ دەکردن و دەیپاراستن هەتا مەترسییەکان لە ئارادا نەمان.

ئیستگە:

یــەکێك لــە دووربینــییــە سەرنجراکێشــەکانی فــاروق زوو هەســتکردن بــوو بــە ئاسۆکانی ئابوورییە تازەکە، ئابووریی پەیوەندییەکان لە کاتێکدا کە ئـەو لـە رووی ئــەکادیمی و ئــەزموونی چــالاکییە ئابوورییــەکانی پێشــوویەوە زۆر دوور بــوو لــەم بوارە. بەڵام بەو هەستە بلیمەتەی خۆی توانی لـە ناوەڕاسـتی نەوەدەکانـەوە یـەکێك لە پێکهێنەرەکانی ئـابووری تـازەی دیجیتـاڵی – کـەرتی پەیوەنـدیکردن – ببینێـت، ئەمە لە کاتێکـدا کـە عێـراق نـوقمی ئابلۆقەیـەکی کوشـندە بـوو بـوو وە هـیچ شـتێك نەیدەبەسـتەوە بـە شۆڕشـی پەیوەنـدی کـردن لـە جیهانـدا! فـاروق هـەموو هـەوڵ و توانایەکی ماددی و دانوسـتانییەکی خـۆی تـەرخان کـرد بـۆ ئـەم بـوارە و بنکەیـەکی وردی دروست کرد – کە هەرچەندە لە کاتی خۆیدا زۆر گەورە نـەبوو – کـە بتوانێـت ببێتە گـرنگترین شایسـتەکانی کێبڕکێکـردن کاتێـك کـە عێـراق دەسـتی کـرد بـەوەی بچێتە ناو ئـابووری دیجیتاڵـەوە پـاش کـەوتنی رژێـم لـە سـاڵی ٢٠٠٣دا و سـەرکەوتن لەپاش سەرکەوتن بەدەست بهێنێت. فاروق بـەم تێڕوانینـە مەحاڵـەوە چـووە شـەڕە مەحاڵەکەوە بۆ بەدەستهێنانی مۆڵەتی کارکردن بۆ ئاسیاسێل کە نرخەکەی گەیشـتە ١,٢٥٠ ملیــار دۆلار واتــە دوو هێنــدەی نرخــە خەملێنراوەکــەی. وە لــەم بــوارەدا زەبەلاحێکی ئـابووری و دارایـی وەك کۆمپانیـای (ئۆراسـکۆم) بـەو هـەموو ئەزموونـە ناوچەیی و جیهانییـەوە نـەیتوانی بـەردەوام بێـت لـە کێبڕکێکـەدا. فـاروق لەوکاتـەدا بەشێکی بچووکی ئەو پارەیەشی نەبوو، بەڵام بەچاوی خۆی ئاسۆکانی چـالاکییەکەی دەبینی و دەیزانی کە پـاش بەدەسـتهێنانی مۆڵەتەکـە ئـیتر هـیچ گیروگرفتێکی وای نایەتە رێ کە بۆ دابینکردنی پارە نەتوانێت زاڵ ببێت بەسەریدا، چونکە وەکو دەڵـێن (ئەوەی مریشکی هەبێت خەڵك هێلکەی بە قەرز دەداتێ).. وە کردیشی.

ئەم هەموو بەهرەیە هاوشان بـوو لەگـەڵ کۆمەڵـە خەسـڵەت و تایبەتمەندییـەکی گەوهەریـدا کـە کارێکیـان کـرد ئـەم سـەرکەوتنە بـەرەو کـامڵبوون بچـێت و بـە ئاڕاسـتەیەکی بنیادنــەر رێبکـات و کـار بکاتــە سـەر رێـڕەوی ژیـان بـە رابـردوو و

ئایندەیەوە.. سەبارەت بە رابردوو، فـاروق سـوور بـوو لەسـەر ئـەوەی کـە لـەکاتی هەڵکشان و سەرکەوتنیدا ئاگای لە هاوڕێ دوور و نزیکەکان و خێزانـەکانیان بێـت و سەرسەختانە هەوڵیداوە ژیانیـان دابـین بکـات وەك بەشـێك لـە خێزانـە گەورەکـەی خۆی و وەك ئەمەکێك بۆ قوربانییەکانیان. سەبارەت بە ئاینـدەش فـاروق پێـداگری کـردووە لەسـەر ئـەوەی سـەرکەوتنە ئابوورییەکـەی خـۆی ئاڕاسـتە بکـات بـۆ دروسـتکردنی ئـابووری شـارەکەی و نیشـتیمانەکەی. ئەمـەش لـەرێی کۆمەڵـە پڕۆژەیەکی گەورەی بەرهەمهێنەوە کە تێکـڕای بـوارە پیشەسـازی و ئەنـدازیاری و پـەروەردەیی و کۆمەڵایەتییـەکان و بوارەکـانی وزە و هاتوچـۆیان گرتووەتـەوە و فاروقیان کردووە بە نموونەی بزنسـمانێکی دانـەبڕاو لـە ئـازار و بەرژەوەندییـەکانی وڵاتەکەی، بە پێچەوانەی مـەرامی زۆرینـەی زۆری پـارە دارەکـان لـە کۆکردنـەوە و کەڵەکە کردنی پارە و سەرمایە گوزاریکردنیدا لە وڵاتان و بانکە بیانییەکاندا.

بە هیوای سـەرکەوتنی زیـاتر لـە رێبازەکـانی بنیادنـان و چەسـپاندنی نـاوت لـە مێـژووی وڵاتەکەتـدا وەك تێکۆشـەرێکی سیاسـی لـە سـەردەمی لاوێتیـدا و بنیاتنەرێکی درەوشـاوە لەسـەردەمی پێگەیشـتنتدا... سـڵاوێك لـە بـرا و بـرادەر و هاوڕێی خەبات.

# فاروقی مەلا مستەفا وەك دیاردەیەكی كۆمەڵایەتی و ئابووری نەك تەنها كەسایەتییەك...



دكتۆر دیار عەبدولقادر ئەحمەد

ناساندنی كاك فاروق وەك سەرمایەدارێك هەم هەڵەیە و هەم ناحەقییە بەرامبەر بەم كەسایەتییە. ئەو لە سفرەوە و بە قەرز دەستی بە كار كردووە نەك سەرمایەی بۆ بەجێمابێت و وەبەرهێنانی پێ كردبێت. سەرمایەش قەت لای ئەم ئامانج نەبووە بەڵكو وەك پێشكەوتنخوازێك بە بەردەوامی لە هەوڵی ئەوەدابووە كە بیر و كار و پرۆژەی نوێ بهێنێتە كوردستان و عێراقەوە. وەك بیروباوەڕیش قەت لەگەڵ سەرمایەداریدا نەبووە و ناشبێت. ئەو وەك پراگماتیستێك هەرچی لە پێناوی پێشكەوتن و خۆشگوزەرانیی كۆمەڵگا و تاكدا بێت لەگەڵیدا بووە و خەباتی بۆ كردووە. باشترین ناساندن بۆ كاك فاروق بەڕای من كە بەداخەوە لە زمانی كوردیدا چەمكێك نییە بەو مانایە، بە ئینگلیزی پێی ئەڵێن Game Changer، واتە ئەو كەسەی بەشداری یارییەك ئەكات و دواتر هەموو یاساكان و بنەماكانی یارییەكە ئەگۆڕێت و یاسا و بنەمای نوێ دروست ئەكات بە مەبەستی پێشخستنی یارییەكە. ئەو

لە سیاسەت و چالاکیی کۆمەڵایەتی و لە بزنسیشدا هەر وای کردووە. هاتە نـاو کـاری دەواجنەوە، دواتـر لـە سـلێمانی یەکـەمین و سـەرکەوتووترین مـەجزەرەی دەواجـنی دروستکرد لەسەر ئاستی عێراق. هاتە ناو پەیوەنـدی و تەلەفۆناتـەوە بـە جانتایـەکی VSAT ەوە لە ژێـرزەمینی بیناکـەی عـەلی نەمەڵیـدا و دواتـر بـۆ یەکـەمین جـار لـە مێـژووی عێراقـدا گـەورەترین کۆمپانیـای مۆبـایلی دامەزرانـد. دواتـر چـووە نـاو پیشەسـازییەوە و کارگـەی چـیمەنتۆی تاسـلۆجەی سـەرلەنوێ دروسـتکردەوە و ٢ کارگەی تری چیمەنتۆی دامەزراند کە لە باشترین کارگەکانی عێراقن ئێستا و چـەندەها کارگەی تری پیشەسـازیی لـە بـوارە جیاوازەکـان دامەزرانـدووە. دەسـتی دایـە ئوتێـل دروستکردن، جوانترین و بەرزترین ئوتێلی عێراقی دروستکرد لە شاری سلێمانی و ناوی نا شـاری جـوان، کـە هەڵبـەت ئـەو شـارە جوانـە لای ئـەو هـەر سـلێمانییە. لـە بـواری خزمەتگوزاریی پزیشکیدا گـەورەترین و پێشـکەوتووترین نەخۆشـخانەی دروسـتکردووە لە عێراقدا و ئێستاش خەریکی دامەزراندنی زانکۆیەکی پزیشکییە کە هەموو بوارەکـانی فێرکردنـی پزیشـکی ئەگرێتـە خـۆ. ئەگـەر بـە لـۆجیکی سـەرمایەداری ئـەم پرۆژانـە هەڵبسەنگێنین هەرگیز ناگەینە ئەو ئەنجامەی کە دەبوا لە سلێمانی یاخود عێراق ئەم کارانە دابمەزرانایە، چونکە ئەگەر لە شوێنی تر ئەنجام بدرایە قازانجی چەندەها جـار زیاتر ئەبوو. بۆیە بە رای من ئەو سەرمایەدار نییە بەڵکو پێشـەوایەکی کۆمەڵایـەتی و سیاسییەکی پراگماتییە بە پلـەی یەکـەم. پێشـەوایەتیی ئـەو لـە بزنسـدا Business Leadership تەواوکـەری بەرنامەیـەکی پێشـکەوتنخوازییە لای ئـەو. سـەرکەوتنی پلانەکانی خۆی لە هەموو شتێك بە گەورەتر ئەزانێت، تەنانەت ئەگەر پلانەکان زەرەری داراییشی پێبگەیەنن. هەر بۆیە لە کارەکانی خۆیدا بە بـەردەوامی هەوڵیـداوە دەسـتی سەدەها گەنج بگرێت و بە نموونە فێریان بکات چۆن تواناکانی خۆیان پـەرە پێبـدەن و چۆن بە رۆحییەتی تیم کار بکەن بـۆ ئـەوەی ببنـە رابـەری دوارۆژ هـەر یەکـە لـە بواری خۆیدا. هەروەها ئەو گرنگیدانەی ئەو بە ئافرەتی ئەدات لە بواری کارەکانیدا بە دەگمەن ئەبینرێت نەك لە عێراق بەڵکو لەسەر ئاستی ناوچەکەش کەمە.

من لە منداڵییەوە کەماڵمان لە شارەبان بوو کاك فاروقم ناسیوە کە ئەهات بۆ سەردانی ئێمە و ماڵی مامم. کە ئەهات بۆ لامان بە کەسێکی تووڕە لێی تێگەیشتبووم و لێی ئەترسام. هەندێك جار پێم ناخۆش بوو کە هاتووە بۆ ماڵمان چونکە لێی ئەترسام! باوکم و مامم زۆریان رێز لێئەگرت و خۆشیان ئەویست و هەموو کات بە فاروقی ئامۆزام لای ئێمە ناویان ئەبرد (لەگەڵ باوکمدا ئامۆزان). ئەو شەوانەی ئەهات بۆ ماڵمان لای باوکم و مامم جەژن بوو و دانیشتن ساز ئەکرا. کاك فاروق زۆری حەز لە دەنگی باوکم ئەکرد و باوکم گۆرانی بۆ ئەگوت. باوکم ئەیگوت مامە مستەفاش (مەلا مستەفای باوکی کاك فاروق) هەر حەزی لە دەنگی باوکم بووە و کە بینیویەتی پێی گوتووە "ئادەی قالە گیان مەقامێکم بۆ بڵێ". دایکم ئەیگوت کاتی خۆی کە باوکم لە ساڵی شەستەکان لە زیندان بووە بە هۆی شیوعییەتەوە، کاك فاروق تەلەبە بووە لە بەغدا بەڵام هەر هاتووە و سەردانی کردوون و یارمەتیی ماددی داون. دیارە لە تەلەبایەتیش دا وەك دواتر زانیم دوای دەوامی زانکۆ کاری کردووە.

لە دوای هاتنەوەمان بۆ سلێمانی لە ساڵی ١٩٨٤ ەوە کاك فاروقم لە بۆنە خێزانییەکاندا و جەژنەکان هەندێك جار ئەبینی. بەڵام لە کۆتایی ساڵی ١٩٩٦ ەوە کە جەڵتەی دڵ لێیدا زۆر نزیك بوومەوە لێی بە حوکمی ئەوەی من خوێندکاری کۆلێجی پزیشکی بووم زوربەی کات لەماڵی ئەوان بووم و لە ژوورەکەی خۆی شەو و رۆژ بە دیارییەوە بووم. لە ساڵی ٢٠٠٢ ەوە بەهۆی کەریمی برا گەورەم کە لەگەڵ ئەو کاری ئەکرد منیش دەستم بە کار کرد لای کاك فاروق. لەو ساڵەوە بە بەردەوامی و لە نزیکەوە لەگەڵ کاك فاروق بووم و لە زوربەی سەفەرەکانی لەگەڵیدا بووم. هەرچییەك لە دونیای بزنس فێری بووم لەوەوە وەرمگرتووە و کاریگەریی ئەو لەسەرم ژیانی گۆڕیم. هیچ کات بە لاوازی نەمدیوە. قەت نەچووەتە ژێر کاریگەریی نەخۆشی و کێشەی ترەوە. کەسێکی یەکجار بەهێزە بە جەستە و بە کەسایەتییەوە. ئەگەر یەك خاڵی لاواز لەودا شك ببەم بۆ خوێی چێشت وەك

کورد ئەڵێت، خۆشەویستییەتی بۆ سلێمانی. بە رادەیەك سلێمانی خۆش ئەوێت ئەگەر بێت و لە یەك هەفتە زیاتر لە دەرەوەی سلێمانی بێت نەخۆش ئەکەوێت و تا نەیەتەوە سلێمانی چاك نابێتەوە !

کاریگەریی باوکم لەسەر ژیانم لە هەموو شتێك گەورەتر بووە. لە ژیانی خۆیدا هەموو شتێك ئەو فێری کردووم، بەڵام نزیك لە کۆچی دوایی و لەسەر جێگەی مەرگ یەك وەسییەتی بۆ کردم و گوتی "ئاگات لە فاروق و ماڵ و مناڵی بێت و دایمە لە خزمەتیا بە".

## تێبینییەك

چەند ساڵێك لەمەوبەر، بەبیٰ ئاگاداریی ئێمە، برادەرێك هەوڵیدابوو ژیاننامەی ئێمە كۆ بكاتەوە و بۆ ئەو مەبەستەش چاوپێكەوتنی لەگەڵ هەندیٰ هاوڕیٰ و كەسی خۆشەویستماندا ئەنجام دابوو، هەندێك لەو هاوڕێیانە ئێستا كۆچی دواییان كردووە، بەڵام هەموو چاوپێكەوتنەكان بە تۆماری دەنگی ماونەتەوە. وەك خۆشەویستی و وەفایەك بۆ ئەوان و بۆ هاوڕێیانی دیكەش لەم بیرەوەرییانەدا ئەو دەقانە بڵاوئەكەمەوە.

## فاروقی مەلا مستەفا

# لە روانگەی هەندێك لە هاوڕێكانییەوە



د. عیزەدین مستەفا رەسوڵ

• فاروق لە ساڵی یەكەمدا كە چووە بەغدا من سەفەرم كرد بۆ یەكێتی سۆڤێت. من یەك ساڵ لە بەغدا لەگەڵی بووم لە ماڵێك ژوورێكمان بەكرێ گرت. ئەو كاتەش هەتا حەزی لە ئیشكردن بوو. چووە وەزارەتی (ئیرشاد) لەوێ دامەزرا.

• كاتێ كودەتاكەی ٨ی شوباتی بەعسییەكان روویدا، ئەو لە چواری كۆلێج بوو. هاتەوە بۆ كوردستان و لەدواییشدا بە ساڵێك لە كۆلێج وەرگیرایەوە و تەواوی كرد.

• بەگشتی من پەیوەندییم لەگەڵیدا زۆر باش بووە. سوپاسی ئەوەی ئەكەم كە زیاد لە پێویست رێزی گرتووم. زۆریشی پێ خۆش بووە كە من ئیشم تێی بكەوێت و بۆم بكات. مەسەلەیەكی كوردی هەیە ئەڵێت (باوكم نابێتەوە تا برایەكی ترم بۆ بێنێت).

• ئەگەر بە کاری نووسینەوە خەریکبووایە ئێستا ئەبوو بە نووسەرێکی باش چونکە ماوەیەکیش لە هەندێك گۆڤاری نهێنیدا کاری کردووە. ئێستاش ئەگەر کاتی هەبێت ئەخوێنێتەوە.

• لە منالّیدا عەجول بوو. چونکە ئەو لەزەتی لە ژیانی منالّی دی ... من خۆم خستە ناو کاری سیاسییەوە. ئەو کاتەی لە شەشی سەرەتایی بوو، بوو بە ئەندام لەناو یەکێتیی قوتابیاندا.

• باوکم زۆر کەسێکی فیکر کراوە بوو، لە مەلا کۆنەپەرستەکان نەبوو. ئەو هانی ئەداین کە هەموو شت بخوێنینەوە. لەبیرمە باوکم کتێبێکی لینینی دامێ لەناو مزگەوتدا. هەر ئەو هۆکارەش بوو کە ئێمە چووینە ناو ریزەکانی حیزبی شیوعیی عێراقەوە.

.........................................................................................................



شێرکۆ بێکەس

• یەکێك لەو منالاّنەی هاوڕێم (فاروق) بوو ... هەموو لە یەك تەمەندا بووین مەگەر یەك دووانێکمان نەبێت بە سالّ و بە دوو سالّ جیاوازیی تەمەنمان هەبووبێت، دوای تەواوبوونی دەوامی قوتابخانە هەموو یەکمان ئەگرت و تا بانگی ئێوارە خەریکی یاری و شەڕەشەقی خۆمان ئەبووین هەمووشمان عەزیی خەتخەتمان لەبەر ئەکرد.

• بزێوییەکەی فاروق لە رادەبەدەر بوو. یارییەك هەبوو بۆ (شروب) شکاندنی سەر سینی، فاروق ئەوەندەی ئەبردەوە منالّی شروبفرۆشی لات و پوت ئەکرد.

• هەرکاتێك بمانویستایە فـاروق بێـدەنگ بکـەین ئـەمانگوت ئەچـین لای باوکـت شکاتت لێ ئەکەین، فاروق هەر لە باوکی ئەترسا و بەس.

• جووتــە پــێڵاوە مقەباکــەی بــە منالێـك فرۆشــتەوە بــە دوو عانــە، دوایــی دوو فلسیشی دا بە من. هەر ئەو کاتەش فاروق ئەقڵێکی بازرگانی و بازاڕی هـەبوو. دوو هاوینیش کە ترۆزی پێ ئەگەیشت ترۆزیمان ئەکڕی و لەسەر سینییەك ئەمانفرۆشت ... هەتا دوو قاشمان ئەفرۆشت، خۆمان سێ قاشمان ئەخوارد بەتایبەتی من.

• ئـەنوەر لاپەڕەیـەکی کـۆن و زەردی رۆژنامەیـەکی پـێ بـوو، لـە لاپەڕەکـەدا وێنەی پیاوێکی سمێڵ رەشی تیا بوو هـەموو لەشـی بـە فیشـەك پێچـرابوو. پێمـان گـوت ئەمــە کێیــە؟ گـوتی ئــەوە شــێخ مــەحمودە زۆر ئازایــە، هــەزار ئینگلیــزی کوشتووە! هەمومان سـەرمان بەسـەر مێزەکـەدا شـۆڕ کردبـووەوە. فـاروق گـوتی جارێکیان باوکم بۆی باس کردووین.

• بە درێژایی ئەو ماوەیە و لەو چەند ساڵەدا هەموو رۆژێـك لەگـەڵ فـاروق دا بـۆ یاری و شەڕەشەق یـەکمان ئـەگرت. عەزییـەکانی بـەرمان زوو زوو ئـەدڕان و پـیس ئەبوون، ئـەم مەسـروفە بـۆ دایکـم زۆر بـوو، بـۆ مـاڵی فـاروقیش. لـە یادمـە چـەند جارێکیش (گوایە) بۆ سەعی کردن ئەچوومە ماڵی فـاروق، وابـزانم یەکـەمجارم بـوو کە بەهەشتی باوکی فاروق، مەلا مستەفام دی، دەسـتی بـە سـەرمدا هێنـا و گـوتی فایەق بێکەس وەتەنییەکی راست بوو، غەل و غەشی نەبوو، تۆش بخوێنە با وەکـو باوکت دەرکەویت.

........................................................................................................



**فوئاد قەرەداغی**

• یەك ساڵی دیاریکراو نییە کە بڵێم فاروقم لەو ساڵەدا ناسیوە.. من هەر چاوم کردووەتەوە فاروقم ناسیوە، بەحوکمی ئەوەی کە ئێمە وەکو بنەماڵە تێکەڵ بووین و تێکەڵییەکەشمان لە باپیرمانەوەیە.

• جار جار ئەهاتن بۆلای کارێزی دایکی پاشا لە سەرکارێز. لەوێ کۆڵانەکەی مامی کاك فاروق، مەلا نەجمەدین، زۆر تەسك بوو. پەتێکمان رایەڵ ئەکرد لە ناوەڕاستی دیوارەکەدا ئەمبەر و ئەوبەرمان پێ ئەگرت و تۆپتۆپێنمان ئەکرد. بەعزێ جاریش تۆپمان لا نەبوو بە تۆپی پەڕۆ یاریمان ئەکرد.

• یادگارییم لەگەڵ فاروقدا زۆر زۆرە، بەڵام هەمووی یادگاریی سیاسییە ... زۆر جار کە لە گەلاڵە و چۆمانەوە بەنهێنی ئەهاتەوە بۆ سلێمانی شەوی وا هەبووە هەتا بەیانی پێکەوە قسە و باس و راوێژمان کردووە.

• دوای راپەڕین پێی گوتین ئەگەر ئێوە ئامادە بن پێکەوە گۆڤارێك دەرئەکەین. من وەکو خۆم زۆرم پێ خۆش بوو. ئیمکانیاتی مادی بە کاك فاروق هەڵئەسووڕا، هەر لەبەر ئەوەش خۆی خاوەن ئیمتیازی گۆڤارەکە بوو.

• ئێمە درەگایەکی پۆلاییمان بە رووودا کرایەوە بەتایبەتی ئەو سەردەمە سەردەمی هەرەسی یەکێتی سۆڤێت بوو. ئەو هەرەسە کاریگەرییەکی زۆری لەسەر دونیا هەبوو. ئێمە وەکو کۆمەڵێك مارکسی پێمان ناخۆش بوو کە ئەم دونیایە لەپڕ هەڵگەڕایەوە.

• فاروق پیاوێکی نیشتمانییە، پیاوێکە حەز ئەکات خزمەت بە شارەکەی بکات. پیاوێکە دڵسۆزە بەرامبەر هاوڕێکانی. لە رۆژی لێقەوماندا هاوڕێکانی لەبیر ناکات. من

خۆم یەکێکم لەوانەی کە لە رۆژگارێکدا پێویستم پێی بووە.. دەستی لێ بەر نەداوم.

• لە سەردەمی نەهامەتی و برسێتیدا کە ماوەیەك کوردستانی گرتەوە، کاك فاروق یارمەتی زۆر کەسی داوە و یارمەتییەکەشی بەخشندانە بووە.

........................................................................................



**حەمە رەشید غەریب**

• بووین بە دوو باڵی جیاوازەوە. لا زۆرەکەی کە زوربەی ئەندامە باڵاکانی لەخۆ گرتبوو بوونە باڵی قیادەی مەرکەزی. ئێمەیش لەگەڵ ئەو باڵەدا بووین و زوربەی حیزبمان لەگەڵ بوو. کاك فاروقی مەلا مستەفا لەوکاتەدا دەورێکی باڵای هەبوو ... ئەو ئەندامی سەرکردایەتی بوو، منیش ئەندامی لیژنەی ناوخۆی سلێمانی بووم.

• پیاوێکی زۆر ئازا و جەریئە. حەزی لە گاڵتە و قسەی خۆش و نوکتەیە. سیحرێکی سەیری تێدایە بۆ خەڵك راکێشان بەلای خۆیدا. لەکاتی کۆبوونەوەی حیزبیشدا کاتێکمان دانابوو بۆ قسە خۆشەکانی ئەو. خۆیشی رێز و ئیحتیرامێکی باشی هەبوو لەناو خەڵك و لەناو حیزبیشدا.

• کەس نەزانێت من باش ئەزانم کە فاروقی مەلا مستەفا خانووەکەی ماڵی باوکی چەند خۆش ئەویست.

• فاروقی مەلا مستەفا ئەوەی کە لە مەزهەب و بیر و فیکریدا نەبێت لەخۆباییبوون و گۆڕانە. هەر ئەو کورەی جارانە کە من دیومە ... چۆنم دیوە هەتا ئێستا هەر وەکو خۆی وایە و نەگۆڕاوە و هەر پێشمەرگەکەی ناو دێی (ناوکێلەکان)ە.

• وەختی خۆی کە قالە شێت مابوو ئەم ئەچوو بەدوایدا و بە سەیارەکەی ئەیبرد نانی بۆ ئەکڕی و پارەی ئەدایە و جل و پێڵاو و هەتا ئەیشیبرد بۆ حەمام و ئەیشیهێنایەوە بۆ ناوبازاڕ. من وێنەی ئەوم دیوە کە لەگەڵ زوربەی شێتەکاندا وێنەی گرتووە.

• ئەوەی من بزانم مانگانە بە لیست ناوی لایە کە یارمەتی خەڵك ئەدات.

..........................................................................................



محەمەد نوری تۆفیق

• هەندێکجار کاك فاروق لەگەڵ مندا رەئی جیاوازمان هەبوو. ئەو جیاوازیی بیروڕایەمان نەبووە هۆی دڵئێشان و جیابوونەوەمان. رۆژ بە رۆژیش هەتا ئەهات پەیوەندییمان قووڵ ئەبووەوە.

• لەو ساڵانەدا کە نووسینگەکەمان لە بینای عەلی نەمەڵی بوو، خەڵك زۆر رووی ئەکردە لامان.. پارەی ئەوەمان نەبوو (چا) بکڕین و خزمەتی میوانەکانمان بکەین. چونکە ئێمە یەکەم نووسینگە بووین و خەڵکێکی زۆریش هاتوچۆی ئەکردین.. کاك فاروق کە ئەوەی بینی رۆژێك بە منی گوت: "ئەوە برا بۆ (چا) ناکڕن؟" منیش گوتم: "وەڵڵا نیمانە." گوتی: "من لەمەودوا چایچییەکم بۆ دانـاون باوك و کوڕێکن و لە خزمەتی ئێوەدا ئەبن." ... هەتا ماوەیەکی زۆر (چا)ی نووسینگەی کوردستانی نوێ لەسەر گیرفانی کاك فاروق بوو. رۆژانە بەقەد دوو چایخانە لە نووسینگە (چا) ئەخورایەوە. بۆ مێژوو باسی ئەکەم.. ئەوەی کە لەسەر چایخانەکە بوو پەیامنێری دەربەندیخان بوو.

• ئەو ئەیگوت "مۆبایل ئەهێنمە ئەم شارەوە." لەکاتێکدا ئەو قسەیەی ئەکرد کە دەبابەکانی سەدام لە بانی مەقان بوون. هەر رۆژێك سەدام ئارەزووی بکردایە ئەهاتە سلێمانی.

• لەدوای راپەرینیشەوە بوو بە خاوەن ئیمتیازی گۆڤاری (دواڕۆژ) و زۆرێك لە بابەت و نووسینی خۆی تێدا ئەنووسی.

• کاك فاروق بە ئەکادیمی بووە بە بازرگان نەك لەناو گۆماوی بازاڕەوە هاتبێت.

• ئەوەندەی من بزانم خەڵکێکی زۆر یارمەتی لە کاك فاروق وەرئەگرن.. تەنانەت یارمەتی زۆر خوێندکاری داوە بۆ تەواوکردنی خوێندن.. زۆر کەسی لە نەخۆشی و دەرد رزگار کردووە و بۆ چارەسەر ناردوونی بۆ دەرەوەی کوردستان.

• خۆی پێم ئەڵێت: "لەوپەڕی سەرقاڵی و مەشغەڵەتا بم کە ژمارەکەت لەسەر مۆبایلەکەم ئەبینم دڵم نایەت جوابت نەدەمەوە."

..........................................................................................



**وەستا محەمەدی بەنا**

**(حەمەی حەپسە)**

• لە ساڵی ١٩٧٢ەوە مەرحەبامان هەبوو. لە ساڵی ١٩٦٣وە ئەمدی کە هاتوچۆی ماڵمان ئەکات و ئەهات بۆ لای شەهید (ئەکرەم)ی برام کە پێکەوە لە رێکخستنەکانی (ح.ش.ع) کاریان ئەکرد. ماڵمان لەسەر جادەی ئۆرزدی بوو کە ئێستا پێی ئەڵێن جادەی گۆران، ئەو ماڵەی تیای ئەژیاین خانوویەکی زۆر ناخۆش

بـوو کـە بـە قـوڕ دروسـت کرابـوو. لـە ژێرخانەکـەدا کـاك فـاروق و هاوڕێکـانی کۆبوونەوەیان تیا ئەکرد ... ئەوەی لەبیرم مابێت کە لـەو کۆبوونەوانـەدا لەگـەڵیان بوو مستەفا چاوڕەش بوو.

- دوای چەند ساڵێك بـووین بـە شـەریك لەگـەڵ کـاك فـاروق لـە سـاڵی ١٩٧٦دا، بیست و چوار ساڵ شەریك بووین لە ناو کـاری مقاوەلاتـدا ... بیسـت و چـوار سـاڵ شەریکی بووم نە درۆم لێ دی و نە خیانەت.
- فاروقی مەلا مسـتەفا کەسـێکی موغامەرەچـییە. گـوێ بـە هـیچ نـادات و لـە هیچـیش ناترسێت.
- رۆژێکیان هاوڕێیەکی خۆمم برد بۆ لای کە نەخۆشی دڵی هـەبوو، بـڕی شـەش هەزار دۆلاری دایە.
- خۆشترین تەبیعەتی هەیە و حەزی لـە نوکتـە و قسـەی خۆشـە ... کەسـێکی قورسە و خاوەنی شەخسییەت و ئەخلاقێکی بەرزە.
- لـە بیرمـە لـە ئیشـێکدا کـە بـە نـۆ هـەزار و چوارسـەد و پـەنجا دینـار بۆمـان دەرچوو پارەکەمان تەواوی نەکرد. کاك فاروق داوای سێ هـەزار دینـاری سویسـری لە کاك مستەفای زاوای کرد ... ئەوەی کە کـاك فـاروقی مـەلا مسـتەفای بـردە نـاو ئیشی گەورەوە نزیکترین و خۆشەویستترین هاوڕێی خـۆی بـوو کـە لـە بەغـدا بـوو، ناوی (ماجید عەلاوی) بوو کە یارمەتی دا کارگەی بلۆك دابنێت.
- من قەناعەتم وایە فاروقی مەلا مستەفا لە (چاو)ی زیاتر شاری سلێمانی خۆش ئەوێت.

...........................................................................



**عومەر حسێن**

• لە دوای نسکۆ گەڕایەوە وەکو گەنجێکی بەئەزموون و پــڕ توانــا و هێــز و جــدی لە ئیشکردندا دەستی کرد بە وەرگرتنی مقاوەلاتی بچووك بچووك وەکو چوار هەزاری و دە هــەزاری. هــەتا لەگــەڵ خۆشەویســترین و ئــازیزترین هــاوڕێی خۆیــدا (ماجیــد عەلاوی) کە ئەو بەڕێزە توانای ماددی زۆر باش بوو برای بەڕێز (د. ئیبراهیم عەلاوی) بوو یارمەتی کاك فاروقی دا بۆ دامەزراندنی کارگەیەکی بلۆك و کەسارەیەکی بەرد.

• داوای لێ کردم لە دەواجینەکە ببم بە ژمێریار. دڵم نــەهات قســەی بشــکێنم و پێکەوە ئیشمان کرد و هەتا وای لێ هــات ئــەو پرۆژەیــە بــوو بــە یــەکێك لــە پــرۆژە هــەرە ســەرکەوتووەکان لــە کوردســتاندا. لــەناو هــەموو پرۆژەکــانی عێراقــدا لــە هەموویان باشتر بوو. هەر ئەمەیش وایکرد کە دوای ئەو ماوە زۆرەی کە بەدەســتی کۆمەڵێکی ترەوە بــوو رێــز و تەقــدیریان بــۆ نــاردین.. چــونکە بەدەســتی ئەوانــەوە فەشەلی هێنابوو.. لە ئیشکردن بەردەوام بوو هەتا راپەڕین.

• کــاك فــاروق چــووە ســەر قائیــدی فیرقــەی هەشــت پێــی گوتبــوو تــۆ مــاڵی حکومــەتت داگــیر کــردووە، ئێمــە هێشــتا قیســتی حکومــەتمان لەلایــە. بەرپرســی جەیشەکە ترسابوو، چــونکە دەواجینەکــەیان کــاول کردبــوو، هەرچــی مریشــك بــوو هەموویان خواردبوو و ئەشیاکانی ناویان شکاندبوو.

• من یەکێکم لەوانەی فەخر و شانازی بە هاوڕێیەتی و دۆستایەتی فاروقی مــەلا مستەفاوە ئەکەم. من بە درێژایی تەمەنم شەهامەت و پیاوەتیی کــاك فــاروقم قــەت

لــەبیر ناچــێتەوە. ئەگــەر ئــەو ڕێــز و برایــەتی و خۆشەویســتی و دڵپاکییــەی هەردووکمان نەبووایە کە لەبەرامبەر یەکتری هەمانە ڕەنگە ئێستا منیش وەکو ئـەو خەڵکە بچوومایە و سەرەم بگرتایە بۆ مووچەی خانەنشینی.

• کـاك فـاروق کەسـێکی زۆر ئـازا و چـاونەترس و جەریئـە و بڕیـاری قـورس و سەخت ئەدات کە لـە مێـژووی ژیانیـدا هەرچـییەکی گوتبێـت جێیـەجێی کـردووە و سەریشکەوتووە. یەکێك لە موجازەفە هەرە گەورەکانی هێنانی مۆبایل بوو.

• کاك فاروق نەگۆڕاوە، لە منالّییەوە چۆنم دیـوە هـەتا ئێسـتاش هـەر وایـە ... مـن خـۆم شـاهیدی ئـەوەم کـە بـە دەیـان کەسـی لـە دۆسـت و هـاوڕێی خـۆی بـۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی ناردووەتە دەرەوە. خـانووی بـۆ زۆرێـك لـە دۆسـتەکانی کڕیوە.. یارمەتی سەدان کەسی داوە کە موستەحەق بـوون و بـاری ژیانیـان خـراپ بووە.. بە سەدان کەسیش کـە نـەیانتوانیوە کرێـی خـانوو بـدەن ئـەو کرێکـەی بـۆ داون، یــان خانووەکــەی بــۆ کڕیــون ... دەســتی کراوەیــە بــۆ هــەموو هــەژار و لێقەوماوێك ئەگەر نەیشی ناسێت.

........................................................................................................



حەسەن حسێن

• لە ساڵی پەنجاکانەوە لەگەڵ فاروقی مەلا مستەفا پێکەوە لە ناوەنـدی بـووین و هاوڕێ بـووین. لـە بیرمـە کاتێـك قوتابییـەکان ژمارەیـان زۆر بـوو لـە بەرخانـەقاوە خانووەکەی (عومەری سام ئاغا)یان بۆ گرتین لە سانەوی سلێمانییەوە چووینە ئەوێ.

• رۆژێکیان سەعید قەزاز و فایەق هۆشیار هاتن بۆ قوتابخانەکەمان ... کاك فاروق گوتی سەیری ئەم قوتابخانەیە بکەن بزانن چیە و ئێمە چی تیا ئەکەین، ئەمە ماڵە نەك قوتابخانە، مامۆستامان نییە، ئەوەی کە ئینگلیزییمان پێ ئەڵێت هەر ئەویشە کە وەرزشمان پێ ئەڵێت. فریامان بکەون وەزعمان زۆر خراپە.

• ئێوارەیەکیان لای نادی مۆزەفینەوە سەیر ئەکەم پیاوێکی بچکۆلەی خڕ پاڵتۆیەکی لەبەردایە و دەموچاوی خۆی ئەشارێتەوە. زۆرم لا سەیر بوو هەر دیقەتم ئەدا و ئەویش لە من خراپتر. لەیەك ڕەت بووین ... سەیر ئەکەم فاروقە، بەوپەڕی تامەزرۆییەوە باوەشم پیا کرد و ئەملا و ئەولای یەکترمان ماچ کرد و چووینەوە بۆ ماڵی خۆمان. گوتم دانیشە ئێستا کێت ئەوێت ئەچم بۆت ئەهێنم ... کەمالی برام و فەرەج بابانم هێنا و من هەتا سەعات یەکی شەو لەگەڵیان دانیشتم و چووم خەوتم. بەیانی سەعات حەوت کە هەڵسام سەیر ئەکەم ئەوان سێ قۆڵی دانیشتوون و قسە ئەکەن. لەگەڵیان بەرچایی بەیانیم خوارد و فاروقم ماچ کرد و پێمگوت: ئیشەڵڵا مۆفەق ئەبیت.

• من ئاگام لێیەتی مووچەی هەزاران قوتابی ئەدات، موچەی بۆ ماڵە شەهید و ئەنفالەکان بڕیوەتەوە و ڕۆژانە یارمەتی هەزاران کەس ئەدات و دەست نانێت بە رووی کەسەوە. ئەمە بێ لەوەی بە هەزاران هەزار کرێکار و کادری زیرەك لە بوارەکانی کۆمپیوتەر و زمانی بێگانە و دەرچووی زوربەی زانکۆکان لەلای ئەو دامەزراون.

• فاروقی مەلا مستەفا خاوەنی ئەخلاقێکی بەرز و تۆکمە و پتەوە، قسەی لە رووە، شەرم لە کەس ناکات، ئازا و چاونەترس و دلێرە و لەکاتی خۆیشیدا شیوعییەکی دڕ و توند بوو، هاوڕێپەرستێکی سەیرە و ئامادەیە گیان و خوێنی خۆی بۆ هاوڕێکانی بەخت بکات.

........................................................................................



**نەوشیروان مستەفا**

**(لە بیرەوەرییەکانیدا، کتێبی: لە کەناری دانوبەوە بۆ خڕی ناوزەنگ)**

• ئیبراهیم (عەلاوی) چووبووە سوریا و فاروق مەسئولی بنکە و پێشمەرگە و ڕێکخستنەکانی کوردستانیان بوو لە (ناوکێلەکان) دائەنیشت.

• ڕۆژانی ئاشبەتاڵ ئەمیش لەگەڵ سەرکردەکانی کۆمەڵە قسەی کردبوو هاوکاریی بکەن بۆ مانەوە و بەرەنگاری. پاشان بۆیان دەرکەوت ئەم کارەیان پێ ناکرێت. ئەوانیش لەگەڵ لێشاوی خەڵکدا گەڕابوونەوە بۆ عێراق. کاربەدەستان، لەوانە غانم عەبدولجەلیل، لەگەڵ فاروق و هاوڕێکانی قسەیان کردبوو کە حیزبەکەی ئەوانیش لە وەزارەت و بەرەدا بەشداریی بکەن.

• لەگەڵ فوئاد (ی مەلا مەحمود) زۆری لەگەڵ خەریك بووین لە ڤیەننا بمێنێتەوە و نەچێتەوە بەر چەقۆی بەعس، تا ئێمەش دەست پێ ئەکەینەوە، ئەوسا پێکەوە ئەگەڕێینەوە کوردستان. فاروق ملی نەدا و سوور بوو لەسەر گەڕانەوەی بۆ عێراق، بیانووەکەشی ئەوە بوو کە ئیلتیزامی هەیە و بەڵێنی داوە بە هاوڕێکانی بگەڕێتەوە لایان. ئەگەر نەگەڕێتەوە لەوانەیە بەعس ئازاریان بدات. فاروق نەیئەزانی چارەنووسی چی ئەبێت و بەعس چۆن رەفتاری لەگەڵ ئەکات. لەگەڵ ئەوەشدا گەڕایەوە بۆ عێراق، بێگومان ئەمە هەڵوێستێکی جوامێرانە و ئازایانە بوو.

.......................................................................................................



**جەلالی عومەری سام ئاغا**

• رۆژی ١٩٦١/١١/٦ خۆپیشاندانێك بۆ هاوكاریی مانگرتنی كرێكارانی جگەرەی بەغدا سازكرا، فاروق هەر شەوی پێش خۆپیشاندانەكە گیرا، چونكە لە گروپی هاوكاریی مانگرتووەكان بوو، وەك سەرپەرشتیارێك ئەناسرا.

• پاش تەواوكردنی ماوەی ئیحتیات فاروق لە بەغدا مایەوە و لە بانكی بازرگانی دامەزرا و منیش هاتمەوە سلێمانی بۆ سەر وەزیفەكەی خۆم، فاروقیش بەهۆی ئەوەی فەرمانی دەستگیركردنی زۆری بۆ دەرچووبوو لە بەغدا هاتەوە سلێمانی، فاروق لە سیاسەت و مل لە چەقۆ سووین بەردەوام بوو، چەند جارێك بە غیابی حوكمی لەسێدارەدانی بۆ دەرچوو، ئەو كاتانەی حوكمی لەسێدارەدانی لەسەر بوو، بەشەو یان بە نیوەڕوانی گەرمی هاوین بە شێوەیەكی بەردەوام هاموشۆی یەكترمان ئەكرد.

• ساڵی ١٩٧٤ – ١٩٧٥، واتە ساڵی هەڵگیرسانەوەی شۆڕش، دیسان من و فاروق یەكمان گرتەوە، ئەوە یەكێك بوو لە بەرپرسە دیارەكانی قیادەی مەركەزی، منیش لە ریزی شۆڕشدا بووم، من لە خوار گوندی (زینۆی شێخی) لەنێوان حاجی هۆمەران و بابەكراوا، لە خانوویەكدا بووم لەگەڵ د. كەمال مەزهەر و خوالێخۆشبوو د. كەمال خەبات و كاك فەرهاد عەونی و سیروان عەبدوڵڵا سەعید كە بەڕێوەبەری چاپخانەی شۆڕش بوو. زوربەی شەو فاروق ئەهاتە لام و لەگەڵ میوانەكانمدا ئەكەوتە قسە، زۆرجار بەهۆی بگرە و بەردەی سیاسییەوە دانیشتنەكانمان تێك ئەچوو، چونكە فاروق جیاوازیی بیروباوەڕی لەگەڵ شۆڕشدا هەبوو.


مستەفا ساڵح کەریم

• ساڵانی حەفتاکان بەڕاستی قیادەی فیعلی و عەمەلیی قیادەی مەرکەزی کاك فاروق ئەیکرد کە ئەوکاتە بارەگاکەیان لە (گەڵاڵە) بوو لە (کێلەکان).

• مەسەلەی مۆبایل لە عێراقدا هەر ناوی بیسترابوو. ئەو توانی کۆمپانیای ئاسیاسێڵ بهێنێت کە درێژترین ڕێگای بۆ خەڵك کورت کردەوە.

• بە هەزاران کەس هەن کە دەوڵەمەندن، بەڵام کەمیان تیایە کە وەکو ئەو یارمەتی قوتابیان بدەن بۆ تەواوکردنی خوێندن. لە هەر شوێنێك لێقەوماوێك هەبێت ئەو ئەچێت بە هانایەوە. ڕەنگە بەبێ موبالەغە ئەگەر بچیت سەیری سجیلی حساباتی کاك فاروق بکەیت ساڵانە هەر لە بەصرەوە هەتا کوردستان ئەوەی کە دەنگ و ناڵەی بگاتە لای کاك فاروق درێغی لێ ناکات. بەتایبەتیش لە ڕووی یارمەتی قوتابیانەوە دەورێکی باڵای هەیە لە یارمەتیدانیاندا.

• ئەو کاتەی کە لە وەزارەتی ئیرشاد ئیشی ئەکرد لەگەڵ چەند برادەرێکیدا گۆڤاری (ئەلعێراق)یان دەرئەکرد کە زمانحاڵی وەزارەت بوو.

• لە دواییشدا کە لە قیادەی مەرکەزیدا بوو، بە زیرەکی و لێهاتوویی خۆی و ئازایی خۆی توانی لەدوای (عەزیز ئەلحاج) لەگەڵ ئیبراهیم عەلاوی و هاوڕێکانیدا حیزبی شیوعی ڕێك بخەنەوە و چەندین کۆنفرانسیان لە مەنتیقەی قەراغ و باڵەك گرت.

........................................................................................



مستەفا چاوڕەش

• بنەماڵـەی کـاک فـاروق هـەم وەك خـۆی و پـێش خـۆی، وەکـو بنەماڵەیـەکی تێکۆشەر و بنەماڵەیەکی ناودار بوون لە شاری سلێمانیدا.

• ئەو کاتە هەمووبان (ح.ش.ع) بووین. سەردەمانی مـن زیـاتر ئەگەڕێتـەوە بـۆ جیابوونەوەی حیزبی شیوعیی لە ١٧ی ٩ی ١٩٦٧.

• ساڵی ٦٨ ... حیـزب مـن و کۆمـەڵێك لـە هاوڕێکـانمی راسـپارد کـە بچـین بـۆ بەغدا، لەوانەش زوربەیان نەماون، هەر خۆم لەناویاندا زیندووم ... بـۆ رۆژی دوایـی گەیشتینە بەغدا. ئێمە چۆن حیزب بدۆزینەوە؟ ئەو کاتە ئێمە کاك فاروقمان ناسـی هەروەکو پێشتر ئاگاداریان کردبووین کە ئەچنە بەغدا ئەبێت پەیوەنـدی بکـەن بـە فاروقی مەلا مستەفاوە و نامەکـەش درا بـە ئـەو. ئـەویش تـوانی پەیوەنـدیی ئێمـە گرێ بدات بە حیزب و رێکخستنەکانی بەغداوە.

• جارێکی تر و بە نهێنی چەندین جار لە سلێمانی یەکترمان دیەوە. وا رێکـەوت بارەگاکانمـان گواسـترایەوە بـۆ مەنتیقـەی حـاجی ئۆمـەران و دێـی (کێلـەکان)، بارەگـای سـەرەکییمان چـووە ئـەوێ و لـەوێ بـووین. دوای ئـەوە چـووینە دێـی (دارلسەلام) کە لە پشتی (کێلەکان)ەوە بوو. پاشان چووینە دێی (گوێزان).

• لەناو بارەگاکاندا پێکەوە بووین بەتایبەت لە کێلەکان و دارلسـەلام، لـە یـەك ژووردا پێکەوە ئەخەوتین. بۆ یادگاری باسی ئەکەم لە ژوورەکەی من و کاك فاروقدا مـارێکی تیـا بوو ئەچووین بۆی بیکوژین خۆی ئەکردەوە بەناو کونەکەدا و دایمـە سـەرەتاتکێی لەگـەڵ ئەکردین. نەمانتوانی بیکوژین.. هەر لەو ژوورەی ئێمەدا ئیبراهیم عەلاویشمان لەگەڵدا بوو.

• پێش ١١ی ئازار کاك فاروق لەناو بارەگاکان مایەوە و وەکو بەرپرسی حیزب لە ناوکێلەکان بوو.

• بڕیارێکی حیزب دەرچوو کە ئەبێت کاك فاروق بچێت بۆ سوریا، من چاوساغەکەی بووم ... هەر یەکەی دە دیناریشمان پێ بوو کە حیزب دابووی پێمان.

• چەند جارێك لەسەر من دائیرەی ئەمنی سلێمانی بانگیانکرد. سەیر لەوەدا بوو کاك فاروقیان بەوە تاوانبار کردبوو لە ئەمنی سلێمانی کە گوایە مستەفا چاوڕەش شەریکتە.

• پەیوەندیی من لەگەڵ کاك فاروق پەیوەندییەکی تونـدوتۆڵ و بەهێزە و تێکەڵیی خێزانییشمان هەیە. لەسەر ئەساسی ئەو ئەخلاق و مەبدەئەی کە نەماندۆڕاندووە.. یەکێکە لە کوڕە هەرە بەوەفا و دڵسۆز و ئازیزەکان لە دڵی مندا.

• کاك فاروق پیاوێکی ئازا و چاونەترس بووە وەك هەموو کاتەکانی تر لە هەموو قۆناغەکانی شۆڕشدا.

........................................................................................................



**ئەحمەد میرە**

• ئەگەر مەلا مستەفای سەفوەت حافزی شیرازی و سەعدی بە ئێمە ناساندبێت، ئەگەر دکتۆر عیزەدین ئەحمەدی خانی بە ئێمە ناساندبێت، ئەوا کاك فاروقی مەلا مستەفاش مۆبایلی پێ ناساندین کە پێموایە پێداویستترین ئامێری تەکنەلۆجیایە.. کاك فاروقی مەلا مستەفا بە ئاسیاسێڵ توانی دەرگای کوردستان بە دیوی دەرەوەدا بکاتەوە.

• ئەگەر یەکێك بیەوێت لەسەر گەشەی ئابووری لە کوردستاندا توێژینەوە بکات بەتایبەتی لەدوای راپەڕین، بێگومان ناتوانێت بەبێ لەبەرچاوگرتنی کار و چالاکییەکانی کاك فاروقی مەلا مستەفا توێژینەوە بکات.. هەتا بۆ مێژوونووسەکانیش هەر وایە.. نووسینەوەی مێژووی ئابووری بەبێ فاروقی مەلا مستەفا مێژوویەکی قەمووره.

..........................................................................................................



ئازاد مستەفا

• من لە بیرم نایەت کەی کاك فاروقم ناسیوه، چونکە ئێمە هەر بە خێزانی جۆرێك لە تێکەڵیمان هەیە لەگەڵ بنەماڵەکەیاندا. لە سلێمانیدا کۆمەڵێك خێزان هەبوون کە لەناو سیاسەتدا کاریان کردبێت، ماڵی کاك فاروقیش یەکێکیان بوو.

• لەبیرمە کاتێك قەراغ گیرا کاك فاروقیش لە قەراغ بوو. هێزەکەیان کشایەوە، کاك فاروق هاتە تەوێڵە، بەو ناونیشانەی کە قاچی لەجێ چووبوو.

• لەدوای نسکۆ، بەو پێیەی کاك فاروق یەکێکبووە لە ئەندامە هەرە باڵاکانی قیادەی مەرکەزی، حکومەتی بەعس زۆری پێ خۆشبوو کە کەسێکی وەکو فاروقی مەلا مستەفا بکاتە بەرپرسێکی باڵا و دیار هەر بۆ ئەوەی بڵێن ئەوەتا بە پارە کڕیمان. کاك فاروق ئەمەی نەکرد. لە ناوبازاڕ دوکانێکی بەکرێ گرت و خەریکی قۆنتەراتی پێنج هەزار دیناری و دە هەزار دیناری بوو.

• من لە لەندەن بووم کاك فاروق هاتووەتە ئەوێ و هەموو هاوڕێکانی لە

قیادەی مەرکەزی بینیوە و بەوپەڕی شانازییشەوە لەگەڵیان دانیشتووە.

• دوای راپەڕین کە هاتەوە کاك فاروقیش وەکو ئەو خەڵکە کەوتبووە بەر لێشاوی تاڵانکردن و هەرچییەکی هەبوو لەدەستیدا.

........................................................................................................



**حسێن شێخ عوسمان نێرگسەجاڕی**

• رۆژگار رۆیشت و من و فاروق لە رێکخراوەکانی پارتی کۆمۆنیستی عێراقدا بەیەك گەیشتینەوە لە ساڵانی شەستەکانی سەدەی بیستدا. کاك فاروقی مەلا مستەفا لێپرسراوی شانەیەکی پێشەوەی رێکخراوی (کاوە)ی قوتابیان بوو ... بە ئینسافەوە باسی ئەکەم، کاك فاروقی مەلا مستەفا زۆر شتی فێر کردین لە بواری فیکری و چالاکیی رێکخراوەییدا.

• لە کارەساتی کیمیابارانی هەڵەبجەدا ژمارەیەکی زۆر لە قوتابیانی خەڵکی هەڵەبجە و دەوروبەری بێ باوان و ماڵە باوك مانەوە. زۆریان یان تیاچووبوون بە کیمیاوی یان پەرتەوازەی ئێران بوون. بەڕاستی رۆژگارێکی یەکجار تاریك و پڕ نائومێدی بوو. بەتایبەتی بۆ ئەو قوتابییانەی بەشی ناوخۆیی کە مابوونەوە بێلانەوبانە، لەکاتێکدا کە نزیکبوون لە تاقیکردنەوەکانی سەری ساڵ و بەکەلۆریی پۆلی سێی ناوەندی و شەشی ئامادەیی ... لەو کاتە جەرگ و دڵتەزێنەدا دوو تروسکە و رۆشناییم شك ئەبرد لە زەینمدا، یەکەمیان کاك فاروقی مەلا مستەفای هاوڕێی شیوعیم بوو ... کە بارودۆخەکەم بۆ باس کرد زۆر مەردانە هاتە پێشەوە و فەرمووی: حسێن گیان هەموو سەری مانگێك وەرە بۆ ئێرە و لیستێك بەناوی قوتابییەکانەوە بهێنە و ناوی چەند فەڕاشێکیش بنووسە با بەشێك لە خزمەتگوزارییەکان پێشکەش بە قوتابییەکان بکەم.



**سلێمانی قەساب**

• من هاتمەوە بۆ کوردستان، لە (کاولان) بووین لـەلای (کونەمشـکان)ەوە. ئـەو کاتە من حسك بووم. وەزعمان زۆر خراپ بـوو. هیچـمان نـەبوو. جوابمـان بـۆ نـارد هەندێك یارمەتی بۆ ناردین کە یارمەتی وا و لەو کاتەدا زۆر زەحمەت بوو.

• من ئەزانم کە رۆژانە یارمەتی هەزاران کەس ئەدات بەبێ موقابیل. نەخۆش و قوتابی بۆ دەرەوەی ولات ئەنێرێت.. من رەفیقی خۆم هەبووە پێشمەرگەی کۆن بووە پێویستی بە یارمەتی هەبووە، چی ویستووە و داوای چی لێ کردووە هەمووی بۆ جێبەجێ کردووە.

..........................................................................................................



**یاسین قادر بەرزنجی**

• ئـەو وەك پیـاوێکی سیاسـی و وەك روونـاکبیر و کەسـایەتییەکی کۆمەڵایـەتی، دەگمەن و هەمیشە چالاك بوو، ئەو کاتانەی بە نهێنی لـە شـاخەوە دەهاتـە شـار، لـە ماڵەکەی خۆیان و لە چەند ماڵێکی خزمە نزیکەکانی و چەند هاوڕێیەکی خـەباتی وەك سەرکردەیەکی هۆشیارو بوێر کارەکانی ئەنجام دەدا.

• کاک فاروق  لای هەر کەسێك لە نزیکەوە ناسیبێتی نموونەیەکی بەرزە بۆ دڵسۆزی و دڵپاکی و بەخشندەیی.

• شانازم بە کاك فاروقی خاڵ و مامۆستا و هاوڕێی گەورە و خۆشەویستم، ئەو پیاوەی لە مێژووی سلێمانی و کوردستاندا ناوێکی گەورە و بەنرخ و خۆشەویستە.

## خێزانەکەمان

لـە ڕۆژی ٦ی تــەموزی ١٩٤١ و وەك بــاوکم نووســیویەتی لــە ســەعات ١٠:٣٠ عـەرەبیی پاشـنیوەڕۆ کـە ئەکاتـە سـەعات ٦ی ئێـوارە لـە گـەڕەکی دەرگـەزێنی سلێمانی لەدایك بووم. مەلا مستەفای باوکم کوڕی حـاجی مـەلا ڕەسـوڵی دێلێژەیـە کە ئەویش کوڕی مەلا محەمەدی مەلا شەریفە. کاتی خۆی حاجی مـەلا ڕەسـوڵ لـە دێلێـژەوە هاتووەتـە سـلێمانی و مەلایـەکی بـەناوبانگ و واعیـز و خەلیفـەی کـاك ئەحمەدی شێخ بووە.



فاروق مەلا مستەفا، مەلا مستەفای سـەفوەت، کانی خان، ١٩٥٨/٣/١٣

بــاوکم لــە ڕەعنــای دایکییــەوە کچەزای شێخ عەزیزە و ئەویش کوڕی شــێخ فەتاحــە، شــێخ فــەتاح کــوڕی حەمەخانــە و حەمــەخان بـرای مــەولانا خالیـدی نەقشـبەندییە. گـۆڕی شـێخ عەزیز و شێخ فەتاح لە خانەقای مـەولانا خالیددایە لە سلێمانی.

بــاوکم کاریگــەریی زۆری هــەبوو لەسەرم، هەر لە فامکردنمەوە بەهۆی جــۆری پەیوەنــدیی لەگەڵمــدا بـــە نەسـیحەتی جـوان و ڕێگـا پیشـاندانم بــەرەو خوێندنــەوە و گــوێگرتن لــە خــۆی و لــەو کۆمەڵــە خوێنــدەوار و پیاوە ئایینیانەی بەدەوری باوکمـەوە

بوون ئەیویست بەو پەیڕەوانـە پـەروەردەم بکـات و لـەناو کـۆڕ و کۆمـەڵی زانسـتدا گوێم بـە ئامۆژگـاری و قسـەی جـوان رابهێنێـت. ئـەو پیـاوە زانـا و بەڕەحمـە، کـە هەموو ژیانی بە خوێندن و نووسـین و رێ نیشـاندانی راسـتی خەڵکـەوە بردەسـەر، هێندە ئازا و بە تەگبیر بوو کە رۆژانە شتی نوێی لێوە فێر ئەبووم. لـە ئایینەکەشـیدا ئەمەندە کراوە بوو، کە ئەوسا و ئێستاش پەنجەی پێشڕەویی بـۆ رائەکێشـن بـەوەی بـاوەڕی بـە دوعـا و نوشـتە و جـۆری تـەڵاق و تـەڵاق چـاککردنەوەی دوور لـە پەیڕەوەکانی ئایینی ئیسلام نەبوو. بەو کـەمیی دەرامەتـەوە سـەغی و بەرچـاوتێر بوو، ئامۆژگاریی ئەوەی ئەکردین خەڵکمان خۆش بووێت و لە هەموو خزمەکانمانەوە دەستی پێ‌ئەکرد.

دایکم جەمیلە ساڵح قادر، ژنێکی یەکجار خـاوەن سـۆز و خۆشەویسـتی زۆر بـوو بەرامبەرم. ئافرەتێکی نەخوێندەوار بـوو، بـەڵام بـەهۆی ژیـانی لەگـەڵ باوکمـدا لـە نەخوێنـدەوار نەئەچـوو. بـاوکم زۆر بـە چـاوی رێـز و خۆشەویسـتییەوە تەماشـای ئەکرد، ئەویش ئەمەندە خەریکی منێکی هاروهاج بوو بە منـاڵی، کـە هـەرگیز بـیرم ناچێت شـەوانێکی زۆر ئەگـەر تۆزێك لەشـم گـەرم بووایـە، تـا بـەیانی بەدیارمـەوە ئێشکی ئەگرت و بە خاولی تەڕ گەرمایی (تا)کەی ئەشکاندم.

دایکـم خـەڵکی قـەرەداغ بـوو، تاقانـەی دایکـی بـوو، بـاوکی زوو کۆچـی دوایـی کردبـوو. دوو خـاڵی هـەبوو سـەعید و قـادر کـە نـەنکم پێکـەوە وەك خوشـك و بـرا هەرسێکیانی گۆش کردبوو. یەکێك لە ئەرکەکانی دایکم جیاواز لە ژنی گەڕەك ئەوە بوو، ئێمە مەڕ و بزنمان هەبوو لەگەڵ رانی ماڵـە ئاژەڵدارەکانی سـەرکارێز بـەڕێوە ئەبران، بەڵام ئێواران دایکم خۆی ئەیدۆشین. لەو ماڵەدا کە خۆمی تیا لـەدایکبووم، مەشکەی ئەژەند و شیرەکەی ئەکردن بە ماست و کەرە و دۆ.

من کە بچووکترین منداڵ بووم یاخود وەك کورد ئـەڵێت، پاشـەبەرە بـووم لەگـەڵ سێ خوشك و برایەکدا لەگەڵ بـاوك و دایکمانـدا ئـەژیاین. خوشـکێکی گـەورەشمان هەبوو لە دایکمان، ئەوسا و تا ئێستاش لە هەرە خۆشەویستەکانمان بوو.



مریەم ساڵح (دادە) (نەنکی فاروق مەلا مستەفا لە دایکەوە)، ١٩٥٨

نابێت باسی دایکی دایکم، مریەم ساڵح نەکەم کە پێمان ئەگوت (دادە) و لە منالیمەوە تا کۆچی دواییەکەی بەردەوام ئەمانبینی و قسە خۆشەکانی و پلارەکانی کەسی نەئەبوارد. نەنکم هەریەکە ناوێکی لێ نابووین. دادە لەگەڵ ماڵی خاڵمدا کە برای بوو وەکو دایك رەفتاری لەگەڵ ئەکرد، لەو ماڵە گەورەیەیاندا ئەژیا و رۆژانەش لەگەڵ دایکمدا و ئێمەش بەدوایدا سەردانی یەکترییمان ئەکرد.

رۆژی ١٩٦٣/١٢/٩ کاتێك باوکم کۆچی دوایی کرد، دادە بەداخی باوکمەوە کە زۆر خۆشی ئەویست نەخۆش کەوت و سەری نایەوە. ئەوکاتە ئەیانگوت دادە تەمەنی لە ١٠٠ ساڵ پترە و تا دوا شەوی ژیانی هیچ دەرمانێکی بەکارنەهێنابوو. خۆی سوور و سپی و چاوی کاڵی مەیلەو شین بوو، یەکێکمانی ناو نابوو شینێ، ئەویتر بۆرە، یەکێکی تر سەگەکە، فلانە قەرەج، فیسارە هەلهەل ..تاد.

# شەجەرەی بنەماڵەی حاجی مەلا رەسوڵی دێلێژە



## پەیوەندیی خێزانەکەمان بە مەولانا خالیدی نەقشبەندییەوە



##ماڵی باوکم

مـن لـە خانوویـەکی بچـووکی سـێ ژووریـدا هاتمـە دنیـاوە، خانووەکـە نزیـك مزگەوتی حاجی مـەلا رەسـوڵی دیلێـژە بـوو کـە دواتـر بـەر جـادە کـەوت و ئێسـتا بەشێکی فولکەی نالی‌یە. باوکم (مەلا مستەفای سەفوەت) دوای کۆچی حاجی مـەلا رەسوڵی باپیرم لە مزگەوتەکەیدا بووبوو بە ئیمام و مودەڕیس.

لەو گەڕەکی دەرگەزێنە، پێش ئـەوەی بخرێمـە قوتابخانـە، لـەبیرم دێ زوربـەی کات لەگەڵ هاوڕێکانمدا خەریکی یاریکردن بـووین. لـەو کاتـەوەی بـیرم دێـت هـەتا گەیشتینە قۆناغی دواناوەندییش هەموو رۆژێك لەبەردەم دوکانەکەی (کاك کـەریمی وەستا بستە)دا کۆئەبووینەوە. کاك کەریم، کەسێکی خۆشەویست و پیاوێکی قسـە خۆش بـوو، چـیرۆك و بەسـەرهاتی ژیـانی خـۆی بـۆ ئەگێڕاینـەوە و باسـی قۆنـاغی سەربازیی خۆی و پاڵەوانبازیی ئەکرد. هەندێکیشمانی وەك شاگرد بەکارئەهێنا.

دەرگەزێنی جاران وەکو ئێستا نەبوو، جادەیەکی باریك بوو کـە لـە هەڵەبجـەوە ئـەهات و ئەگەیشـتە سـەرکارێز و لەوێشـەوە بـەرەو خـوارەوە بـۆ ئەسحابەسـپی. بێگومان ئەوکاتە ئوتومبیـل زۆر کـەم بـوو، بـەو جادەیـەدا، تاکـە تاکـە ئوتومبیـل هاتووچۆی ئەکرد. یەکێك لەو شتانەی منداڵی گەڕەك چێژمان لێ ئەبینی، ئـەوە بـوو کاتێـك لـە هەورامانـەوە پیکـاب ئـەهات و پـڕ بـوو لـە گـوێز بـەرەو بـازاڕی سـلێمانی ئەرۆیشت، ئێمەش دوای ئەکەوتین و خۆمان پیادا هەڵئەواسی و چەند گوێزێکمان لـێ ئەخستە خوارەوە.

بۆ ناو شار و هاتوچۆی ئەم گەڕەك و ئەو گەڕەك، لەجیاتی تاکسـی، کەرەسـەی هاتوچۆ تەنیا عەرەبانەی دوو ئەسپی بوو. کەسێك یان چەند کەسێك یـان خێزانێـك سـوار ئـەبوون و سـواربوونیش بەشـێوەیەکی گشـتی بـە ٥٠ فلـس بـوو. منـاڵانیش خۆیان بەدواکەیدا هەڵئەواسی، عەرەبانچییەکە قامچییەکی درێژی بەدەستەوە بـوو بۆ پێشەوە لە ئەسپەکانی ئەدا تا خێرا رەو بکەن و بـۆ دواشـەوەی ئەهاویشـت تـا منداڵان دووربخاتەوە لە خۆ پیاهەڵواسیندا.



لە راستەوە: فاروق مەلا مستەفا، کەریمی وەستا بستە، عەلی مەلا عەبدوڵڵا، دەرگەزێن - فولکەی نالی - بەرامبەر دوکانی کەریمی وەستا بستە، ١٩٦١

منالانی گەڕەك کە بەر لە قۆناغی سەرەتایی و دوای ئەوەش زۆر پێکەوە ئەبووین و هاوڕێی نزیکم بوون، بریتی بوون لە فاروقی شێخ محەمەدی مەحوی، سەباحی برایمی سنگەر، عەلی کاکە حەمە، ئازادی حەمەی مەلا تۆفیق، عومەری حاجی حسێن و ئەنوەری وەستا ئەحمەدی حاجی سەیفوڵڵا، جەلالی سنگەر، عەلی سالّح ئاغا، ئەوڕەحمانی حاجی برایم، نەوزادی جەلال ئەفەندی دواتریش ژمارەی هاوڕێکانمان زیادی ئەکرد و زوربەی کات پێکەوە ئەبووین و وەك تاقمێك وەهابووین، هەڵسان و دانیشتنمان پێکەوە بوو.

لەبیرمە کە منالّ بووین جارێکیان ئەنوەری وەستا ئەحمەد و عومەری حاجی حسێن بوو بە شەڕیان و ئەنوەر خەنجەرێکی بەدەستەوە بوو، ئێمەش ئەنوەرمان گرتبوو بۆ ئەوەی عومەر بریندار نەکات، کەچی عومەر ئەیگووت: بەری بدەن با خەنجەرێکی تەختەمان لێ بدات!

## سەرەتای خوێندن

بەرلەوەی تەمەنی چوونە قوتابخانەم هەبێت، وەك گوێگر برام بۆ قوتابخانەی (زەهرا)ی کچان و ماوەیەکی کەم لەوێ بووم، ئەو ماوەیەش بیرەوەری زۆری تێدایە. ماوەیەکی کەمیش برامە قوتابخانەی پێنجوێنییەکان کە دوای بوومەلەرزکەی پێنجوێن لە سلێمانی بۆیان کرابووەوە و دواتر ناوی (عەبدولئیلاه)ی لێنرا. ئەو رۆژە خۆشەم لەبیر ناچێتەوە کە ئەو کاتەی تەمەنم گەیشتە تەمەنی قوتابخانە، کاکم منی برد بۆلای (رەفیقی مەحمود ئەفەندی رەسام)ی برادەری، وێنەیان گرتم و لە قوتابخانەی فەیسەڵییە خرامە پۆلی یەك. تا ئێستاش زوربەی مامۆستایانی ئەو ساڵە و بەڕێوەبەر و ژمارەیەکی زۆر لە قوتابیانی ئەو پۆلە و پۆلەکانی تری فەیسەڵییە لە بیرەوەرییمدا ماونەتەوە و تا ئەمڕۆش لەگەڵ زۆریاندا لەنێوان ناسیاوی و برادەرێتیی نزیکدا ماوینەتەوە.



فاروق مەلا مستەفا
سەرەتای چوونە قوتابخانە

(فەیسەڵییە) یەکێکە لە قوتابخانە سەرەتاییە هەرە کۆنەکانی شاری سلێمانی[١].
من لە ساڵی ١٩٤٧دا چوومە فەیسەڵییە، ئەو ساڵە مامۆستا (جەلال محەمەد سەیفوڵڵا) بەڕێوەبەری قوتابخانەکە بوو. ساڵی پێشتر مامۆستا (فوئاد رەشید بەکر) بەڕێوەبەر بوو، بەڵام ئەو ساڵە لە پەروەردەی سلێمانی (کە مەعاریفیان پێ ئەگوت) بوو بوو (موفەتیش).

---

[١] ئەم قوتابخانەیە سەرەتا لە ١٩٣٣/١٠/١دا بە ناوی قوتابخانەی (یەکەم)ەوە دامەزرا و لە ساڵی ١٩٣٦ ناوەکەی گۆڕرا بۆ فەیسەڵییە، و بەو ناوەوە مایەوە هەتا ١٤ی تەموزی ١٩٥٨.

بەهۆی ئەو خزمایەتی و برادەرایەتییەی جەلال ئەفەندیی بەڕێوەبەر لەگەڵ باوکم هەیبوو پێم ئەگوت (کاکە جەلال). بەڵام لەبەرامبەر بزێوی من و هەندێ برادەری دیکەمدا سەد (کاکە جەلال) و (مامۆستا گیان) نەیئەخوارد. ئەو کاتەی زۆر تووڕە ئەبوو، لێدان و فەلاقەکەی هەر ئەبوو ببێت، ئەم فەلاقەکردنەش زیاتر من و ئەنوەری وەستا ئەحمەدی حاجی سەیفوڵڵای ئامۆزای ئەگرتەوە، مەبەستەکەشی پەروەردەکردن و بەتەنگەوەهاتنی جووتێك منداڵی هاروهاج بوو کە خزمی خۆی بوون! ڕۆژێکیان کاکە جەلال زۆر لە من و ئەنوەر تووڕە بوو، گوتی: ئەڵێی بتانکەم بە قوربانی یەك فیشەك. ئەنوەر گوتی: بەو دەمانچەیەی کە پەلەپیتکەکەی شکاوە؟ تومەز ئەنوەر ئەیزانی کاکە جەلال لەماڵەوە دەمانچەیەکی پەلەپیتکە شکاوی هەیە!



لەڕاستەوە: ڕەفیق مەحمود (ڕەفیقی ڕەسام)، فاروق مەلا مستەفا، عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ، مزگەوتی حاجی مەلا ڕەسوڵ، ١٩٤٧

کە چوومە پۆلی دوو، مامۆستا محەمەد تۆفیق وانەی عەرەبی پێ ئەگوتین. محەمەد ئەفەندی لەبەر ئەوەی تاقانەی دایکی بوو بە ناوی دایکییەوە بە (حەمەی حەلاو) ناسرابوو. ئەو پیاوێکی هێمن و خوێندەوار بوو، لە خوێندنەوەی عەرەبیی من زۆر ڕازیبوو، بەڵام هەرگیز نمرەی ١٠ی نەئەیامێ و هەر ٩ی بۆ دائەنام. دوای دەیان ساڵ کە ڕێکەوت کردینی بە خزمی یەکتر، ئەو نمرەیە بووبووە مایەی سوعبەت و گاڵتەکردنمان.

مامۆستایەکی دیکەش، عوسمان ئەفەندی، واتە عوسمانی سەعیدی مەلا عەباس بوو کە لە پۆلی سێیەمدا وانەی مێژووی پێ ئەگوتین و چەندین یادگاری ئەویشم هەیە. یەکێکی تریش مامۆستا حسێن ساڵح ئاغا کە پیاوێکی رووخۆش بوو هەر بۆ هاندان پێی ئەگوتم (کوڕی گەڕەك)، یادیان بەخێر. ئەمیش پیاوێکی چاك و دیار بوو لە قوتابخانەکەدا. داود ئەفەندییش هەبوو کە مامۆستای وەرزشمان بوو، بەبێ تاقیکردنەوە لە یاریی کورسی کورسیدا بۆ (ئیستیعراز)ی قوتابخانە سەرەتاییەکان منی هەڵبژارد و ئەوەبوو ئەو ساڵە پلەی یەکەمم بۆ قوتابخانەکەمان بەدەستهێنا.

وا باوە زۆر کەس بە ستایشی منالّیی خۆیان دەست بە بیرەوەریی تۆمارکردن ئەکەن، بەڵام من قۆناغەکە وەك خۆی ئەگێڕمەوە، چونکە تام و چێژێکی خۆی هەیە.

ساڵانی سەرەتایی گەلێك بیرەوەریی خۆشی تێدایە. (شێرکۆ بێکەس) یەکێك بوو لە هاوڕێ خۆشەویستەکانم. هەر لە پۆلی یەکەمی سەرەتاییەوە، وەك خۆیشی لە هەندێك بیرەوەرییدا ئەیگێڕێتەوە، هاوڕێ و هاوگەڕەك بووین و لە ترۆزی و محەلەبی فرۆشتنەوە تا دواساتی ژیانی ئەو شاعیرە گەورەیە هەر هاوڕێ بووین. لە پشووی ساڵانەی نێوان پۆلی سێیەم و چوارەمدا کە پێی ئەگوترا (تەعتیل)، من و بێکەس چووینە حوجرەکەی مامۆستا (نەجمەدین مەلا) کە خانوویەکی دووقاتی زۆر کۆن بوو لە بەردەرکی سەرا لە کۆڵانی تەنیشت کاك حەمە سەعیدی خەیات کە ئێستا کتێبخانەی سلێمانییەکەی کاك عومەری رەحمەتییە. بەیانییەك زوو، بەر لە هاتنی قوتابییەکان گوتم "شێرکۆ با بەو عەمموودەدا سەرکەوین، بابزانین مامۆستا چی ئەکات، ئەڵێن ژنی هەیە و کەس نازانێت." بە عەمودەکەدا هەڵگەڕاین و کە گەیشتینە ئاستی هەیوانەکەی سەرەوە، لەگەڵ ژنەکەیدا دەرکەوت کە ناوی (فاتیمە) بوو، تازە لە خەو هەڵسابوون، کە ئێمەی بینی زۆر توڕە بوو لێمان و بە جنێودان راوی ناینە کۆڵان.

هەر لە حوجرەکە، مامۆستا نەجمەدین مەلا بۆ ئەوەی قەرەباڵغی لە دەستشۆر و تەنیا تەوالێتەکەی خوارەوە کە بە بیست قاڵدرمەی زۆر کوورِ ئەیگەیشتینێ،

دروست نەبێت، لەسەرەوە پارچە مقەبایەکی بە پەتێك هەڵواسیبوو. هەموومانی فێرکردبوو هەر کاتێك کە یەکێك بچێتە خوارەوە بۆ سەرئاو ئەبێت دیوی (ڕۆیشت) ەکە دەربخات، کە هاتیشەوە هەڵیبگێڕێتەوە بۆ دیوەکەی تری کە لێی نووسرابوو (هات)، کە خۆی بە خەتی گەورە و جوان نووسیبوونی. ڕۆژێك قوتابییەك چووە خوارەوە و دیوی (ڕۆیشت)ەکەی دەرخست، من و شێرکۆ هەڵمانگێڕایەوە بۆ (هات). یەکێکی تر ڕۆیشت و هەمان کارمان کرد. ئیتر هەر کە یەکە یەکە ئەچوونە خوارەوە هەمان شتمان دووبارە ئەکردەوە، تا ئەو کاتەی لە خوارەوە قەرەباڵغی و دەنگە دەنگ دروست بوو. کاتێك مامۆستا زانی ئێمەین بە دەنگە گڕ و نێرەکەی نەڕاندی بەسەرماندا و دەریکردین و جنێوی دنیای پێداین. ئێمەش بە دڵخۆشییەوە گەڕاینەوە بۆ ناو مناڵان و بالە و فتبۆڵێن و ڕاکردن و یارییەکانی تر.

## گواستنەوەم بۆ قوتابخانەی خالیدییە

لە پۆلی پێنجەم بووین، ڕۆژێك هەر لەگەڵ ئەوەی پێم خستە ناو دەرگای قوتابخانەوە (حەمە درێژی فەڕاش) پەلی گرتم و پێی گوتم "وەرە بەڕێوەبەر بانگت ئەکات." کە چوومە بەردەمی جەلال ئەفەندیی بەڕێوەبەر، بینیم هەرچەندە هەوڵ ئەدات ئارام و لەسەرخۆ بێت، بەڵام چاوەکانی ئاگریان لێ ئەبارێت. "دانیشە." منیش دانیشتم و پێڵاو و گۆرەوییەکەم (کە پەنجە گەورەی قاچمی لێوە هاتبووە دەرەوە) داکەند، ئەوەش خۆئامادەکردن بوو بۆ فەلاقە. بەڵام جەلال ئەفەندی زۆر لەسەرخۆ گوتی "لەپێیان بکەرەوە." نووسراوێکی دایە دەستم، تومەز نووسراوی گواستنەوەیە بۆ قوتابخانەی خالیدییە!

لەلایەکەوە پێم خۆشبوو بچمە قوتابخانەیەکی تر، بەڵام هەندێ شتی ناخۆشیش بە مێشکمدا ئەهاتن و ئەیان وروژاندم! گواستنەوە مانای ئەوە بوو کە ئەبێت هەموو هاوڕێیانی پێنج ساڵەکەی فەیسەڵییە، ئەنوەر و شێرکۆ و ئیسماعیل و کامیلی حاجی سەعیدی حەڵواچی و ئەکرەمی حاجی حەملانی ئامۆزایان بەجێ

بهێڵم و بچمە ناو قوتابیانی قوتابخانەیەکی نوێوە کە نایانناسم.. باشە بچمە خالیدییـە نالێن بۆچی گوێزراوەتەوە بۆ ئێرە؟! ئەی بە باوکم بڵێم چی! هاوڕێیانی فەیسەڵییە و خۆشەویستیی نێوانمان و یاریی ناو قوتابخانە بە بەرچاومدا ئەهاتن و ئەچوون.

قوتابخانـەی خالیدییـە لـە مـاڵی خوالێخۆشـبوو غـەنی شـاڵیدا بـوو لـە خـوار بەرخانەقاوە بەرەو شیوی قازی، خانوویەکی گەورە بـوو. کـە گەیشـتمە خالیدییـە چوومە ژووری (یونس ئەفەندی)ی بەڕێوەبەر و پێی گوتم "تۆ کوڕی مەلا مستەفای خۆمانیت؟" تۆزێك تەسکینی بە دڵمدا هات و گوتم "بەڵێ ئەفەندی." پرسی "چۆنە گوێزراویتەوە؟" وەڵامم دایەوە گوتم "بـاوکم ئـەڵێت هـەموو سـاڵێك لـە بەکـەلۆریی شەشەکاندا خالیدییە یەکەمی قوتابخانە سەرەتاییەکانی سلێمانییە، منـیش لـە پـۆلی پێنجەمدام و هەر لەئێستاوە بۆ پۆلی شەشـەم خـۆم ئامـادە ئەکـەم." قسـەکەمی زۆر پێخۆشبوو، بەڵام هەر لەدوای دوو رۆژ بانگی کردم گوتی "ئەمە تۆ لەسەر هاروهـاجی نەقلێ کراویت؟ دەی پێڵاوەکانت داکەنە بۆ فەلاقە."، گـوتم "ئەفەنـدی وانییـە، کاکـە جەلال خزمیشـمانە بـەڵام کوڕەکـەی شـەڕی پـێ ئەفرۆشـتم و لەیـەکتریمان دا، بۆیـە نەقلی کردووم. تۆ لێم بووەستە با دوو هەفتە دەوام بکەم، ئەوسا بزانە زیـرەکم یـان تەمەڵ، ئاقڵم یـان بـێ حـەیام." فـەرمووی "قسـەکەت جوانـە، بـڕۆرەوە پۆلەکـەی خۆت." یونس ئەفەندی پەروەردەکارێکی ناوداربوو، یەکەم تاقیکردنەوەی مانگانـە وا رێککەوت (جوگرافیا) بوو، کە مامۆستا شێخ محەمەد سەید غەفوور پێی ئەگوتن، ٨٩م تیادا وەرگرت. مودیر ناردی بە شوێنمدا گوتی "راستت کرد ئافەرم."

یەك دوو رۆژ دوای ئەوە دەمـەو عەسـرێك جـەلال ئەفەنـدی هـات بـۆلای بـاوکم، چایەکم بۆ دانا، دەستی گرتم و گوتی "بە باوکت گوتووە نـەقڵم کردوویـت؟" بـاوکم گـوتی "بـۆ کـوێ و لەسەرچـی؟" مـن نـەموێرابوو گواسـتنەوەکە بـە بـاوکم بڵـێم. ئەفەندی گوتی "ئەو رۆژە دووجار لە قوتابخانە و لەڕێی ماڵەوە لە نەوزادی کـوڕمی داوە و سەریشی شکاندووە، شەویش بە بەرد شووشەی پەنجەرەکانمانی بە سـاغی نەهێشتووە، بۆ ئەوەی دڵت لە مـن نەئێشـێت، ناردوومەتـە خالیدییـە کـە باشـترین

قوتابخانەیە و خۆیشم یونس ئەفەندی ئاگادار ئەکەم کە کوڕی جەنابتە و خزمی خۆمە، تاوەکو ئاگای لێی بێت".

لە سەرەتادا کە گواسترامەوە بۆ قوتابخانەی خالیدییە زۆر دڵتەنگ بووم بە دوورکەوتنەوەم لە هاوڕێکانم، بەڵام لە خالیدییە لە پۆلی شەشەمدا لەگەڵ هاوڕێی تردا راهاتم. لەوکاتەدا و بەر لەوەش لە گەڕەکدا لەگەڵ (سەرداری غەنی شاڵی) هاوڕێ بووین، تائێستاش هەر هاوڕێیەکی زۆر خۆشەویستمە. هەروەها لەگەڵ (مەحمود کەریم)یشدا کە کوڕێکی زۆر باش و تێکۆشەر بوو، هاوڕێیەتییم پەیدا کرد و وەك دواتر باسی ئەکەم، هەر لە پۆلی شەشەوە پێکەوە چووینە ریزی یەکێتیی قوتابیانەوە. لە شوێنی تردا باسی خوالێخۆشبوو مەحمود کەریم ئەکەم کە چۆن لە ساڵی ١٩٦٣دا شەهید بوو.

لە خالیدییە زۆر گۆڕرام، لە شەڕە گەڕەك و بزێوی دوورکەوتمەوە و لەگەڵ مەحموددا زوربەی کاتمان پێکەوە بەسەر ئەبرد. براکانیشمان کە کاك ئەحمەد کەریم و کاك عیزەدینم بوون، هاوڕێی یەکتری و هاوڕێی بزووتنەوەی سیاسی بوون.

لە مامۆستاکانی خالیدییە کە هەرگیز لەبیرم ناچنەوە، یەکێکیان مامۆستا عەلی شێخ رەشید بوو کە لێپرسراوی حانووتیش بوو. هەر رۆژەی قوتابییەك ئەکرایە چاودێری حانووت و خواردن و خواردنەوەی وەك سۆدە و سیفۆن و (عەسیری) پرتەقاڵ و سینییە پاقلاوە ئەفرۆشرا، هەر پاقلاوەیەك بە عانەیەك (چوار فلس) بوو. هەر لە حانووتەکە قەڵەم و قەڵەمدادەر و لاستیکی خەتکوژانەوەش ئەفرۆشرا. رۆژێك مامۆستا عەلی بانگی کردم و کردمی بە چاودێری حانوت. لە کۆتایی وانەی شەشەمدا کاتێك حسابی لەگەڵ کردم، لەبیرم دێ بایی ٨١١ فلسم فرۆشتبوو. دەستی گرتم و بردمی بۆلای یونس ئەفەندیی بەڕێوەبەر، ئەویش پرسی "چی کردووە؟" وەڵامی دایەوە گوتی"هیچی نەکردووە. ئەمە یەکەم جارە قوتابییەك پارەکەی هاوتا بێت لەگەڵ فرۆشتنەکانیدا. هەتا دوا فلس تەواوە و سەرە پاقلاوەکانیشی نەخواردووە!" ئەو سەردەمە چاودێری حانوت مافی خواردنی سەرە پاقلاوەکانی پێ درابوو.



لە راستەوە: فاروق مەلا مستەفا، شەماڵ حەکیم ئاغا، مامۆستا شێخ محەمەد
سەید غەفور، کەمال غەفور شاڵی، باخچەی مەکتەبی خالیدییە، ١٩٥٣

مامۆستایەکی دیکەمان مستەفای حاجی قادری عەرەبانچی بوو کە پیاوێکی زۆر چاك بوو. مامۆستا مستەفا منی کرد بە چاودێری یاریی تۆپی سەرمێز (تێنس). ئێستا لەگەڵ جیاوازیی تەمەندا مامۆستا مستەفا هاورێمە و لەم دواییانەدا بۆی گێرامەوە، گوتی "ئەو کاتە یونس ئەفەندی پێی گوتین (ئەم منالە لەسەر بزێوی گواستراوەتەوە)، تۆش لەو یارییەدا زۆر پێشکەوتوو بوویت، بۆیە کردمیت بە چاودێر تاوەکو لە پشووەکاندا سەرقاڵ بیت و ژیانت لە هاروهاجییەوە بگۆرێت بۆ هێمنی و لەسەرخۆیی".

لە پۆلی شەشەمدا، بە پێچەوانەی ساڵانی پێشووترەوە، یەکێك بووم لەو قوتابییە تاکوتەرایانەی ئەو ساڵە دەرچووین. ئەو ساڵە لە وانەی عەرەبیدا شەش حەوت کەس دەرچووین. ئەوکاتە دارشتن (ئینشا)ی عەرەبییان پێ لەبەرئەکردین و لە تاقیکردنەوەی بەکەلۆریدا دارشتن ٤٠ نمرەی لەسەر بوو، رێزمان و ئیملا و ئەدەبیش ٦٠ نمرە. ئێمە ٣٣ دارشتنمان هەبوو کە هەر هەموویم لەبەرکردبوو، بەلام ئەوانەی لەبەرکرابوون هیچیان لە بەکەلۆریدا نەهاتەوە لەبەرئەوە کەممان لە

دەوری یەکەمدا دەرچووین. من بەهۆی ئەو بارە رۆشنبیرییەی لە مالّی ئێمەدا هەبوو، شتێك عەرەبی فێربووبووم و توانیبووم وەلاّم بدەمەوە و نمرەی باشم هێنا.

قۆناغی سەرەتایی ماوەیەکی خۆشە بۆ منالّ. بێگومان ئێستا لەرووی ژیان و پەروەردەییەوە خۆشترە، چونکە ئەوسا زوربەی خەلّك ژیانێکی کەمدەرامەتیان هەبوو. لە سلێمانی ئەو کاتە چەند فەرمانگەیەك هەبوون کە ناویان هەبوو، وەکو مەعاریف و (ئینحیسار)ی تووتن. کارگە و پیشەسازیی لە ولاّتدا پەیدا نەبووبوون.

❊ ❊ ❊

سلێمانی ئەو سالاّنە بچووك بوو، لە مالّەوە بە پێ ئەچووین بۆ قوتابخانە. جلوبەرگی ئەو کاتانە زۆر ئاسایی بوو، زوربەی خەلّکەکە هەژار بوون، دەولّەمەند زۆر کەم بوو. باوکی قوتابییەکان بەزۆری دوکاندار و بەرگدروو و دارتاش و هەندێکی کەمیشیان مامۆستا و فەرمانبەر بوون، تاکە تاکەیەکیش وەکو خوالێخۆشبوو غەنی شالّی بەلێندەر بوون. زوربەی خەلّك لەنێوان هەژار و مامناوەندیدا بوون. منالّی دەولّەمەندەکان جلوبەرگیان زۆر جیاواز بوو لەوەی قوتابییەکانی تر. کاتێك لە خالیدییە بووین، قوتابخانە دوو دەوام بوو، لەنێوان وانەی دووەم بۆ سێیەم ماوەی پشووەکە درێژتر بوو، تیایدا برێك خواردن، نان و تاعین یان هێلکەیان ئەدا بە قوتابییە هەژارەکان. خواردنەکان زۆر کەمتر بوو لەچاو ژمارەی قوتابییەکان و دەستنیشانکردنی هەژارەکانیش بووبووە جێگای نارەزایی زوربەمان و ئەبووە مایەی ناخۆشیی نێوان قوتابیان.

لە قۆناغی سەرەتاییدا لە چەند نمایشێکی وەرزشیدا بەشداربووم. هێشتا لە فەیسەلّییە بووم لە کورسی کورسیدا بەشداربووم. بۆ بەشدارییکردن تاقییان ئەکردینەوە. لەبیرم دێت داود ئەفەندی گوتی "بێ تاقیکردنەوە فاروق ئەبێت بە هەلّبژێردراوی فەیسەلّییە لە کورسی کورسیدا." ئەوەبوو لەئەنجامدا یەکەم بووم. ئێمە و قوتابخانەی گوێژە بۆ یەکەمی مابووینەوە و، من و یادی بەخێر (جەمالی عەبەی نازێ) کە قوتابیی گوێژە بوو هەردووکمان پێکەوە گەیشتینە خالّی کۆتایی. جەمال ویستی لەسەر کورسییەکە دابنیشێت و من خێرا کورسییەکەم راکێشا و

دانیشتم. ئیتر بوو بە مشتومڕی نێوان حەکەمەکان کە کاممان یەکەمین و دواجار من کرامە یەکەم. ئەمەش بۆ من دەستکەوتێکی گەورە بوو چونکە قوتابییە وەرزشکارەکان دیار بوون و ڕێزێکی تایبەتیان هەبوو لەناو قوتابیان و لەناو خەڵکی شاریشدا، چونکە سەدان کەس ئامادەی بەڕێوەچوونی نمایشە وەرزشییەکان ئەبوون.

## خزم و کەسوکار

من چوار مامم هەیە: مامە مەحمود و مامە مەلا ئەحمەد و مامە نەجمەدین و مامە محەمەد. جگە لە هاوڕێکانی قوتابخانەم، بیرەوەرییەکی زۆری منالّیم لەگەڵ خزمەکانمدا هەیە. (مامە مەحمود)م پیاوێکی زۆر قسە خۆش و شیعرلەبەر بوو. لە باوکم گەورەتر بوو، ئەبوو لە جیاتی باوکم، ئەو جێگاکەی (حاجی مەلا ڕەسوڵ)ی باپیرم بگرێتەوە، بەڵام ئەو ڕێگای بازرگانی و کاری ئازادی گرتبووەبەر کە بەداخەوە تیایدا سەرنەکەوت. لەگەڵ کوڕەکانیدا (نوری، فەوزی، فوئاد) و دواتر (فازیل) کە لەوان منالّتر بوو، هاوڕێیەتییەکی زۆرمان هەبوو. من و فەوزی لە پۆلێکدا بووین، فوئاد دوو ساڵ دوای ئێمە بوو، فازیل چەند ساڵێك زیاتر لەویش لەدوای ئێمەوە بوو. کاك نوری لە ئێمە گەورەتر بوو. زوربەی زۆری تەمەنی منالّیمان لەگەڵ ئەم ئامۆزایانەدا لە گەڕەکێکدا بووین و پێکەوە گەورە بووین. ئەوان مالّیان لە دوو شوێن بوو، لە پێشدا لە چوخمەکەی بەرخانەقاوە بۆی ئەچوویت، نزیك مزگەوتی شێخ مارف، ئەودیویان قوتابخانەی (زەهرا) بوو، تەنیشتیان مالّی کاك حەمە شەمەیی بوو — کە ئەوانیش دوو کوڕیان هەبوو و دۆستایەتی و دراوسێیەتیمان لەنێواندا بوو. لەگەڵ منالّەکانی مامما، هاموشۆی زۆرمان هەبوو، بەتایبەت بەهۆی سەردانەکانی شەوەوە بۆ مالّی یەکتری بە خێزانەوە زۆر پێکەوە ئەبووین و برادەرێتیی زۆرمان هەبوو. لە پۆلی پێنجەمیشەوە کە چوومە قوتابخانەی خالیدییە، لەگەڵ ئەم ئامۆزایانەم زیاتر پێکەوە ئەبووین و هەندێ نیوەڕوانیش ئەچوومەوە مالّی ئەوان و پاش نانخواردن لە کەلاوەکەی نزیکیان لەگەڵ چەند برادەرێکیاندا یاریی بالەمان ئەکرد.



لەڕاستەوە: د. عیزەدین، مەلا مستەفا سەفوەت، حاجی مەلا ئەحمەد حاجی مەلا ڕەسوڵ، فاروق مەلا مستەفا، قادری مەلا ئەحمەد حاجی مەلا ڕەسوڵ، خانەقین

خۆشەویستییەکی زۆرمان لەنێواندا بوو، لە هەمووشیان زیاتر و بە درێژایی ئەو ساڵانەی مناڵی تا دوا کۆچی لە ساڵی ١٩٨٠دا، ئەتوانم بڵێم (فوئاد)ی مامم نزیکترین هاوڕێم بووە. مردنی فوئاد کاری زۆری تێکردم و هەموو کاتێك هەر لەیادمە، هەمیشە لەگەڵ یادی ئەودا خۆشی و ناخۆشییەکانی ژیان و ڕۆژگاری سیاسەتکردنمان دێنەوە یاد.

بە کۆچی دوایی فوئاد و شەهیدبوونی (فازیلی مەلا مەحمود)ی ئامۆزام کە لەگەڵ د. قاسملودا چوونە ریزی شەهیدانەوە، دوو هاوڕێی زۆر خۆشەویستم لێ دوورکەوتنەوە. فوئاد چونکە لاوێکی دیموکراتخواز و پێشکەوتنخواز بوو، هەتا دوا ساتی ژیانی کە بووبووە لێپرسراوی ڕێکخستنی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لە نەمسا، هەر بەو سادەییە مایەوە. فوئاد لە بیرکردنەوەی سیاسییدا پێشکەوتوو بوو، لە ژیانی کۆمەڵایەتیشدا کەسێکی ڕووخۆش و قسەخۆش و ڕاستگۆ بوو.

ئامۆزاکانم کە هاتنە ناو سیاسەتەوە، لەدوای ساڵی ١٩٥٨ چوونە نێو پارتی دیموکراتی کوردستانەوە، خەبات و ڕێبازی سیاسیی جیاوازمان کاری نەئەکردە سەر

دۆستایەتی و برادەریمان و تا ئەمڕۆش لەگەڵ ئامۆزاکانی دیکەمدا کە لە ژیانـدا مـاون ئەو پەیوەندییە توندوتۆڵەمان هەر بەردەوامە. نوری و فەوزی، لەدواتردا و لە سـاڵانی تێکۆشـانی سیاسـیدا دوای ١٩٦٨ کـە رامکـرد و خـۆم شـاردەوە، دوای هاتنــە سـەر حوکمی رژێمی بەعس کە لە شوێنی تردا لێی ئەدوێم، ماڵەکانی ئـەوان دوان لـەو ماڵانـە بوون کە خۆمم تیایاندا ئەشاردەوە. زیاتریش لە ماڵی فەوزی ئەبووم و هەنـدێ کـاتیش لە ماڵی باوکیان داڵدە ئەدرام و کاتم تیایدا ئەبردە سەر. حەشارگەیەکی دیکەشـم مـاڵی باجی سەبیحی ئامۆزام بوو کە کچی مامە مەلا ئەحمەدم و خوشـکێکی زۆر دڵسـۆز بـوو بۆم و خۆشەویستیی من و باجی سەبیح لەناو بنەماڵەکەماندا زۆر دیار و بەرچاو بوو.

مامە مەلا ئەحمەدم، کە براگەورەی مامەکانم بوو لـە خانـەقین ئـەژیا و ئیمـام و مـودەڕیس و خـەتیبی مزگـەوتی گـەورەی خانـەقین بـوو. وا دیـارە لـە سـەردەمی یەکەمی چوونیدا بۆ خانەقین بووبووە موفتیی خانـەقین و هـەتا وەفـاتی لـە سـاڵی ١٩٧٠ بـە مەرجـەعی یەکـەمی سـوننەی خانـەقین ئـەژمێردرا. خانـەقین بـەردەوام سـوننە و شـیعەی تێـدا بـووە، بـەڵام مـامم و ئیمـامی شـیعەی ئـەو شـارە، واتـە حسێنییەی شیعە و مزگەوتی گەورەی سوننە زۆر رێك و تـەبا بـوون. تەنانـەت ئـەو کاتــەی مــامم کۆچــی دوایــی کــرد هــەموو نــاودارە ئاینییــەکانی شــیعەش لەگــەڵ تەرمەکەیدا هاتن بۆ سلێمانی و لە حسێنییەی خانەقینیش پرسەیان بۆ دانا.

مامە مەلا ئەحمەد دوو کوڕ و یەك کچی هەبوو، کوڕێکیشی بە منالی مردبوو کـە نـاوی رەسـوڵ بـوو. کـاك قـادر کـوڕە گـەورەی مامـە مـەلا ئەحمـەد لـە منالیـدا بـە تەقینـەوەی نـارنجۆك یـاخود فیشـەکی گـەورەی نەتـەقیوەی بۆردومـانی سـلێمانیی ئینگلیزەکان دەستێکی قرتابوو. هەر لەو کاتی منالییەوە وریا و جەربەزە بووە. بە گەورەییش یەکێك بوو لەو خوێنـدەوارە گەورانـەی بـە دەگمـەن هەڵئەکـەوێت، کـە هەرچەندە مانگێکیش بە منـالی لـە قوتابخانـەدا نەیخوێنـدبێت بـەڵام دوایـی ببێتـە خوێنـدەوارێکی گـەورەی بـوارە جیاجیاکـانی وەك فیزیـا و فەلسـەفە و ئـابوری و ئەدەب. کاك قادر شاعیر بوو، دەنگیشی زۆر خۆش بـوو، بـە یـەك دەسـت نـەخشو

نیگاری جوان و شتی وای ئەکرد جێگای سەرسوڕمان بوو. کاک جەلالیش هەر کوڕی مامە مەلا ئەحمەدم بوو، چەند ساڵێك لە کاك قادر بچووکتر بوو، ئەمیش نموونەی پیاوی دڵپاك و دڵسۆز و خۆشەویست بوو لە بنەماڵەی حاجی مەلا رەسوڵی دێلێژەدا و لە ساڵی ٢٠٠٦دا کۆچی دوایی کرد.

هەردوو ئامۆزام کاك قادر و کاك جەلال لە تێکۆشەرانی ئازای حیزبی شیوعیی عێراق بوون. هەردووکیان زیندانەکانی بەغدا و حلە و نوگرە سەلمان، و کاك جەلال بە پێشمەرگایەتی چیاکانی کوردستانیشی چەند ساڵێك بینیبوو. کاك جەلال لە سەردەمی پێشمەرگایەتیدا لە دێلێژە بوو، بارودۆخی ئەو کاتە وابوو کە زوربەی کات لە بارەگاکەیان نان و دۆیان هەبوو، کاك جەلال گوتبووی: بە نان و دۆ خواردن تێر نابین، بەڵکو هەتا ماندوو ئەبین ئەیخۆین. تاقە خوشکیان باجی سەبیح کە خوشکی گەورەی هەموومان بوو، ئافرەتێکی ئازا و نەفس بەرز و خۆڕاگر بوو، (فریا)ی کوڕی بە نەخۆشییەك لەدەست دا و (هیوا)ی کوڕیشی لە بۆردومانی قەڵادزێدا کە ئەوکاتە خوێندکاری زانکۆی سلێمانی بوو شەهید بوو.

مامەکەی ترم، کە ئەمیش پیاوێکی عەلمانی بوو مامە نەجمەدین، یاخود بڵێین (ن. ئاری)ی شاعیر بوو. ئەو ژمێریار بوو لە فەرمانگەی کشتوکاڵ، لەنێوان سلێمانی و کەرکوك و چەند شارۆچکەیەکدا ژیانی فەرمانبەریی بردەسەر. ئەو لە هەشت منالّ تەنیا (ژیان) و (ئازاد)ی بۆ مابووەوە. ئازاد یەك ساڵ لە من گەورەتر بوو. ساڵانێکی دووردرێژ هاوڕێیەتی بەهێزمان هەبوو و خۆشەویستم بوو، بەڵام بەداخەوە ئازاد بە گەنجی کۆچی دوایی کرد. (ژیان)یش دواتر بەجێی هێشتین. کە ئەچووم بۆ کەرکوك بە خۆشەویستیی ئەوانەوە ماوەیەکی زۆر ئەمامەوە، بەتایبەت خۆشەویستیی باوکیان کە پیاوێکی رۆشنبیر و شاعیر بوو. دایکیشیان بۆ ئێمە وەکو ئامۆژن نەبوو، بەڵکو وەکو پوورێك سۆز و خۆشەویستی هەبوو بۆمان. ئێستاش کە ئەچمەوە کەرکوك ئەو گەڕەکانە دێنەوە یادم کە ماڵی ئەوانی تیادابوو. لەبەری ئەمبەر ئەوکاتە (چایی)یان پێدەگوت و (قۆریە) لەوبەرەوە بوو، سەردەمێکیش

ماڵیان لە (قەڵا) بوو. ئەوکاتانە لە کەرکوك هەندێك هاوڕێی تورکمانیشمان هەبوو کە ڕۆژانی دوورودرێژمان پێکەوە ئەبردە سەر. مامێکی تریشم هەبووە بە ناوی مامە محەمەد، کە بە گەنجی کۆچی دوایی کردووە.

لە هاوڕێکانی دیکەم کە بەهۆی خزمایەتییەوە بووبوونە هاوڕێم، کوڕەکانی کاکە ڕەزا (مەلا ڕەزا) و کاك ئەحمەدی برای بوون، کە پورزازای باوکم بوون. ئێمە (کاکە ڕەزا)مان بە مامی خۆمان ئەزانی و ئەم دوو برایە هەتا کۆچی دوایی باوکم و دواتریش هەتا لە ژیاندا بوون لە نزیکترین کەسەکانمان بوون. هەندێك لە کوڕەکانی کاکە ڕەزا لە تەمەنی منەوە نزیك بوون، تا ئێستا لەگەڵ حاجی فەتاحی کوڕیدا هاوڕێیەتیمان هەیە. حاجی فەتاح، شێرکۆ و چەند خوشك و برایەکی بچووکتری هەبوو، لە چوارباخ بەرامبەر ماڵی فەقێ ڕەشیدی قەشان ئەژیان. هەر بەهۆی نزیکیی ئەوان و هاوڕێیەتی باوکمانەوە، من هاوڕێیەتییەکی زۆرم لەگەڵ فاروق و فەرەیدونی فەقێ ڕەشید و دواتریش لەگەڵ فەهمی برایان دروست کردبوو. ئەوان هاوڕێی سەردەمی ناوەندی، دواناوەندی و یاریی فتبۆڵێنم بوون. لە دواناوەندی تیپێکی تۆپی پێیان هەبوو ئەوەندەی لەیادم مابێت ناوی تیپی ئاکۆ بوو، منیش بەهۆی ئەو برادەر و خزمانەوە یەکێك بووم لە ئەندامەکانی ئەو تیپە.

کاك ئەحمەدی برای کاکە ڕەزا کە لەم ساڵانەی دواییدا کۆچی دوایی کرد هەتا بڵێی پیاوێکی باش و دەست و دڵ کراوە بوو. هەموو جارێك کە لە بەغدا ئەگەڕامەوە، دەعوەتی ماڵی کاك ئەحمەد وەك جۆرە بەرنامەیەکی لێ هاتبوو بۆم. کاك ئەحمەد چەند کوڕێکی هەبوو کە گەورەکەیان (محەمەد) بوو، بە گەنجی تووشی نەخۆشی هات و کۆچی دوایی کرد. محەمەد کە لە تەمەنی مندا بوو هەتا بڵێی کوڕێکی باش و خۆشەویست بوو. (ئەکرەم) لەو منداڵتر بوو، بەداخەوە ئەویش لەم ساڵانەی دواییدا کۆچی دوایی کرد.

هەرگیز هەڵسوکەوتی ئەو خزم و هاوڕێیانەم لەیاد ناچێتەوە، بەتایبەت قسەوباسی دانیشتنی شەوانە.

لـە خزمـەكانی دیكـەم، ئـەمجارەیان لـە دایكمـەوە، مـاڵی خـاڵم (حـاجی قـادر ساڵح)ی باوكی كـاك عـەلی و كـاك بـەكر و (كـەمال)ی جوانەمـەرگ بـوو. دیسـانەوە ئێرەش بۆ من ماڵێكی كراوەبوو. خانووەكەی ئەوان لە فولكەی نالی بوو كـە پێشـتر خانووی حاجی مەلا رەسوڵی باپیرم بوو، خاڵم لێی كڕیبوو. خانووەكە گەورە بـوو، هـەزار مـەترێك ئـەبوو، بـاخێكی پـڕ لـە میـوەی تێـدا بـوو. بیرەكـەیان وەك كـارێز لێكردبوو، و پێیان ئەگوت (قەسرەكە). لە حەوشـەوە بـە قالدرمـە بـۆی ئەچـوویتە خوارەوە، جێی پاڵكەوتنی دوو كەسی تیا ئەبووە و شوێنێكی فێنك بوو.

كوڕە گەورەی خاڵم كاك عەلی بوو كە لەو ساڵانەی پێشوودا لـە ئـەڵمانیا كۆچـی دوایی كرد. ئەو بە گەنجی وەرزشكار بوو. لەبیرمە هەموو ساڵێك لـە راكردنـی ١٥٠٠ مەتریـدا لـە ئیسـتعرازدا یەكـەمی سـلێمانی ئـەبوو. دوای ئـەو (ئەبوبـەكر) بـوو كـە ساڵێك لە من منالتر بوو، هـاوڕێ بـووین و لـە حەوشـەكەی مـاڵی ئەوانـدا فتبـۆڵێنی دووكەس بە دووكەس ئەكرا. لەوان منـاڵتر (كـەمال) بـوو كـە گـەنجێكی وەرزشـكار بوو، و یاریی لەشـجوانی ئـەكرد. كـەمال گـەنجێكی زۆر جـوان بـوو، لـەو تەمەنـەدا شیوعییەكی ئازا بوو. هەر سێ برا هەموویان شیوعی بوون.

لـە سـاڵانی خۆشـاردنەوەدا خـاڵ و خـاڵۆژنم خزمـەتی زۆری منیـان كـرد. لـە پەنجەرەی ژوورەكەیانـەوە كـۆڵان و شـەقامەكان دیـار بـوون. خـاڵۆژنم ژنێكـی زۆر باش و قسەخۆش بوو، لەگەڵ رووخۆشییەكەی خاڵم هانیان ئەدام لەلایان بمێنمەوە. خاڵم بەسەرهاتی سەربازیی خـۆی بـۆ ئەگێڕامـەوە كـە چـۆن لـەپاش جـەنگی جیهـانی چووەتە (باكۆ) و گەڕاوەتەوە. بێگومان حـاجی قـادر خـاڵی دایكـم بـوو، بـەڵام لەگـەڵ دایكیشمدا شیریان خواردبوو.

لەگەڵ بەكری خاڵۆزامدا هەر لە زووەوە لە قوتابیانـدا پێكـەوە كارمـان ئـەكرد و ماڵەكەشیان وەك بارەگایەكی حیزبی شیوعی وابـوو، هەمیشـە كۆبوونـەوەی تیـادا ئەكرا و كەسـانی هـەڵاتوو لـەوێ خۆیـان ئەشـاردەوە، ئـەوەش زیـاتر بـەهۆی كـاك عەلییەوە بوو، كە كوڕە گەورەی ماڵ بوو.

ماڵی خاڵم و مامە مەحمود لەیەکەوە نزیك بوون. کەمال هاوتەمەنی فوئـاد بـوو. لە کۆڵانی نێوان ماڵی خاڵم و ماڵی عەبدوڵڵا بەگ و مزگەوتەکەی بـاوکم و باپیرمـدا، لـە خواریشـەوە لـە کۆڵانەکـەی لای مـاڵی (حەمـە بەگـە کـوێرە)، لەوێـدا پـەتمان هەڵئەخست و یاریی بالەمان ئـەکرد. هـەر خزمـەکان پێـنج شـەش کـەس ئـەبووین، شەشی تریش لـە هاوڕێکانمـان بەشـدارییان ئـەکردین. لەوانـەی کـە لـەیادم ناچـن، یەکێکیان (عەبدولی شێخ ساڵح) بوو کە لە تەمەنی کەمالدا بـوو، ئـەویش هـاوڕێ و لە یارییشدا لەگەڵمان بوو. شێخ عەول هەتا وەفاتی کرد هەر برادەرم بوو.

لە خزمە نزیکەکانمان کە لە بەغدا جێنشین بوون، یـەکێکیان مـاڵی کـاك ئـەدیب عارف بوو کە کوڕی پوری باوکمە. کاك ئەدیب ئەفسەرێکی کۆن بوو، و لە شۆڕشی شێخ مەحمود دا بەشداری کردبوو. ژنەکـەی کـە نـاوی بـەهێ خـان بـوو لـە موسـڵ ژیابوو، هەتا بڵێیت ژنێکی خزم دۆست و خزمەتگوزار بوو، لە کاك ئەدیب زیاتر وێڵ و ماریفەتی بەرامبەر من ئەنواند. کاك ئەدیب دوو کـوڕ و دوو کچـی هـەبوو: حامیـد کە دەرچووی کۆلێجی حقوق بوو، د. رافید کە دکتـۆرێکی گـەورە و نـاودار بـوو لـە بەغدا، هەروەها د. سەمیرە دکتۆرێکی پسـپۆڕ و خێزانـی د. قوتەیبـە شـێخ نـوری بوو، دوا مناڵیان موبەجەل بـوو کـە دەرچـووی کـۆلێجی بازرگـانی بەغـدا بـوو. مـن یەکەمجار کە بەغدام بینی ئەو ساڵە بوو کـە لـە پـۆلی یەکـەمی سـەرەتایی بـووم و لەگەڵ باوکم و دایکم چووبووینە بەغدا و میوانی ماڵی کاك ئەدیب بووین.

لە گەورەییشـمدا و تـا ئێسـتاش لەگـەڵ ئەوانـەی مـاون و کـوڕ و کچەکانیشـیان پەیوەندیی خزمایەتیم بەتینە. هەر چوار کوڕ و کچەکانی کاك ئەدیب شیوعی بـوون و لە کەسایەتییە گەورە و ناودارەکانی بەغدا بوون.

دکتۆر رافید و دکتۆر قوتەیبە و دکتۆرە سەمیرە خزمـەتی زۆری نەخۆشـیان ئـەکرد بەشێوەیەکی مرۆڤانە دوور لە پارەپەرستی نەشتەرگەرییەکی زۆری نەخۆشـیان ئـەکرد و هەندێکیشی من بۆم ئەبردن بە خۆڕایی. د. رافید و د. قوتەیبە دکتۆری نـاودار بـوون، و هونەرمەندی ناسراوی ئەو ساڵانەش بوون. هەردووکیان لەو شیوعییانە بـوون کـە بـە

شەمەندەفەری مەرگ (قطار الموت) لەگەڵ سەدان تێکۆشـەری دیکـەدا دوای کودەتـای بەعسی ساڵی ١٩٦٣ برانە زیندانی نوگرە سەلمان و لەوێ چەند ساڵێکیان بردەسەر.

## دەرودراوسێ

زەمانی ئێمە پەیوەندیی دراوسێیەتی پەیوەندییەکی زۆر بەهێز و بەڕێز بوو. لـە سەردەمی مناڵیدا، لە گەڕەکدا ئەمدیومان ماڵی (مەجید ئەفەندی سەلیم ئاغـا) بـوو کە نزیکترین کەسیان بـۆ تەمـەنی مـن کـاک نـەژاد بـوو. کـاک نـەژاد دوو سـێ سـاڵ لـەپێش منـەوە بـوو، گـەنجێکی زۆر زیـرەك بـوو. دوای خوێنـدنی دواناوەنـدی بـۆ خوێنـدن چـووە بریتانیـا و لـەوێ بڕوانامـەی لـە ئەنـدازەی نەوتـدا وەرگـرت. لـە کوڕەکانی مەجید ئەفەندی ئێستا تەنیا نەژاد لە ژیاندا ماوە کە زۆر هـاوڕێ بـووین. ئەوسا دراوسێ وەك یەك ماڵ وابوون و تێکـەڵیی زۆرمـان لەگەڵیانـدا هـەبوو، تـەنیا دیوارێـك لەنێوانمانـدا بـوو، کـە ئـەویش پەیـژەی پێوەبـوو. مەجیـد ئەفەنـدی لـە خەجاوە خان ئەختەر و لە ژنێکـی دیکـەش مەلیحـە خـانی هـەبوو . خـەجاوەخانی دایکیان ژنێکی باش و قسەخۆش بوو. کوڕەکـانی مەجیـد ئەفەنـدی کـاك کـەمال و کـاك نـوری بـوو کـە بوونـە ئەفسـەر لـە سـوپای عێراقـدا و لـە پیـاوە نـاودارە نیشتمانپەروەرەکان بوون. هـەروەها کامیـل و پاشـان د. جـوامێر کـە دواتـر بـووە سـەرۆکی زانکـۆی تەکنـەلۆجی لـە بەغـدا، ئینجـا کـاك زوڵاڵ کـە بـووە فرۆکـەوانی مەدەنی هاوڕێیەتیمان هەبوو.

لەگەڵ ماڵی مەجید ئەفەندیدا بیرەوەریی خۆشمان هەیە، ئەوان بەگشـتی، واتـە کوڕەکان شیوعی بوون، کاك جـوامێر نـزیکترین هـاوڕێی کـاکم بـوو، هـەروەها کـاك زوڵاڵ، بـــەهۆی نزیکیـــی ماڵـــەوە زۆر یـــەکتریمان ئـــەبینی، خـــەڵکێکی ڕۆشـــنبیر و عەلمانی بوون. نەژادیش هاوڕێی ڕۆژانەم بوو.

لە دیوی ئەودیومانەوە ماڵی مەلا ڕەشید بوو، کە یەك کوڕی هەبوو (کـاك عـەتا) و برادەر بووین، دوایی بوو بە فەرمانبەر لە پەروەردە.

ژیانی نێو گەڕەکی ئەو کاتانە تامی خۆشی خۆی هەبوو. با سەرەتا باسی ژنان بکەم،ماڵی شێخ کەریمی باسنەیی کە کاك عومەر و عوسمان و عەبدوڵلا و بەکر و جەلالی هەبوو، دایکیان (خاتوو گوڵێ) بوو کە من شیریم خواردبوو، وەك دایك سەیری خاتوو گوڵێم ئەکرد و تا لەژیاندا بوو هەروا بوو. تا ئەم ساتە (عەبە) برادەرمە و سوعبەتی زۆرمان هەیە. لەم ساڵانەدا بە شێخ عەبدوڵلام گوت: عەبە، توو گۆڕی خاتوو گوڵێی دایکمان، من کەرترم یان تۆ؟ گوتی: لە ... دایکی پارە بەم، تۆ پارەت هەیە ئەگینا ئەقڵی منت بە هیچ جۆرێك نییە! لەگەڵ شێخ عوسمانیش هەتا ئەوکاتەی بە نەخۆشییەکی کتوپڕ کۆچی دوایی کرد هەر برادەر بووین. ئەتوانم بڵێم ئەوان دەوڵەمەند بوون، مامە شێخ کەریم کوتاڵفرۆش بوو. خانووەکەیانم تەواو لەبەر چاوە، کە ئەچوویتە ژوورەوە سەرتەنوورەکە بوو. لەبیرم ناچێت کە خاتوو گوڵێی دایکمان کاتێك چێشتی تێئەکرد، قاپ قاپ ئەیدا بە منالەکان و ئەیگوت ئەمە بۆ فلان و ئەمەش بۆ فلان و بەو جۆرە، هەر کوڕەش ناوێکی لێنابوون بە منیشەوە.

دیوی ئەمدیویان ماڵی (حاجی مەحمود) بوو، واتە ماڵی باوکی حەمە رەشید ئەفەندیی ئەفسەری پۆلیس. ماڵێکی خۆشەویست بوون، بەتایبەت (ئامنەخان)ی خێزانی معاون حەمە رەشید کە لەم ساڵانەی دواییدا کۆچی دوایی کرد. ئامنەخان ژنێکی زۆر جوان و قسەخۆش بوو، لەگەڵ ماڵی ئێمە و خوشکەکانی مندا زۆر تێکەڵ بوو. گەڕەکەکانی ئەو سەردەمە و بەتایبەت گەڕەکی ئێمە، خەڵکەکەی زۆر تێکەڵ بوون، بێ مەوعید هەموو هاموشۆی یەکتریان ئەکرد و نان و چایان پێکەوە ئەخوارد. کاك حەمە رەشید ئەفەندی لە وەزیفەدا تا پلەی موقەدەمی پۆلیس رۆیشت. لە کوڕەکانی ئەوەی بیرم ماوە و لە دەرەوە لە وڵاتی جیاجیا ئەژین، بریتین لە جەمال رەشید کە هەر لە منالییەوە هونەرمەندێکی پێشکەوتوو بوو، هەروەها خالید رەشید کە هونەرمەندێکی دەنگ خۆشە، بەداخەوە تەنیا لە بۆنەکاندا ئەیانبینم. هەر بۆ یادگاری، جارێکیان ئەم کاك حەمە رەشیدە بۆ ناونووسینی جەمالی کوڕی لە

پەیمانگای هونەرە جوانەکانی بەغدا، لەوێ لە کەبابخانەیەك بینیم و دەعوەتم کردن. کە گەڕابۆوە بۆ سلێمانی، بە ئامنەخانی گوتبوو: ئەزانیت فاروق لە عیزەدین باشترە؟ مەبەستی کاك عیزەدینم بوو. گوتبووی چۆن؟ گوتبووی لە کەبابخانەکە ئێمەی بینیوە و دەعوەتی کردووین. ئامنەخان گوتبووی ئاخر خۆ عیزەدین لەوێ نەبووە، چوزانیت؟ گوتبووی ئاخر ئەگەر عیزەدین بووایە دەعوەتی نەئەکردین.

بەرامبەر ماڵی ئێمە ماڵی (باجی مریەم) بوو کە پێی ئەگوترا (مریەمی حەسەنەلی) کە یەك کوڕی تاقانەی هەبوو، ئەویش (مەولود) ئەفەندی بوو کە فەرمانبەر بوو لە پەروەردە. یەکێك لە شتە خۆشەکانی ئەوە بوو کە نووسراویان بۆ ئەبرد ئەیدڕاند. پێیان ئەگوت "مەولود ئەفەندی ئەوە نووسراوی رەسمییە بۆ ئەیدڕی؟" ئەویش ئەیگوت "ئەگەر موهیم بێت ئەوا تەئکید مولحەقی بەدوادا دێت، تاقەتم نییە ئەو هەموو نووسراوە کۆبکەمەوە!"

کۆڵانی بەرامبەریشمان، ماڵی (فاتمەی نوری) و هەردوو براکەی کاك حەمە سەعید و کاکە حەمەی لێبوو کە لەگەڵ شەمسە خانی دایکیان پێکەوە ئەژیان. تەنیشتیان ماڵی (کاك حەمە باقی) بوو، کە ژمارەیەك کوڕی رێکوپێکی هەبوو، کاك ئەحمەد و کاك مەحمود و لەپاش ئەوان کاك حەمەی حەمەباقی نووسەر و شاعیری ناسراو، دوای ئەویش عەبدول و نەجات. لەگەڵ ئەوانیشدا دۆستایەتیمان زۆرە و یادی ئەو رۆژانە شتێکی تایبەتی و دەگمەنە. ئێستا پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکە وەك ئەوسا نەماوە. ئەولاتر ماڵی حاجی فەرەجی پلاوخۆر بوو، حاجی فەرەج خۆی و شەمسەخانی ژنی کە شاژنێك بوو لە گەڕەکدا هەموو رۆژێك ئەمبینین. لەولای ئەوانیشەوە ماڵی (سابیری کوێخا سەعید) بوو.

باوکم پایەیەکی ئایینی و کۆمەڵایەتی هەبوو، کەسێکی زۆر دیار بوو، بۆیە خەڵکی گەڕەك هەموو دۆستی بوون و هاموشۆی ماڵی ئێمەیان ئەکرد. ژن و پیاویان هاموشۆیان ئەکرد، ئەوە ئامنەخانی ژنی حەمە رەشید ئەفەندی، لەولاتر لەعلی خانی ژنی وەستا حەسەن، لەوبەرەوە باجی ئاسکەی دایکی حەمەی حەمەباقی،

ئینجا باجی شەمسە و فاتمەی نوری، لەولاتریشەوە ماڵی (حەمە رەشیدی مەلا عەلی) کە دڵشادی کوڕی لە ئێمە منداڵتر بوو، وە لە سەردەمێکی گەورەبوونماندا یەکێکە لە برادەرە نزیکەکانم و بە بادینانیش ئەبێتە هاولنگم، یەعنی ئاوەڵزاوا. ئەمانە هەموو ناسیاوی یەکتری بووین، تێکەڵ بووین و لە خۆشی و ناخۆشیدا بەشداری یەکتر بووین.

کۆڵانی پشت ئێمە (ئەحە شەشۆیی) بوو، کە حسێن و خالید و بورهان کوڕی بوون و دۆستایەتیی زۆرمان لەنێواندا هەبوو. لەمسەر بۆ ئەوسەری گەڕەك هەموو یەکترمان ئەناسی، خوار ئەوان ماڵی وەستا محێدین (محەی دگل) بوو کە جەلالی کوڕی لە تەمەنی ئێمەدا بوو. سوعاد خان ژنی کاك قادری وەستا محێدین خوا لێی خۆشبێت لە ژنە هەرە قسە خۆشەکانی گەڕەك بوو. ئەولاتر ماڵی (مامۆستا جەمال) بوو کە کوڕی مەجید ئەفەندی سەلیم ئاغا بوو و (پەخشان خان)ی ژنی خزممان بوو. خوار ئەوان ماڵی وەستا (غەفووری سەعەی چەمە) بوو، کاك عوسمان کوڕی بوو کە پێی ئەگوترا عوسۆلی وەستا غەفوور. ئەو لەتەنیشت ماڵی دکتۆر جەمال و دکتۆر فوئادی مەجید بەگەوە بوو. بەرامبەر ئەوان ماڵی ئەحمەد فەهمی بوو، باوکی شەهید جەلال ئەحمەد فەهمی کە ئەفسەرێکی شیوعی بوو لە ساڵی ١٩٦٣ شەهید کرا، کوڕەکانی تریشیان کاك سەلاح و چالاك و لاوچاك بوون.

کاك عوسمانی وەستا غەفوور نموونەی سەرخۆشی ئەو ساڵانە بوو، ئێواران بە سەرخۆشی ئەهاتەوە و شەڕی بە ماڵی ئەحمەد فەهمی ئەفرۆشت، ئەوانیش هەموو ئەفسەری سوپا و پۆلیس و بەتوانا بوون، بەڵام بە ناوبژیکردنی دراوسێکانەوە هەر زوو شەڕەکە ئەبڕایەوە. لە ماڵی مەجید بەگ، کاك فوئاد نموونەیەکی گەورەبوو بۆ ئێمە، پیاوێکی شیوعی و خوێندەوار و بە شەخسیەت بوو. کاك سامالێش کەسێکی دیار بوو، شەماڵ هاوتەمەنی من و لەوان منداڵتر بوو، ئێستا دکتۆرای هەیە. لەمدیوەوە ماڵی رەشید ئەفەندی باوکی دکتۆر جەمال بوو کە لە ئێستادا یەکێك لە هۆڵەکانی نەخۆشخانەکەی خۆم بەناوی (دکتۆر جەمال رەشید)ەوە ناو ناوە، چونکە

لەسەردەمێکدا ئەو کاتەی سلێمانی دوو سێ دکتۆری تێدابوو خزمەتێکی زۆری خەڵکی سلێمانی ئەکرد و بە شەو و رۆژ ئەچووە نەخۆشخانە و نەشتەرگەری ئەکرد. کاک نامیق و کاک فیکری و کاک بەرقی کە فرۆکەوانێکی ناسراو بوو کوڕی ئەو خێزانە بوون.

سەرووتر ماڵی کاک حەسەن و لەعلی خان و ماڵی عەبە دەلاك بوو. لە ماڵی وەستا حەسەندا ماڵی بێکەسی تیابوو کە شێرکۆ وەك گوتم لەو تەمەنەدا برادەرێکی خۆشەویستم بوو، لەبەرێکی ماڵی کاك حەسەندا کرێچی بوون. لەولاتر ماڵی وەستا قادری چایچی بوو. ئێمەی برادەرانی گەڕەك تا ئێستاش نوکتە و قسەی خۆشی ئەو سەردەمانە ئەگێڕینەوە کە چێژێکی تایبەتیان هەیە و هەرگیزیش تەواو نابن.

ئەمە وێنەیەکی بچووکی ئەو گەڕەکە بوو کە من تیایدا لەدایك بووم. لە پاش گەڕانەوەمان لە شکستی ١٩٧٥، ئەو خانووە پڕ لە یادگارەم فرۆشت چووینە خانووی کرێ، چونکە وەك دواتر باسی ئەکەم، بۆ ژیان و دەستکردن بە ئیشوکاری تازە پێویستم بە دەستمایە هەبوو.

## قۆناغی ناوەندی

لە ساڵی ١٩٥٣ لە پۆلی شەشەم دەرچووم و چوومە (سانەوی سلێمانی). ئەو ساڵە هەر سانەویی سلێمانی هەبوو، کە ناوەندی و دواناوەندیی بوو. ماوەیەکی کەم لەوێ لە پۆلی یەکەم دەواممان کرد، و ئینجا خوێندنگەیەکی ناوەندیی لە بەرخانەقا کرایەوە. ناوەندییەکە لە خانووی عومەر ئەفەندی سام ئاغادا بوو. ژمارەیەك لە قوتابییەکان لەسەر داوای خۆمان و هەندێکیان لەسەر خواستی ناوەندییەکە گواسترانەوە بۆ ئەم (ناوەندیی سلێمانی)یە. من حەزم لەم ناوەندییە کرد چونکە لە ماڵی خۆمانەوە کە لە دەرگەزێنی گەڕەکی سەرکارێز بوو نزیکتر بوو. کە چوومە ناوەندی، بە رەسمی چوومە نێو یەکێتیی قوتابیانی عێراقەوە کە بەشێك بوو لە حیزبی شیوعیی عێراق، یان لەسەر رێڕەوی ئەو بوو، چونکە ئەدەبیاتی یەکێتیی قوتابیان و ئەدەبیاتی حیزبی شیوعیمان پێکەوە و لەیەککاتدا پێدەگەیشت.

ئـەو کاتــە دوو بڵاوکـراوەی ســەرەکی هــەبوون: رۆژنامــەی (القاعـدة)ی حیزبـی شیوعی بە زمانی عەرەبی و (رۆژنامەی ئازادی)ی لقی کوردستانی حیزب بە زمـانی کوردی. وەك پێشتر باسمکرد لە پۆلی شەشەمی سەرەتاییدا من و مـەحمود کـەریم[١] پەیوەندییمان بـە یـەکێتی قوتابیانـەوە هـەبوو. یەکـەمجار (عەباسـی مـەلا قـادری نانەوا) کە هاوڕێی خۆشەویستم بوو لێپرسراوی من بوو لە پـۆلی یەکـەمی ناوەنـدی. لەو پۆلەدا لیژنەیـەك هـەبوو منـیش کرامـە ئەنـدامی ئـەو لیژنەیـە، مـن دوو شـانەم لەلابوو: یەکەمیان لە ماجیدی ئەحمەدی عەزیز ئاغا، واتە دکتۆر ماجید کە هـاوڕێی خۆشەویستمە سەردار بەهادین کە ئێستا فەریق روکنی خانەنشـینە و هـەر هـاوڕێی خۆشەویستمە، و عیزەت رەشید کە ساڵی ١٩٦٣ لەسەر نیشـتمانپەروەرێتی لەسـێدارە درا پێکهاتبوو. شانەکەی دیکەش بریتی بوون لە بەکر محەمەد ئـەمین کوێرەکـانی کـە بەداخەوە زۆر بە گەنجێتی لەڕێی بەغدا لە لافـاوێکی لای شـاری (دووز)ەوە لەگـەڵ ژمارەیــەك سەرنشــینی دیکــەی پاســێکدا گیانیــان لەدەســتدا، هــەروەها عیــزەت عەبدولفەتاح و حەیدەری سدیق نەقاش دوو ئەندامی دیکەی شانەکە بوون.



شەهید مەحمود کەریم، فاروق مەلا مستەفا، باخی گشتی سلێمانی

---

[١] لە ساڵی ١٩٦٣دا مەحمود کە ئەفسەری ئیحتیات بوو بە دەستی ئەفسەرێکی بەعسی شەهید کرا.

سالآنی ١٩٥٣–١٩٥٤ بزووتنەوەی نیشتمانی بەشێوەیەکی گشتی لە فراوانبـوون و پـەرەسەندندا بوو. لە پۆلی یەکەمی ناوەندی، دوو یان سێ کـەس هـەبوون کـە لـە رێکخسـتنی یـەکێتیی قوتابیانـدا نـەبن. لـەو برادەرانـەی دیکـەی لـە ناوەنـدی و لـە پۆلـەکانی تـردا چـالاکییان هـەبوو، کـاك ئـەنوەر عەبـدولڕەحمان گـورون کـە ئێسـتا دکتۆرە لەو کاتەدا لێپرسراومان بوو. سەردەمێك من و شەهید تاهیری عەلی والی بـەگ و حەمەلاوی حاجی عەلی کەباچی لیژنەیەك بووین و کـاك ئـەنوەر لێپرسـراومان بـوو. ئەو سالآنە گەلێك بیرەوەریی خۆشیان تێدایە، بـەردەوامیش لـە مشـتومڕی سیاسـیدا بووین و رۆژانەش لە جموجوڵی یەکێتیی قوتابیاندا بووین.

ئەوانەی زۆر دیاربوون، بێجگە لە ئەنوەر عەبدولڕەحمان و حسێن عارف لـە ناوەنـدیی سلێمانی، بریتی بوون لە کاك عەلی حاجی قادر و ئەنوەری عیـزەت نـەجیب و کـەمال مستەفا قادر کە دواتر بوو بە حـاکم. دواتـریش کاتێـك ئـەوان لـە پـۆلی سـێیەم دەرچـوون، محەمەد فەتاح و فایەق سالْح جێگەیان گرتنەوە. سەروو ئەمانـە هـەموو کـاك فـەرەج ئەحمەد بوو کە لەناو قوتابیانی سلێمانیدا زۆر چالاك و زۆر خۆشەویست بوو.

کاتێك لە پۆلی دووی ناوەندی بووم، فەرمانی گرتنی کاك حسێن عارف دەرچـوو کە لە لیژنەی قوتابخانەدا بوو، ئەویش رایکرد و خۆی شاردەوە. رۆژێك ئەچووم بـۆ خەستەخانە. کاتێك بمانویستایە لە خوێندنگەوە بۆ خەستەخانە بچین، لە پشـووی دەرسی دووەمدا بۆ ئەوەی تەنیا یەك دەرسمان لەکیس بچێت، وەرەقەیـەکیان بـۆ ئەکردین و بەپێ ئەچووین بۆ مەڵبەندی تەندروستیی قوتابیـان کـە پێیـان ئـەگوت خەستەخانەی مەعاریف. منیش بە شـەقامی کـاوەدا ئەڕۆیشـتم، تەماشـام کـرد لـە دوکانی رەوفی مەلا عەبدوڵلا کە خزمیشمان بـوو، پۆلێـك پـۆلیس و ئـەمنی لێبـوو، بەشوێن کـاك رەوفـدا ئەگـەڕان. ئـەمنێکیان عـەرەبێکی ناسـراو بـوو لای خـەڵك لـە سلێمانی. منیش ئیتر لە جیاتی ئەوەی بچمەی لای دکتـۆر لـە ئەسـحابە سـپییەوە بەرەو قەزازەکان سەرکەوتم، ماڵی کاك رەوف لە قەزازەکان بوو، چووم ئاگاداریـان بکـەم. حەسـیبە خـانی خوشـکی کـاك رەوف هاتـە دەرەوە، ئـەوەم پـێ گـوتن و

تەماشام کرد کاك حسێن عارف لەوێ خۆی شاردووەتەوە، واتە (مختفی) بوو، خێرا پێڵاوەکانی لەپێ کرد و گوتی "بڕۆ بە پەلە عەلیی خاڵتم بۆ بدۆزەرەوە." مەبەستی عەلی حاجی قادر بوو، گوتم "ئەوی ناوێت با یەکەمجار من بتبەم بۆ ماڵی خاڵم." ئەوەبوو بردم بۆ ئەوێ و ئینجا چووم کاك عەلیشم بۆ دۆزییەوە.

کاك حسێن ماوەیەك لەوێ بوو، ئا لەوکاتانەدا کە سەیرانە ناودارەکانی (چەقڵاوە) ئەکرا کە سەیرانی ئەندامانی قوتابیان بوو، هەروەها سەیران و کۆبوونەوەی حیزبی شیوعی لەوێدا ئەکرا، کاك حسێن لەو کاتانەدا بە لەبەر وتاری درێژی ئەدا، وتارەکان سیاسی بوون و بە رستە و وشەی جوان ئەیڕازاندنەوە. هەموو وتارەکانیمان پێ خۆش بوو، چەپڵەڕێزانمان ئەکرد. کاك حسێن تەنانەت لەو تەمەنە بچووکەیدا کەسایەتییەکی گەورەی ناو قوتابیان و جوڵانەوەی سیاسی بوو لە شاری سلێمانی.



لەڕاستەوە (ئەوانەی ناسراونەتەوە): عەبدولڕەحمان حەکیم، حسێن عارف، محەمەد عەزیز، فاروق مەلا مستەفا، عوسمان ئاسنگەر، فەرەج ئەحمەد، جەمال خەمیس، عەباس مەلا قادر، ئەنوەر عوسمان. سلێمانی - چەقڵاوە ١٩٥٤

لە سەردەمی ناوەندیی سلێمانیدا سەیرانی زۆر ئـەکران، سـەیرانی سیاسـی، بـۆ چەقڵاوا لای تانجەرۆ و هەروەها بۆ موشیرئاوا. جارێکیان شەهید روشـدی ئەحمـەد بەگ[١] کە ئەوکاتە خوێندکاری زانکۆ بوو لە بەغدا هاتبووەوە، قسـەی بـۆ خەڵکەکـە ئەکرد. من سەرەتا نەمناسییەوە، دواتر زانیم ئەوە و ئیتر دۆستایەتیمان بەردەوام بوو.

لەو قۆناغەی خوێندندا بەیاننامەکانمان بـە دەسـتخەت ئەنووسـییەوە، ئەوانـەی ئێمـــە لـــە (ســـانەوی ســـلێمانی) بڵاوئەکرانـــەوە و هەڵئەواســـران بـــۆ ئـــەوەی دەسـتوخەتەکانمان نەناسـرێتەوە و لـەلای بەڕێوەبـەرێتیی قوتابخانـە و ئـەمن و پۆلیس ئاشکرا نەبین. من ئەندامێکی سەرەکیی نووسینەوەکان بـووم کـە لـە مـاڵی ئەنوەر عەبدولڕەحمان گورون بەڕێوە ئەبرا. باوکی ئەنوەر پیاوێکی زۆر چاك بـوو، ڕێگەی پێدابوو ماڵەکەیان بۆ چالاکیی حیزب بـەکار بهێنێـت. کـاری نووسـینەوەکە چەندین سەعاتی ئەویست، بەیاننامـەکانمان بـە قەڵـەمی مـۆر (قـۆپی) ئەنووسـی و چـوار پێـنج کاربۆنمـان ئەخسـتە نێـوان کاغـەزەکان بۆئـەوەی وێنـەی زیـاتری لـێ بگرینەوە. کاتێك لە پۆلی سێ بووین، کاك ئەنوەر دەسـتگیر کـرا و لـە بەندیخانـەی سلێمانی بەندکرا. حیـزب لەگـەڵ کەسـوکارەکەیدا منیـان نـاردە لای و نامەیـەکیان پێدا ناردم. هاوڕێ ئەنوەر کەسێکی ئازا و خـۆڕاگر بـوو. هەنـدێ هـاوڕێ تـری ئـەو

---

[١] د. روشدی (تۆفیق روشدی ئەحمەد بەگ) لەدایکبووی سـاڵی ١٩٢٧ لـە سـلێمانی، ئـەو کاتـەی هات بۆ سەرپەرشتیکردنی ئەم کۆبوونەوەیە، قوتابی بوو لـە کۆلێجی ئـاداب لـە بەغـدا. لەسـەر چـالاکیی شـیوعێتی چـەند جارێـك گـرتن و راونـانی حـوکمی پاشـایەتی بەرکـەوتبوو، و لـە بەندیخانـەی (کـوت) بـە گوللـەی یاسـاوڵەکانی بەندیخانـە بریـندار کرابـوو. دوای شۆڕشـی ١٤ی تەموز بۆ خوێندن چووە مۆسکۆ و دکتۆرای لە فەلسەفەدا هێنـا و دواتـر لـە زانکۆکـانی عێـراق و لیبیادا مامۆستایی کـردووە، دواجـار لـە کۆلێـژی پـەروەردەی زانکـۆی عـەدەن وەکـو مامۆسـتا دەرسی گوتووەتەوە. رۆژی ١٩٧٩/٦/٢ لە کردەوەیـەکی تیرۆریسـتییدا لەلایـەن خوێنرێـژەکانی باڵیۆزخانەی عێراقەوە لە عەدەن شەهید کرا. شەهیدبوونی دکتۆر روشدی وەك هەواڵێکی گـرنگ لـە رۆژنامـەکانی یەمـەنی دیموکراسـی و لوبنـان و رۆژنامـە فەلەسـتینییەکاندا دەنگـی دایـەوە و حکومەتی عەدەنیش تاوانبارەکانی دەستگیر کرد.

قوتابخانەیەم بریتی بوون لە: محەمەد فەتاح و فایەق ساڵح و عەبدولڕەحمان حەکیم و حەسەن حسێن، کە هەموویان ئەندامی چالاکی یەکێتیی قوتابیان بوون.

بیرەوەریی ئەو ساڵانە زۆرن، چونکە قۆناغێکی گرنگ بوون لە ژیانی مندا، هەر لە بەشداریکردن لە مانگرتن و خۆپیشاندانەکاندا دژی حکومەت، تا ئەگات بە خوێندنەوەی کتێبی سیاسی.

لەو ساڵانەدا لە سلێمانی، بزووتنەوەی قوتابیان بەشێکی گرنگ و دیاری جوڵانەوەی نیشتمانی بوو. بە باشی لە بیرمە لە پۆلی یەکەمی ناوەندیی سلێمانی کە من لە لیژنەی پۆلدا بووم، زۆرینەی پۆلەکە لەناو (یەکێتیی قوتابیانی عێراق)دا رێکخرابوون، ئەو ساڵە هێشتا (یەکێتیی قوتابیانی کوردستان) لاواز بوو، هەر ئەو دوو رێکخستنەش لە کوردستاندا هەبوون. هەروەها هەردوو حیزبی شیوعیی عێراق و پارتی دیموکراتی کوردستان لە گۆڕەپانەکەدا بوون و پەیوەندیشیان زۆر باش بوو، ئەوەبوو لە هەڵبژاردنی ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراقدا شیوعی و پارتی هاوکار بوون و (بەرەی نیشتمانی)یان پێکهێنابوو. کەس نییە دروشمەکانی ئەو سەردەمەی سەر دیوارەکانی سلێمانی فەرامۆش کردبێت کە ئەنووسرا: هەڵبژێرن ئیبراهیم ئەحمەد و مارف بەرزنجی.

جوڵانەوەی سیاسیی نیشتمانیی ئەو ساڵانە لە هەڵچوون و داچووندا بوو، ئەویش بەهۆی بوونی بڕێك ئازادی لە هەندێك کاتدا و داپڵۆسین و گرتن و دەرکردن لە قوتابخانەکاندا لە کاتەکانی دیکەدا.

هەر ئەو ساڵانە (بەکری خەیات) کە ئەندامی حیزبی شیوعی بوو لە خۆپیشاندانێکی سلێمانی بە گوللەی پۆلیس شەهید کرا، ئەمە لەکاتێکدا بوو کە جوڵانەوەی سیاسی نەگەیشتبووە ئاستێکی ترسناك بۆ حکومەت و خۆپیشاندانەکانیش بێ چەك و ئاشتیخوازانە بوون. هەروەها مانگرتن لەنێو ئەو بەندیخانانەدا بەڕێوە ئەچوو کە بە رۆڵە نەبەردەکانی کوردستان و عێراق پڕکرابوون و لەوێ دەستدرێژییان ئەکرایە سەر و زۆریان لێ شەهید کران. ئەم راستییە ئەخەمە بەرچاوی هەندێك لەو نووسەر و مێژوونووسانە کە بە مەبەستی جیاواز ستایشی سەرانی حکومەتی پاشایەتیی عێراق ئەکەن.

## شێخ مەحمودی نەمر..
## ئەو دەنگ و ڕەنگەی هەمیشە لەبەرچاو و لە گوێمدایە

لە ماوەی نێوان ساڵانی ١٩٥٣ تاوەکو ١٩٥٦، ساڵانە و هەندێ ساڵ زیاتر لە دوو جار لەگەڵ باوکمدا سەردانی شێخی نەمرمان ئەکرد. من لە پۆلەکانی ناوەندییدا بووم. باوکم دۆستی نزیکی شێخ مەحمود بوو، پەیوەندیشیان لە باوك و باپیریانەوە دەستی پێ کردبوو. حاجی مەلا ڕەسوڵی باپیرم خەلیفەی یەکەمی کاك ئەحمەدی شێخی باپیری شێخ مەحمود بوو. ئەوەش باس ئەکرا کە کاتێك شێخ مەحمود بووبوو بە مەلیکی کوردستان، داوای لە حاجی مەلا ڕەسوڵ کردبوو ببێت بە وەزیری داد (عەدل)، بەڵام حاجی مەلا ڕەسوڵ ڕەزامەند نەبوو و نەیکرد. لە مێژوودا تۆمار کراوە کە بۆ یەکەمجار لە مێژوودا حاجی مەلا ڕەسوڵ ئاڵای داچەقیوی ئینگلیزی بەسەر سەرای سلێمانیدا هەڵکەند و فڕێی دایە سەر زەوی و ئاڵای کوردستانی لەجێگایدا بەرز کردەوە کە ئاڵای حکومەتی کوردستان بوو بە مەلیکیی شێخ مەحمودی نەمر.

چەند جار لە سلێمانییەوە لەگەڵ باوکمدا ئەچووین بۆ داریکەلی، ئەو گوندەی کە وەك پایتەختی شێخ مەحمود تەماشا ئەکرا. جارانێکی تریش لە دێلێژەی خۆمانەوە بە سواری ئەچووین بۆ داریکەلی. ئێمە بە خێزان هەموو ساڵێك لە هاویندا بۆ ماوەیەك ئەچووینەوە دێلێژە. خۆشترین کات لەلای باوکم ئەو سەردانانەی دێلێژە بوو.

زوربەی ئەو چەند جارەی لە دێلێژەوە ئەچووین بۆ داریکەلی، کاکە شێخ ڕەفیقی شێخ عارفی خوشکەزای باوکم و مامە شێخ کەریمی دێلێژە کە مامی کاکە ڕەفیقیش بوو لەگەڵ باوکمدا ئەهاتن. ئەو کاتە خواردن لەسەر سینی ئەهێنرا نەك سفرە ڕاخستن. هەر سینییەك بۆ سێ کەس دائەنرا. ئەو چەند جارە شێخ و باوکم و من لەسەر سینییەکی مسی سپیکراوەی جوان کە قاپ و کەوچك و چەتاڵی زیوی جوانی لەسەر ئەبوو، پێکەوە نانمان ئەخوارد.

شێخ پیاوێکی خۆبەزلزان نەبوو، زۆر سادە بوو، هەروەها وەك هەموو کەس ئەیزانی شێخ شاعیریش بوو، قسەخۆش و رووخۆش بوو. باوکیشم زانا و شاعیر بوو. بەو سیفەتانەوە زۆر حەزیان بە دانیشتنی یەکتر ئەکرد، بە رۆژ و بەشەو باس باسی کورد و مێژوو و شیعر و ئەدەب و زانستە ئایینییەکان بوو.

شێخی نەمر زۆری پێخۆش بوو قسە لەگەلّ من بکات و گوێ لە پرسیارەکانم بگرێت. منیش منالّێکی حەز بەزانین و پرسیار کردن بووم لە هەموو شتێك کە زانیارییم نەبوو لەسەریان و بیرم لێ ئەکردنەوە.

هەرگیز ئەو هەلّسەنگاندن و نەسیحەتەیم لەبیر ناچێت گوتی: مەلا مستەفا.. فاروق ئاقلّە.. قەت درۆش ناکات. شێخ بەوە ناسرابوو کە لە زانستی (فیراسەت)دا زۆر شارەزایە، کە ئەمەشی بە من گوت، لە هەموو ژیانمدا سوودم لێ وەرگرت.

شمشێرێکی نیشاندام کە چەند ئایەتێکی قورئانی بە ئاوی ئالّتون لەسەر هەلّکەنرابوو. لەیادما نەماوە کە فەرمووی ئەمە سولّتان سەلیم یا سلێمانی قانوونی سەردانی ئەم ناوچەی کوردستانەی ئێمەیان کردووە. من گوتم دیارە دەستاودەست کەوتۆتە دەست جەنابت. بەلاّم شێخ زۆر حەزی لە قسەی خۆش ئەکرد گوتی ئەمەت نەزانی، مەعلوم لەم ناوە لێیان دزیوە!

بەردێکی گەورەی نیشاندام کە لە خوار هەیوانە بەرزەکەی میوانخانەکەیدا دانرابوو، وێنەی مانگ و ئەستێرەی لەسەر هەلّکەنرا بوو، کە هی چەرخێکی زۆر کۆن بوو. وەك باسی ئەکرد دیار بوو شێخی نەمر وەك شاعیر و رۆشنبیر، هەواداری کەلەپور و ئاساری کۆنیش بوو، ئەمەش ئەوە دەرئەخات کە شێخ مەحمود تێگەیشتنی لە جیهان و لە ژیان لە رادەی پیاوێکی گەورە و سەرکردەدا بوو.

من ئەو کاتە کامێرایەکی کۆداکم هەبوو کە فیلمی هەشت وێنەیی ئەگرت. حەزم ئەکرد رەسمێك لەگەلّ ئەو پیاوە گەورەیەدا بگرم، بۆیە جارێکیان کە چووین بۆ سەردانی، کامێراکەم لەگەلّ خۆم برد. لێم پرسی: ئەتوانم رەسمێکت لەگەلّ بگرم؟ گوتی ئەی بۆ نا، بەلاّم بەمجۆرە نا.. من رۆژێك لە رۆژان مەلیکی کوردستان بووم،

شەرواڵ و ستارخانییەکی جوانترم هەیە لەبەری ئەکەم. ئینجا مەسینە و لەگەنیان هێنا و شێخ مەحمود دەستنوێژی گرت و دوای نوێژکردن، بە ستارخانییەکەوە چەند رەسمێکمان گرت. بەداخەوە بەهۆی شوێنگۆڕین و خۆشاردنەوە و رووداوەکانی ساڵانی دواتر، ئەو وێنانە ون بوون و لەناوچوون.

هەموو جارێکیش شێخی نەمر چەند پرسیارێکی لە من ئەکرد، دیارە ئەیویست بزانێت نەوەی نوێ چۆن بیر ئەکاتەوە کە من نموونەیەك بم لەو بۆچوونەی. جارێکیان لێی پرسیم: فاروق هەواڵی عیزەدینی براتم پرسی گوتیان ئەویش لە دێلێژە بوو کە ئێوە هاتن، ئەوە بۆ نەهات بۆ لام؟.. بە راستی نەمئەزانی چ وەلامێکی بدەمەوە، تۆزێك وەستام بەلام ئەو یەکسەر لەسەر قسەکەی خۆی رۆیشت و گوتی: ئەو شیوعییە، رەنگە من بە دەرەبەگ بزانێت بۆیە نەهاتووە. گوتم: ئینجا خۆ ئەبێت شیوعییەکان تۆیان زۆر خۆش بوێت چونکە هەردوولا دژی زوڵم و حوکمی پاشایەتیی عێراق و ئینگلیزن! شێخی گەورە پێکەنی و گوتی تۆ زۆر ئاقڵێت، ئەو قسەیەی خۆتیان پێ بڵێ.

کە گەڕاینەوە بۆ دێلێژە، بۆ کاکم (عیزەدین)م گێڕایەوە، زۆری پێ ناخۆش بوو، چونکە ئەویش شێخی گەورەی زۆر خۆش ئەویست. ئینجا جێی دڵخۆشی ئەوە بوو کە لە کۆنگرەی دووەمی حیزبی شیوعیی عێراق لە ساڵی ١٩٥٦دا، شێخ مەحمود کە هێشتا لە ژیاندا بوو وەك قارەمانی نەتەوەیی هەڵسەنگێنرا. هەر بۆ مێژووش، داریکەلیی شێخ مەحمود پشت و پەنای شیوعی و راونراوە نیشتمانپەروەرەکان بوو، وە خۆیشی زۆر دڵی بە هونەرمەندانی وەك حەمەساڵح دیلان و حەمەی بەکر ئەکرایەوە و زوو زوو سەردانیان ئەکرد، هەروەها پیاوی وەك مەحمود ئەحمەد کە شیوعیی راونراو بوو لە حکومەتەوە هەمیشە میوانی نزیکی شێخ بوو.

پاش ماوەیەك شێخ مەحمود بە نەخۆشی برا بۆ بەغدا و لەوێ لە ٩ی تشرینی یەکەمی ١٩٥٦دا ئەو دڵە پاك و گەورەیەی لە لێدان کەوت و کۆچی دوایی کرد. لە کاتی هێنانەوەی تەرمی شێخ مەحمودی نەمردا جەماوەرێکی زۆر لە دەروازەی ئەوسای سلێمانی بەپیری ئەو سەرکردە گەورە و مێژووییەی گەلەکەیانەوە چوون.

خۆپیشـاندانێکی گـەورە بەڕێوەچـوو بـۆ ئـەوەی دەرگـای بەندیخانـەی سـلێمانی بشکێنرێت و شێخ لەتیفی نەمر ئازاد بکرێت کە وەك بەهۆی زیندانەوە نـەیتوانیبوو لە نەخۆشی و گیانسپاردن و کۆچـی دوایـی باوکیـدا ئامـادە بێـت، بـەڵکو ئامـادەی ناشتنی ئەو شێرە گەورەیە ببێت کە رۆژگارێك مـەلیکی کوردسـتان بـوو. ئـەوەبوو پەلامار و کوشتن بەرامبـەر خۆپیشـاندەرەکان ئەنجامـدرا. لەوکاتـەدا مـن قوتـابیی ناوەندیی بووم و بەشـداریی ئـەو خۆپیشـاندانەم کـرد و (ئەختـەری رەشـۆڵ)م بـە بەرگی کوردی و سەروبەستێکی جوانەوە بـینی کـە بـە دەسـتدرێژیی پۆلیسـەکانی سلێمانی شەهید کرا و چـەند فیشـەکێکیش بـەر ئـەو تەرمـە نـازدارەی تێکۆشـەری مێژوویی کورد شێخ مەحمودی نەمر کەوت.

ئـەو رۆژە عومـەر عـەلی کـە ئەفسـەرێکی گـەورەی سـوپای عێـراق و خـاوەنی بـیروڕای تـورانیی دژی کـورد، کرابـوو بـە موتەسـەڕیفی سـلێمانی و راسـتەوخۆ ئاگاداری ئەم رووداوە بوو.

شەو درەنگ باوکم هاتەوە بۆ ماڵەوە، گوتی شـێخ مـەحمودمان ناشـت. لەسـەر تاتەشۆرەکە پێش کفنکردنی خوێن لەو جەستە جوان و پیرۆزەی ئەهات. باوکم کە ئەمەی ئەگێڕایەوە، فرمێسك بە بێ راوەستان بە چاویدا ئەهاتە خوارەوە.

ئەوانەی بیرم ماون لە خۆپیشاندانەکەدا بوون، فەرەج ئەحمەد و قادر و جـەلالی میرزا کەریم و کەمال سەلمان و ئەنوەر عوسمان بوون.

## ناوەندیی دوور لە سیاسەت

لە ناوەندیی سلێمانی ژمارەی مامۆستامان کەم بـوو. مامۆسـتا عـەزیز محەمـەد مامۆستایەکی دڵسۆز بوو، خۆی لە قوتابخانەیـەکی سـەرەتایی مامۆسـتای وەرزش بوو، بەڵام لەبەر بێ مامۆستایی ئێمە و بەهۆی توانایەوە گواسترابووەوە بـۆ ناوەنـدی. مامۆستا عەزیز ئەیبردین بۆ فتبۆڵێن بۆ گۆڕەپانەکەی هۆمەرمەندان. ئەو بێجگـە لـە وەرزش، وانـەکانی مێـژوو و جوگرافیـا و ئینگلیزیشـی پـێ ئـەگوتین. لـە ئینگلیزییـدا

مامۆستا عەزیز وشەکانی (either or) و (neither nor)ی زۆر بەکارئەهێنا و وای لێهاتبوو ئەبووە پێکەنین. حەسەن حسێن چاودێرێکی زۆر هاروهاجی پۆلەکەمان بوو. کاتێك مامۆستا ئەهاتە پۆلەوە بۆ رێزگرتن لێی ئەگوترا: "هەڵسن (قیام)". رۆژێك مامۆستا عەزیز هاتە ژوورەوە، حەسەن گوتی: "(قیام) بۆ (either or) و (neither nor)"، واتە (یان ئەم یان ئەو) و (نە ئەم و نە ئەو)! مامۆستا گوتی "هەتیو تۆ زۆر لاساریت، چۆن بە مامۆستای خۆت وا ئەڵێیت".

لە پۆلی یەکەمدا رۆژێك پشکنەر (موفەتیش) هات، عەزیز ئەفەندی پێی گوتین ئەمڕۆ بۆ وانەی مێژوو دەرسێکی هەفتەکەی پێشووتان پێ ئەڵێمەوە، چونکە باشترم لەبەرە، بەڵام کەس قسە نەکات. هەموو گوتمان بەڵێ باشە ئوستاذ — لە ناوەندیدا بە مامۆستامان نەئەگوت ئەفەندی، بەڵکو ئەمانگوت ئوستاذ. پشکنەر لەگەڵ بەڕێوەبەردا کە خوالێخۆشبوو ئەحمەدی قازی بوو هاتنە پۆلەوە. عەزیز ئەفەندی کەوتە گوتنەوەی وانەکە. لەناو هەمووماندا حەسەن حسێن دەستی هەڵبڕی و گوتی "ئوستاذ، ئەمە دەرسی هەفتەی پێشووە." موفەتیشەکە پێکەنی و چووە دەرەوە. بەڕێوەبەریش زۆری پێناخۆش بوو. عەزیز ئەفەندی گوتی "هەی سەرسەری، پاڕامەوە لێتان، من لە تۆ پاڕامەوە چونکە ئەزانم چەندە بێ نامووسیت، وەرزش عەزیز محەمەد، مێژوو عەزیز محەمەد، جوگرافیا هەروا، هەموو بە خۆڕایی ئەڵێمەوە، تۆ لەبەرچاوی ئەم موفەتیشە بۆ وات کرد".

ئەوکاتانە پەیوەندیی نێوان قوتابی و مامۆستا رێزێکی زۆری تیادا بوو، جاروبار نەبێت کە قوتابییەکی وەکو حەسەن چەتوونی ئەکرد، یاخود هەندێ قوتابی بە قۆپییەوە ئەگێران.

بێجگە لە قوتابخانە لە کۆڵانandا یاریمان ئەکرد، هەندێ جار لە کۆڵانی پشت مزگەوتی خۆمان و هەندێ جاری دیکەش ئەچووین بۆ سەرقەبران، لە لێژاییەکەدا کە تا ئێستا بەشێکی ماوە لەوێ فتبۆڵێنمان ئەکرد. یاخود لەبەر ماڵی رەشید ئەفەندی و حاجی مەجید بەگی برایدا داری بالەمان ئەچەقاند و یارییمان ئەکرد. جاران وەك ئێستا جێگای تایبەت بۆ یاریکردن نەبوو.

ساڵانێکی پێش شۆڕشی ١٤ی تەموزی ١٩٥٨، کە ڕێکخستنی نهێنی هەبوو، بە تەواوی نەمئەزانی کێ بەرپرسی یەکەمە، چەند جارێك نامەم ئەنارد و پرسیاری زۆریشم ئەکرد. وەڵامێکی سەیرم بە ئیمزای (مەسئول) بۆ هاتەوە تیایدا نووسرابوو "هاوڕێ تۆ زۆر پرسیار ئەکەیت، لەسەر هەر هەنگاوێك، یان هەڵوێستێك نامەیەکمان بۆ ئەنێریت، لەکاتێکدا تۆ نە سەلکی سیریت نە قنچکی پیازیت". نامەکە زۆر ناخۆش بوو لەلام، دوای شۆڕشی تەموز کە ڕێکخستن ئاشکرا بوو کاك فەرەج پێی گوتم "ئەو نامەیەی ئەو ساڵە، من بۆم نووسیبوویت، واتکردبوو نەمئەزانی چۆن وەڵامت بدەمەوە، ئەو نامەیەم نارد گوتم با زوویر بێت و چەند مانگێك ئیسراحەت بکەم!"

کاك فەرەج تا دواساتی ژیانی دیارترین کەس بوو لە تێکەڵکردنی سیاسەت و گاڵتە و نوکتەدا. گەر باسی ئەو بە درێژیی بکەین، ئەوا ئەتوانم کتێبێکی لەسەر بنووسم، ئەو پیاوە مەرد و ئازا و خاوەن مێژووە، یەکێکە لە ناودارەکانی سلێمانی، بەداخەوە زوو بەجێی هێشتین.

## هاوڕێیانی تەمەن لە بیر ناچنەوە

هاوڕێی هەڵکەوتوو و قسەخۆش و ڕووناکبیر.. کەسایەتی سیاسی و کۆمەڵایەتی.. کاکە فەرەج: کە بە فەرەجی ئەحمەد بەگ ناو ئەبرا و لە قۆناغێکی تردا خۆی کرد بە فەرەج بابان.

فەرەج ئەحمەدی برا و هاوڕێ لە سەردەمی خوێندنی ناوەندی و دواناوەندییدا لە سەرەتای هەرزەکارییەوە پەیوەندیی بە حیزبی شیوعییەوە کرد و یەکێك بوو لەو گەنجانەی شاری سلێمانی کە لە هەموو کۆڕ و کۆمەڵێکدا گوڵی مەجلیس بوو.

کاك فەرەج وەك لە چەند شوێنی دیکەی ئەم بیرەوەرییانەمدا باسی هاتووە و دێت، هاوڕێییەکی وەها نزیك و خۆشەویست بوو، کە ساڵانێکی زۆری تەمەنی کاریگەرییەکی زۆری هەبوو لە ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ڕۆژان و شەوانی

هەڵسوکەوتماندا. رۆژێك تێنەئەپەڕی قسەیەکی خۆش یان تەعلیقێکی پڕ مانا یاخود سوعبەتی فەرەج ئەحمەد لەسەر زمانمان نەبێت. ئەوێکی گەورە منی بە نزیکترین و خۆشەویسترین هاوڕێی خۆی ئەزانی و لە هەموو کۆڕ و کۆمەڵە زۆرە جیاوازەکانیدا ئەو هەستە بەرزەی بەرامبەر من دەرئەخست.


فەرەج ئەحمەد

یەکەمجار فەرەج ئەحمەدم وەك لێپرسراوی حیزبیم ناسی، لە دوای ئەوە وەك هاوڕێی ساڵانێکی زۆری زانکۆی بەغدا، ئنجا من بووم بە لێپرسراوی ئەو. لە دانیشتن و سەیرانی زۆری کەسانی جیاجیا لەگەڵ برادەرە زۆرەکانماندا فەرەج وەك پێشوو رابەری سیاسییمان بوو، لەم ماوانەدا رێکخەر و بەڕێوەبەری دانیشتنە شەخسییەکانمان بوو. لە شوێنێکدا کە وەك رۆشنبیرێکی بە توانا و بە ئەزموونی سیاسیی دوور و درێژی خەبات قسەی ئەکرد و زاڵ بوو بەسەر باسە سیاسی و رۆشنبیرییەکاندا لە دانیشتنەکانی خۆی و هاوڕێیانی ئەو گروپەمان حسێن عارف و شێرکۆ بێکەس و رەوف بێگەرد و لەتیفی شێخ تەها و یاسین خەلیل و ئەنوەر عوسمان و کامەرانی تاپۆ بوون.

لە دیوێکی تری کۆبوونەوە و دەعوەتەکانی ترماندا لەگەڵ کامەرانی تاپۆ و حەمەی بەکر و مستەفای سەید مەجیدی بەرگدروو و جەمال شاداندا جێگای خۆی هەبوو. دانیشتنەکانمان لەگەڵ حسە دەبۆی خۆشەویست و ئارازی شێخ جەنگی و ئەنوەر عوسمان و دڵشاد رەشید و وەستا محەمەدی حەپسە و سمایل و کامیلی حاجی سەعیدی حەڵواچیشدا بە جۆرێکی تر پڕ بوو لە سوعبەتی سلێمانییانە و نوکتەی پڕ لە پەند و پێکەنین. هەر کاك فەرەج لەناو هەمووماندا زۆر دیار بوو.

سەردەمێك لە بەغدا بووین فەرەج ئەحمەد کادێرێکی پێشکەوتووی حیزبی شیوعی بوو. ساڵێکیان لێپرسراوی کرێکارانی چێشخانەکانی بەغدا بوو. هەموو ستافەکان کاك فەرەجیان ئەناسی: ئەو کاتە زاراوەی "قۆزیی دفن"ی داهێنا. برنج و شلە بە ١١٠ فلس بوو، قۆزی بە ١٨٠ فلس، بە ناوی برنج و شلەوە خواردنیان بۆ فەرەج ئەهێنا بەڵام گۆشتی قۆزییەکەیان ئەکرد بە ژێر برنجەکەوە. ئەمەی بۆ چەند برادەرێکیش بانگ ئەکرد هەتا دوایی بەهۆی زۆر وتنی ئەنوەر عوسمانەوە، پێ‌ی زانرا. کاك فەرەج ناو و ناتۆرەی لە زۆر برادەر ئەنا بە ئەنوەر عوسمانی ئەگوت: سەرسەریی تەقەدومی.. واتە سەرسەریی پێشکەوتخواز. بە یەکێکمانی ئەوت پاشا و بە یەکێك پرۆفیسۆری فشە.

کە نەخۆش ئەکەوت یا ماڵێکی ئەگواستەوە برادەرانی ئەکرد بە چەند بەشێکەوە، ئەوەی بە ئەرکی سەرشان هەڵسابێت یان ئەوەی درەنگ بچووایە ناوی جیامان هەبوو لەلای، دابەشکرابووین بەسەر: عظماء و شرفاء و حقراء.

مەزنەکان ئەوانە بوون شتی باشیان بۆ ئەبرد. (شرفاء) دوای ئەوان، و ئەوەش کە درەنگ بچوایە و هیچی نەبردایە لە لیستی (حقراء)دا بوو. برادەرێکمان زۆر دواکەوتبوو لە لێپرسینەوەیدا، گوتی کاك فەرەج مەعلوم من لە لیستی (حقراء) دام، گوتی حەددت چییە! تۆ (أسفل السافلين)یت، هیچت نەهێناوە و شفتەشت لێ دزیوم. کاك فەرەج زۆر حەزی لە شفتە ئەکرد.

مامۆستا جەمال عەزیزیش برادەرێکی زۆر خۆشەویستی کاك فەرەج بوو. دوای راپەڕین لە ساڵی ١٩٩١ دا کاك جەمال یەکێك بوو لە لێپرسراوەکانی رێکخستنی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و نزیکیش بوو لە مام جەلالەوە. کاك فەرەجیش خاوەنی کتێب و کتێبخانەی دەوڵەمەندی خۆی بوو. جەمال پێی گوت مام جەلال تازە هاتۆتەوە و بێ کتێب و کتێبخانە هەڵناکات، بۆچی ئەم کتێبخانەیەت نەفرۆشم بە مام جەلال و پارەیەکی باشت بۆ وەرگرم؟ ئەمیش گوتی باشە. کتێب نێردرا بۆ قەڵاچوالان و حەوت هەزار دینارێکی ئەوساش کە کەم نەبوو مامۆستا

جەمال هێنای بۆ کاك فەرەج. لە خۆشیدا پێی لە عـەرز نەئەکـەوت کـە مـام جـەلال پێی گوتبوو مامۆستا جەمال ئەم ئێوارەیە ئەو کاك فەرەجە و کـاك فـاروق و خـۆت دەعوەتن لام بفەرموون بۆ قەڵاچوالان. مامۆستا جەمال سەری لە وەڵامی مامۆسـتا فەرەج سوڕما: "جەمال گیان زۆر سوپاسـی ئەکـەم.. ئـەم ئێوارەیـە دەعـوەتم لای برادەرێك ئـەم سـەگبابە ئەمەنـدە رەزیلـە دوو ساڵە ئـەیهێنم و ئەیبـەم ئەمشـەوی داناوە بۆ ئەم دەعوەتە. بەخوا نایەم بـۆ قەڵاچـوالان ئەمـە ئـەخۆم و جـەنابی مـام جەلال پیاوێکی نەجیب و خواردەیە جارێکی تـر هـەر بۆمـان ئەکاتـەوە." نـەهات و کاك جەمالی خستە رووداماندیکی ناخۆشەوە بەرامبەر مام جەلال.

رۆژێك لـە مـاڵی کـەمال شـاڵی دەعـوەت بـووین. کـاك فـەرەج رووی کـردە کـاك نەوشـیروان مسـتەفا و پێـی گـوت: کـاك نەوشـیروان خـۆت ئـەزانیت مـن لـە سـاڵی ١٩٤٨ەوە شـیوعیم. گـوتی راسـتە مامۆسـتا فـەرەج. گـوتی یـەك جـار گـیراوم لـە ژیانمدا ئەویش بە هۆی پارتیی ئێوە بـوو کـە تـۆش و مـام جـەلالیش سـاڵی ١٩٦٢ پـارتی بـوون (بـە رێکـەوت کـاك فـەرەج بـە یادداشـتێکی پارتییـەوە بـۆ سـەرۆك وەزیرانی عێراقەوە گیرا) کەچی وا تـۆ هەڵبـژاردنی ئەنجوومـەنی شـاری سـلێمانیت راپەراندووە دوای ئەم راپەرینە ئەبوو بە منت بگووتایـە خـۆ نەشـم ئـەکرد، کەچـی چوون بیست کەستان هەڵبژاردووە، دوانزەیـان لادێـین و شەشـیان ناویـان قـادرە و شەشیان ناویان عومەرە. ئەمـە راسـتە توخـوا؟ کـاك نەشـیروان گـوتی وەڵـڵا کـاك فەرەج راست ئەکەی خوا عومەری سەید عەلی بگرێت ئەو ناوەکانی داناوە.

دیسانەوە ئەڵێم بۆ کاك فەرەج ئەحمەد نووسینی کتێبێکی گەورە پێویستە.

کەس نەبوو سیاسەت و کاری حیزبی و سوعبەت و پێکەنین وەك کاك فەرەج تێکەڵ بکات:

سـاڵی ١٩٦٤–١٩٦٥ مـن لێپرسـراوی رێکخسـتنی قوتابیـانی حیـزب (حیزبـی شیوعیی عێراق) بووم لە بەغدا.

کاك فەرەجیش چەند سـاڵێك لـە زیندانـەکانی بەغـدا و حلـە و نـوگرە سـەلماندا لەسەر شیوعێتی حوکم درا بوو و تازە بـەربوو بـوو، ئـەو لـە سـاڵی ١٩٦٢ لـە پـۆلی

سێیەمی کۆلێجی ئادابی زانکۆی بەغدا بوو کە گیرا. هەرچەندە سەرەتا لەسەر نامەیەکی سەرکردایەتی پارتی دەستگیر کرا، بەڵام لە زینداندا هێلرایەوە و دوای کودەتاکەی ١٩٦٣، بەهۆی شیوعێتییەکەی چەند ساڵێك حەپس کرا. دوای ئازادبوونی گەڕایەوە و بوو بە لێپرسراوی قوتابیانی شیوعیی دواناوەندییەکانی بەغدا هەمووی. هەر ئەو کاتە من و حسێن عارف لە لیژنەی قوتابیانی بەغدادا بووین.

هاوڕێی خوالێخۆشبوومان عومەر فەخری لە کۆلێجی ئاداب بوو، و لەگەڵ کاك فەرەج برادەر بوون، عومەر لە ڕێکخستنی حیزب و یەکێتیی قوتابیانی عێراقدا لە کۆلێجی ئاداب بوو. دیارە ئەوەی لە یاد نەبوو فەرەج ساڵانێکی زۆر هەر لە لاوێتییەوە تا ئەو ڕۆژە شیوعییەکی ناسراو بووە و چەند ساڵێك لەسەر سیاسەت لە زینداندا توندکرابوو.

کاك فەرەج بۆی گێراینەوە کە عومەر تازە ئەیەوێت لە ڕێکخستنی قوتابیاندا وەك لایەنگر بیخاتە کارەوە. گوتی زۆرم پێخۆشە، ئەمە چەند ڕۆژێکە لە یانەی کۆلیج چا و چای حەلیبم بۆ ئەکڕێت بە هیوای ڕاکێشانم بۆ ناو ڕێکخستنی یەکێتیی قوتابیان.

دوای چەند ڕۆژێك کاك فەرەج بە عومەر ئەڵێت با نانێك بخۆین لە یانەکەمان و دوای ئەوە چەند دۆستێکم ئامادە کردووە ئەچین من وەك تۆ لێی نازانم وەرە قسەیان بۆ بکە. عومەر کە برادەرێکی دڵسۆز بوو بۆ بیروباوەڕ و بۆ حیزب دڵی خۆش ئەبێت و دوای، وەك کاك فەرەج گوتی، سەندویچێك و چای حەلیبێك بەسەریا ئەچنە پۆلێکی چۆڵ کە دەرسی تێدا نییە. عومەر تەماشا ئەکات چوار پێنج قوتابیی کۆلێجی خۆیان کە بە جەلالییە چالاکەکان ناویان هەبوو دانیشتوون. ئەڵێ: فەرەج ئەمانە چین؟ ئەڵێ: بەسەری تۆ قەناعەتم پێکردوون بێنە ڕێکخستنەوە، ئەی خۆ شیوعیت بۆ ڕاناکێشم.. ئەرێ برادەرینە یەکێتیی قوتابیان باشە یا نا هەموو ئەڵێن باشە.

کاك عومەر نامەیەکی نووسی بۆ حیزب کە گەیشتە دەست من داوای کرد فەرەج ئەحمەد خائینە و ئەڵێن لە حیزبدایە ئەبێ دەری بکەن ئەگینا من ئیستیقالە ئەکەم.

یادت بەخێر فەرەج ئەحمەدی تێکۆشەر و کەسایەتیی دیار و قسەخۆش و بەوەفا. رۆڵەیەك لە رۆڵە لەبیرنەچووەکانی ئەو قۆناغەی شاری سلێمانی و هەتا هەتایە بە نەمری ئەمێنێتەوە و سڵاو لە گیانی پاکی هاوڕێ فەرەج.

## کۆمەڵێك بیرەوەریی کۆمەڵایەتی

بەو مەبەستەی لاوانی ئێستامان سوودی لێ وەربگرن، بە باشی ئەزانم جارجار هەندێ بیرەوەریی بچووك و سادەش بخەمە بەرچاو کە رەنگە لای کەسانێك سوودبەخش بن.

لە ماوەی ١٩٥٢–١٩٥٨ (سەردەمی خوێندنی ناوەندی و دواناوەندی)، من لە دوو بەری جیاوازی بیروباوەڕدا ژیانم بەسەر ئەبرد: لە بەرێك کۆڕ و کۆمەڵی باوکم کە پڕی بوو لە ئەدەب و مێژوو و ئایین و بەراوردکردنی زۆر فیکری جیاوازی مەزهەبەکانی ناو ئیسلام، لەوبەریشەوە ژیانی قوتابخانە و سیاسەت لەگەڵ هاوڕێیانی شیوعی و خوێندنەوەی مێژووی شۆڕشەکان و سەرەتای خوێندنەوەی هەندێك نووسراوی ئابوری و فەلسەفیی ساکار.

باوکم حەزی ئەکرد نوێژ بکەین و بەرۆژوو بین، ئەو کاتانە تازە (موکەبەرە) لە مزگەوتی ئێمەوە و پێش مزگەوتەکانی دیکەی سلێمانی داهاتبوو، زۆر لام خۆشبوو کە جارجارە بە موکەبەرەکەدا بانگم ئەدا.

هەر لەو کاتانەدا، کاکم کە لە دارولموعەلمینی عالی لەسەر سیاسەت فەسڵ کرابوو، گەڕابووەوە بۆ سلێمانی و لە قوتابخانەی فەیسەڵییە بووبوو بە مامۆستا. دواتر کە عومەر عەلی موتەسەریفی ئەوکاتەی سلێمانی لەوێ چاوی پێی کەوتبوو، گوتبووی ئەم کەسە لەسەر سیاسەت فەسڵکراوە و نابێ لێرە بێت. ئەوەبوو گواستییەوە بۆ قەڵادزێ.

لە ماڵی ئێمەدا بەهۆی باوکم و هەروەها رۆشنبیریی کاکمەوە، رەوشێکی رۆشنبیریی هەبوو. باوکم باسی ئەدەب و ئایین و کوردایەتی بۆ ئەکردم، چێژێکی

زۆرم لــە شــیعرەکانی و نووســین و وەرگێڕانــەکانی وەرئــەگرت، ئەوەنــدەش قســە خۆش و رووخۆش بوو حەزت ئەکرد هەمیشە لەگەڵیدا بیت و گوێی لێ بگریت.

سەرەتای کاری سیاسـییم، یـاخود رووکردنـە ئـەو کـارە بـە سـادەییەکەی ئـەو تەمەنەم بوو. لە ساڵی ١٩٥٢ەوە کـە لـە پـۆلی شەشـی سـەرەتایی بـووم و لەگـەڵ مەحمود کەریمدا لە قوتابخانەی خالیدییە لە یەك پۆلدا ئەمانخوێنـد، براگەورەکـەی مەحمود و کاکم هاوتەمەن بوون و پەیوەنـدیی سیاسـییان هـەبوو، هەردووکیشـیان رێکخســتنی نــاو حیزبــی شــیوعی کردبوونیــە بــرادەر. هــەر لــەو کاتــەوە مــن و مەحمودیش نزیك بووینەوە و بیرمان لە باری سیاسیی ئەو رۆژانە ئەکردەوە.

لە سەرەتای سەرکەوتن بە قاڵدرمەکانی قوتابخانەکەماندا بەلای دەستی راسـتدا تاقێکی تێدابوو جێگای دوو کەسی بۆ دانیشتن تێدا ئـەبووەوە. زۆر جـار لـە کـاتی پشوودا من و مـەحمود پێکـەوە لـەوێ دائەنیشـتین. بـیرم ناچـێت مـەحمود باسـی خوێندنی دوای قۆناغی دواناوەندی و زانکۆی ئەکرد و ئەیگوت تۆ بڵێی تـا ئێمـە لـە دواناوەندی دەرئەچـین ئـەم حکومەتـە برووخێـت و پێکـەوە بچـین بـۆ مۆسـکۆ بـۆ خوێندن. منیش ئەمگوت ئەوە خەونێکی خۆشە، لەو باوەڕەدام بێتە دی!

ئـەو سـاڵەی لـە دواناوەنـدی دەرچـووین، مـەحمود لـە (خوێنـدنگای دارسـتانەکان) لـە ئەبوغرێب وەرگیرا و منیش لە کۆلێجی بازرگانی و ئابووری و هەتا شـەهید بوونیشـی لەسـاڵی ١٩٦٣دا بە دەستی ئەفسەرێکی بەعس، نزیکترین هاوڕێ بووین و لەسەر هەمان رێگا بووین.

جگـە لـە هۆکـاری کـاکم و هاوڕێکـانی، هۆیـەکی دیکـەی دەسـتپێکردنی کـاری سیاسییم ئەوە بـوو ئێمـە لەگـەڵ مـاڵی مەجیـد ئەفەنـدی سـەلیم ئاغـادا دراوسـێی ئەمدو ئەودیو بووین کە جـوامێر و زولال و نـەژادی کوڕیـان هـەموو شـیوعی بـوون. ئێمە ئەوەندە تێکەڵ بووین کـە وەك ئـەڵێن، وەك یـەك ماڵـە وابـووین، بۆیـە گـوێم لەوانیش ئەگرت و هەموویان کەسی زیرەك و خاوەن را و بۆچوونی خۆیان بوون.

هـەر لـە پـۆلی شەشـی سـەرەتاییەوە هـەنگاوی یەکـەمی پەیوەنـدییم بـە یـەکێتیی قوتابیانی عێراقەوە نا، کە گەیشتمە پۆلی یەکەمی ناوەندی، عەباسی مـەلا قـادری نانـەوا

کە لە ژیاندایە، هاتە لامەوە گوتی هاوڕێ، یەکێتیی قوتابیان و حیزب منیان ناردووە ببمە ڕێکخەرت (پێمان ئەگوت "مونەزیم").. چونکە تۆ لە سەرەتاییەوە لایەنگریت. کاك عەباس من و دوو کەسی تری کرد بە شانەیەك کە یەکێکیان فایەق غەریب و ئەوی دیکەیان عەتای مەلا ڕەشید بوو. لەو کاتەوە من کەوتمە ژیانێکی نوێی ڕێکخستنی سیاسییەوە.

لەولاشەوە کاکم کاریگەریی هەبوو لەسەرم و شانازیم پێوە ئەکرد کە خوێندەوار و چالاك بوو لە سیاسەتدا. کاکم لە ماڵەوە هەموو خوشکەکانمانی فێری نووسین و خوێندنەوە کرد.

مزگەوتیش بۆ ئێمە قوتابخانەیەکی بەنرخ بوو. هەموو ڕۆژێك دوای نوێژی عەسر ژمارەیەك ڕۆشنبیر و شاعیر، بەتایبەت ژمارەیەك لە مەلاکان و دۆستی دیکەی باوکم ئەهاتنە مزگەوت و لە میوانخانەکەی خۆیدا دائەنیشتن. هەرچەندە من حەزم ئەکرد بچمە ناو هاوڕێکانی خۆم بۆ یاری کردن، بەڵام باوکم ئامۆژگاری ئەکردم لە مزگەوت لەگەڵ ئەوان دابنیشم تا سوود لەو قسە و باسانەی ئەوان وەرگرم کە زوربەی باسی شیعر و ئەدەب و باسی ئایینی و ڕۆشنبیری بوون. زوربەی بابەتەکان لای هەمووان نوێ بوون.

لە ژیانی مزگەوتدا ژووری فەقێیەکانم لە هەموو پێ خۆشتر بوو، هەموو مزگەوتێك فەقێی نەبوو، تەنیا ئەوانە هەیانبوو کە مامۆستاکە جگە لەوەی ئیمام و پێشنوێژ، مودەڕیسیش بووایە. مزگەوتی ئێمە یەکێك بوو لەوانەی بەردەوام باوکم فەقێی هەبوو، فەقێی ناسراویشی تیا پەروەردە کرابوو، بۆ نموونە مامۆستا عەلادین سەجادی، مەلا ئەحمەدی بانیخێڵانی، مەلا عەزیزی جوانڕۆیی، مامۆستا فاتح هەمەوەندی، مەلا نوری عەبدوڵڵا و مستەفا چاوجوان کە ئەمانە بەشێکیان لە (ئەزهەر) دەرچووبوون و دواتر بوون بە مامۆستای سانەوی. پانزە – بیست فەقێ لە مزگەوتەکە کۆئەبوونەوە و شەوانە بە موناقەشە و نوکتە و کڵاوکڵاوێنەوە کاتیان بەسەر ئەبرد. بە ڕۆژیش یاری دیکەیان هەبوو، وەکو سێ باز و دایماسۆن و یاری تر کە خۆشییەکی زۆری بە ئێمە ئەبەخشی.

باوکم حەزی ئەکرد جێگای خۆی و باوکی و باپیری کوێر نەبێتەوە و یەکێك لە کوڕەکانی خۆی، یان کوڕی براکانی ببن بە مەلا. کاتێك کاکم لە پۆلی سێیەمی ناوەندی دەرچوو من لە سەرەتایی بووم. بە حەزی باوکم و حەزی کاکیشم خۆی لە کۆلێجی (شەریعە) لە بەغدا وەرگیرا و بە جبە و مێزەرەوە وێنەی خۆی بۆ ناردینەوە، بەڵام ساڵی یەکەمی شەریعەی تەواو نەکرد بە شیوعێتی هاتەوە سلێمانی و چووە دواناوەندی. منیش ئەو کاتە وانەکانی (عوامل و بناء)م لە مزگەوت خوێند و کەڵکی زۆرم لەو دەوروبەرە و مێژووی ئیسلام وەرگرت، بەتایبەت لە (فتوحاتی ئیسلامی)، زۆر سەرسام بووم بە خالیدی کوڕی وەلید و بە زراری ئەزوەر (رووتەی پاڵەوان).



عیزەدین مستەفا رەسوڵ
بە جبە و مێزەرەوە

هەر لە منالی و لەپاڵ سیاسەت و ژیانی ناو مزگەوتدا، ئارەزووی پوول کۆکردنەوەم هەبوو. حەزم لە کۆکردنەوەی پوولی پۆستە ئەکرد کە پوولبازییان پێ ئەگوت. لە سلێمانی ژمارەی پوول کۆکەرەوەکان کەم بوون، من یەکێکیان بووم، ئەوانی تر بریتی بوون لە وەستا جەلال، کاك مەجید سۆفی، کەمال عەبدوڵڵا و عومەر عەلی ئەمین (ژنبرای شێخەی حەڵواچی). بەڵام لە بەغدا کۆمەڵەی ئارەزوومەندانی کۆکردنەوەی پوول هەبوو (جمعیة هواة الطوابع). ئێمەی پوول کۆکەرەوە لە سلێمانی دوو جێگامان هەبوو، یەکێکیان لای کاك مەجید سۆفی، بەڕەحمەت بێت کە فەرمانبەری پۆستەی سلێمانی بوو، ئەوەی تر دوکانی وەستا جەلالی دارتاش بوو، کە دواجێگای دوکانەکەی لە کانێسکان بوو. لەو شوێنانە گۆڕینەوە و کڕین و فرۆشتنی پوول ئەکرا و تیرو پشك ئەکرا بۆ براوەکان، ئەمەش فێڵێك بوو بۆ ئەوەی خاوەن پوولەکان هانبدرێن پوولەکانیان بفرۆشن. تا ئێستاش هەندێك لە پوولەکانی ئەو کاتەم لەلا ماون.

بەڕاستی سەردەمی خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی سـەردەمی خۆشـی ژیانمـان بوو، چونکە بەردەوام لەگەڵ برادەرەکانمان لـە کـۆلآن خـەریکی یـاریکردن بـووین. ئەوانەی لەو سەردەمەدا زۆر برادەربووین: ئەنوەری وەستا ئەحمەد، شێرکۆ فایەق بێکەس، جەلالی سنگەر، نەوزادی جەلال ئەفەندی، فاروق و سـەباح و ئـەوڕەحمانی حاجی برایم و عەلی سـاڵح ئاغـا. دواتـر جیابوونـەوە روویـدا و شـەڕمان بـوو، بـەڵام ئاشتبوونەوەشی تێدا بوو.

یەکێکی تر لە بیرەوەرییـەکانی منـاڵییم ئـەوە بـوو کـە جارێکیـان گوتیـان کـاك ساڵحی کوڕی مەلا عەبدوڵای دراوسێمان، کە براکەشی هاوڕێمان بوو، ژن ئەهێنێت. ئێمـە نەمانئـەزانی ژنهێنـان و زاوایـەتی چـۆنە و قسـەی زۆر لەسـەر ئـەکرا. یـەکێك ئەیگوت نوێژ ئەکەن، یـەکێك ئـەیگوت زۆران ئـەگرن. وابـزانم ئـەو کاتـە لـە چـواری سەرەتایی بووین. ماڵی کاك ساڵح پەنجەرەیەکیان لەسەر دیوارە قووڕەکەی کـۆلآن هەبوو. ئـەو شـەوەی گوتیـان کـاك سـاڵح ئـەبێت بـە زاوا، مـن سـەباحی سـنگەر و فاروقی مەحوی و پێنج شەش منالّی دیکەی گـەڕەکم بـانگکرد و گـوتم وەرن پشـتم بۆ دابنێن و لە شووشەی پەنجەرەکەوە سەیری ژوورەوەم کرد. ماڵی مەلا عەبـدوڵڵا کارەبایـان نـەبوو چـرا هـەڵکرابوو، سـەیرم کـرد کـاك سـاڵح نوێـژ ئـەکات، دوای نوێژەکە هەندێ جولآنەوەی کرد، هاوارم لێ کـرد "کـاك سـاڵح نەکـەی!" ئـەویش هاتە دەرەوە و بە کۆلآناندا راوینـاین، دواتریش لای بـاوکم شـکاتی لێ کـردم. لـەو ساڵانەی دواییدا بووبووینەوە بە دۆست و هەموو جار یادی بـەخێر بێـت ئـەیگوت "تۆ ئەو شەوەت لە من تێکدا".

یاری کۆلآنانی ناو شاری سلێمانی هەر لەو کاتەدا، قەلآ قـەلآ و هـەیجۆ هـەیجۆ و بە رۆژیش فتبۆڵێن بوو. لـە گـەڕەکی ئێمـەش وەك پێشـتر بـاسمکرد کـاك کـەریمی وەستا بستە قسەی خۆشی بۆ ئەکردین، کاك کەریم چیرۆکی زۆری بۆ ئەگێڕاینـەوە بەتایبەتی لەبارەی ئازایی و پاڵەوانێتیەکانی خۆی. ئێمە بـە قسـە خۆشـەکانییەوە مەشغوڵ ئەبووین و منـاڵانیش بـە دزییـەوە ناخوونـەکیان لـە میوەکـانی بـەردەمی

دوکانەکەی ئەدا. لەولاترەوە دوکانی کاك مستەفای کۆیی لێ بوو کە سەردانی ئەویشمان ئەکرد. ئەو ساڵانە لە شاردا سینەمای سەڵاحەدین و سینەمای گوێژەی هاوینە تازە دامەزرابوون، پاشان سینەمای سیروان و سینەما رەشید کرانەوە. میرزا برایمی سنگەر کە هاوڕێی باوکم و باوکی هاوڕێکانم بوو، خاوەنی سینەمای رەشید بوو و بەهۆی سەباح و جەلال و جەمالی کوڕییەوە، سینەما بۆ من بەخۆڕایی بوو، هەفتەی جارێك دوو جار ئەچووین بۆ سینەما، ئێستاش هەندێ لە فیلمەکانی ئەو ساڵانەم لەبیرماوە.

تیپێکی دیکەی یاریمان هەبوو، فتبۆڵێنمان ئەبردە دەرەوەی گەڕەك، ئەم تیپە من و سەباحی سنگەر لەلایەك، سەردار و هۆشیاری غەنی شاڵی و نەوزادی حسێن ئەفەندی ساڵح ئاغاش کە پورزایانە لە لاکەی دیکە بوون. هەر لەو یاریی گەڕەکەدا و لە سانەویدا هاوڕێیانم، کەمالی حەمە کەریم و خوالێخۆشبوو سەڵاحی حەمە کەریمی برای و فەوزی و فوئادی ئامۆزام تیپێکی تری گەڕەکی سەرکارێز بووین.

## شۆڕشی ١٤ی تەموزی ١٩٥٨

سەر لە بەیانیی رۆژی ١٤ی تەموزی ١٩٥٨ لە خەو هەڵسـاین و لەگەڵ باوکم و دایکم و خوشکەکانم خەریکی بەرچایی خواردن و نانی بەیانی بووین. لە هەیوانەکەی نێوان ژووری نووستن و ژووری ئازووقەکەماندا نان و ماستەکەمان لەبەردەمدا بوو، دایکم خەریکی دانانی پیاڵە چاکان بوو. باوکم رادیۆکەی کردەوە و بەتەمای گوێگرتن بوو لە قورئانی بەیانیی ئێستگەی بەغدا. دەنگێکی بەرزی پڕ حەماسەتی رادیۆکە ئێمەی هەژاند و سەرسامی کردین، دەنگەکە هاواری رووخانی فەرمانڕەوایی پاشایەتیی ئەکرد و بەیاننامەی ژمارە (یەك)ی شۆڕشی ئەخوێندەوە (بڕوانە دەقی بەیاننامەکە لە کۆتایی ئەم کتێبەدا).

ئەو رۆژە رەشەبایەکی بەهێز بوو لە سلێمانی.

من زۆر بەپەلە خۆم گۆڕی و رووم کردە بەردەرکی سەرا. پێش ئەوەی بگەمە ئەوێ، لە نزیك مزگەوتی دوودەرگا و ئەسحابەسپی خەڵك کۆبووبوونەوە و هەموو بەم رووداوە گەورەیە دڵخۆش بوون. سەعاتێکی پێ نەچوو چەپڵە و دروشم بەرزکردنەوەی خەڵك دەستی پێکرد و بوو بە نمایشی پشتیوانیکردن لە شۆڕش، منیش لە پێشی پێشەوە بووم هاوارمان ئەکرد (بژی شۆڕش و بمرێت خائینان).

لە یەکەم سەعاتەوە ئەو رۆژە رۆڵی حیزبی شیوعیی عێراق و پارتی دیموکراتی کوردستان دیار و ئاشکرا بوو، و خۆپیشاندانەکان بە هاوکاریی هەردوو لا بوو.

حکومەت لە سلێمانی جووڵەی نەبوو.

هەر لە پاشنیوەڕۆی ١٤ی تەموزەوە، قەدەغەکردنی هاتوچۆ بۆ ماوەیەکی کاتی لە رێگەی رادیۆوە بڵاو کرایەوە. لە سلێمانیش ئەوە جێبەجێ کرا، بەڵام شیوعی و پارتی رایانگەیاند کە لە گەڕەکەکاندا بۆ پاراستنی ئاسایش، نیشتمانپەروەران پاسەوانی ئەکەن. لە گەڕەکی خۆمان من و برادەرێکی دراوسێمان کە ناوی عوسمان سابیر بوو، هەر یەکە بە دارێکەوە وەك نیشانەی لێپرسراوێتی لە سەرکارێزەوە هەتا گەراجی ئەسحابەسپی ئێشکمان ئەگرت.

سلێمانی (حامیه)یەکی تێدابوو عەقید نوری مەلا مارف فەرماندەی بوو. کاك نوری لە یەکەم ساتەوە پشتیوانیی بۆ شۆڕش ئاشکرا کرد و لە خۆپیشاندانەکاندا وتاری خوێندەوە. هەرگیز یەکەم هوتافی ئەو بەیانییەم بیر ناچێتەوە کە کاك عیزەت رەشید (رەشەکاو) بە دەنگی بەرز هاواری ئەکرد: (بژی بەرەی نیشتمانیی.. بژی شۆڕش).

سالآنێك بوو بەرەی نیشتمانی لە عێراقدا لە حیزبی شیوعی و حیزبی نیشتمانیی دیموکراتی و حیزبی ئیستیقلال و حیزبی بەعس پێکهاتبوو، و لە بەرەبەیانی شۆڕشەوە لە بەغدا سەدان هەزار کەسیان بۆ پشتگیری لە شۆڕشی ١٤ی تەموز رژانە شەقامەکانی پایتەختەوە. لە کوردستانیشدا لەنێوان حیزبی شیوعیی عێراق و پارتی دیموکراتی کوردستاندا پەیمانی هاریکاری (میثاق التعاون) ئیمزا کرابوو.

ئیتر هەموو رۆژێك خۆپیشاندان لە بەردەرکی سەرا دوو وتاربێژی پارتی و شیوعی لەسەر بیناکەی بەرامبەر سەرا، کە پێیان ئەگوت بیناکەی نوری عەلی خوتبەیان ئەدا و هەندێك جاریش لە فولکەی بەرخانەقا لەسەر ئوتێل شەمێرانەوە وتار ئەخوێندرایەوە. کەسە دیارەکانی ئەو رۆژە مێژووییانە، لە حیزبی شیوعی ئەحمەد غەفور، فەرەج ئەحمەد، حسێن عارف، هەر سێ برا غەفور و قادر و جەلالی میرزا کەریم، کەمال سەلمان، و ئەنوەر عوسمان بوون. لە پارتیشدا وتاربێژی ناودار و شاعیر کامەران موکری لە هەمووان دیارتر بوو. وتاربێژی ئەو رۆژانەی حیزبی شیوعی حەسەنی عەلی غالب بوو کە بەهۆی ئەوەی لە سلێمانی نەژیابوو، زۆرجار وتارەکانی بە عەرەبی ئەدا و ئەوەش هەڵەیەکی گەورەی حیزب بوو کە لەو کاتەدا خوتبە بە عەرەبی بدرێت لە سلێمانی.

## ئازادکردنی بەندە سیاسییەکان و هاتنەوەیان بۆ سلێمانی

لە مانگی ئابی ١٩٥٨ بلّندگۆ بەناوشاردا ئەگەڕا و داوای لە نیشتمانپەروەران ئەکرد بچن بەپیر تێکۆشەرە زیندانیکراوەکانەوە کە بەبڕیاری شۆڕش ئازاد کرابوون و بڕیار بوو لە بەغداوە بگەنە کەرکوك. منیش یەکێك بووم لەو سەدان کەسەی بەرەو کەرکوك کەوتینە رێ. لە تەکییەی تاڵەبانی کۆبوونەوە کرا بۆ بەخێرهێنانەوەی ئەو تێکۆشەرانەی سلێمانی و حیزبی شیوعیی کە لە بەهادین نوری و عەبدوڵڵا گۆران و نائیب عەبدوڵڵا و عومەری مامە شێخە پێکهاتبوون. کۆبوونەوەکە بەهۆی موکەڕەم تاڵەبانی کە یەکێك بوو لە سەرکردەکانی حیزبی شیوعی لەو تەکییەیە بەسترا. لەوێ مامۆستا گۆران هەڵبەستە بەناوبانگەکەی خۆی بەناونیشانی (بت بتەوان) خوێندەوە کە لەپاشدا بە جوانترین هەڵبەست دانرا لەسەر شۆڕشی ١٤ی تەموز و مامۆستا گۆران لە بەیانیی رۆژی ١٤ی تەموزدا لە بەندیخانە ئەو هەڵبەستە مێژوویییەی دانابوو. هەروەها کاك بەهادین و نائیب عەبدوڵڵاش وتاریان خوێندەوە.

دوای شۆڕشی ١٤ی تەموزی ١٩٥٨، زوربەی کۆبوونەوەی فراوانی قوتابیان و حیزب لە ماڵی حاجی قادری خاڵم، باوکی ئەندازیار بەکر قادر ئەکرا. خانووەکەیان گەورەبوو. خاڵم پیاوێکی باش بوو، ئازادییشی بە کوڕەکانی دابوو. دایکیشیان ژنێکی زۆر باش بوو، میوانداریی ئەو ژمارە زۆرەی قوتابیانی ئەکرد.

لە ناوەندیدا زۆرجار مانگرتن ئەکرا و دەرس نەئەخوێنرا، بۆ نموونە لە بۆنەکانی راپەڕینەکانی کانوونی ١٩٤٨ و ١٩٥٢ ئەو یادانە بە مانگرتن یادیان ئەکرایەوە. مامۆستا ئەحمەدی قازی رۆژێك منی بانگکرد و گوتی "تۆ بەم ئیتیحادی تەنەکەیەوە ئەم دنیایەت تێکداوە." مەبەستی لە (ئیتیحادی تەنەکە)، ئیتحادی تەلەبە (یەکێتیی قوتابیان) بوو. پاشان گوتی "تۆ منداڵێکی بچکۆلەیت، بەقەد زەردەزیڕەیەکیت، تۆ بۆ وائەکەیت؟" منیش گوتم "ئوستاذ، ئێمە هاوڕێکانمان لە بەغدا کوژراون، لەسەر نیشتمانپەروەری و بۆ بەدیهێنانی خوێندنی

باش زۆریان بەند کراون، ئەمەی ئێمەش گوزارشتە لە پشتگیریی ئەوان."
لێپرسینەوەکەی ئەحمەد ئەفەندی هەر ئەوەندە بوو.

پاش شۆڕشی ١٤ی تەموز ئەحمەد ئەفەندی بوو بە بەڕێوەبەری دواناوەندیی سلێمانی. هەڵبژاردنی یەکێتیی قوتابیان بە ئاشکرا و بە رەسمی ئەنجام درا، دیارترین قوتابیی چالاك لە پۆلی پێنجەکان بریتی بووین لە فەهمی فەرەج، سەلاح عەلی ئایشەخان، شەهابی رەمزی مەلا مارف و من، دەورمان هەبوو لە قوتابخانەکەدا. من سەرپەرشتیاری لیستەکەی خۆمان بووم، لە پۆلی یەکەوە تا پۆلی پێنج. کاتێك دەنگەکان لەناو سندووقەکاندا جیاکرانەوە، لە پۆلی سێیەکان کە (بەکر قادر) و (قادر ساڵح) پاڵێوراوی ئێمە بوون، دەنگێك بۆ (ساڵح قادر) نووسرابوو. مامۆستا شیوعی و پارتییەکان لەسەر یەکلاکردنەوەی ئەم دەنگە رێك نەکەوتن و مامۆستا پارتییەکان داوایانکرد تەلەفۆن بکرێت بۆ حاکم. منیش بە ئەحمەد ئەفەندیم گوت "باشە ئوستاذ ئەم ئیتیحادی تەنەکەیە ئەم هەموو بەزم و رەزمەی ئەوێت؟" دیارە قسەکەی کاتی ناوەندیی خۆیم بیرخستەوە. من ئەمەم بە پێکەنینەوە پێ گوت، ئەویش وەڵامی دایەوە "ناماقووڵی مەکە، بەڵێ ئەیەوێت و زیاتریش".

لە ماوەی خوێندنی سانەویدا یەکێتیی قوتابیانی عێراق و یەکێتیی قوتابیانی کوردستان هەبوون، لە ساڵانی ١٩٥٨ – ١٩٥٩ لە زوربەی قوتابخانەکاندا پاڵێوراوانی ئێمە دەرچوون، ئەوکاتە حیزبی شیوعی حیزبێکی زۆر بەتوانا و بەهێز بوو، پارتی تازە زیاتر گەشەی ئەکرد، پارتی و شیوعی لەدوای ١٩٥٤ەوە بەهۆی پەیمانی هاریکاری (میثاق التعاون)ەوە پەیوەندییان باش بوو، بەڵام لە ساڵانی دواییدا ململانێ وایکرد لە هەندێ شوێن بەیەکدا بدەن و گرژی کەوتە نێوانیانەوە.

## قۆناغی نوێی بەرەو خوێندن لە بەغدا

سەردەمی ئێمە، خوێندنی سانەوی پێنج ساڵ بوو. لە ساڵی ١٩٥٩دا، کاتێک لە پۆلی پێنجەم دەرچووم، لە کۆلێژی بازرگانی و ئابووری لە زانکۆی بەغدا وەرگیرام. چەند قوتابییەکی دیکەی سلێمانی لەوێ وەرگیران، کە بریتیبوون لە من و سەردار مستەفا مەزهەر و ئەنوەری حاجی ئەمینی میسری و جەلال عومەری سام ئاغا و شەماڵ کەریم و ئەمین عارف.

کە چوومە بەغدا بەهیوا بووم کاکم هاوکاریم بکات، بەڵام هەر ئەو ساڵە لەگەڵ چەند کەسێکی تر دا رۆیشتن بۆ یەکێتیی سۆڤێت بۆ خوێندن کە یەکەم دەستە بوون بە زەماله بۆ خوێندنی زمان و مێژوو و ئەدەبیاتی کوردی بچنە دەرەوەی وڵات. ئەوکاتە کاکم لە ئامادەییەکی بەغدا مامۆستا بوو. ژیانی قوتابی لە بەغدا مانگانە ١٥–٢٠ دینارێکی ئەویست، باوکم مووچەکەی ٤٠ دینار بوو، بەڵام گوتی "هەرچۆنێك بێت ئەبێت بخوێنیت. من لە دەمی خۆمی ئەگێڕمەوە بۆ تۆ"، ئیتر هەوڵی کارکردنم دا. ئەوەبوو لە ئیستگەی کوردی بەغدا وەزیفەیەکیان هەبوو بە پلەی وەرگێڕ (موتەرجیم). چووم و تاقیکردنەوەیان کردم و دەرچووم. ئەوانەی تاقیکردنەوەیان کردم بۆ وەرگێڕانی عەرەبی – کوردی هەروەها کوردی – عەرەبی، بریتی بوون لە کاك ئەحمەد حامید و خوالێخۆشبوو کاك تەحسین بەرواری. گوتیشیان بە هەقی خۆت و بە ئاستێکی باش دەرچوویت.

بەیانیان لە وەزارەتی ئیرشاد (کە دواتر بوو بە وەزارەتی راگەیاندن) دەوامم ئەکرد. عەسرانیش ئەچوومە کۆلێژی بازرگانی بۆ خوێندن، ئەوسا چەند کۆلێژێك هەبوون هەر دوو دەوامی بەیانیان و پاش نیوەڕوانیان هەبوو، بەڵام تاقیکردنەوەکانیان پێکەوە ئەکرا، زوربەی کاتیش قوتابیانی پاشنیوەڕوانیان یەکەم ئەبوون. ئەوکاتە لەگەڵ چەند برادەرێکدا خانوویەکمان گرتبوو. کاتێك لە پۆلی یەکەم بووم، خانووەکەمان کاکم و حەمە کەریم فەتحوڵڵا و شێرکۆ عەزیز و رەوف عارف پێکەوە گرتبوومان. خانووەکە لە گەڕەکی وەزیرییە بوو کە زۆر نزیك

بوو لە کۆلێجی بازرگانییەوە. هەر یەکەمان خواردنی بۆ خۆی دروست ئەکرد، کۆششمان ئەکرد و چوونە دەرەوەشمان هەبوو. خوێندن و کارکردن و کاری سیاسی و دووری لە کەسوکار لەو تەمەنەدا ژیانی قورس کردبووین.

پاش ماوەیەك کاك جەلال رەشید کە هاوڕێی کاکم بوو هاتە ماڵەکە لەگەڵمان، کاك جەلال ئەفسەری پۆلیس بوو. هەتا بڵێی پیاوی چاك و خاوەن هەڵسوکەوتی برایانە و برا گەورە بوو.

کە لە وەزارەتی ئیرشاد دامەزرام کەوتمە ناو دنیایەکی نوێ و ناو کۆمەڵێك خەڵکی گەورە و مێژوویی هەموو عێراقەوە. نووسەر و بیرمەندی هەرە گەورە (هادی ئەلعەلەوی) لێ بوو، یەکەم کەس ئەو لێم نزیك بووەوە و گرنگی پێدام، برایەکی باش و مامۆستایەکی بێ وێنە بوو بۆ من. زۆر شت لەوەوە فێربووم – هەر بۆ مێژووش، چەند ساڵێك دواتر من ئەوم بۆ ئەندامێتیی حیزبی شیوعی پالاوت. هادی ئەلعەلەوی نووسەر و لێکۆڵەرێکی قووڵ و رۆشنبیرێکی گەورە بوو، پیاوێکی قسەخۆشیش بوو. هەروەها جەمیل ئەلجبورییم ناسی کە نووسەرێکی دیاربوو و هێشتا لە ژیاندایە. نوری ئەلڕاوی شێوەکارێکی گەورە و عەبدولحەمید ئەلعەلوەچی پسپۆری کەلەپوور و رۆشنبیری مەزنیشم ناسی. کەسێکی دیکەش کاریکاتێریستێك بوو بەناوی غازی و بەرپرسی هەموو بەشەکانیش دکتۆر ئەکرەم فازیل بوو کە بەڕێوەبەری گشتیی رۆشنبیری بوو لە وەزارەت.

هەرچەندە لە سلێمانی خوێندنمان بە زمانی عەرەبی بوو، بەڵام لەبەر ئەوەی بە زمانی کوردی وانەکان ئەگوترانەوە، کەم قوتابی ئەیتوانی بە عەرەبی قسە بکات. لەو تەمەنی گەنجێتییەدا من بەهۆی باوکمەوە عەرەبییەکی باشم ئەزانی. یەکەم کارم وەرگێڕانی بابەتی عەرەبیی بڵاوکراوە بوو بۆ زمانی کوردی، ئەو برادەرانەم کە لەدەرەوە کارەکانی منیان ئەخوێندەوە زۆر لە وەرگێڕان و داڕشتن و رێنووسە کوردییەکەم رازی بوون.

وەك گوتم لەوێ زۆر شت فێربووم. گۆڤاری (العراق الجدید) دەرئەچوو، بە زمانی عەرەبی و کوردی و ئینگلیزی و فڕەنسی و ئەڵمانی و تورکی و فارسی.

ئەوانەی بەرپرسی زمانەکانی ئەو گۆڤارە بوون هەموو ژووری جیاجیایان هەبوو، بەڵام نزیك بە یەکتر بوون لە نهۆمێکدا. من لە (عێراقی نوێ) واتە گۆڤارە کوردیزمانەکە کارم ئەکرد. سەردەمێك کوردییەکە کاك شەوکەت غەفور بابان و من بووین، و هەتا ئەو کاتەی لەسەر سیاسەت گواسترایەوە بۆ وەزارەتی پەروەردە، کاك شەوکەت بەرپرسی من بوو و کارەکانمان پێکەوە رایی ئەکرد. زمانی نووسین و قسەکردنم باش بوو، بۆیە جگە لە وەرگێڕانی بابەتە عەرەبییەکان، جارجاریش رێپۆرتاژم لە گۆڤارەکەدا بڵاودەکردەوە کە بەشێکیان لەبارەی سلێمانییەوە بوو.

بۆ من ئەو ماوەیە بۆ فێربوونی زمان، هزر، سیاسەت و بواری دیکەش زۆر گرنگ بوو. لەوێ پیاوی وەك (ئەحمەد سووسە)م ناسی، کە پێکەوە بۆ بینینی شوێنەوارەکانی سامەڕا چووینە ئەو شارە، د. سووسە زانایەکی گەورەیە لە مێژووی عێراقدا و بە زانایەکی ناسراوی بواری ئاودێرییش دائەنرێت. هەروەها د. مستەفا جوادم ناسی و سەفەرێکم لەگەڵ کرد. مامۆستا جەلال ئەلحەنەفیم ناسی و پێکەوە بە مزگەوتەکانی بەغدادا ئەگەڕاین و ئەو لەسەر مێژوویانی ئەنووسی.

سێ ساڵ لە وەزارەتی ئیرشاد کارم کرد و هاوکات لە کۆلێجیش ئەمخوێند، هەتا گەیشتمە پۆلی چوارەم. لە زانکۆ چالاکیم زۆر بوو. چەند جارێك لەنێوان ئێمە و بەرەی بەعسی و قەومییەکاندا شەڕ رووی ئەدا و من چەند جارێك گیرام. لە کۆلێجی بازرگانی ژمارەیەك برادەری خۆشەویستم بۆ پەیدا بوو کە تا ئێستاش هاوڕێیەتیم ماوە لەگەڵیاندا. هەرچەندە هاوڕێکانی زانکۆم هەموو لە کوردستان نین و بەشێکیان لە شوێنی جیاوازی ئەم جیهانە ئەژین، بەڵام هاوڕێیەتیمان هەر ماوە و ژمارەیەکی زۆریان وەك ئەوسا خاوەنی فیکری خۆیانن.

یەکەمجار کە چوومە خوێندنی بەغدا، گواستنەوە حیزبییەکەم گەیشتبووە بەغدا، چاوپێکەوتنێکیان بۆ دانام و چاوم بە (زوهێر ئەلتائی) ناوێك کەوت کە وەری گرتم. لەپاش ئەو (موسلیم عوێنە)م ناسی کە لاوێکی تێکۆشەر و خوێندەوار و شاعیر و برای شەهیدی قارەمان (حەسەن عوێنە) بوو. لەبەر ئەوەی عەبدولکەریم

قاسم بەرەو دواوە گەڕابووەوە و دەستکرابوو بە لێدانی حیزبی شیوعی و جوڵانەوەی پێشکەوتنخوازی عێراق بە گشتی، ئەو ماوەیە خۆپیشاندانی زۆر روویدەدا. بەو ماوەیە ئەگوترا ماوەی (انتکاسە) واتا پاشەکشە یاخود هەرەس.

لە یەکێك لە خۆپیشاندانەکاندا من و یەکێك لە برادەرەکانم کە (شاکیر عیسا موسا) بوو، و کە دواتر من بوومە لێپرسراوی، لەتەنیشت منەوە بریندار بوو کەوت، هەر لەوێدا (مونیب ئەلسکوتی) بریندار بوو، دوای پەنجا ساڵ لە شوێنێك چاوم پێی کەوتەوە بوو بوو بە بەڕێوەبەری بانك. ئەکرەم ئەلڕوبێعی لە برادەرەکانی کۆلێجی بازرگانی، هادی ئەلسوهەیل، نەبیل یوسف یەکێك لە برادەرە هەرە خۆشەویستەکانم بوو، کە ئێستا لە ئەمریکا ئەژی و ساڵی ٢٠١١ لەگەڵ چەند برادەرێکی تردا دەعوەتم کردن هاتن بۆ سلێمانی.

لە کوردەکاندا نزیکترین کەسم سەردار مستەفا مەزهەر و جەلالی عومەری سام ئاغا بوون، کە کاتمان پێکەوە ئەبردە سەر. سەردار لە حیزبدا بوو، جەلالیش دۆستێکی نزیکی حیزب بوو، لە هەموو بۆنەکاندا لەگەڵماندا بوو.

هاوڕێکانی دیکەم مونزر توبیا، نزار قستۆ و کوڕە ئازاکەشمان جواد حەیدەر هەروەها زوهێر ئەلتائی و وائیل ئەلتائی. جواد وەرزشکار و کوڕێکی قۆز بوو، شەڕکەرێکی زۆر ئازاش بوو، وەك پاڵەوانی فیلم، بە شەڕە مست بەرەنگاری چەند کەسێك ئەبووەوە و سەریش ئەکەوت. نزیکترین هاوڕێیانی دیکەی ئەو سەردەمەم نەبیل یوسف، سامی عەنتەر، ئیبراهیم ئیسماعیل، جواد مەهدی، و مەهدی قاسم بوون کە لە ئەندامە شیوعییە ئازاکانی کۆلێج بوون.

یەکێك لەو جارانەی دەستگیر کراین لە ١٩٦١/١١/٦دا بوو، لە میانەی مانگرتنی کرێکارانی جگەرەدا. ئەو کاتە من لە پۆلی دووەمی کۆلیج بووم و چووبووین بۆ هاوکاریی کرێکارە مانگرتووەکان. شەو تا بەیانی دەوریان گرتین و ژمارەیەکی زۆرمان دەستگیر کراین و لە (سرية الخيالة)ی نێوان وەزیرییە و ئەعزەمییە خراینە بەندیخانەوە. نۆسەد کەسێك ئەبووین. شتێکی سەیربوو، ٧٦ کەسمان لە ژوورێکدا

بووین بە شەڕەشەق جێگامان ئەبووەوە و بەباشی نەمانئەتوانی پاڵ بکەوین. ماوەیەك ڕێگە بە بینین نەدرا، لەپڕ ڕێگەیان دا و لە پەنجەرەی حەپسخانەکەوە باوکم بینی لە ریزدا راوەستا بوو. زۆر خەفەتم خوارد کە بە گیرانی منی زانیبوو و هاتبوو بمبینێت.



لەڕاستەوە: غەفور عەزیز، عەلی ئەحمەد حەمامچی، فەهمی فەرەج، فاروق مەلا مستەفا، سەرداری مستەفا مەزهەر، نەناسراوەتەوە، جەلالی ساماغا. نەورۆز لە زەعفەرانیە، ١٩٦٠/٣/٢٠

یەکێك لە زیندانییەکانی ناو ژوورەکەمان ناوی (فازیل) بوو، فازیل یەك دەستی هەبوو، چایچی بوو لە گەڕەکی مەهدییە. کە دائەنیشتین قسەی خۆشی ئەکرد، ئەیگوت "من هاوڕێی عەبدولکەریم قاسمم." کە دەستی پێ ئەکرد ئاماژەمان بۆ یەکتر ئەکرد و ئەمانگوت "فازیل دەستی کردەوە بە فشە." ماوەیەکی پێ نەچوو، لەپڕ لێپرسراوی بەندیخانەکە کە ناوی موقەدەم عەبدولڕەزاق بوو هات و گوتی "فازیل کێیە؟"، بەبێ ئەوەی لەجێگەی خۆی هەڵسێت گوتی "منم." ئەویش پێی

گوت "هەڵسە نوێنەکانت بپێچەرەوە و وەرە لەگەڵمان بۆ دەرەوە." گوتی "جارێ هیچ کەسێك نوێن و شتی پێ نییە و ئێمە هەموو لەسەر ئەو حەسیرانە نووستووین." هەر نەجولا، ئیتر موقەدەم عەبدولڕەزاق و چەند یاوەرێکی بە زۆر هەڵیانساند، ئەمیش ئەیگوت "ناڕۆم و بەتەنیا ناچمە دەرەوە." هەموو سەرمان سووڕما! لێپرسراوی بەندیخانەکە گوتی "بێ ئەقڵ تۆ نازانێ کێ داوای کردوویت؟" ئەوە بوو قسەکەی فازیل راست دەرچوو. لەناو دەرگاکەدا هاواری کرد "بەزۆر ئەمبەن، ئەگینا بەجێتان ناهێڵم." هەروەها گوتی "وەعدی پیاو بێت ئەمشەو بچم بۆ لای زەعیم."

رێکەوتێکی سەیربوو. دوای دوو رۆژ فازیل هات بۆ لامان بۆ سەردان (مواجهه)، بردیانینە دەرەوە. فازیل گوتی "هەر کە بەربووم شەو چوومە لای عەبدولکەریم قاسم، یان ئەمڕۆ یان سبەینێ بەر ئەبن." هەندێ ئەیانگوت "وەك فشەکانی تری وایە". بەڵام من رام وابوو کە راست ئەکات. بۆ سبەینێ ئەو هەموو خەڵکەیان بەرەڵاکرد، لەبەر خاتری فازیل، ئەوەش ئەگەڕێتەوە بۆ گەورەیی عەبدولکەریم قاسم.

چەند جارێکی تر لە ماوەی خوێندنمدا لە کۆلێژی بازرگانی دەستگیرکراوم، جارێکیان لەسەر شەڕی ناو کۆلێژ، کە لەنێوان شیوعی و قەومییەکاندا روویدەدا.

یەکێك لەو شتە سەیرانەی لە ژیانمدا دیومە شەڕ لەنێوان دوو بەرەدابوو. دەیان کەس بەرامبەر دەیان کەس وەستا بووین. سوپا هات، بە سەرۆکایەتیی یاریدەدەری سەرۆك ئەرکانی سوپا کە ناوی (زەعیم شەریف) بوو. من ئەو کاتەی لە وەزارەتی ئیرشاد بووم و بەشی رەقیبی چاپکراوەکان (رقابة المطبوعات)یشمان هەبوو. کە ئەو هات ئەفسەرێکیان گوتی یەکێك لەمبەر و یەکێك لەوبەر با بێنە پێشەوە، برادەرانی ئێمە منیان هەڵبژارد، ئێ تەماشام کرد و گوتم باشە سبەینێ زەعیم شەریف چۆن ئەهێڵێت من لە رەقابە بمێنم، هەرچەندە پیاوێکی باش بوو. لاشم عەیب بوو نەچم، ئەگەر نەچوومایە ئەیانگوت ئەترسێت! چوومە پێشەوە،

کاتێك زەعیم شەریف منی بینی گوتی "بۆ جەنابت نوێنەری شیوعییەکانیت؟"، گوتم "بەڵێ." یەکێکیش لەوبەر هات و قسەکرا. ڕێکی خستین کە ئەو شەڕە ببڕێتەوە و لەپێشدا بەشێك بچینە دەرەوە بەڵام بە سەرباز لەگەڵیان بچێتە دەرەوە تا لەدەرەوە شەڕ ڕوونەدات.

بۆ سبەینێ چوومەوە وەزارەت، لەوێ خوالێخۆشبوو (لوتفی ئەلخوری) سکرتێری دەستەی ڕەقابە بوو، پیاوێکی زۆرباش بوو، بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕایەوە، گوتی "زەعیم شەریف پیاوێکی باشە.. بەشکم بە لابردن، یان دەست لەکارکێشانەوە وازت لێ بهێنێت، چونکە ئەو نایەڵێت تۆ لێرە بمێنیت." ئامۆژگاری کردم گوتی "با کەسی تر تێ نەکەوێت، خۆت بچۆ ببینە. خەڵکی تێ بکەون ئەویش ناچار ئەبێت توند بێت لەگەڵت." ئەو سەرۆکی ڕەقابە بوو لەوکاتەدا، من و کاك عەزیز خانەقا ڕەقیبی چاپکراوی کوردی بووین. بە فەڕاشەکەی زەعیم شەریفم گوت کە ناوی حەسەن بوو، "ئەگەر هات پێم بڵێ." دوای کەمێکی تر حەسەن هات و گوتی "ئەوە هاتووە و لە ژوورەکەی خۆیەتی و کاسەیەك ماست و سەمونێکم لە حەیدەرخانە بۆ هێناوە و خەریکی خواردنە." چووم و لە دەرگای ژوورەکەیم دا، بەڵام وەڵامی نەدایەوە. فەڕاشەکەی گوتی "لەوێیە." بە هێواشی چوومە ژوورەوە، بینیم سەری لار بووەتەوە و شەپقەکەی کەوتووەتە خوارەوە، هەروەها کەوچکەکەی دەستیشی کەوتبووە خوارەوە.

گەڕامەوە فەراشەکەیم بانگ کرد و گوتم "وەرە، لەوە ئەچێت بووراببێتەوە." ئەو گوتی هیچ قسە مەکە با تووشی گێروگرفت نەبین، چوومەوە لای لوتفی ئەلخوری و گوتی "چی بوو؟"، گوتم "بەخوا لام وا بێت کارەکە چارەسەر بوو، یان بووراوەتەوە یان مردووە." پاش ماوەیەك بوو بە دەنگە دەنگ، چەند کەسێك زەعیمیان برد بۆ خەستەخانە، ئەوەبوو بەداخەوە کۆچی دوایی کردبوو. لەو ساڵانەی کۆلێژی بازرگانی من چوار پێنج جار دەستگیر کرام، و هەر جارە چەند ڕۆژێك تا دوو هەفتە لە زیندان ئەمامەوە.

هەر لەسەرەتای چوونە بەغداوە، چوومە ڕۆژنامەی (ئازادی)ی حیزب و وەك ئێستا پێی ئەڵێن خۆبەخشانە کەوتمە کارکردن تیایدا، سەرەتای کارەکانم هەڵەبڕی (تەصیح)ی وتاری وتارنووسەکان بوو. کاتێك ڕۆژنامەکەم ئەبرد بۆ چاپخانە و نوسخەی یەکەمی چاپ ئەکرا ئەکەوتمە هەڵەبڕیکردنی.

ڕۆژنامەی ئازادی، هەفتانە بوو، وەك زمانحاڵی لقی کوردستانی حیزبی شیوعیی عێراق بە زمانی کوردی دەرئەچوو. لەهەمان بارەگای ڕۆژنامەی (ئیتیحاد ئەلشەعب)دا بوو کە بارەگای سەرکردایەتی حیزبیش بوو، کەوتبووە سەر شەقامی کیفاح – (فەزوەت عەرەب– فضوة عرب). بەو هۆیەوە ژمارەیەکی زۆرم لە سەرکردەکانی حیزب ناسی وەك هاوڕێیان: سەلام عادل، عەزیز محەمەد، بەهادین نوری، عەبدولجەبار وەهبی (ئەبو سەعید) و عامیر عەبدوڵلا. هەروەها دەیان کادیری تری ڕۆشنبیری و حیزبیم لەوێ ئەبینی بۆ نمونە حسێن جواد گومەر و ماجید ئەلعامل و روشدی ئەلعامل. هاوڕێ ئیبراهیم عەلاویم لەوێ ناسی کە ئەو کاتە نووسەری سەرەکیی گۆڤاری (Iraq Review) بوو کە بە زمانی ئینگلیزی دەرئەچوو.

بەڕێوەبەران و نووسەرانی (ئازادی) بریتی بوون لە شەهید نافیع یونس کە ئەندامی سەرکردایەتی و خاوەن ئیمتیازی ڕۆژنامەکە بوو. نووسەرەکانیش عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ و محەمەدی مەلا کەریم بوون و پاش ماوەیەك محەمەد کەریم فەتحوڵلاش هاتە ریزی ئەوان. مامۆستا گۆران پاش ساڵێك لەو سەرەتای چوونەی من هاتە ڕۆژنامەی (ئازادی) و بێگومان هەموو وەك براگەورە و مامۆستای خۆیان لێیان ئەڕوانی.

کەوابێت، هەر لە ڕۆژانی یەکەمی چوونە بەغداوە من قوتابییەکی ئاسایی نەبووم کە تەنیا خەریکی دەوام و کۆشش کردنی وانەکان بم، بەڵکو کاتەکانم دابەش بووبوون بەسەر: خوێندن و کارکردن لە وەزارەت و سەرەڕای ئەوەش چالاکییەکی زۆری سیاسیی.

پەیامم بۆ نەوەی نوێ ئەوەیە پێیان ئەڵێم با چاو لە هەوڵ و هیلاکیی ئەو ساڵانەی من بکەن. بەیانیان سەعات شەش لە خەو هەڵئەستام بە پاسێك و هەندێ جار بە دوو ئیستگەی پاس ئەچوومە سەر کار و ئەبوو پێش سەعات هەشتی بەیانی

بگەمە دەوامی وەزارەتی ئیرشاد کە وەك فەرمانبەر کارم لێ ئەکرد. هەتا سەعات دووی پاشنیوەڕۆ دەوامم ئەکرد. ئەبوو پێش سەعات چواری پاشنیوەڕۆ و پێش لێدانی زەنگی یەکەم بگەمە کۆلێج و لەفەیەکی خێراشم لە یانەی کۆلێج خواردبێت.

سەعات ٧ی ئێوارە دەوامی کۆلێج تەواو ئەبوو، ئینجا بەرەو بینین و کۆبوونەوەی حیزب ئەچووم. شەو درەنگیش ئەگەڕامەوە بۆ ژوورەکەم یا هەندێ کات ئەو خانووەی لەگەڵ چەند برادەرێکدا بەکرێمان ئەگرت و لانی کەم شەوانە ١-٢ سەعات کۆششمان ئەکرد. خۆم جلەکانی خۆمم ئەشت و ئوتووم ئەکردن. مانگی جارێکیش بەرگە لێفەکەم کە لە هەموو کارێك ناخۆشتر بوو لەلام لە لێفەکە ئەکردەوە و ئەمشت و دواتر لە لێفەکەم ئەگرتەوە. هەمووشیم ئەکرد و هەموو ساڵەکانیش دەرئەچووم و ناوبەناویش لەسەر چالاکیی سیاسی، شەڕ و گرتنیشم تووش ئەبوو.

ئەو ساڵانە تا کودەتای ٨ی شوباتی ١٩٦٣ کە لە پۆلی چوارەمی کۆلیج بووم، ساڵانێکی پڕ لە هەڵبەز و دابەزی فیکری بوو لەناو حیزبی شیوعی و هەموو جوڵانەوەی سیاسی عێراق و کوردستاندا.

حکومەتی عەبدولکەریم قاسم ڕێبازێکی شلۆقی بەرامبەر بە حیزبە سیاسییەکانی عێراق هەبوو. لەگەڵ هەموو ئەو دەستکەوتانەی گەلی عێراقدا کە شۆڕشی ١٤ی تەموزی ١٩٥٨ بەدەستی هێنابوو، تاکڕەوی و ڕێبازی دیکتاتۆری ئاڵۆزییەکی گەورەی لە ژیانی سیاسی عێراقدا دروستکردبوو.

هەڵبژاردنی ڕێکخراوەکان و جوتیاران و نەقابەکانی کرێکاران و مامۆستایان و قوتابیان بووبووە زۆرانبازییەکی حیزبەکانی عێراق و پێکدادانێکی زۆر رووی ئەدا حکومەتیش بە زۆری لایەنی بەرەی بەعس و نەتەوەییەکانی عەرەبی ئەگرت. دوابەدوای هەوڵی تیرۆرکردن و بریندارکردنی عەبدولکەریم قاسم لە ناوچەی (رەئس ئەلقەریە) لە ٧ی تشرینی یەکەمی ١٩٥٩ لەلایەن حیزبی بەعسەوە کە سەدام حسێن یەکێك بوو لە هێرشبەرەکان، وەرچەرخانێکی گەورە لە سیاسەتی عەبدولکەریم قاسمدا روویدا، سیاسەتەکە هەتا کودەتای ١٩٦٣ درێژەی کێشا.

لە مانگی کانوونی دووەم، مانگرتنی قوتابیانی زانکۆی بەغدا بە سەرکردایەتیی بەعسییەکان و بەشداریی نەتەوەییە عەرەبەکان و ئیخوان موسلمین دەستی پێکرد. ئەو مانگرتنە سەرەتایەك بوو بۆ شڵەقانی باری سیاسی نەك تەنیا لە زانکۆ بەڵکو لە سەرانسەری بەغدا و بەشێك بوو لە پلانی بەعسییەکان بۆ کودەتای ١٤ی رەمەزان (٨ی شوباتی ١٩٦٣).

هەر لەگەڵ گۆڕانی رێڕەوی عەبدولکەریم قاسم بەرەو تەسککردنەوەی پەیوەندیی خۆی بە حیزبی شیوعیی عێراقەوە، سیاسەتی توند بەرامبەر حیزبی شیوعی پەیڕەو کرا و بە گواستنەوە و دەرکردنی شیوعی و دیموکراتخوازانی نزیکیان لە سوپا و تێکڕای ناوەندە گرنگەکانی حکومەت دەستی پێ کرد وەك وەزارەتی بەرگری و ناوخۆ و ئیرشاد، هەروەها بە داخستنی رۆژنامە و رێگریکردن لە زوربەی چالاکییە جەماوەرییەکانیان. ئەمەش وایکرد دامودەزگا حکومییەکان پڕ ببن لە دەسەڵاتداران و هەوادارانی بەعسی و نەتەوەیی و کۆنەپەرستان.

## سەرەتای کودەتای شوبات

کاتێك مانگرتنی بەرەی بەعس و نەتەوەییەکان لە زانکۆی بەغدا لە کانوونی دووەمی ١٩٦٣دا دەستیپێکرد، دامودەزگاکانی حکومەت لەجیاتی دژایەتیکردن و گرتنەبەری هەڵوێستی یاسایی بەرامبەریان، ئەیانپاراستن و هانیان ئەدان بۆ بەردەوامبوون. هەر بۆ مێژووش قوتابییە کوردەکانی سەر بە پارتی دیموکراتی کوردستانیش لە کۆلێجەکانی زانکۆی بەغدا دەوامیان نەکرد و لەگەڵ مانگرتنەکەدا بوون.

سەر لە بەیانی ٨ی شوبات، کودەتاچییەکان دەستیان کرد بە بۆردومانی وەزارەتی بەرگری. هەرچەندە هەزاران کەس لە گەڕەکە جیاجیاکانی بەغدا خۆپیشاندانی گەورەیان کرد و داوایانکرد عەبدولکەریم قاسم چەکیان بداتێ هەتا بتوانن بەرگری لە خۆی و حکومەتەکەی بکەن، بەڵام چەکی پێ نەدان و خۆی و هاورێ نزیکەکانی لە وەزارەتی بەرگریدا ماوەیەك بەرگرییان لە خۆیان کرد. دواجار دەستگیرکران و بۆ ئێستگەی رادیۆی بەغدا بران و لەوێ زۆر نامەردانە بەبێ هیچ گوێدانە یاسا و دابونەریتی سیاسی و کۆمەڵایەتی و بێ هیچ داد و دادگاییەك لەگەڵ فازیل مەهداوی و تەها شێخ ئەحمەد و وەسفی تاهیر بەدەم هوتافی مەردانەیانەوە بە (هەر بژی گەلی عێراق) و (بژی حیزبی شیوعی عێراق) شەهید کران.

بە رووخانی حکومەتی عەبدولکەریم قاسم و سەرکەوتنی کودەتای رەشی ٨ی شوبات (١٤ی رەمەزان)ی ١٩٦٣ قۆناغێکی تازە لە عێراقدا هاتە کایەوە کە سیما سەرەکییەکانی پاشگەزبوونەوە لە زوربەی کارە گەورە نیشتمانی و نەتەوەییەکانی حکومەتی ١٤ی تەموز بوو. راگەیەنراوی ژمارە ١٣ی کودەتاچییەکان بۆ (لەناوبردنی شیوعییەکان) درندەیی و دژایەتیی نامرۆڤانەی بەعسییەکانی خستە روو، کە لەو کاتەدا هەزارەها شیوعی و دیموکرات و نیشتمانپەروەرانیان خلتانی خوێن کرد. هەزارەها کەسیان خستە زیندانەوە و سەدانیان لەژێر لێدان و ئەشکەنجەدا لە (قەسرولنیهایە) کوشت و جۆری تازەی ئەشکەنجەیان داهێنا هەر لە برینەوەی دەست و قاچ بە مشار و چاوهەڵکۆڵینەوە هەتا فرێدانی تێکۆشەران بە زیندوویی بۆ ناو حەوزی تێزاب.

پارتی دیموکراتی کوردستان کە لە پێش روودانی کودەتاکەوە لەگەڵ بەعسدا لە گفتوگۆدا بوون، لەو رۆژە رەشەدا کەوتنە پشتگیرییکردنیان و خۆیان خستە هەڵەیەکی مێژووییەوە. پشتگیرییەکە بە بروسکەی سالْح یوسفی کە ئەندامی مەکتەبی سیاسیی پارتی دیموکراتی کوردستان بوو ئاشکرا کرا کە ئەڵێت:

**لقد تلاحمت الثورتان**[١]..

ئەو هەڵوێستەی پارتی دیموکراتی کوردستان بە یەکێك لە هەڵوێستە هەرە خراپەکانی پارتی ئەژمێردرێت کە بوونە هاوکاری بەعسییەکان لە رووخاندنی حوکمی نیشتمانیی عەبدولکەریم قاسم و بەشدارییکردنیان لە حکومەتی بەعسدا.

بەڵام ئەم دۆستایەتییە چونکە لەسەر بناغەیەکی پتەو دروست نەبووبوو، دەرەنجامی بەباشی تێنەگیشتنی پارتی بوو لە بەعس و بەرەی بەعس، بۆیە بەعسییەکان بە گورجی رووی راستی خۆیان دەرخست و پاش ماوەیەکی کەم دەستیان کرد بە هێرشکردنە سەر ئەندام و لایەنگرانی پارتی لە بەغدا و ئەو پەیوەندییە بە هەڵگیرساندنەوەی شەڕ کۆتایی هات و لە ٩ی حوزەیرانی ١٩٦٣دا هێرشی فراوانی سوپا و حەرەس قەومی بست بە بستی کوردستانی گرتەوە.

لەناو شارەکانیشدا خەڵکێکی زۆر بە دەستی چەپەڵی دوژمنانی گەلەکەمان گیانیان لەدەستدا و بۆ ترساندنی کورد بە گشتی و شیوعی و پارتی بەتایبەتی،

---

[١] لە بەرەبەیانی رۆژی ٨ی شوبات کودەتاکە روویدا و رژێمی عەبدولکەریم قاسم لەکار خرا، لەهەمان ئێوارەدا سالْح یوسفی بە هاوڕێیەتی فوئاد عارف و ئەندازیار شەوکەت عەقراوی چوونە بارەگای ئیستگەی رادیۆی عێراق کە لەهەمان کاتدا بارەگای ئەنجومەنی نیشتمانیی سەرکردایەتیی کودەتاکە بوو، بروسکەیەکیان رادەست کرد کە لەلایەن پارتی دیموکراتی کوردستانەوە رەوانە کرابوو وە ئەڵێت: "لقد تلاحمت الثورتان، الثورة الكردية والثورة القومية العربية .. وقد تهاوت قوى الظلام والشعبوية تحت ضربات الثورة" و سالْح یوسفی پێی راگەیاندن کە مەلا مستەفا بارزانی فەرمانی کردووە بە وەستاندنی هەموو کردەوە سەربازییەکان دژی سوپای عێراق لە هەموو بەرەکانی شەڕ لە کوردستانی عێراقدا.

پۆلێك تێكۆشەری ناوداری كەركوكیان لە بەندیخانەكانی بەغداوە گەڕاندەوە كەركوك و لەوێ لە قەنارەیان دان. ئەم كارە لە لایەك بۆ تۆقاندنی ئەو دوو لایەنە بوو، لەلایەكی ترەوە بۆ رازیكردنی كۆنەپەرست و توندڕەوەكانی كەركوك بوو كە لەگەڵ بەرەی بەعس و نەتەوەییە عەرەبە شۆڤێنییەكاندا بۆ تەعریبكردنی كەركوك هاوكار و پیلانگێڕ بوون. پۆلێك لەو شەهیدانە رۆڵە قارەمانەكانی كەركوك، شێخ مارف بەرزنجی و شێخ حسێن بەرزنجی و جەبار پیرۆز خان و فاتیح مەلا داود جەباری بوون كە لە رۆژی ١٩٦٣/٦/٢٣ لە سێدارە دران.

شاڵاوە درندەكانی سوپای عێراق و هاوكارەكانیان لە سوپای بەعسی سوریاشەوە، زۆر ئازایانە لەلایەن پێشمەرگە قارەمانەكانی كوردستانەوە بەرهەڵستی كرا و سەدان داستانی نەبەزییان بەرامبەر دوژمنانی گەل تۆمار كرد.

## پارتی دیموكراتی كوردستان و كودەتاچییەكانی ٨ی شوباتی ١٩٦٣

كاك مەسعود بارزانی لە بەشی یەكەمی بەرگی سێیەم لە كتێبی (بارزانی و بزووتنەوەی رزگاریخوازی كورد — شۆڕشی ئەیلول) لە لاپەڕیە ١٠٣ دا ئەڵێت:

"پێش دەستكردن بە كۆدێتاكە بە ٤ رۆژ، ساڵح یوسفی نێردرا بۆ ئەوەی لەگەڵ عەلی ساڵح سەعدی رازگری گشتیی سەركردایەتیی قوتریی بەغدا كۆببێتەوە. لەو كۆبوونەوەیەدا سەعدی بۆ نوێنەری ئێمەی دووپات كردەوە كەوا هەر لەگەڵ سەركەوتنی كودێتاكەدا جاڕی ئۆتۆنۆمی بۆ گەلی كورد دەدرێت.

لە رۆژی یەكەمی كۆدێتاكەدا گۆتیاری رادیۆی بەغدا داوای لە عەمید فوئاد عارف و ساڵح یوسفی كرد بەپەلە بڕۆن بۆ ئێستگەی رادیۆ بۆ دابینكردنی پەیوەندییكردن لەنێوان سەركردایەتی پارتی و بەغدا، بەڵام ئەو راگەیاندنە درێژە ژمارە (١) ەكەی بەناو ئەنجومەنی سەركردایەتیی شۆڕش كە دەرچوو هیچ باسێكی مافەكانی گەلی كوردی نە لە نیزیك و نە لە دوورەوە تێدا نەبوو."

لە راستیدا وەك لە زۆر سەرچاوەدا باس لە هەڵوێستی پارتی كراوە بەرامبەر

کودەتای ٨ی شوبات و هەوڵدان بۆ هاوکارییکردنێك کـە شۆڕشـی کـورد بگەیـەنێت بە هەندێك ئامانجیان لێکدانەوەیەکی سەرپێیی بـێ بنـەما بـووە لـە تێگەیشـتن لـە حیزبی بەعس، هەر بۆیە ئەو بروسـکەیەی سـاڵح یوسـفی لـە یەکـەم رۆژی کودەتـا خوێناوییەکەدا دای بە حکومەتی نوێی بەعس و بـەناوی (لقـد تلاحمـت الثورتـان..) ناسرا، بووە مایـەی نـاڕەزایی هاووڵاتیـان لـە عێراقـدا کـە تیایـدا خۆشـباوەڕییەکی یەکجار پەلە بە دوژمنێکی سەرسەخت ئەکەن. من چـەند جـار لـەم سـاڵانەی پـێش نەخۆشییەکەی ئێستای مام جەلال خۆم لە مام جـەلالم بیسـتووە کـە ئـەڵێت ئێمـە عەبدولکەریم قاسممان رووخاند بەڵام حسابی وردی بەدیلەکەیمان نـەکردبوو، ئـەوە بوو بەعس هاتە سەر حوکم.

## چاوخشاندنەوەیەك

لە ئێستادا کارێکی یەکجار پێویستە چاو بە باری حیزبـی شـیوعی و سیاسـەتی بەرامبەر حکومەتی قاسمدا بخشێنرێتەوە.

حیزبی شیوعیی عێراق یەکێك بوو لە حیزبە ناودارەکانی ئەوسای جیهان و پێش شۆڕشی ١٤ی تەموزی ١٩٥٨ رۆڵێکـی گـەورەی هـەبوو لـە جوڵانـەوەی نیشـتمانیی عێراقدا. لە ساڵی ١٩٣٤دا هاوڕێ یوسف سـەلمان (فەهـد) دامەزرێنـەر و سـکرتێری بـوو. لەسـەر بنـەڕەتێکی چـینایەتی و بـە تێگەیشـتن لـە بـاری سیاسـی عێـراق و مەسەلەی کوردەوە دامەزرابوو کە یەکێك لە دروشمەکانی بریتی بوو لە (قووا تنظيم الحركة الوطنية قووا تنظيم حزبكم) واتە: رێکخسـتنی جوڵانـەوەی نیشـتمانی بـەهێز بکەن، جوڵانەوەی حیزبەکەتان بەهێز بکەن. لە بەرنامەی حیزبدا مافی گـەلی کـورد بە روونی و ئاشکرا دیاریکرابوو، ئەوەبوو لە رۆژنامـەی (كفـاح الشـعب)ی زمانحـاڵی حیزبدا دان بەوەدا نرابوو کە کورد مافی جیابوونەوەی لە عێراق هەیە.

ئەو باوەڕە پتەوەی فەهد و حازم و صارم هەیان بوو بە شـیوعێتی وەك رۆژی روونـاك بەشێوەیەك هاتە پێش چاو کە هەرگیز لەوەوپێش لەوجۆرە قارەمانێتییە نەبینرابوو.

پێشتر فەهد و زەکی بەسیم (حازم) و حسێن شبیبی (صارم) حوکمی زینـدانیان بەسەردا درابوو. لەگەڵ پەرەسەندن و پێشکەوتنی توانا و فراوانبـوونی جـەماوەری حیزب لە عێراق، حکومەتی (نوری سەعید) جارێکی دیکـە بەشـێوەیەکی نایاسـایی دادگایی کردنەوە و سزای مردنیان بەسـەردا سـەپێنرا و لـە بەرەبـەیانی ڕۆژی ١٤ی شوباتی ١٩٤٩ بەدەم هوتافی شێرانەیانەوە ملیان کرا بە پەتی سێدارەدا:

فەهد هاواری کرد: شیوعێتی لە مردن بەهێزترە و لە داری قەنارەش بەرزترە.

زەکی بەسیم (حازم) هاواری کرد: بە شـیوعێتی ژیـام، بـە شـیوعێتییش مـردم، ئەگەر بۆم ڕێك بکەوێت جارێکی دیکە زیندوو ببمەوە هەر شیوعی ئەبم.

حسێن شبیبی (صارم) گوتی: مایەی شانازییمە لە شوێنێکدا لە سێدارە ئـەدرێم کە خەڵك خۆپیشاندانی تێدا کردووە دژی ڕژێمی کۆنەپەرستی.

خنکاندنی ئـەو سـێ سـەرکردەیە بـەو قارەمانێتییـە بـێ وێنەیـە تـین و گـوڕمی زیاتری بەخشی بە شـیوعییەکان و نیشـتمانپەروەران و خواسـت و هـەوڵی گـۆڕینی فــەرمانڕەوایی پاشـایەتی سـەر بـە ئیمپریـالیزم و بـەرەی دیموکراسـیخوازیی و نیشتمانپەروەری، چەندین ئەوەندەی پێش ئەو تاوانەی بەرامبـەر فەهـد و هـەردوو ئەندامی مەکتەبی سیاسییەکەی حیزبی شیوعی کرا، گەورەتر و پتەوتر بوو.

مــن لێــرەدا ئەمــەوێت بڵــێم حیزبــی شــیوعی بــەو جــۆرە دامــەزرا و بەرهەڵستیکەری سەرەکی بوو دژ بە حکومەتە یـەك لـەدوای یەکـەکانی عێراقـی پاشایەتی و توانیبووی سـەرکردایەتیی ڕاپەڕینـەکانی بەغـدا و عێـراق بکـات لـە ١٩٤٨ و ١٩٥٢دا و لایەنی سەرەکی بـوو لـە دامەزرانـدنی (بـەرەی نیشـتمانی)ی عێراقــدا و هاوکـات لــە هاوپــەیمانێتیی حیزبــی شــیوعی و پــارتی دیمــوکراتی کوردستاندا نزیکترین حیزب بـوو لـە کۆمەڵـەی ئەفسـەرە ئازادەکـانی عێـراق بـە سـەرۆکایەتیی زەعـیم عەبدولکـەریم قاسـم لـە پـێش شـۆڕش و هــەر ئـەم حیزبـە وادەی دەستپێکردنی شۆڕشی ١٤ی تەموزی ئـەزانی و لایـەنگری هـەرە گـەورەی شۆڕشەکە بوو لە عێراقدا.

ئەوە بوو دوای سەرکەوتنی کودەتاکەی ٨ی شوبات هەرچی بۆنێکی شیوعی لێبهاتایە یان دۆستیان بووایە تووشی گرتن و زیندان کرا. لە عێراقدا دەیان هەزار کەس خرانە زیندانەکانەوە.

لە چەند شوێنێکی بەغدا و بەتایبەتی لە گەڕەکی کازمییە و بابولشێخ بەرگرییەکی زۆر لە شۆڕشی ١٤ی تەموز کرا و بەرگرییەکە تا دوو رۆژ بەردەوام بوو. سوپا بە هەڵەیەکی گەورە هێزی زۆر لەناو وەزارەتی بەرگریدا لە دەوری عەبدولکەریم قاسم کۆکردەوە. جگە لەمانە، بەلای منەوە گرنگترین بەرگرییکردن لە شۆڕشەکە ئەوەی سەربازگەی سەعد بوو لە بەعقوبە کە مولازم ئەوەل سەلاح محەمەد جەمیل سەرکردایەتی کرد. سەلاح یەکێك بوو لە هاوڕێ خۆشەویست و نزیکەکانم.

## یادی هاوڕێی قارەمان شەهید سەلاح محەمەد جەمیل

وێنەیەکی بەرز لە قوربانیدان:

کاتێك کودەتای ٨ی شوباتی ١٩٦٣ لە بەغدا روویدا و یەکەم بەیاننامەیان لە ئێستگەی بەغداوە بڵاوکردەوە، سەلاح محەمەد جەمیل بە رووتبەی مولازم ئەوەل ئەفسەر بوو لە مەعەسکەر سەعد لە بەعقوبە کە نزیکترین شار بوو لە بەغداوە.

سەلاح کە خاوەنی بیروباوەڕی پتەوی خۆی بوو و ئەندام بوو لە حیزبی شیوعیی عێراقدا بەبێ راوەستان و دوودڵی لەگەڵ هاوڕێکانیدا دەستیان گرت بەسەر سەربازگەکەیاندا کە یەکێك بوو لە مەڵبەندە سوپاییە گرنگەکانی سوپای عێراق و لە بەیەکدادانێکدا لەگەڵ بەعسییەکانی ناو سەربازگەی سەعد سێ ئەفسەری گەورەی سەر بە کودەتاچییەکان کوژران، سەلاح و مولازم محەمەد باباجان بە تەواوەتی بەسەر لایەنگرانی ٨ی شوباتدا سەرکەوتن.

لێرەدا نامەوێت بکەومە لێکۆڵینەوە لە هۆکار و ئەنجامەکان، تەنها یادکردنەوەی ئەم پاڵەوانەم مەبەستە وەك وەفادارییەك بۆ خۆبەختکەران لە پێناو نیشتیمان و گەلەکەیاندا.



فاروق مەلا مستەفا، شەهید سەلاح محەمەد جەمیل، ١٩٦٢

پاش سەرکەوتنی کودەتا و دوای ئەوە سەرکردەکانی شۆڕشی ١٤ی تەموز کە عەبدولکەریم قاسم و فازیل مەهداوی و تەها شێخ ئەحمەد بوون بەبێ دادگاییکردن شەهید کران، سەلاح و چەند هاوڕێیەکی لە ناوچەی بوهرزی دیالە دەستگیرکران و برانە بەغدا.

چەند ئەفسەرێك کە لە شوێنانی دیکەدا زیندانی کرابوون بۆیان گێڕامەوە کە سەلاح وەك شێر نەڕەی ئەهات بەرامبەر ئەو جەلادانەی ئەشکەنجەیان ئەدان.

بۆ چاوشکاندنی خەڵك نیوە ئاشکرا سەلاح و هاوڕێکانیان دایە دادگایەکی سوپا و وێنەکەیان لەناو قەفەسی دادگادا لە رۆژنامەکاندا بڵاو کردەوە کە دەست و پێیان کۆت و زنجیر کرابوو بەڵام لە وێنەکەدا دیاربوو سەلاحی جوانەمەرگ بەو جوانییەی خۆیەوە سەربەرز و دەم بەپێکەنین وەك پاڵەوانێکی مەردی نەترس لە ئەشکەنجە و لە مردن ئەدرەوشایەوە. وەڵامی سەرۆکی دادگای دابووەوە کە: من کوردم و رۆڵەی گەلەکەمم و ئەندامی حیزبی شیوعیم و ئێوە سەرشۆڕ و ناپاکن بەرامبەر گەلی عێراق. ئەمە بەرامبەر قسەی ئەو جەلادە کە گوتبووی (تۆ "هەجین"یت) مەبەستی لەوە بووە باوك و دایکی یەکێکیان کوردە و ئەویدیکە عەرەبە.

هەر کە حوکمی خنکاندنیان درا کە ماوەی پانزە دەقیقەی پێچوو، سەلاح رووی کردە محەمەد باباجان و پێی گوت: تۆ پاڵێوراویت بۆ ئەندامێتی حیزب بە بۆنەی ئەم فەرمانەی حوکمی دیکتاتۆرەکانەوە شەرەفی ئەندامێتیت ئەدەمێ.

هەزار سڵاو لە گیانی پاکت سەلاح گیان. هاوڕێی منالّی و هەتا شەهیدبوونت.

سڵاو لە گیانی پاکی هەردوو خوالێخۆشبوو فەرەیدون عارف نەجیب و بەهزاد جەمیل سائیب کە دوو ئەفسەری فڕۆکەوانی ناسراوی سوپای عێراق بوون و هەردووکیان بەشێکی ئەم مەرگەساتەیان بۆ گێڕاومەتەوە لە کاتی خۆیدا و هەردووکیان لە هاوڕێ خۆشەویست و نزیکەکانی من بوون لە ژیانیاندا و ئەوانیش چەند ساڵێك حوکم دران و لە بەندیخانەکانی عێراقدا زۆر مەردانە بەشێکی زۆر لە گەنجێتییان بەسەر برد.

## گەڕانەوەم بۆ کوردستان

دوو رۆژ دوای کودەتاکە، واتە لە ١٩٦٣/٢/١٠دا، ژمارەیەك لەو قوتابیانە و هەندێ فەرمانبەریش کە دەستگیر نەکرابووین لە بەغدا بەرەو شارەکانی کوردستان گەڕاینەوە. من لە دوا قۆناغی زانکۆ لە کۆلێجی بازرگانی و ئابوری بووم و یەکێك بووم لەو کەسانەی هەر ئەو یەکەم رۆژەی لە سلێمانی پەیوەندییم بە حیزبەوە کرد هیوام وابوو لە سوپاوە بزووتنەوەیەکی گەورە رووبدات بۆ رووخاندنی حکومەتی بەعس، بەڵام چاوەڕوانی درێژەی کێشا.

لە قوتابیانی زانکۆ، هاوڕێیان حسێن عارف، لەتیف شێخ تەها، حەمە سدیق مەحمود، فوئاد شمقار، کەمال کەریم و تەها خەلیل گەڕاینەوە سلێمانی و پاش ماوەیەکیش هاوڕێ عەلی مەحمود گەڕایەوە کە لە حیزبدا لە هەموومان پێشکەوتووتر بوو. دوای گەڕانەوەمان بۆ سلێمانی، سەرەتا من خرامە لیژنەی قوتابیانی سلێمانییەوە. ئەوەندەی پێ نەچوو هاوڕێ شێخ قادری شێخ رەزای قادر کەرەمی کە لێپرسراوم بوو گەیاندمییە هاوڕێ سەبری یوسف.

**ئای ژیان و تێکۆشان و یادی سەبری یوسف!**

هاوڕێ سەبری مامۆستایەکی قوتابخانەی سەرەتایی بوو، و ئەندامی لیژنەی محەلیی سلێمانی بوو. هاوڕێ سەبری مەسیحییەکی موسڵ بوو، کەم کەس لە سلێمانی وەك شیوعی ئەیانناسی. هەر کە بینیم هەستم بەوە کرد کە پیاوێکی ئازا و چاونەترس و خاوەن هەڵوێستی مەردانەی شیوعییە.

کاتێك بینیم، پێی گوتم: "هاوڕێ تۆمان هەڵبژاردووە بۆ لیژنەیەکی تایبەتی دەرەوەی ڕێکخستنی شار، بەڵام پەیوەندییت بە شاریشەوە ئەبێت." ئەمەم بەلاوە چاوەڕوانکراو بوو، چونکە ئەو کاتەی هاوڕێ شێخ قادر پێی گوتم هاوڕێیەکی سەروو من ئەتبینێت، زانیم کارێکی نوێم پێ ئەسپێردرێت.

هاوڕێ سەبری گوتی "ئێمە لەم ڕۆژە سەختانەدا ئەژین، حکومەتی عێراق سیاسەتی لەناوبردنمانی گرتووەتە بەر و بە کردەوەش زۆر بە توندی ئەو کارە جێبەجێ ئەکات، لە کوردستانیشدا لایەنێکی پارتی دیموکراتی کوردستانیش لەباتی هاوکاری و هەرەوەز لەگەڵماندا توندوتیژییمان بەرامبەر ئەنوێنن و هەڕەشەی لێدان و داپڵۆسینمان لێئەکەن." بەداخەوە ئەو قسانەی هاوڕێ سەبری هەموو ڕاست بوون.

برادەرانی ئێمە ئەوەی لەناو شارەکاندا ناسرابوون بەرەو لادێ و شاخ کۆچیان کرد و لە چەند شوێنێکدا بارەگایان دانا. یەکێك لەو شوێنانە گوندی کەڵکەسماق بوو کە شوێنی کاکە حەمەی مام ڕەزای حەقە، جێنشینی مامە ڕەزای سەرۆکی حەقە بوو. کاکە حەمە خزمەتی زۆری ئەو سەدان راکردووەی کرد کە لە کەڵکەسماق نیشتەجێ بووبوون و خۆیان ئامادە ئەکرد بۆ دامەزراندنی هێزێکی پێشمەرگە بەمەبەستی بەرەنگاربوونەوەی هێزەکانی حکومەتی بەعس. بارەگاکانی دیکەی حیزب لە گوندەکانی ئاوەگرد و داربەسەر بوون.

ئەو هەڵوێستەی مامەڕەزاییەکان هەیانبوو یاخود بەرامبەر بە شیوعییە هەڵاتووەکانی شارەکانی کوردستان و عێراق گرتیانەبەر لەیاد ناچنەوە و پیاوەتی و جوامێرییان ئەبێت بەرز و بەنرخ رابگیرێت. چۆن وەها نابن لەکاتێکدا ئەزانن مامە

ڕەزای سەرۆکی حەقە پەندێکی گەورەی بەجێهێشتووە و گوتوویەتی: "ئەگەر لە دنیادا دوانزە شیوعی بمێنێتەوە و لەو دوانزەیەش یانزەیان بکوژرێن ئەو تاکە کەسە کە ماوەتەوە شیوعێتیی زیندوو ئەکاتەوە!" ئەوە چ باوەڕێکی پتەو و جوانە لای ئەو کەڵەپیاوە.

مەلا مستەفا بارزانی هەڵوێستی تایبەتی خۆی بەرامبەر برادەرانی ئێمە هەبوو، بە هەموو شێوەیەك سیاسەتی پاراستن و داڵدەدان و هاوکارییانی گرتە بەر. ئەمانە بوون بە سەرەتای دامەزراندنی هێزی پێشمەرگەی حیزبی شیوعی لە کوردستاندا.

من تا ئەو کاتە لەناو شار مابوومەوە و لە دوو جۆر ڕێکخستندا کارم ئەکرد: یەکێکیان لیژنەی شاری سلێمانیی حیزب بوو کە لە من و عوسمانی کەریم چاوشین و عارف مارفی دارتاش پێکهاتبوو، و ماوەیەکی زۆر خدر شەوکەتی ئەندامی لیژنەی محەلیی سلێمانی لێپرسراومان بوو. دووەمیشیان لیژنەی بەرگری میللی بوو کە هاوڕێ سەبری یوسف بەڕێوەبەری بوو و من بەشێکی زۆری ئەو ڕێکخستنەم لەلا بوو. لە ڕێکخستنی ناوشاردا من لێپرسراوی جیهان سدیق شاوەیس و تەها خەلیل بووم کە زۆر برادەر بوون و زۆر کات بەهۆی حەمە سدیقەوە لە ماڵی خوالێخۆشبوو کاکە ڕەشەی موختار خۆیان ئەشاردەوە.

کاکە ڕەشە پیاوێکی چاك و قسە خۆش بوو، چاکەی بەسەر کەسانێکدا هەبوو کە فەرمانی گرتنیان بۆ دەرئەچوو. زۆرجار پێش پشکنینی ماڵان بۆ دەستگیرکردنی داواکراوان جوابی بۆ ئەناردن. شانبەشانی ئەو هەموو چیرۆك و بەسەرهاتانەی ئەیگێڕانەوە و زوربەیانی بۆ خۆشی و پێکەنین دروست کردبوو، ئەبێت ئەو پیاوەمان لەیاد بێت و قسەکانیمان بیر نەچێت.

دوای ئەوەی هاوڕێ جیهان و هاوڕێ تەها نێردرانە دەرەوە، لە بنکەی کەڵکەسماق جێگیر بوون. ئەو کاتە هەردووکیان گەنج و دڵتەڕ بوون و سیاسەت لێی تێکدابوون خەیاڵێکیان لای حیزب و چەند قاتی ئەوەشیان لای دەستگیرانەکانیان بوو. ڕۆژێك دوو نامەیان بە تەتەرێکی حیزبدا ناردبوو بۆ ناوشار هەریەکە بۆ دەستگیرانەکەی خۆی، بەڵام ئەم نامە ناردنە گرفتێکی گەورەی لێ کەوتەوە. تومەز تەها بە جیهانی گوتووە

هاوڕێ تۆ قەڵەمت لە من بەهێزترە نامەیەکی جوانم بۆ بنووسە بۆ خۆشەویستەکەم بەو خەت و ئیملا و ئینشا جوانەی خۆت، کاك جیهانیش بە گوێی کردبوو و بەدڵی خۆی نامەیەکی بۆ دەستگیرانەکەی خۆی و یەکێکی تری بۆ ئەوەی تەها نووسیبوو، ئیتر تێنەگەیشتم تەتەرەکەی حیزب بە ئەنقەست نامەکانی گۆڕیبوو هی تەهای دابوو بە خۆشەویستەکەی جیهان و هی ئەویشی دابوو بەوەی تەها، یان هەر بەڕاستی لێی تێکچووبوو. ئیشەکە ئاڵۆسکا: بەپەلە هەردووکیان هاتنەوە ناو شار و لە ماڵی کاکە رەشەی موختارەوە ناردیان بەشوێن مندا. خۆشەویستەکەی جیهان کردبووی بە هەڵلا و زویر بوونێکی توند، ئەبینێت خەت و قسە هی جیهانە بەڵام بۆ کچێکی تر نووسراوە !

جیهانی رەحمەتی کە لاوێکی زۆر خوێندەوار و ئازا بوو بەسەر تەها خەلیلدا ئەینەڕاند: "هەی ... ... تۆ ژیانت لە من تێکدا.. کە نازانیت نامەیەك بنووسیت بۆ دڵداری ئەکەیت؟" بە منیشی ئەگوت: "بۆیە هاتوومەتەوە ناو شار تۆ لێپرسراوی هەردووکمانیت ئەبێت تەها لە حیزب دەربکرێت.. ئەمە خیانەتە لە من و لە حیزبدوویەتی." یادیان بەخێر هەردووکیان تێکۆشەر و دڵپاك بوون بە هەزار پاڕانەوەی تەها و تکای من دواجار هاوڕێ جیهان لێی خۆش بوو و ملی ڕێگایان رووەو بنکەکەی خۆیان گرتەوە بەر. داخی گرانم هیچیان نەبوون بە خاوەنی ئەو دەستگیرانانەیان! هەزار سڵاو لە گیانی پاکی هەردووکیان.

ئەو چەند مانگە لە سلێمانی بە خۆشاردنەوە و کاری حیزبەوە خەریك بووم، بیر و هۆشم لە بەغدا و لای ئەوە بوو بزانم لە هاوڕێکانی زانکۆم کێ دەستگیر کراوە و کێ کوژراوە و کێ هەڵهاتووە.

لە هاوینی ئەو ساڵە، خۆم داوام لە لقی کوردستانی حیزب کرد کە بچمەوە بۆ بەغدا، ئەوانیش پێیان خۆش بوو، ناونیشانێکیان دامێ کە بەڵکو بتوانن سەرکردایەتیی لقی کوردستان و مەرکەزی حیزب لە بەغدا بە یەك بگەیەننەوە. لەراستیدا ژمارەیەك لە ئەندامانی مەکتەبی سیاسیی حیزب و لیژنەی مەرکەزی و لەسەروو هەموویانەوە هاوڕێ عەزیز محەمەد لە کوردستان بوون.

## ڕووداوە ناخۆشەکان

## نێوان پارتی و شیوعی / تاوانی کانی ماسی

لە شوێنی تردا ئاماژەم بۆ توندوتیژیی هەندێ لایەنی مەکتەبی سیاسیی پارتی کرد دژ بە حیزبی شیوعی، بیانووەکەشیان ئەوە بوو کە گوایە ئەمان نەتەوەیین و دژی بیروبۆچوونی شیوعین. لە ساڵی ١٩٦٣ و لەو کاتەدا کە حکومەتی بەعس کەوتە کوشتن و بڕینی دڕندانەی شیوعی و لایەنگرەکانیان، ئەم لایەنەی پارتی کەوتنە سیاسەتی ڕاونان و تۆقاندنێکی بەربڵاو و تەنگ پێهەڵچنینێکی زۆر تا گەیشتە ئەوەی بەبێ ڕوودانی هیچ ڕووداو یاخود پێکدادانێك ئەندامێکی حیزبی شیوعییان لە سلێمانی تیرۆر کرد.

هاوڕێ عوسمان سەیوانی کە خۆم لە نزیکەوە دۆستایەتیم لەگەڵیدا هەبوو، یەکێك بوو لە برادەرە چالاکەکانمان. ناوبراو بێ ئەوەی هیچ کردەوەیەکی بەرامبەر هیچ لایەنێك جێبەجێ کردبێت بووە قوربانی ئەو سیاسەتە توندەی بەرامبەر شیوعییەکان پیادە ئەکرا. لەمە زیاتر ڕووداوی دڵتەزێنی گەورە ڕووداوی کانی ماسی بوو کە پارتی دیموکراتی کوردستان ئیدانەیان کرد و دایان بەسەر کاژیك دا، بەڵام هیچ کاردانەوەیەکی حیزبی یا دادگاییەکیان بەرامبەر ئەو تاوانە گەورەیە نەکرد. ئەمە لەکاتێکدا بوو کە هەموو تاوانبارەکان یەك بەیەکیان ناسراو بوون و بە ئاشکرا خۆیان بەو تاوانەوە هەڵئەکێشا. یەکێك لە شەهیدەکانی کانی ماسی ئەوڕەحمانی ساڵحی خلە بوو کە تێکۆشەرێکی نەبەردی شاری سلێمانی و کەسایەتییەکی ناسراوی ناو کۆمەڵانی خەڵك بوو، دڕندانە کوشتیان و ئاگریان نا بە لاشەکەیەوە.

ئەمە چاولێکردنێکی ڕێڕەوی بەعسییەکانی بەغدای ٨ی شوبات بوو. کاژیك کە بزووتنەوەیەکی نەتەوەیی بچووك بوو، ژمارەیەکی دیاری سەرکردەکانیان کەسانی کۆنە شیوعی بوون، ئەوانە بوون کە یان ئیعتیرافیان کردبوو یاخود پاکانەیان بڵاوکردبووەوە و بەرەڵڵا کرابوون.

من لێرەدا کە باسی کاژیك و کردەوەکانیان ئەکەم، بۆ پەند وەرگرتنە لەو ڕووداوانە. تا ئێستا کە کاژیك گۆڕا بە پاسۆك و پاسۆکیش چووە ناو پارتی

دیمــوکراتی کوردســتانەوە، هێشــتا زوربــەی کۆنــە ســەرکردەکانی کاژێــك بــۆ خۆپاککردنەوە لەو تاوانە گەورەیەی کانی ماسـی لـە راگەیانـدن و تەلەفزیۆنەکانـدا ئـەڵێن ئـەو تاوانـە بـەبێ ئاگـا و فـەرمانی ئـەوان بـووە بـەڵام خـەڵکی سـەر بـەوان کارەکەیان ئەنجامدابوو.

بۆ وەڵامی ئەو قسانە بە دەرفـەتی ئـەزانم لێیـان بپرسـین ئـەی بۆچـی ئەوکاتـە بەیاننامەیەکتان دەرنەکرد ئەو تاوانە و پاڵەوانەکانی! ریسوا بکەن.

ئـەزموونی هـەموو لایـەك دەریخسـت کـە رێگـای (تـیرۆر) کردنـی تێکۆشـەرانی حیزبــەکان، هــەموو حیزبــەکان لــەناو خۆیانــدا، رێگایــەکی زۆر چــەوت بــوو و ئەنجامەکانی بە باشی نەگەڕایەوە بۆ ئەوانەی بەو رێگایـەدا رۆیشـتن، چ تاکەکـەس بووبن یاخود حیزب.

ئەو لێپرسراوانەی کاژێك کە لە ژیاندا ماون، پێویستە دان بەو هەڵـە مێژووییـەدا بنێن کـە بـە نـاوی ئەوانـەوە کـرا. پێویسـتە داوای لێبـوردن لـە حیزبـی شـیوعی و کەسوکاری ئەو شەهیدە سەربەرزانە بکەن و شانازی بە بوون و سەرکردایەتیی ئەو بزووتنەوە بچووکەوە نەکەن کە هـیچ رۆڵێکـی ئیجابییـان لـە مێـژووی بزووتنـەوەی گەلی کورددا نەبوو.

## شەهید کردنی رەوفی حاجی قادر

لێرەدا جێی خۆیەتی چەند ساڵێك بچمە پێشەوە و باسی ساڵی ١٩٦٧ بکەم کـە کادری پێشـکەوتووی حیـزب و تێکۆشـەری ناسـراو رەوفـی حـاجی قـادر لـە سـلێمانی شەهید کرا. زۆر کەس لای وابوو لایەنی مەکتەبی سیاسیی پارتی (جەلالیی ئەوسا) ئەو کارەیان کردووە. ئەوەبوو مام جەلال بەپەلـە لـەرێی منـەوە حیزبـی شـیوعیی ئاگادارکرد کە نەك ئـەوان لـەم کـارە بەرپرسـیار نـین، بـەڵکو هـەقی ئـەو شـەهیدە گەورەیە لە تاوانبارەکان ئەسێنینەوە. راستیشی کـرد ئـەوان بەرپرسـیار نـەبوون، بـەڵکو کـاك رەوفـی تێکۆشــەر بــە دەســتی تــاقمێکی تاوانبــاری ســەر بــە دەزگــا

ئەمنییەکانی حکومەت تیرۆر کرابوو.

بێجگە لەوەی کاك رەوف تێکۆشەرێکی ئازا و کۆڵنەدەری دەیان ساڵ بوو، بۆ منیش کارەساتێکی جەرگبڕ بوو، پێش شەهید بوونی لە منەوە نزیك بوو، و لە بەغدا میوانی من بوو، وەك باسم کردووە لە شوێنێکی تردا، چوونەوەی بۆ سلێمانی بۆ ئەوە بوو بگەڕێتەوە بۆ بەغدا و لەگەڵ هاوڕێ ئیبراهیم عەلاوی و مندا دابنیشێت بۆ را و تەکبیری تازەی ئەو کاتەی ناو حیزب.



شەهید رەوفی حاجی قادر

## گەڕانەوەم بۆ بەغدا

**"ئەگەر دەستگیر کرایت سەری خۆت و من شۆڕ مەکە. پیاوێکی ئازا بە."**

لە مانگی ئابی ١٩٦٣دا گەڕامەوە بۆ بەغدا.. ئەو شارەی کە خۆشم ئەوێت و زیاتر لە چوار ساڵ تیایدا ژیابووم. بەغدای قەشەنگ کە دەیان هاوڕێ و سەدان هەڤاڵی حیزبم تێدا ئەبینی و لەگەڵیاندا ئەژیام و لە کەشوهەوایەکی زانکۆیی پڕ لە بیرەوەرییەکانی بۆنەی خوێندکاران و ئاهەنگە جۆراوجۆرەکانمان و ململانێکانمان لەگەڵ هێزە سیاسییەکانی دیکەدا و هەروەها بیرەوەرییەکانی تەوقیفخانەکان لە گرتووخانەی (سەرای) و (زیندانی خەیالە) و ناوەندی پۆلیس و ئەمنی (وەزیرییە) و (عیوازییە). ئەم وێنانە هەموویان وەکو فیلمی سینەما بە مێشکمدا ئەهاتن. ئەوەتا وا من بەشێوازێکی دیکە ئەگەڕێمەوە بۆ بەغدا.

بە نهێنی دوور لە چاوی خەڵك گەڕامەوە چونکە دەزگاکانی بەعس بە شوێنمدا ئەگەڕان وەك یەکێك لەو ئەندامە چالاکانەی کە لەدەستی خوێناویی ئەوان رزگاری بووە، خوێناوی بە خوێنی هاوڕێکانم کە کەوتنە چنگیان. کە بیرم لە هەموو ئەمانە

ئەکردەوە وەسێتەکەی باوکە مەزن و میهرەبانەکەم لە گوێمدا ئەزرنگایەوە کاتێك کە لە سلێمانی ماڵئاواییم لێ کرد و بەرەو بەغدا رۆیشتم، ئەو پێی گوتم: "ئەزانم تۆ بۆ ئەوە ناگەڕێیتەوە بەغدا کە خوێندن تەواو بکەیت، بەڵکو بۆ ئەرکە حیزبییەکانت ئەگەڕێیتەوە. من ڕێگری ئەوەت لێ ناکەم بەڵام ئەگەر دەستگیر کرایت سەری خۆت و من شۆڕ مەکە. پیاوێکی ئازا بە".

من کە ئەم قسانە ئەکەم ئازار دڵم ئەگوشێت وەك حەسرەتێك بۆ ئەو رۆژە شکۆدارانەی خەباتکردن بۆ دروستکردنەوەی پەیوەندی و بنیادنانەوەی رێکخراوە حیزبییەکان لە بارودۆخێکدا کە لە هەموو هەنگاوێك و لە هەموو پێچێکدا مردن و دەستگیرکردن هەڕەشەی لێ ئەکردین. ئەوانە رۆژگارێکن کە هەتا ئەمرم هەمیشە بە یادیانەوە ئەژیم و شانازییان پێوە ئەکەم.

هەر کە لە بەغدا جێگیر بوم رووم کردە ماڵی یەکێك لە هاوڕێکانم بۆ ئەوەی لەوێوە پەیوەندییەکانم دەستپێبکەم. ئەو رۆژگارە رۆژگارێکی زۆر قورس بوون لەسەردەمی حەرەس قەومیدا کە بێجگە لە کوشتن و خوێنڕشتنی هەموو ئۆپۆزسیۆنێك هیچی دیکەی نەئەزانی و هیچ پرنسیپێکی نەبوو. ترس خەسڵەتێکی زۆر ئاشکرا بوو بە هەموو ئەو کەسانەدا کە ئەمبینین و ئەیانزانی من بە خۆشاردوییەوە هاتووم و بەدوای هاوڕێ خۆشاردووەکان و لانە نهێنییەکانیاندا ئەگەڕێم، ئەو لانانەی کە دەستی رەش نەیگەیشتبوونێ.

یەکەمین هەوڵم سەری نەگرت. هەرچەندە ئەو ناوونیشانەم دۆزییەوە کە پێم درابوو، بەڵام خاوەن ماڵەکە لەوێ نەمابوو، گواستبوویەوە بۆ شوێنێکی نادیار، دوایی تێگەیشتم خاوەن ماڵەکە هاوڕێ خزەیر عەباس بوو. زۆر گەڕام بەدوای هاوڕێیاندا و لەگەڵیشیدا هەوڵی دۆزینەوەی ئەندامە پچڕاوە دەستگیر نەکراوەکانم ئەدا بە تایبەت ئەوانەی سەر بە رێکخستنی حیزب لە زانکۆی بەغدا بوون. پاش هەوڵ و سەرکێشییەکی زۆر و لە ئاکامی گەڕانمدا بەدوای ناوەندی حیزبدا پاش زەبرە توندەکان هەندێك هاوڕێم بینی.

ڕەنگە ئێستا هەندێك كەس بایەخی ئەو شتە نەزانێت كە من لەو ڕۆژانەدا بەدوایدا ئەگەڕام، بەڵام من پێم وابوو مەسەلە ناوەندییەكە لە ژیانمدا ئەوەیە بگەمە پاشماوەی ناوەندە سەركردایەتییەكەی حیزب لە بەغداد. ئەوی ڕاستی بێت من گەیشتمە ئەنجامگیرییەكی گرنگ ئەویش ئەوەبوو كە پاشماوەی ناوەندەكە هاوڕێ كازم سەفار (كاظم الصفار) بوو كە چەند ژمارەیەكی ڕۆژنامەی حیزبی بە ئامێرێكی ئاسایی چاپ و بڵاوكردبووەوە. (كازم سەفار بووە ئەندامی لیژنەی مەركەزیی حیزب و دواجار بووە ئەندامی مەكتەبی سیاسیی قیادەی مەركەزی و كەسی دووەم تیایدا.) لە ناوەندەوە نامەیەكم بەدەستهێنا بۆ ناوەندی حیزب لە كوردستان كە هاوڕێ عەزیز محەمەد سەرۆكی بوو. ئەو نامەیە بووە مایەی خۆشحاڵیی هاوڕێ عەزیز محەمەد و نامەیەكی پێدا ناردمەوە و پێیان گوتم ئەگەر مەترسیت لەسەر بوو دەستگیر بكرێیت، نامەكە بخوێنەرەوە و بیدڕێنە. هاوڕێ عەزیز تێگەیشتبوو كە نووسەری نامەكە هاوڕێ كازم سەفارە، بۆیە لە وەڵامدا نووسیبووی "رفيقي العزيز اخ الشهيد بل اخ الشهداء" واتە: هاوڕێ خۆشەویستم برای شەهید بەڵكو برای شەهیدان، بەوەی براكەی كازم كە شەهید بوو لە ساڵی ١٩٥٦دا وەك قارەمانێكی شیوعیی ملی كرابوو بە پەتی قەنارەدا.

* * *

لەو هەوڵدانەمدا، یەكەم پەیوەندی گرنگی من بە حیزبەوە، پەیوەندیكردنم بوو بە هاوڕێ (ئیبراهیم عەلاوی)یەوە. لە ئێستگەیەكی پاسدا یەكترمان بینی و نەریت وابوو كە لێپرسراوەكە یان هاوڕێی پەیوەندییەكە چەند پرسیارێكی دژبەیەك بكات و ئەویدیكەش وەڵامی سەیر و نامۆی بداتەوە هەتا پەیوەندییەكە دروست ببێت و متمانە بەیەكتری بكەن.

كاتێك هاوڕێ ئیبراهیم عەلاویم لە گەڕەكی كەڕادە لە ئێستگەی پاسەكەدا بینی لەجیاتی پرسیار گوتم هاوڕێ پێویست بە پرسیار و وەڵام ناكات چونكە من ئەتناسم.. تۆ هاوڕێ ئیبراهیم عەلاویت. وەك پێشتر باسم كرد، لە بارەگاكەی حیزب لە جادەی كیفاح لە (فضوة عرب) ئەوم ناسیبوو.

هاوڕێ ئیبراهیم عەلاوی بوو بە لێپرسراوم و دەستم کرد بە کارکردن لەگەڵیدا بۆ دروستکردنەوەی ڕێکخراوی قوتابیان و شانبەشانی ئەوەش ئەگەڕام بەشوێن هاوڕێ دابڕاوەکانی دیکەدا لە ڕێکخستنەکانیان پاش زەبرە گەورەکەی شوباتی ١٩٦٣.

لە ئاکامی بارودۆخی کاری نهێنیی ئەو سەردەمەدا، کە تەنانەت دواتریش نەمتوانی بەڵگەنامەکان گل بدەمەوە و ڕووداو و مێژووەکان لای خۆم هەڵبگرم، لەبەرئەوە پشت بە زەین و بیرەوەری ئەبەستم و ئەوانەی بیرم ئەکەونەوە تۆماریان بکەم بەرلەوەی دەرفەتەکە لەدەست بچێت.

لە ١٨ی تشرینی دووەمی ١٩٦٣دا کە من ئەوکاتە لە بەغدا خۆم شاردبووەوە و کاری حیزبم ئەکرد، کودەتاکەی عەبدولسەلام عارف بەسەر بەعسیەکاندا ڕوویدا و من بەڕێکەوت لە گەڕەکی (بەتاوین) لە بەغدا بە کۆڵانێکدا ڕەت ئەبووم کە گوێم لە هاوارێك بوو ئەیگوت: "حازم جواد شیل ایدك شعب العراق ما یریدك" واتە حازم جواد دەست هەڵگرە گەلی عێراق تۆی ناوێت. حازم جواد ئەوکاتە سکرتێری حیزبی بەعس بوو. ڕۆژێکی یەکجار خۆش بوو کە حەرەس قەومییەکان جلوبەرگیان فڕێ ئەدا و بە فانیلە و دەرپێوە ڕایان ئەکرد. ئەو چەند ڕۆژە لە شوقەیەکی برادەرانی خۆماندا بووم کە هی هاوڕێیان لەتیفی شێخ تەها و فوئاد شمقار و حەمە سدیق و سەباح مەجید قەدوری بوو.

ڕۆژانە یا ڕۆژە نا ڕۆژێك هاوڕێ ئیبراهیمم ئەبینی. دەستم کرد بە گەڕان بە دوای هاوڕێ دابڕاوەکان لە حیزب. لە ماوەیەکی کەمدا توانیم دەیان هاوڕێ بدۆزمەوە و سەرەتا لیژنەی زانکۆی بەغدامان پێك هێنا و بەرەبەرە ڕێکخستنەکانی کۆلیجەکانیش پێکهاتن.

من کە لە کودەتای ٨ی شوبات وازم لە خوێندن هێنا و چووبوومەوە بۆ کوردستان لە پۆلی چواری کۆلێجی بازرگانی وئابووریدا بووم، کاتێك بەعس ڕووخا چوومەوە بۆ دەوام کردن. ژمارەیەکی دیار لە هاورییانی کۆلێجی بازرگانی هاتنەوە ناو ڕێکخستنەوە. بە باوەڕێکی پتەو و ئازایانە لەناو قوتابیانی بەغدا جموجۆڵێکی گورج و گۆڵمان هەبوو، ئەو ڕۆژە خۆشانەی کە چەند کەسێکی تازەمان

ئەهێنایەوە ناو حیزبەوە هەستمان بە سەرکەوتن ئـەکرد و دڵمـان زۆر خۆشـبوو بـە دواڕۆژێکی نوێ بۆ گەلەکـەمان. هـەرگیز ئـەو هاوڕێیانـەی کـۆلێجی خۆمـان نـەبیل یوسف و سامی سـەلیم عەنتـەر و حسـێن فـەتحوڵلا و ئیـبراهیم ئیسـماعیل و جـواد مەهـدی و مەهـدی قاسـم و جـەمیل حەدیسـی و سـەباح مەجیـد قـەدوری و دەیـان هـاوڕێی دیکـە کـە دەڵـێی ئەمڕۆیـە و لـە بـیرم ناچـن. ئـەم برادەرانـە هەنـدێکیان دەرچـووبوون و هەنـدێکیان لـە کۆلێجـدا مـابوون و بـەرەو ڕێکخسـتن هاتنـەوە نـاو کۆڕی تێکۆشانەوە.

لیژنەی قوتابیان دامەزرا. سەرەتا من و هاوڕێ حسێن عارف و سەباح گـۆرگیس بووین. پاش ماوەیەك هاوڕێ مەهدی حافزیش به نهێنی گەڕایەوە و هاتە لیژنەکەوە. پاش ئەویش ماجید عەبدولڕەزا هات کە حسێن جواد گومەر هێنایە ناو لیژنەکەوە.

لە لایەکەوە خەریکی ڕێکخستنەوەی لیژنە و شانەکانی حیزب بووین، لە هـەمان کاتدا موناقەشەی زۆری فیکری و هەڵسەنگاندنی هێڵی گشـتی حیزبمـان ئـەکرد کـە ئایا ئەم کارەساتەی کودەتـای ٨ی شـوبات بۆچـی ڕووی دا؟ سیاسـەتی یـەمینی و تەوفیقی! سەرکردایەتیی حیزب و نەبوونی ڕێبازی سەربەخۆی حیـزب کـە سـاڵانی پێشوو بووبوینە پاشکۆ و(تووتی)ی حیزبی شـیوعیی سـۆڤێت. بۆچـی حیـزب بـەو هەموو هێز و توانایەوە نەیویست دەسەڵات بگرێتە دەست؟

جیاکردنەوەی دوو هێڵی یەمینی و چەپ لە ناو حیزبدا بە ئاشکرا پەیدا بـوو، بـە خێرایی پەرەی ئەسەند. وا بە هەموو توانایەکـەوە هـەوڵی بەهێزکردنـەوەی حیـزب ئەدەین بـەڵام ئەگـەر سیاسـەتی حیـزب و ڕێـرەوی شۆڕشـگێرانەی لەگەڵـدا نـەبێت مانای ئەوەیە ئاسنی سارد ئەکوتین و بـە دەسـتی خۆمـان کارەسـاتێکی دیکـە بـۆ حیزب و گەلەکەمان دروست ئەکەین.

دوای ئەم هەموو قوربانیدانە و شەهید بوونی سەدان هاوڕێ کە ئێمە بە تـەمای ڕێبازێکی شۆڕشگێڕانەی تازە بووین لە سەرکردایەتیی حیزبـەوە و بـەو ئازایـەتی و بـاوەڕە پتـەوەوە کـە هـەمانبوو بـۆ هەڵسـاندنەوەی حیـزب، لـە دەرەوەی وڵاتـەوە

بەیاننامــەی روو رەشــی ئــابی ١٩٦٤ دەرچــوو، کــە داوای نزیکبوونــەوە ئــەکات لــە حکومــەتی عەبدولســەلام عــارف و ئامــادەش بــوون حیزبــی شــیوعی لــە (ئیتیحــادی ئیشــتیراکیی عــەرەبی)دا بتوێننــەوە. ئــەم رێکخســتنەی هەنــدێك لــە نەتەوەچــییە عەرەبەکان دایانمەزراندبوو خۆی لە خۆیدا رێکخراوێکـی ئیفلیجـی بـێ سـەروبەر بـوو. سەرکردە یەمینییەکانی حیزبمان بێ لێکدانەوە و بەبێ گەڕانـەوە بـۆ را و هەڵوێسـتی قاعیـدەی حیــزب و لــە کاتێکـدا هێشــتا هــەزارەها شــیوعی و دۆســتەکانمان لــە زیندانەکانی حکومەتدا بە کۆت و زنجـیرەوە ئەیانناڵاند، حکومـەتێك کـە بەشـێکی گرنگی حکومەتی ٨ی شوباتە و بەرپرسە لە شەهیدکردنی سـەدان یـاخود هـەزاران ئەندام و لایەنگرمان ئەم داوایەیان ئەکرد. بەبێ ئـەوەی ئـەم رێکخـراوە نەتەوەییـە پووچە داوا لە حیزبی شیوعیی بکات بۆ بەرەیەکی نیشتمانی یاخود پەیمانێکی دوو قۆڵی، تەنیا بە ئیشارەتێکی سـۆڤێت ئـەم هەڵوێسـتە خراپـەیان وەرگـرت کـە دژی هەموو بەرژەوەندی وپەیڕەوەکانی حیزب بوو.

## ڕاپەڕینی ٣ی تەموزی ١٩٦٣

پاش ئەو شاڵاوە دڕندە فاشستییانەی حەرەس قەومی و سوپا و هەموو هێزەکانی بەعس لە ٨ی شوباتی ١٩٦٣ بۆ سەر هاوڕێیان و بە کوشتن و بە لەسێدارەدان و لە پارچەپارچەکردنی لەش و سەری ئەو سەدان یا هەزاران شەهیدانەی حیزب و دەرچوونی بەیاننامەی ژمارە ١٣ی دامودەزگای بەعس بۆ لەناوبردنی شیوعییەکان لە هەر کات و شوێنێك بەدی بکرێن، بەشێوەیەك کە گەورەترین ژمارەی سەرکردەکانی حیزبیش بەر ئەم شاڵاوی لەناوبردنە بەکۆمەڵە کەوتن، کۆمەڵە قارەمانێکی ئەندام و لایەنگرانی حیزبی شیوعی لە هەڵمەتێکی سەربەرزی شۆڕشگێڕانەی وەها کە کەمجار مێژوو لەو بارودۆخەدا دیبێتی، لە بەرەبەیانی ڕۆژی ٣ی تەموزی ١٩٦٣دا هەوڵی ڕووخاندنی ئەو ڕژێمەیان دا.

لەکاتێکدا کە بەعسییەکان بەوەیان زانی، ئەوەی زانرا و دەستیان پێی گەیشت لە ئەندام و لایەنگر و ڕێکخستنەکانی حیزب لەنێوان لەناوبردن و زیندانیکردندا باڵی ڕەشیان بەسەر گشت شارەکانی عێراقدا، بەتایبەتی بەغدا، کێشا.

بە قارەمانێتی و نەبەزی و باوەڕبوون بە بیروباوەڕی پۆڵایینیانەوە، تەنیا لەپاش چوار مانگ و ٢٣ ڕۆژ دەستیان دایە چەك و زوربەی زۆری گرنگترین سەربازگەی عێراقیان کۆنترۆڵ کرد کە (سەربازگەی ڕەشید) بوو، کە ئەگەر هەندێك پەلە و هۆی تری بچووك نەبوایە ئەو ڕاپەڕینە ئەبووە شۆڕشێکی فراوان و هەموو عێراق لە تاوان و تاوانبارە فاشستەکان پاك ئەکرایەوە و نەك هەر مێژووی عێراق ئەگۆڕا، بەڵکو سەردەمێکی نوێ لە ناوچەکەشدا بەرپا ئەبوو.

سەرکردەی ئەم ڕاپەڕینە شەهیدی گەورە عەریف حەسەن سەریع بوو لەگەڵ کۆمەڵێك سەربازی لەخۆبوردووی گیانبەخش کە بێجگە لە هێزەکەی خۆیان پەیوەندییان لەگەڵ چەند کەسان و ڕێکخراوە نەگیراوەکاندا هەبوو بە سەرکردایەتیی هاوڕێ ئیبراهیم محەمەد عەلی کە پێش ڕاپەڕینەکە بە ماوەیەکی کەم لە بەغدا دەستگیر کرا و لەژێر ئەشکەنجەیەکی دڕندانەدا گیانی پاکی بە گەلەکەی بەخشی.

ئیبراهیم محەمەد عەلی هاوڕێیەکی نزیك و خۆشەویستی من بوو، کە من لە وەزارەتی (ئیرشاد) کارم ئەکرد و مانگانە گۆڤاری عێراقی نوێمان دەرئەکرد، ئەو لە چاپخانەی رابیتە (الرابطة) کاری ئەکرد. بۆ چەند ساڵێك هاوڕێیەتیمان زۆر بەتین بوو، و زۆرجار لەگەڵ ئەو و شەمران یاسریی شیوعیی رۆشنبیر و شاعیری میللی ناودار کۆئەبووینەوە و باس باسی حیزب و دواڕۆژی رووناك بوو لەگەڵ رەخنەی زۆر و رۆژانەمان بۆ سیاسەتی ناشۆڕشگێڕیی حیزب. هاوڕێ محەمەد عەلی ئەندامی لیژنەی کرێکاریی هەموو حیزب بوو.

من ئەو رۆژانی راپەڕینە دەست بەعس و خوێنڕێژەکانی نەکەوتبووم و لە چەند شوێندا باسی ئەو رۆژانەم کردووە کە لە سلێمانی کەوتبوومە ناو رێکخستنی لیژنەی شاری سلێمانییەوە. هەواڵی ئەو راپەڕینەم بیست و خۆزگەم ئەخواست لەو رێکخستنە سەربەرزەدا بوومایە.

سەرچاوەی بەڵگەیی تەواو لە هیچ شوێنێك بڵاو نەکرایەوە بێجگە لە لێکۆڵینەوەی پچڕ پچڕ نەبێت، هەندێکیان لە زمانی ئەو هاوڕێیانەی لە ئەنجامی سەرنەکەوتنی راپەڕینەکە دەستگیر نەکران و هەندێکیشیان لەو هاوڕێیانەی لە بەندیخانەی ژمارە ١ی مەعەسکەر رەشید لەسەرەتای کودەتای ٨ی شوباتەوە گیرابوون و دوای سەرنەکەوتنی راپەڕینەکە بە (شەمەندەفەری مەرگ) بە پلانێك بۆ لەناوبردی بەکۆمەڵیان خرانە شەمەندەفەرێکی بارهەڵگری کون و کەلەبەرگیراو بۆ ئەوەی لە رێگا ئەو ٥٠٠ – ٦٠٠ رۆڵە دڵسۆزانەی گەلەکەمان و حیزبمان لەو گەرمای هاوینەدا گیان لەدەست بدەن.

ئەوانەی لەگەڵ پاڵەوانی یەکەمی راپەڕینەکەدا گیران، ژمارەیەك سەرباز بوون بە روتبەی بچووك و دران بە دادگایەکی عەسکەریی و سەرجەمیان حوکمی خنکاندنیان بەسەردا درا.

حەسەن سەریع لە قەفەسی دادگاکەدا بەسەر تاوانبارەکاندا نەڕاندی: "تەنیا من لێپرسراوی ئەم بزووتنەوەیەم و من بە فەرمانی عەسکەری فەرمانم بەم برادەرانە داوە کە لەم کارە دوا نەکەون و من و تەنیا من لێپرسراوم."



سێیەم لە راستەوە: حەسەن سەریع، لە قەفەسی دادگادا

ئـەم قارەمانانـە بەتـەواوەتی وتـە مێژووییەکـەی مارکسـیان بـۆ ئـەگونجێت کـە وەسفی قارەمانەکانی کۆمۆنەی پاریسی کرد پـاش سـەرنەکەوتنیان کـە: پیاوانێـك بوون سەریان لە هەور ئەدا.

باشترین وەسفی دوور و درێژی ئەم بزووتنەوەیە لە باسکردنی (تالیب شـبیب)ی ئەندامی سەرکردایەتیی حیزبی بەعسی ئـەو سـاڵە و وەزیـری دەرەوەی حکومـەتی بەعسی کودەتای ٨ی شوبات ئەخوێنینەوە کە رۆڵەکانی راپەڕینەکە خۆی و حـازم جواد کە سکرتێری حیزبی بەعس بـوو، هاوکـات وەزیـری نـاوخۆی حکومەتەکـەیان بوو، چۆن شۆڕشگێڕان دەستگیریان کردبوون:

**کڵاوە سەربازییە چەکدارەکە**

**بزووتنەوەی حەسەن سەریع (حسن السريع)**

**نووسینی: تالیب شبیب**

ناوبەناو زانیارییمان لە سەرکردایەتیی حەرەس قەومی و دەزگای ئەمنەوە بۆ ئـەهات دەربارەی رێکخراوێکی سەربازیی شیوعی کە ژمارەیەك سەرباز و پلەداری تێدایە، جگـە لە ژمارەیەکی کەمی شانەی مەدەنی شیوعی کە دەستیان کردووەتـەوە بـە چـالاکی لـە هەندێك لە گەڕەکـەکانی بەغـدا و هەنـدێك پارێزگاکـانی ناوچـە جیاجیاکـەنی وڵاتـدا،

زانیارییەکان ئەیانگوت کە سەرکردایەتیی حەرەس قەومی توانیویەتی هەندێك لەو شانانە بدۆزێتەوە و ئەندامەکانیان دەستگیربکات.

هەرچەندە سەرکردایەتیی حەرەس قەومی بایەخی دابوو بە مەسەلەکە، بەڵام سەرکردایەتیی قوتری حیزب مەسەلەکەی بە جدی وەرنەگرت (١) چونکە حیزبی بەعس دەستی گرتبوو بەسەر هەموو چەکەکانی سوپای عێراقدا لە بەغدا و دەوروبەری. هەروەها سەرکردایەتی هەر چوار کەتیبەکە بەدەست ئەفسەرانی بەعسییەوە بوون، پاش پاککردنەوەی هێزەکانی لەوانەی کە گومان لە دڵسۆزییان هەبێت بۆ حیزب، یەکەکانی هێزی پیادەش بەدەست ئەفسەرانی بەعسی و دۆستەکانەوە بوون.

بە زامنکردنی سوپا کە گرنگترین کەرەستەکانی دەسەڵاتە، شتێکی سروشتی بوو کە هەست بە ترس نەکەین، بەڵکو لە کەشوهەوایەکدا ئەژیاین کە وامان ئەزانی سەلامەتە پێش ئەوەی کە غافڵگیربکرێین بە بزووتنەوەکەی حەسەن سەریع.

من بەش بەحاڵی خۆم لە ڕێی پەیوەندییەکەی تەلەفۆنییەوە بە یاخیبوونەکەی ناو سەربازگەی ڕەشیدم زانی کە گەیشتە نووسینگەی حازم جواد کە بە جلی سەربازییەوە هات بۆ ماڵی ئێمە و هەواڵی یاخیبوونە سەربازییەکەی پێ گەیاندم. لە ماڵی ئێمەوە چەند تەلەفۆنێکی کرد بۆ وەزارەتی بەرگری و کۆشکی کۆماری و پێیان ڕاگەیاند کە مەسەلەکان کەوتوونەتە ژێر کۆنترۆڵەوە. بەڵام توڕەیی و بێزاری بە ئاشکرا لە ڕوخساریدا دەرکەوت کە زانی عەبدولسەلام عارف خۆی کەتیبەی چوارەمی دەبابەکان سەرکردایەتی ئەکات کە لەدوای ١٤ی ڕەمەزان ناوی لێنرابوو کەتیبەی دەبابەکانی کۆشکی کۆماری و خۆی سواری یەکەمین دەبابە بووە و سەرکردایەتی دەستەیەك دەبابەی کردووە بەرەو سەربازگەی ڕەشید.

پێموایە هەڵسوکەوتی عەبدولسەلام و پێشڕەویکردنی پرۆسەکە هۆکاربوون بۆ پێداگریی حازم جواد کە دەستبەجێ بڕۆین بۆ سەربازگەکە بۆ ئەوەی مەسەلەکە بەچاوی خۆمان ببینین و لەوێ بین کاتێك بڕیاری سەربازی ئەدرێت کە ڕەنگە ترسناك بن و بەمەش دەرفەت بۆ عەبدولسەلام عارف نەهێڵینەوە کە وەکو ڕزگارکەر و پارێزەری حوکمی بەعس دەربکەوێت.

بەڵام بەداخەوە هەرزوو بۆمان دەرکەوت ئەم بیروبۆچونە ژیرانە نییە. باشتر وابوو بڕۆینە بارەگاکانی سەرکردایەتی لە وەزارەتی بەرگری یاخود کۆشکی کۆماری.

من و خۆی و بەهاء شبیبی برام سواری ئوتومبێلەکەی بووین کە حامید جوادی برای حازم جواد لێی ئەخوڕی، کە ئەفسەر بوو لە هێزی ئاسمانی و لێپرسراوی حیزبییش بوو. ئێمە تەنها دەمانچەکانی خۆمان و یەك کلاشینکۆفمان پێ بوو. کاتێك کە چووینە سەربازگەی رەشید بێ سەروبەرییەکی تەواومان بینی. ئەو دەبابانەی کە عەبدولسەلام عارف رابەرایەتی ئەکردن بەر لە ئێمە بە ماوەیەکی کەم هاتبوونە سەربازگەکەوە. شەڕ گەرم بوو، تۆپێکی زۆریش بە چڕی ئەتەقێنرا. چەند یەکەیەکی حەرەس جمهوری ئەبینران کە بەناویاندا کۆمەڵێك سەرباز و کۆمەڵێکیتر بە جلوبەرگی حەرەس قەومییەوە لە جموجوڵدا بوون. هەموو ئەم هێزانە زۆر بێ سەروبەرانە تێکەڵی یەك بووبوون.

هیچ نیشانەیەك نەبوو کە بەڵگە بێت بۆ هەبوونی سەرکردایەتییەك یاخود رێکخستنی ناوەندیی، بگرە کەس نەیئەزانی ئەوەی لە تەنیشتییەوەیەتی کێیە و سەر بە چ لایەنێکە. ئێمە پێشتر ئەمانزانی کە حەرەس قەومی بەرەلایە، بەڵام ئەوەی ئێمە بینیمان لە بێ سەروبەرەییەکی ناماقوڵی چاوەڕوان نەکراودا مەسەلەکەی بۆ سەلماندین.(٢)

ئێمە بەناو قەرەباڵغییەك لە سەرباز و حەرەس قەومیدا تێپەڕ بووین و تاقمێك ئوتومبێلەکەمانیان راوەستاند کە جلوبەرگەکانیان وەك جلوبەرگی حەرەس قەومی بوو. داوای هەوێیان لێ کردین ئێمەش هەوێکانمان دانێ و بە توندی سەرزەنشتمان کردن لەسەر هەڵسوکەوت و نەبوونی گوێڕایەڵیی سەربازی کە هیچ نیشانەیەکی رێکخستن و سیستمی سەربازی تێدا نییە. بە خەیاڵی خۆمان ئەمانە لاوانی حەرەس قەومین، بەڵام کتوپڕ تفەنگەکانیان ئاڕاستەی سنگمان کران و داوایان لێ کردین لە ئوتومبیلەکە داببەزین. هەر لەو چرکەساتە هەستیارەدا حامید جواد کە جلی سەربازی لەبەردا بوو دابەزی بوو لە ئوتومبیلەکە و توانی خۆی بدزێتەوە. نازانم لەبەر رێزی جلە سەربازییەکەی رێگەیاندا بڕوات کە ئەویش وەکو ئەمان سەربازە، یان لەبەر ئەوەی کە هەموو خەیاڵیان لەسەر ئێمە چڕ بووبوەوە کە نێچیرێکی بەنرخ بووین (وەزیری دەرەوە و

وەزیری ناوخۆ)، چواردەوری ئوتومبیلەکەیان دا و فەرمانیان پێ کردین دابەزین پاش ئەوەی چەند گوللەیەکیان تەقاند بەڵام هەر بۆ ترساندن بوو.

ئەوان ٨ کەس بوون ئێمەیان دایە پێش کە ٣ کەس بووین- من و حازم و بەهاء- بۆ لای دیوارێك لە نزیك دەروازەی سەربازگەی رەشید. دڵنیابووین کە ئەکوژرێین. من ئێستا ناتوانم هەستی خۆمت بۆ دەربڕم چونکە هەستم بە هیچ نەئەکرد، نە بە ترس و نە بە هیچ شتێکی تر، مەسەلەکە هەمووی لە چەند چرکەیەکدا کۆتایی هات. غافڵگیرییەکە خۆی کاتی بۆ نەهێشتینەوە بترسین یان هەست بە هیچی تر بکەین. تەنیا ئەوە لە مێشکماندا چەسپا کە ئەکوژرێین. رووبەڕووی دیوارەکە وەستاین و سەربازەکان لە پشتمانەوە وەستان و پێشتر لەلایەن عەریفێکەوە کە کەسێکی ئاشوری بوو بە ناوی صەباح لێلیە فەرمانیان پێ کرابوو تفەنگەکانیان بهێننە سەر پێ. هەمووومان لەو باوەڕەدا بووین کە پاش ماوەیەکی زۆر کورت فەرمانی تەقەکردنیان پێ ئەدرێت. ئا لەو کەشوهەوا بێ سەروبەر و شێواوەدا هەموو داخ لە دڵ و کەسێکی سەرچڵ بەبێ هیچ لێپرسینەوەیەك ئەتوانێت بە پەلەپیتکەیەك لەناومان ببات.

کتوپڕ دەنگێکی سەربازیی بەرزمان بیست کە فەرمانی کرد بە سەربازەکان بوەستن، ئەوانیش ئاوڕیاندایەوە و بینییان چواردەوریان دراوە بە فەسیلێکی تەواوی حەرەس جمهوری بە سەرکردایەتی ٢ ئەفسەر کە بریتیبوون لە حامید دلێمی کە ئەمانناسی و لەگەڵیدا حامید جواد هەبوو (ئەو شۆفێرەی کە دابەزی)، بەم جۆرە زیاتر لە ٤٠ تفەنگ ئاڕاستەی سنگیان کرا.

لە بەختی باشی ئێمە و بەختی خراپی ئەوانەی دیلیان کردبووین ئەوە بوو کە ئەوان کەسانێکی سادە بوون و نەیانئەزانی کە دلێمی و سەربازەکانی ناتوانن تەقە بکەن چونکە ئەگەر تەقەیان بکردایە ئێمەش ئەکوژراین. هەروەها، ئەو ٨ سەربازە ناسنامەکانی ئێمەیان خوێندبووەوە و ئەیانزانی پۆستی باڵامان هەیە کەچی نەیانکردین بە کەرەستەی مامەڵەکردن لەگەڵیاندا، کە ئەمە زۆر یارمەتی ئەدان و بواری بۆ ئەڕەخساندن داوای یارمەتی بکەن یاخود هەڵبێن و تێکەڵی ئەو هەموو سەربازە بن کە لەناو سەربازگەکە و دەرەوەی

سەربازگەکەدا پەرشوبڵاو بووبوونەوە. پێدەچێت گەمارۆدانیان لەلایــەن ژمارەیــەك ســەربازەوە کە لە ژمارەی ئەوان زیاترە سەری لێ تێکدابن و غافڵگیری کردبن، بۆیە چەکەکانیان فڕێــدا و تەسلیم بوون، دەستبەجێ حامید دلێمی فەرمانی ئیعدامکردنی هەر ٨ سەربازەکەی دەرکرد. (٣)

دوایی زانیمان کە مونزیر وەنداوی سەرکردەی گشتی حــەرەس قــەومی و جێگرەکــەی (نەجات ئەلصافی) و چەند کەسێکی دیکە پێش ئێمە گەیشتوونەتە ســەربازگەکە و دیــل کراون و ئێستا گیراون. لەم کاتەدا دڵنیا بووین بە شێوەیەکی بەڵگەنەویست کە حــەرەس قەومی ناتوانێت هیچ ئەرکێکی راستەقینە و کردەوەیەکی سەربازی جێبەجێ بکات، بــە بەڵگەی ئەوەی لە پێش هەموو کەس سەرکردایەتییەکەی خۆی بــە دیــل گــیراوە و خــۆی خستۆتە گێژاوێکی وەهاوە کە ناتوانیت دوژمن لە دۆست و سەرباز لە حەرەس قەومی و لە شۆڕشگێڕی یاخی جیا بکەیتەوە. هەستمان کــرد جیاوازییــەکی زۆر هەیــە لــە نێــوان رەفتاری هێــزی نیزامــی و هێــزی غــەیرە نیزامــی ئــەویش بــە بــەراوردکردنی رەفتــاری سەربازەکانی حامید دلێمی لەگەڵ ئەو دەیان حەرەس قەومییەدا کە هیچیان نەکرد زیاتر لەوەی قوڕەکەیان خەستترکردەوە.

حامید جواد پێی راگەیاندین کــە پــاش ئــەوەی لــە ئوتومبیلەکــە خــۆی دزیوەتــەوە رۆیشتووە بە دوای یارمەتیدا گەڕاوە بۆ رزگارکردنمــان و حامیــد دلێمــی بینیــوە لەگــەڵ سریەیەکدا و باسی ئێمەی بۆ گێڕاوەتــەوە کــە بــە دیــل گیراویــن و رەنگــە دەســتبەجێ بکوژرێین، ئەویش زۆر بە خێرایی لەگەڵ فەسیلەیەکدا هاتووە پاش پشــکنینی شــوێنەکە رزگاری کردین. بارودۆخی سەربازگەکە هەتا چرکەساتی رزگارکردنمان ناجێگیربوو. باش و خراپ تێکەڵ بووبوون و شەڕەکە لە گەرمیــدا بــوو و کــەس نەیئــەتوانی بــە دڵنیاییــەوە دۆست لە دوژمن جیا بکاتەوە و کەس نەیئەزانی کۆنترۆڵی دۆخەکــە بەدەســت کێوەیــە. هەروەها ئەوەشمان زانی کە لە ناو یاخیبووەکاندا هیچ ئەفسەرێکیان لەگەڵدا نییە، بەڵکو هەموویان سەرباز و پلەدار و ئەندامی مەدەنیی حیزبن و لە پلەی یەکەمدا مەبەســتیانە زیندانی ژمارە (یەك) داگیربکەن بۆ رزگارکردنی ئەفسەرەکان، بەڵام سریەی پارێزەری ئەو زیندانە بەرهەڵستییەکی چاوەڕوانکراویان کرد. (٤)

هەروەها زانیمان کە سەرکردەی یاخیبوونەکە پلەدارێکە بە ناوی حەسەن سەریع و توانیویەتی هەڵبێت و لە دەوروبەری کاتژمێر ٧ی بەیانیدا هێزەکانی حکومەت توانیویانە یاخیبوونەکە ئابڵۆقە بدەن و ئێستا سەرگەرمی وردوخاشکردن و خامۆشکردنین. ئەوەش هاتەدی و زوربەی یاخیبوان دەستگیرکران.

یاخیبوونەکە چەند کاتژمێرێکی خایاند، ئێمە لە دەوروبەری کاتژمێر ٦ی بەیانی چووینە سەربازگەکە و بە دیل گیراین، شەڕەکە لە دەوروبەری کاتژمێر ٨ ی هەمان بەیانیدا تەواوبوو، بیرمە من ئەو رۆژە وادەی دیدارێکم هەبوو لەگەڵ شاندێکی پەرلەمانی بریتانی کە سەردانی عێراقیان کردبوو. دیدارەکە کاتژمێر ٨ ی بەیانی ئەو رۆژە بوو لە بارەگای وەزارەتی دەرەوە. بە پەلە خۆم گەیاندە وەزارەت و کۆبوونەوەکە ئەنجامدرا و هەر لە کاتی کۆبوونەوەکەدا لە میوانەکانم پرسی ئایا هیچ شتێکیان بیستووە دەربارەی دۆخی ئاسایشی وڵات و گوێیان لە هیچ تەقەیەك بووە؟ وەڵامیان دایەوە کە گوێیان لە هیچ شتێك نەبووە و دۆخەکە لەلایان باشە پێمڕاگەیاندن پاش کەمێکی دیکە لە رادیۆوە گوێیان لێ ئەبێت کە یاخیبوونێکی سادە لە یەکێك لە سەربازگەکاندا روویداوە و بە ئاسانی و بە خێرایی کۆنترۆڵکراوە.

* * *

(١) ئەحمەد عەزاوی (ئەندامی سەرکردایەتیی گشتیی حەرەس قەومی) ساڵی ١٩٧١ لە دیمەشق پێی گوتین کاتێك کە سەرکردایەتیی حەرەس قەومی زانیاری دەستکەوت لەسەر هەندێك شانەی (رێکخراوە تازەکە)ی حیزبی شیوعی لە بەغدا و هەندێك شاردا وەك ئەڵێن کێچ کەوتە کەولی و هەموو تواناکانی خۆی خستەکار بۆ دۆزینەوە و دەستگیرکردنیان. عەزاوی ئەمەی لەو بابەتەدا باس کرد کە پەیوەست بوو بەو گیروگرفت و ئەو خەوزڕانەی کە تووشی رژێمی بەغداد بووبوون لە ئاکامی چالاکییە نهێنییەکانی هێزە ئۆپۆزسیۆنەکانی عێراق.

(٢) بەرەبەیانی رۆژی ٣ی تەموزی ١٩٦٣ کە هێشتا دنیا تاریك بوو، عەریف حەسەن سەریع و کۆمەڵێك سەرباز و پلەداری قوتابخانەی پیشەیی سەربازی و هەندێك

کەسی مەدەنی بە جلی سەربازییەوە لەگەڵ ژمارەیەك سەربازی یەکە سەربازییەکانی دیکە بەرەو کەتیبەی هەندەسە بەڕێ کەوتن لەناو سەربازگەی رەشید دا. هەندێکیان جلوبەرگ و پلەی سەربازییان پۆشیبوو. پاش ئەوەی کە بە ئەندازەیەکی گونجاو لە پاسەوانی دەروازەی کەتیبەکە نزیکبووەوە، بە جوڵەیەکی خێرا و زیرەکانە کلاوەسەربازییەکەی بەرزکردەوە و زۆر بە متمانەوە و بە دەنگێکی زوڵاڵ داوای لێ کردن چەکەکانیان فڕێ بدەن، لەمەشدا سوودی لە تاریکی شەو و سام و شکۆی ئەو خەڵکانە وەرگرت کە لەگەڵیدا بوون، کە پاسەوانەکان وایانزانی ئەویش و هاوڕێکانیشی هەموویان چەکیان پێیە و نەخشەیەکی ئامادەکراوی پێش وەخت جێبەجێ ئەکەن و ئەوەی کە ئەنجامی ئەدەن زۆر گرنگە و بەشێکە لە چالاکییەکی فراوان بۆیە پاسەوانە ساویلکەکان چەکەکانیان فڕێدا.

ئەمە سەرەتای دەستپێکردنی بزووتنەوەکەی حەسەن سەریع بوو که توانی کەتیبەی هەندەسە و پاش ئەو بەشێکی زۆری سەربازگەکە داگیر بکات کە گەورەترین هێزی بەغدای تێدا بوو به فڕۆکە و تانك و زرێپۆش و بەشی ئەندازیاری و چەکی پیادەوە ..تاد. هەروەها توانییان ژمارەیەك ئەفسەری لایەنگری حکومەت دەستگیر بکەن و چەند فڕۆکەیەك ئامادە بکەن تا ئەفسەرە فڕۆکەوانەکان دەگەن پاش دەرکردنیان لە زیندانی ژمارە (یەك) کە لە هەمان سەربازگەدا بوون و نزیکەی ٥٠٠ ئەفسەری شیوعی و لایەنگری قاسمی تێدا بوو، بۆ ئەوەی دابەشبکرێن بەسەر یەکەکانی ئەو سەربازگەیەدا و سەربازگەکانی تاجی و ئەبو غرێب و محاویل و هەندێك یەکەی سەربەخۆ لە بەغدا، جگە لە بانگکردنی ژمارەیەکیان بۆ بەشداریکردن لە سەرکردایەتیکردن و بەڕێوەبردنی بزووتنەوەکەدا. لە راستیدا بزووتنەوەکە کۆمەڵێك سەربازی بەسەر هەموو یەکەکاندا دابەشکردبوو کە پێیان راگەیەندرا کاتژمێری سفری دەستپێکردنی بزووتنەوەکە ئەو کاتەیە کە ئەفسەرە ئازادکراوەکەیان ئەگاتە ئەو یەکەیە. بزووتنەوەکە هەروەها پەیوەندی کردبوو بە شیوعییەکانی بەغدا و هەندێك پارێزگا و هەروەها بە رێکخراوی فوراتی ناوەڕاستیشەوە کە زۆر زیانی پێنەگەیشتبوو چونکە ئەو رێکخراوە بە

سەرکردایەتیی ئەندامی مەکتەبی سیاسی، باقر ئیبراهیم موسەوی و بە یارمەتی ئەندامی یەدەکی لیژنەی ناوەندی سالّح ئەلرازقی چووبوونە گوندەکانی ئەو ناوچەیە لەگەلّ ژمارەیەك کادری پێشکەوتووی دیکەدا. هەروەها بزووتنەوەکە پەیوەندی کردبوو بەشاری ناصریە و بە کۆمەلّێك لایەنگری زۆرەوە کە دانیشتووی گەڕەکە میللییەکانی بەغداد بوون و هاوئاهەنگیی لەگەلّدا کردبوون بۆ ئەوەی لەگەلّ دەستپێکی بزووتنەوەکەدا ئەوانیش بکەونە جولّە لە سەربازگەکانی خۆیاندا. ئامانجی ئەم پەیوەندییە فراوانە ئەوە بوو بزووتنەوەکە سەرکەوتن بەدەستبهێنێت لە رێگەی کاری جۆراوجۆری زۆرەوە کە نیشانەی بەرفراوانبوونی بزووتنەوەکە بوون و بۆ ئەوەی کاردانەوەکانی حکومەت پەرشوبلاو بکاتەوە و ورەی دوودلّەکان لاواز بکات، ئەمە ماوەیەکی باش بۆ شۆڕشگێڕەکان دابین ئەکات کە خەلّکێکی زۆری لایەنگر پەیوەندی پێوە بکەن، هەروەها دەرفەتیش بۆ ئەفسەرە شیوعی و قاسمییە ئازادکراوەکانی زیندانی ژمارە (یەك) ئەڕەخسێنێت شوێنی خۆیان بگرن و بە هاوکاریی سەربازەکان کۆنترۆلّی یەکەکانیان بکەن. حەسەن سەریع و هاوڕێکانی هیوای زۆریان هەبوو کە سەربازەکانی سوپا بە دەنگیانەوە بچن چونکە زوربەیان لە ناوەندە کۆمەلایەتییە چەوساوەکانەوە هاتوون و هاوسۆز بوون لەگەلّ قاسمدا کە چەندین پرۆژەی لە بەرژەوەندی ئەواندا دروستکرد. ئەمانە زوربەیان بە ئاشکرا پەشیمانییان دەرئەبڕی کە لە رۆژی ٨ ی شوباتدا نەیانتوانیوە بەرگری لە قاسم بکەن، وا ئێستا لەم هەولّە تازەیەدا دەرفەتی تۆلّەسەندنەوەیان بۆ رەخساوە. لێکۆلّینەوەکان و زانیارییە دزەکردووەکان لێرە و



حەسەن سەریع

لەوێ دەریدەخەن کە حەسەن سەریع و هاوڕێکـانی بیریـان لـە هەسـتیارترین وردەکـاری کردووەتەوە و نەخشەیەکی ئازایانەیان ئامادە کردبوو کە ئەگەر چەند ڕووداوێکـی سـادە نەبوونایە سەرکەوتنیان بەدەستئەهێنا، لەوانە ترسنۆکیی سەرکردەی ئەو تاقە تانکەی کە بەشداری کردبوو لە هێرشەکەدا بۆ سەر شـوێنی زینـدانیکردنی ئەفسـەرەکان، هـەروەها درێژەکێشانی پرۆسەی گرتنی زیندانەکە وای کرد حکومەت کـاتێکی باشـی بەدەسـتەوە بێت. بەمەش شۆڕشگێڕەکان غافڵگیری و دەستپێشخەرییان لەکیسچوو. بزووتنەوەکەیان لەناو سەربازگەکەدا ئابڵوقەدرا بـەهۆی چـاوەڕوانکردنی یـەکلایی کردنـەوەی شـەڕەکەی زیندان و چـاوەڕوانیی هەڵـدانی فڕۆکـە بۆردومانکـەرەکان و بـەکارهێنانی تانکـەکان و جۆرەکانی دیکەی چەك. دیـارە زانیـاری و وردەکـاری زۆر دەربـارەی ئـەو بزووتنەوەیـە فەوتاون بەهۆی کۆمەڵێك هۆکـارەوە لەوانـە لەسـێدارەدانی کەسـایەتییە گرنگـەکانی و راونان و بێسەروشوێنکردنی هاوکارەکانی لە ساڵانی دواتردا بۆیە بەوردی نازانین ئاسـتی هاوئاهەنگی چۆن بووە لە نێوان سەربازەکانی ئەو بزووتنەوەیـە و ئەفسـەرە گیراوەکـانی زیندانی ژمارە (یەك) و ئایا ئەفسەرەکان رازیبوون هاوکاری بزووتنەوەکە بکەن.

(٣) سەرەتای بزووتنەوەکەی حەسەن سەریع لەو هەوڵە تاکە کەسیانەوە دەسـتی پێکـرد بۆ دروستکردنەوەی ڕێکخستنەکان کـە شـیوعییەکان ئـەنجامیان دا پـاش ئـەوەی لـە ٨ی شوباتدا زەبری گورچکبڕی وەهایان بەرکەوت کە رایەڵی ڕێکخستنەکانی پچراند. بەڵام شانە و ڕێکخستنە حیزبییەکانی خوارەوەی حیزب لە هەموو کەرتە کۆمەڵایەتی و سەربازییەکان، زەبری وایـان بەرنەکـەوتبوو و هێشـتا دەسـتی دەسـەڵات و دەزگاکـانی دەسـەڵاتیان پـێ نەگەیشتبوو. لە هەمانکاتیشدا کارەکانیان سڕ بووبوون و نەیانئەتوانی پەیوەندی بکەن بـە ناوەندەی سەرکردایەتییەکانیانەوە بـەهۆی سـەختیی بـارودۆخ و کـوژران و زینـدانیکردن و هەڵهاتنی لێپرسراوە راستەوخۆکانی حیزب. بۆیە بـێ سـەروبەری و کـاری تاکەکەسـی تـا ئەندازەیـەکی وا سـەریهەڵدا کـە تەنانـەت یـەکێك لـە شـیوعییەکان بەیاننامەیـەکی بـە دەستوخەتی خۆی نووسی و بە نهـێنی بـڵاوی کـردەوە بـە نـاوی (حیزبـی شـیوعی لـەناو دوورییەکاندا) - پێ ئەچێت کۆمەڵەکەی حەسەن سەریعیش یەکێك بووبێت لەو ڕێکخراوانە

بە حوکمی ئەوەی لێپرسراوانی زوربەی رێکخراوە سەربازییەکانی حیــزب لــەناو کــوژراوان و زیندانیکراواندا بوون و هەندێکیشیان لە پێش ١٤ی رەمەزانی ١٩٦٣وە لە زینداندا بــوون. بیرۆکەی بزووتنەوەکــە ئــەو کاتــە دروســتبوو کــە رێکخراوەکــەی حەســەن ســەریع لەگــەڵ رێکخراوێکی کرێکاری لەخۆی گەورەتر کە ئیبراهیم محەمەد عــەلی سەرپەرشــتی ئــەکرد و ورەیەکی بەرزی هەبوو و ئەندامی لیژنەی کرێکاری بوو لە بەغداد کە لیژنەیەکی گرنگــە و راستەوخۆ پەیوەندی هەبوو بە لیژنەی ناوەندی حیزبی شیوعییەوە و بەوە ناســراوە کــە ئــەم لیژنەیە پێش ٨ی شوباتیش رەخنەی هەبوو لە سیاســەتەکانی حیــزب. ئــەم لیژنەیــە لــە ٣ لیژنەی بچووك پێکهاتبوو کە بریتین لە لیژنەی گەورەی کرێکاری و ئەو کرێکارانــە لــە خــۆ ئەگرێت کە لە بوارە گەورەکانی وەکو نەوت و کارەبادا کار ئەکەن، لیژنــەی مامناوەنــدیش کرێکارانی کارگە ناوەندییەکان لە خۆ ئەگرێت وەك رستن و چنین و خواردنــەوە گازییــەکان، لیژنەی کرێکاریی بچووکیش کرێکارەکانی چاپخانە و نانەواخانە و دامــەزراوە بچــووکەکان ئەگرێتەوە. ئیبراهیم محەمەد عەلی کە کورد بوو ئەندامی سەرکردایەتیی باڵای ئەم لیژنانــە بوو، لەهەمان کاتیشدا سەرۆکی لیژنە بچووکەکە بوو. کاتێك کە پەیوەنــدییان پچــڕا، ئــەم ئەندامانی دەستەی ئاگادارکردەوە لەوەی بەسەر حیزبدا هاتووە و پێشنیاری کرد بەردەوام بن لە کار کردن و وای دابنێن لیژنەکەیان بریتییە لە حیزب تا ئەو کاتەی دەرووبەك ئەکرێتەوە. جا لەبەر ئەوەی کە زۆر چستوچالاك بوو کەوتە ئاگادارکردنەوەی لیژنەکەی خۆی و ئەوانەی پەیوەندییان بە لیژنەکەوە هەیە بەو زانیارییانەی کە لە رادیۆکان و سەرچاوە کۆمەڵایەتی و سیاسییە جیاوازەکانەوە ئەیبیستن هەمووشی لە کەشوهەوایەکی نهێنی و وریادا بــەجۆرێك کە چالاکیی نهێنیی حیزبی بە پتەوی بهێڵێتەوە. بەم جۆرە ئەم خەتە کەوتە چالاکیی گەورە و پەیوەندی کرد بە خوێندکاران و سەربازان و ژمارەیەك لە دابڕاوان بەڵام بە وریــایی زۆرەوە چونکە ئەگەر نهێنییەکەیان ئاشکرا ببوایە ئەنجامی خراپی لێ ئەکەوتەوە. پاشان لە ئاکامی گــەورەبوونی رێکخســتنەکەدا بڕیاریانــدا کارەکــان دابــەش بکــەن، لــەو چوارچــێوەیەدا سەربازەکانیان خستە رێکخراوێکی سەربەخۆوە کە ئەبو سەلام (محەمەد حەبیب) راســپێردرا سەرپەرشتی بکات و ئەمیش بە هۆی ئەرکە تازەکەیەوە حەسەن سەریعی ناسی. ســەرەڕای

سەقامگیربوونی ئیشوکاری ئەو لیژنەیەی باسمان کرد بەڵام سەرکردایەتییەکەی هەر ئەگەڕا بەشوێن ڕێگایەکدا بۆ پەیوەندیکردن بە لیژنەی ناوەندی حیزبەوە (جەمال حەیدەری) و (عەبەلی). پێدەچێت ئەم گەڕانەیان بەدوای ناوەندا ئیبراهیم محەمەد عەلی خستبێتە داوەوە، چونکە شیوعییەکی هاوکاری ڕژێم بە بیانووی ئەوەی کە ئەتوانێت بیگەیەنێتە سەرکردایەتی حیزب بەگرتیدا و بردیانە (قەسرولنیهایە) کە ئەشکەنجە درا و لە ئاکامی ئەشکەنجەداندا گیانی لەدەستدا بێ ئەوەی یەك وشە بڵێت. شیاوی باسە لەو کاتەدا شیوعییە رووخاوەکان یاخود ئەوانەی کە پێشتریش هاوکاریی رژێمیان کرد بوو بوونە مایەی هەڕەشەیەکی گەورە چونکە بە هەموو بەغدادا ئەگەڕان بۆ دۆزینەوە و بەگرتدانی ئەو شیوعییانەی کە هێشتا نەگیرابوون و خۆیان شاردبووەوە. دوای گرتنی ئیبراهیم محەمەد عەلی، ڕێکخستنەکە لەلایەن محەمەد حەبیبەوە بەڕێوە ئەبرا و دەستبەجێ بیری لەوە ئەکردەوە کە بزووتنەوەیەکی گەورەتر و کاریگەرتر ئەنجام بدات، نەك تەنیا هەر خەریکی کۆکردنەوە و ڕێکخستنی ئەندامەکان بێت. لەمەشدا ئەندامە سەربازییەکانی حیزب هانی زۆریان دا، بۆیە پێویستییەکانی ئامادە کرد و لەگەڵ حەسەن سەریع دا کەوتە هاوئاهەنگیکردن کە کەسایەتییەکی بەهێز و پتەو بوو و ئەیتوانی بەرامبەرەکەی قایل بکات لەسەر ئەو شتەی کە ئەیەوێت. ئەوەبوو نەخشەی بزووتنەوەکەی و سەرکردایەتییەکەی ئامادەکرا لەژێر ناونیشانی (ئەنجومەنی شۆڕشگێڕ). ئەندامە مەدەنییەکانیش کەوتنە چالاکی بۆ پەیوەندیکردن و ڕەخساندنی کەشوهەوا و سازدانی ئەوانەی کە توانای چەکهەڵگرتنیان هەیە بۆ چوونە ناو سەربازگەی ڕەشیدەوە بە یارمەتی ئەو سەربازانەی دیکە کە بەشدارییان ئەکرد لە جێبەجێکردنی نەخشەکەدا.

(٤) سەرکردایەتیی بزووتنەوەکە لەو باوەڕەدا بوو کە زیندانەکە بە ئاسانی خۆی ئەدات بە دەستەوە، بەڵام دواکەوتنی ئەو پرۆسەیە کاتێکی زۆری بۆ تانکەکانی کۆشکی کۆماری ڕەخساند کە بگەنە ئەو سەربازگەیە و ناتوانین بە دڵنیاییەوە بڵێین ئەگەر زیندانەکە زوو ئازاد بکرایە بزووتنەوەکە چارەنووسێکی دیکەی ئەبوو یان نا چونکە ئەنجامدەرانی بزووتنەوەکە کەسانێك بوون خۆیان ئەو ڕێگەیەیان هەڵبژارد و زیندانەکەش سەدان ئەفسەری پسپۆڕی

چەکە جۆراوجۆرەکانی تێدا بوو کە ئەوە دەرفەتێکی نایاب بوو. شکستهێنانی بزووتنەوەکـە و ئازادنەکردنی ئەفسەرەکان وای کرد کە سەربازگەکە و یەکە سەربازییەکانی دیکە نەیەنـە نـاو مەسەلەکەوە. دەسـەلاتیش بـە هـیچ شـێوەیەك پێشـبینی ئـەو رووداوەی نـەکردبوو و هـیچ نەخشەیەکی نائاسایی ئامادە نەکردبوو بۆ رووبەڕووبوونەوە. خاڵـە سەرنجڕاکێشـەکە لەوەدایـە کە چۆن ئەو سەربازە گەنجانەی کە تێکرای تەمەنیان لە ٢٥ ساڵ تێپەڕی نەئەکرد و هێشتا لە قوتابخانەی ژیاندا ئەزمونی تەواویان وەرنەگرتبوو لە حیزبیشدا هیچیان نەگەیشتبوونە ئاسـتی لیژنەی محەلی کەچی لە نەخشەیەکدا بەشدارییان کرد بۆ گرتنی دەسـەلاتی سیاسـی ئەمـەش مەسەلەیەکی زۆر ئاڵۆز و ترسناکە، چونکە نەریت وایە کرێکاران مان لە کار بگـرن و ئینجـا سەربازەکان لە یەکە سەربازییەکانی خۆیان هەڵبێن. لەبەر ئەوە رووداوەکە رەنگدانـەوەی ئـەو ئاستە سیاسییە پێشکەوتووەیە کە قوتابخانە حیزبییەکەی حیزبی شیوعی پێی گەیشتبوو کـە حەسەن سەریع نمونەکەی بوو. ئەم گەنجانە لە روانگەی هەڵوێست و هەستێکی نـەگۆڕەوە ئـەم کارەیان کرد کە دەسەلاتە یەك لەدوای یەکەکانی عێراق ناحەز و دوژمـنی ئـاوات و ئامـانجی ئـەم سـەربازانە و کەسـوکارەکانیانن بۆیـە وەك دوژمـن سـەیری دەوڵـەتیان کـردووە. لـە بەرامبەریشدا پێچەوانەکەی ئەبینین کـە کـادرە سـەربازییەکانی ٨ ی شـوبات لـە ئەنجامـدانی کارەکانیاندا هەموویان ئەفسەر بوون هیچ سەربازێکیان بەشدار نەکرد لە کودەتاکەیاندا چـونکە ئەترسان کە سەربازەکان دژی ئەو کودەتایە بن ئەمـەش دەریئـەخات کـە بۆشـاییەکەی گـەورە هەیە لە نێوان سەرباز و بەشێکی گەورەی ئەفسەراندا. مەسەلەیەکی دیکە کە مایـەی سـەرنجە ئەوەیە سـەربازەکان نەخشـەیان کێشـاوە بـۆ بـەکارهێنانی سـوپا وەك ئـامرازی راسـتەقینەی دەسەلات و ئەمەش نیشانەی هەستێکی پێشکەوتووە سەبارەت بە چـۆنێتی بـەڕێوەبردنی وڵات کە پەرلەمانێکی راستەقینە لە ئارادا نەبوو. لێکۆڵینەوەکان دەریانخست کە ئەم کـارەی ئـەمان ١٠٠٪ کاری خۆیان بووە و هیچ دەستوەردان و یارمەتییەکی دەرەکی تێـدا نـەبووە بۆیـە لـە بزووتنەوەکەیانـدا کـورد و عـەرەب و ئاشـوری و موسـڵمان و مەسـیحی هـەبوون. لەبەرئـەوە رووداوەکـەی ٣ی تـەموزی ١٩٦٣ تـەنیا هـەر ئاگادارکردنـەوەی دەسـەلات نـەبوو، بـەڵکو هۆشدارییەکی گشتی بوو کە پێویستە هەمووان بگەڕێنەوە بۆ گەل و لێی دوور نەکەونەوە.

ئینجا خوێنەری خۆشەویستی ئەم بیرەوەرییانە.. ئەبینیت کە یەکێك لە سەرکردە گەورەکانی حیزبی بەعس پاش رووخانی حکومەتەکەیان، چۆن باسی ئەو ترس و لەرزەی سەرکردەکانی ئەو کودەتایە ئەکات و بەرامبەر ئەوەش ئازایەتی و قارەمانێتی ئەو رۆڵە نەبەزانەی پاش ئەو هەموو کوشتن و بڕینەی بەسەر حیزب و گەلەکەیاندا هات چەند



شەهید خالید ئەحمەد زەکی

(هاوڕێ زافر)

باوەڕی پتەویان بە حیزبی خۆیان و گەلەکەیان هەبووە. من لە لێکۆڵینەوەی ئەم راپەڕینە مەزنەدا نیم، ئێستا، چونکە پێویستی بەوە هەیە چەند کەسێك هەڵسەنگاندنێکی یەکگرتووی بۆ بکەن وەك راپەڕینێکی مێژوویی پێشەنگ لە مێژووی سەربەرزیی حیزبی شیوعیی عێراق، چونکە و هەرچەندە لە زۆر شوێن و لای جیاجیاوە ئەو هەوڵە دراوە بەڵام وەك لێکۆڵینەوەیەکی داڕێژراوی فراوان هەقی خۆی نەدراوەتێ. ئەو لاپەڕە زێڕینانەی ئەو قارەمانانە بە خوێنی گەشیان تۆماریان کرد، بەشێکن لەو مێژووەی فەهد و زەکی بەسیم و حسێن شبیبی رەنگیان بۆ رشتن. فەهد لەسەر قەنارەکە گوتی: "شیوعێتی بەرزترە لە کۆڵەکەکانی لە سێدارەدان و بەهێزترە لە مردن." هەروەها هاوڕێکانی بە هەمان جۆری نەبەزی بەرەو رووی لە سێدارەدانیان خۆڕاگرانە گیانیان بە گەلەکەیان بەخشی. راپەڕینەکەی ٣ی تەموزی ١٩٦٣ بە سەرکردایەتیی حەسەن سەریع و هاوڕێکانی رێگاخۆشکەر و چرایەك بوو بۆ راپەڕینی زۆنگاوەکانی خوارووی عێراق بە سەرکردەیی خالید ئەحمەد زەکی. ئەوەیان بە یەکەم هەوڵدانی شۆڕشگێڕانەی پۆلێك لە شۆڕشگێڕانی حیزب بۆ

دەسەلات وەرگرتن ئەژمێردرێت، راپەڕینی دووەمیش بە جۆرێکی دیکە بە هەولدانی دووهەم ئەژمێردرێت. من کە شەرەفی هاورێیەتی (شەهید ئیبراهیم محەمەد عەلی)م هەبوو کە رابەرێکی راستەقینەی چینی کرێکار بوو بۆ راپەڕینی ٣ی تەموز – شەرەفی هاورێیەتیی یەك لیژنە و یەك ئەنجوومەنیشم هەبوو لەگەڵ شەهید خالید ئەحمەد زەکی دا و بەشدار بووم لە خۆئامادەکردندا بۆ راپەڕینەکەی ١٩٦٨. ئەگەر لادانی سەرکردایەتیی حیزب نەبووایە لە دوای هێلی ئابی دوژمن بە رێبازی شۆڕشگێریی حیزب و رێگرتنیان لە هەوڵی ئەو راپەڕینەی لە سالانی ١٩٦٥ – ١٩٦٦ کە روو نەدات، منیش سەربەرزیی دیارم ئەبوو لە جێبەجێکردنیدا بە زیندویتی یان بە شەهیدبوون لە رێگای بیرو باوەڕی مەردانەی دوژمن بە فەرمانڕەوایی دیکتاتۆریی داپلۆسێنەری گەل.

هەندێك لە ئاکامەکانی ئەو شەپۆلی تورەیی و رۆحی تۆڵەسەندنەوەیەی کە لەدوای کودەتاکەی ٨ی شوبات هاتنە ئاراوە، پاش بزووتنەوەکەی حەسەن سەریع، دروستبوونی بزووتنەوەی (لیژنەی شۆڕشگێڕ – اللجنة الثورية) و بزووتنەوەی (خەباتی چەکداریی میلیی – الكفاح الشعبي المسلح) لە هۆڕەکانی عێراق دروستبوون.

زوربەی لایەنگران و هەڵسوڕاوانی ئەم بزووتنەوانە بریتی بوون لەو کادیرانەی حیزب کە لە گرتووخانەکانی پاش ١٨ی تشرینی دووەمی سالی ١٩٦٣ هاتبوونە دەرێ و هەروەها ئەوانەش کە رزگاریان بووبوو پاش ئەوەی بەچاوی خۆیان مردنیان بینی و شاهیدی کوژرانی هاورێکانیان بوون. ئەمە شەپۆلێکی ناڕەزایی تورەی دروست کرد دژی سەرکردایەتیی حیزب کە زوربەی ئەندامەکانی لە دەرەوەی ولات بوون.

دامەزرێنەرانی (لیژنەی شۆڕشگێڕ) بریتی بوون لە کۆمەلێك ئەفسەر و پلەدار و ژمارەیەکی زۆری خەڵکی مەدەنی، لەناویاندا مولازمی یەکەم فڕۆکەوان عەبدولنەبی جەمیل و مولازمی فڕۆکەوان سەلاح عەزاوی و مولازم شاکیر عەزاوی و مولازم جواد قرتاس و نایب زابت کەریم عەزیز و عەریف موتعیب خەمیس (لێپرسراوی سەربازیی ناوچەی دیالە) و چەند کەسێکی دیکە.

پاش پێگەیشتنی ئەم ڕێکخراوە نهێنییە و دوای ئەوەی ژمارەیەکی زۆر خەڵکی مەدەنی و سەربازی پەیوەندییان پێوە کرد، سەرکردایەتییەکەی هەواڵی بۆ ئەو ئەفسەرە باڵایانە نارد کە لەلای شۆڕشی کورد بووبوونە پەنابەر و پێی ڕاگەیاندن کە لە توانادا هەیە دەسەڵات بگیرێتە دەست. لەم چوارچێوەیەدا موتعیب ڕەوانە کرا بۆ کوردستان و لەناو ئەفسەرەکاندا کە مەلا مستەفای بارزانی ئەیپاراستن، تەنیا عەقید سەلیم فەخری رازی بوو. شیاوی باسە ئەرکی ڕێکخراوی لیژنەکە تەنیا هەر ڕووخاندنی دەسەڵاتی عەبدولسەلام عارف بوو.

سەلیم فەخری بە نهێنی و ناسنامەی دروستکراوەوە لەڕێگەی دیالەوە چووە بەغدا و لەوێ لەگەڵ سەرکردایەتیی لیژنەی شۆڕشگێڕدا بەیاننامەی ژمارە (یەك)یان نووسی و ناوی سەرکۆمار و ئەنجومەنی وەزیران و سەرکردەکانی سوپایان دیاری کرد. بەڵام بەهۆی ناپاکیی کەسێك یان چەند کەسێکەوە، ماڵی سەلیم فەخری و ژمارەیەکی زۆری حەشارگە نهێنییەکان پەلامار دران و ئەم هەوڵە و ڕێکخراوەکەش شکستیان هێنا. شیاوی باسە ڕای گشتیی نێودەوڵەتی و فیستیڤاڵە نێودەوڵەتی و ناوچەییەکان نەیانهێنێشت بەشدارە سەربازییەکان لەسێدارە بدرێن.

سەرکردایەتییە پێشنیارکراوەکە:

- کامیل چادرچی یان ئیسماعیل سەفوەت، سەرکۆمار
- مەلا مستەفای بارزانی، جێگری سەرکۆمار
- سەلیم فەخری، سەرۆك وەزیران
- ئیبراهیم کوبە، وەزیری ئابووری
- محەمەد حەدید، وەزیری دارایی
- عەبدولوەهاب مەحمود، وەزیری دەرەوە
- عەبدولوەهاب قەیسی، وەزیری داد
- جەلال تاڵەبانی، وەزیری نیشتەجێکردن
- جەلال باڵتە، وەزیری ناوخۆ
- مستەفا عەلی، وەزیری ئەوقاف

- عەزیز شەریف، وەزیری کار
- عەبدولفەتاح ئیبراهیم، وەزیری نەوت
- رافید سوبحی ئەدیب، وەزیری پەروەردە
- محەمەد مەهدی ئەلجەواهیری، وەزیری رۆشنبیری و ئیرشاد
- عەباس بەلداوی، وەزیری شارەوانییەکان
- محەمەد سالّح بەحرلعلوم، وەزیری دەوڵەت
- وەزیرێکی تری دەوڵەت لە پارتی دیموکراتی کوردستان

قائیـد فیرقـەکانیش بـریتی بـوون لـە: سـەعید موتـەر، عەبـدولقادر مـەحمود، ئەحمەد موحسین محەمەد عەلی، و عەبـدوڵلا سـەعید. هـەروەها بڕیـار بـوو عەقیـد روکن عەبدولڕەحمان قازی بکرێت بە حاکمی گشتیی سەربازی.

## دوای سەرنەکەوتنی راپەڕین

## چیرۆکی شەمەندەفەری مەرگ ( قطار الموت )

دوای ئـەو کارەسـاتە دڵتەزێنـەی سـەرنەکەوتنی راپـەڕینی ٣ی تـەموز کـە بـە سەرکردەیی حەسەن سەریع ئەنجام درا و پێویستە بۆ مێژوو بنووسـرێت کـە شـەهید ئیبراهیم محەمەد عەلی مـەخموری و شـەهید محەمـەد حـەبیب لـە نەخشەکێشـەکانی ئەو راپەڕینەدا بوون، پاش سەرکەوتنی حکومەتی بەعس بەسەر ئـەم بزووتنەوەیـەدا و کوشـتن و گـرتنی قارەمانـەکانی راپەڕینەکـە، چـیتر روویـدا؟ سـەربازگەی رەشـید (مەعەسکەر رەشید) وەك باسم کرد، ئەو ساڵە گرنگترین سەربازگەی سـوپای عێـراق بوو، بـەهۆی ئـەو بەشـە جیاجیایانـەی هێزەکـانی سـوپا تیایـدا، وەك بنکـەی هێـزە ئاسمانییەکان، هێزی دەبابە، هێزی پیـادەی سـوپا، کـۆلێجی عەسـکەری و کـۆلێجی ئیحتیات، عـەمباری گـەورەی چـەك و تەقەمـەنی، چـەند کەتیبـەی تـۆپ و هـەروەها نەخۆشخانەی عەسکەریی. لـەدوای کودەتاکـەی ٨ی شـوباتی ١٩٦٣ بەندیخانەیـەکی گەورەش بەناوی (بەندیخانەی ژمارە ١) لەم شـوێنەدا دروسـتکرا بـۆ زوربـەی پیـاوە

ناسراوەکانی حکومەتی عەبدولکەریم قاسم و ئەفسەرە گەورەکانی سوپای عێراق کە زوربەیان لە ئەندامان و دۆستانی حیزبی شیوعیی عێراق بوون. یەکێك لـە پلانـەکانی شۆڕشـگێڕانی راپەڕینەکـە شـکاندنی ئـەم بەندیخانەیـە و ئـازادکردنی زیندانییـەکانی ناوی بوو کە ژمارەیەکی زۆریشیان ئەگـەر پلانەکـە سـەرکەوتایە بەشـدارییان ئـەکرد لـەو راپەڕینـەدا، بـە تایبـەتی ئـەم ئەفسـەرانە: فرۆکەوانـەکان، ئەفسـەری دەبابـە و زرێپۆشی دیکە کە ژمارەیەکیان لـەم کـارە ئاگـادار بـوون پـێش روودانـی. لـە چـەند سەرچاوەیەکدا باسی ئەوە ئەکرا کە ئـەو سـەربازەی فـەرمانی ئـەوەی پێـدرابوو بـە دەبابەکەی هێرش بکاتە سەر بەندیخانەکە، ترسنۆك دەرچوو بـوو یـان وەك هەنـدێك گوتیان بە جۆرێك شـڵەژابوو نـەیتوانیبوو ئـەو فەرمانـە کـە گـرنگترین ئەڵقـەی کـارە شۆڕشـگێرییەکە بـوو بـەجێ بهێنێـت و ئـەوە بـووە هـۆی سـەرەکیی سـەرنەکەوتنی راپەڕینەکە. ئیتر مێژوو هەندێك رووداوی تێدایـە کـە بـە ئازایـەتی یـان بـە ترسـنۆکی تاکە کەسێك ئەنجامێکی ئەمدیو یا ئەودیوی مێژوویەکی جیا دروست ئـەکات. ئەگـەر سەرباز (خەلەف شەڵتاغ) ئازا بووایە و ترسـنۆکی بەرچـاوی رەش نەکردایـە کـارێکی ئەکرد یان ئەبووە پاڵەوانێکی گەورەی مێژوویی یاخود وەك نائیـب عـەریف حەسـەن سـەریع و عـەریف کـازم بەنـدەر قارەمانانـە شـەهید ئـەبوو. پـاش چـەند رۆژێـك لـە کارەساتی سەرنەکەوتن، بەندەکانی بەندیخانەی رەشید کـە بـێ نـان و ئـاو کرابـوون لەگەڵ خۆرهەڵاتنی رۆژی ٤ی تەموزی ١٩٦٣ ئەو سەدان رۆڵە دڵسۆزەی گەلی عێراق بـە کەلەپچـەکراوی هێنرانـە دەرەوە و بـەرەو (شـەمەندەفەری مـەرگ) راپـێچ کـران. بەعسییە فاشستەکان دوو رایان هەبوو لە بڕیاردان بەرامبەر ئەم سەدان رۆڵە خـاوەن بەهرە و زانا و پزیشك و ئەندازیار و ئەفسەری سوپایە. یـەکێکیان دەسـتڕێژکردن لـە هەموویان و کوشتنیان بە کۆمەڵ بەمەبەستی نەهێشـتنی مەترسـی ئـەوەی جـارێکی دیکـە بەشـداری بکـەن لـە هـیچ جـۆرە کردارێکـی دوژمـن بـە حیزبـی فاشسـت و هاوکارەکانیان. ئەویتریان: نەء لە ترسی رای گشتیی جیهان کـە ئێسـتا هـەمووی لـە هەژاندایە دژی ئێمە و ئەمە یەکجاری دوژمنمان بۆ زیاد ئەکات و سومعەمان دێنێتـە

سەر سفر، یا بە شەمەندەفەرێکی بارهەڵگر هەموو کون و درزێکیشی بە قیر بئاخنین و بەم گەرمای تەموزە بیانێنین بۆ سەماوە و لەوێوە بۆ بەندیخانەی نوگرە سەلمان، کە بێگومان هەموو لە رێگادا ئەمرن و وەك قەزاوقەدەر ئەچێتە ناو دەنگوباسەوە. رای دووەم پەسەندکرا و بە ئاگاداریی هەموو سەرکردەکانی بەعس و حکومەت بەگشتی دەستکرا بە جێبەجێ کردنی ئەم پلانە چەپەڵەی لە جیهاندا وێنەی کەم بووە. کە "بار" بارکرا ئینجا شۆفێری شەمەندەفەرەکەیان هێنابووەوە رایانسپاردبوو کە زۆر بە هێواشی رێگای (سەماوە) بگرێتەبەر. ژمارەی ئەو ئەفسەرە لێپرسراوانە نزیکەی هەزار کەس بوو "بە گوێرەی راپۆرتە زانستییەکانی ئەو کاتە هەبوون"، لەناو ئەو جۆرە شەمەندەفەرانەدا و بەو گەرمایەی سەر لە بەیانیی ١٩٦٣/٧/٧ هیچ کەسێك لە ٢-٣ سەعات زیاتر بەرگەی ئەو گەرمایە ناگرێت، لە کاتێکدا زیندانییەکان هەندێکیان بە کەلەپچەکراوی و هەندێکیان بە زنجیر بەیەکەوە بەسترابوونەوە.

خۆراگریی زیندانییەکان بەشێکی بەهۆی ئەوەوە بوو کە هەندێکیان پزیشك بوون داوایان لە هاورێکانیان کرد پەنجەی خۆیان و هەر شوێنێکی دیکەی لەشیان کە دەمیان بیگاتێ بمژن تا هەندێ (خوێ) بگێڕنەوە بۆ لەشیان کە گەرما خوێی تێدا کەم کردووەتەوە و بە شێوەی ئارەق کردنەوە دێتە دەرەوە. ئەمە و هەندێك ئامۆژگاریی پزیشکانەی دیکە کە دکتۆر رافید ئەدیب یەکێك بوو لە بەندکراوەکان رۆڵی دیاری هەبوو تیایدا. دوای سەعاتێك لە کەوتنەڕێی



د. رافید سوبحی ئەدیب

شەمەندەفەرەکە، زیندانییەکان بەرەبەرە توانای خۆڕاگرییان کەم بووەوە و توشی دڵ تێکەڵهاتن و رشانەوە و نزمبوونەوەی فشاری خوێن بوون. لە شانسی ئەو قارەمانانە شەمەندەفەر لە دوای (دۆرە) و لە ئێستگەی (مەحاویل) راوەستا. لێرەدا شۆفێرەکە کە ناوی عەبد عەباس بوو پێیان گوتبوو باری فارگۆنەکانت هەموو شیشی ئاسنە گوتبووی لەم راوەستانەدا لە (مەحاویل) کوڕێکی گەنج سەرکەوتە سەرەوە بۆلام و پێی گوتم خاڵە گیان ئەو بارەی پێتە ئاسن نییە، بەڵکو مرۆڤن و چاکترین رۆڵەی گەلەکەمانن. عەبد عەباس یاریدەدەرەکەی خۆی نارد بۆ فارگۆنەکان. کاتێك گەڕایەوە لای وەستای، رەنگی زەرد هەڵگەڕابوو و هاواری کرد خێراکە وەستا قسەکە راست دەرچوو. عەبد عەباس نەیئەزانی دارەمەیتێکی پێیە لە شێوەی شەمەندەفەرێکدا کە کوون و کەلەبەرەکەشی بە قیر گیراوە. کاتێك ئەمەی زانی، شەرەف و شەهامەتی ئینسانی کاری تێکرد و لەبری ئەوەی بە خاوی و لەسەرخۆیی لێخوڕین بەوپەڕی توانای شەمەندەفەرەکەی بە خێرایی لێخوڕی و دوو سەعات پێش کاتی ئاساییش گەیشتە سەماوە. عەبد عەباس میفرەجی بۆ مەزهەری کوڕی گێڕابووەوە کە: کاتێك گەیشتینە (هندیە) و (دیوانیە) خەڵکێکی زۆر لە ئیستگەکە راوەستابوون و ئاوڕشێنی فارگۆنەکانیان ئەکرد بۆ ئەوەی تۆزێك لە گەرما و گڕەکەی سارد بکەنەوە. "لەوکاتەشدا ژنێك بە پەلە بەرەوە پیرم هات و پەلاماری دەستی دام و ماچی کردم و گوتی تکایە بەپەلە بیانگەیەنە" نەم ئەزانی ئەو هەواڵە چۆن گەیشتووەتە ئەو خەڵکە، بەوەش


عەبد عەباس میفرەجی

نەوەستابوون بەڵکو هەواڵیان گەیاندبووە سەماوە کە راوەستاین و دەرگای فارگۆنەکان کرایەوە زیندانییەکان وەك لاشەی کوڵاو و بەسەریەکدا کەوتوو دەرپەڕینە دەرەوە و هەندێکیشیان بورابوونەوە یەکێکیشیان کە دکتۆر یەحیا نادر بوو گیانی لەدەست دابوو. یەکێك لە بەندەکانی ناو شەمەندەفەرەکە ئەفسەرێکی دەرمانساز بوو و خەڵکی سەماوە بوو، باوکی کە بە (باوکی تالیب) ناو ئەبرا لە بەغداوە هەواڵی گەیاندبووە شارەکەی خۆیان (سەماوە) و وای کردبوو خەڵکێکی زۆر بە ئاو و خواردنی زۆرەوە چاوەڕێی میوانەکانیان بکەن و بێجگە لەوەش باری لۆرییەکی گەورەی پڕ لە برنج و رۆن و شەکر و چا و خورمای ناردە زیندانی نوگرە سەلمان بۆیان. لەو کاتەشدا دکتۆر رافید و دوو پزیشکی دیکە لەناو بەندەکاندا بوون، قەڵەمبازیاندا بۆ لای ئەو جەماوەرەی نان و ئاو و خواردنیان هێنابوو و هاواریانکرد کەس ئاو و ساردەمەنی نەخوات و تکایە مەیاندەنێ خێرا ئاوی شلەتێن و خوێمان بگەیەننێ، ئەوەبوو بەپەلە تەشتی گەورە گەورە و خوێیاویان گەیاندنێ و بەمەش جارێکی تر لە مردن رزگاربوون. یەکێك، لە زیندانییەکان کە هاوڕێ حەمدی ئەیوب بوو، ئەو بەپیرەوە چوون و فریاکەوتنەی ناو نا "راپەڕینە بێدەنگەکەی سەماوە".

کە بڕوانیتە هەزار کەس: برسی و تینو و هەموو جل و بەرگی تەڕ بە ئارەقی لەش و چاو دەرپۆقیو لە هیلاکی و ترس و مردن و برسێتی و تینوێتیدا، چ کارەساتێکی مرۆڤایەتی وا جەرگبڕ، فاشستێتی بەعسییەکان لە ناخ و دەروونی هەموو کەسێکدا لەبیر ئەباتەوە؟ بەم جۆرە باسکردنی ئەم تراژیدیایە — بۆ ئەوەیە رۆڵەکانی ئەمڕۆ و نەوەی تازەش ئازایەتیی تێکۆشەرانی گەلەکەمان و بەسەرهاتە گەورەکانی و گیانی شۆڕشگێڕی و خۆبەختکردنیان لەبەرچاو و لەسەر زمان بمێنێت.

ئەوەی زانرا لەکاتی خۆیدا: شەهیدەکانی راپەڕینی سەربازگەی رەشید کە لە رۆژی یەکەمدا ٢٠٠ کەس بوون و ٤٦ کەسی دیکەیان فەرمانی خنکاندنیان درا و گوللەباران کران و ژمارەیەکیش لە ژێر ئازار و ئەشکەنجەدا گیانی پاکیان لەدەستدا و چوونە کاروانی شەهیدانی حیزبی شیوعی و گەلی عێراقەوە. لەناو ئەم

زیندانیانـەدا زەعـیم غـەزبان سـەعد و عەقیـد ئیـبراهیم حەسـەن جبـوری و عەقیـد حەسەن عەبود و عەقید سەلمان عەبدولمەجید حەسان و موقەدەم عـەدنان خـەیال و رەئیس ئەوەل لوتفی تاهیر و حەمـدی ئـەیوب و دکتـۆر رافیـد سـوبحی ئـەدیب و فرۆکـەوان ئیـبراهیم موسـەنا و ئەنـدازیاری کارەبـا و ئەفسـەر عەبـدولقادر شـێخ و رەئـیس ئـەوەل سـەلاح قـەزاز و ئەفسـەر یـەحیا نـادر و جـەمیل مـونیر ئـەلعانی و ئەندازیار حەسەن زێوەر و سەدان کەسایەتیی ئەم گەلەیان لەناودا بوو.[١]

هەرچەندە راپەڕینەکەی ٣ی تەموز سەرنەکەوت بـەڵام هێـز و ئازایەتییـەکی بـێ وێنەی دا بە شۆڕشگێران بە تایبەتی بە شـیوعی و جـەماوەرە فراوانەکـەیان. دوای ئەوە کە عەبدولسەلام عارف و برادەرە نەتەوەییە عەرەبـەکانی کودەتایـان بەسـەر بەعسـدا کـرد، ئاسـۆیەکی گەشـتر و فـراوانتر هاتـە کایـەوە و بـڕوای جـەماوەر بەسەرکەوتن پتەوتر بوو کـە ئـەو زەبـروزەنگ و کوشـتن و بڕینـە نـەیتوانی بـەعس لەسەر حوکم بهێڵێتەوە و لە چەند سەعاتێکدا رووخان.

ئێمەش کە لە بەغدا بە نهێنی کارمان ئەکرد، چالاکیمان ئاسانتر بـوو بـۆ رێکخسـتنەوەی ریزەکانمان و رۆژانە دەیان ئەنداممان ئەبەسـتەوە بـە حیزبـەوە و باوەڕمـان بـە سـەرکەوتن روو لــە هەڵکشــان بــوو. شــانازیمان ئــەکرد بــە پاڵــەوانێتی و خــۆڕاگریی ســەرکردە قارەمانەکانمانەوە کە بە دڕندەترین شێوەی ئازار و ئەشکەنجە شەهید ئەکران.

سەلام عادل و جـەمال حەیـدەری و ئـەبو سـەعید و حەسـەن عوێنـە و محەمـەد حسێن ئەبولعیس و نافع یونس و دەیان سەرکردە و سەدان کادر و هەزاران لایەنگر و دۆستی حیزب، ئەوانە بوونە چرایەك بۆ رووناککردنەوەی رێگـای شۆڕشـگێڕێتی و کەس بە خەیاڵیدا نەئەهات کە پـاش ئـەو هـەموو رووداوانـە سـەرکردایەتیی حیـزب جارێکی دیکە بکەوینە هەڵە و بەتایبەتی هەڵەی گەورەی کوشندەوە.

---

[١] ئەم زانیارییانە لە چەند بیرەوەری و دیداری رۆژنامەوانییەوە سوودی لێ وەرگیراوە وەك: نامەی مەزهەر عەبد عەباس کوڕی شۆفێری شەمەندەفەرەکە، غـەزبان ئەلسـەعد ئەفسـەری شیوعیی بەناوبانگ، ئەحمەد عەزاوی، کاظم سەماوی و چەند کەسێکی دیکە.

گەر وەك زنجیرەیەك رووداو بگەڕێینەوە سەر کودەتای ٨ی شوباتی ١٩٦٣، ئینجا پاش بەیاننامەی ژمارە ١٣ی بەعس بۆ لەناوبردنی شیوعییەکان، لە ٣ی تەموزی هەمان ساڵدا رۆڵەکانی ئەم حیزبە هەوڵی هاتنە سەرحوکم بدەن بەرووخاندنی حیزبی بەعسی درندە، تەنیا راپەرینی ٣ی تەموزی ١٩٦٣ ئەبوو مێشکی سەرکردە چەقیوەکانی ناو قوڕاوی پاشکۆیەتی بجولێنێت و رێبازی شۆڕشگێرانەیان پێ بگرێتە بەر، کەچی بە ئیشارەتێکی دەرەوەی وڵات پاشەکشەیەکی یەکجار ناپەسەندیان کرد و خوێنی هەزارەها هاوڕێیان کرد بە قوربانیی ئافەرینێکی ریڤیژنیزمی سۆڤێت.

قاعیدەی حیزب و جەماوەری حیزب نەك هەر بەم ئەم رێبازە چەوتە رازی نەبوون، بەڵکو بە هەموو شێوەیەك دژی وەستان بەڵام ئەنجام ئەوە بوو سەدان ئەندامی چالاك و تێکۆشەر باوەڕیان بە حیزب نەما و وازیان هێنا.

من کە لێپرسراوی زانکۆی بەغدا و رێکخستنی یەکێتیی قوتابیانی نهێنی عێراق بووم، کاتێك لێپرسراوەکەم حسێن جواد گومەر بوو داوای لێ کردم بە کۆمەڵ بچین بۆ ساحەی کەشافە بۆ پشتیوانی لە (ئیتیحادی ئیشتیراکیی) و چەپڵە لێدان بۆ عەبدولسەلام عارفی خوێنڕێژ، پێم گوت ئەمە گەورەترین خیانەتە ئێوە لە حیزب بگرە لە گەلی عێراقی ئەکەن. بە هیچ جۆرێك من ئەم فەرمانەی ئێوە جێبەجێ ناکەم و هەموو هاوڕێیان لەم هەڵوێست و گۆڕانەتان ئاگادار ئەکەمەوە. گوتم ئەم کارە وەك رێبازی سیاسی لە ١٠٠٪ هەڵەیە و تەسلیمبوونە بە حوکمێکی کۆنەپەرستی خوێنڕێژ و وەك کارێکی ئەخلاقییش بێ وەفایی و ناپاکییە لە هەزارەها شەهیدی دوێنێ و ئیسپاتی ئەوەش ئەکات سەرکردەکانی ئێستای حیزب بە هیچ جۆرێك سەربەخۆییان نییە لە بڕیاردانی ناو وڵات و گەلی خۆیان و تەنیا پاراستنی بەرژەوەندیی دەوڵەتی سۆڤێتە کە ئەمەش فڕی نییە بەسەر شیوعێتی و نیشتمانپەروەرییەوە.

کاتێك کە قاعیدە و جەماوەری حیزب بە توندی دژی ئەم هێڵە چەوتە راوەستان، سەرکردەکانی ئەم رێبازە کەوتنە پاشەکشە، بێگومان نەك بە باوەڕەوە بەڵکو بۆ پاراستنی پێگە حیزبییەکانیان و خۆکۆکردنەوە و ئامادەکاریی نوێ بۆ درێژەپێدان بە هەمان هێڵی سیاسیی خۆیان بە جۆرێکی دیکە.

## هێڵی ئاب (١٩٦٤)

ڕێکخراوەکانی حیزب بەبێزاری و دەربڕینی ناڕەزایی ڕووبەڕووی هێڵە پاکتاوییەکەی ئاب بوونەوە و ژمارەیەکی زۆریان وازیان لە حیزب هێنا و سەرەتاکانی تەکەتولە جیاجیاکان دەرکەوتن وەك کاردانەوە دژی سیاسەتە هەڵەکان و متمانە نەکردن بەو سەرکردایەتییەی کە هەیە. منیش یەکێك بووم لە کادیرەکانی حیزب و باوەڕمان وابوو کە پەیڕەوکردنی هێڵێکی شۆڕشگێڕ حیزب و جەماوەر سازئەکات بۆ گۆڕینی وڵات و ڕزگارکردنی لە حوکمە دیکتاتۆرییە دڕندەکە و دامەزراندنی حکومەتێکی نیشتمانیی دیموکراسی.

ئەوەبوو یاداشتێکمان پێشکەشکردن بە ناوی (تیمێك لە کادرەکانی حیزب) ئەم تیمە ناونرا کیتلەی (نەجم) کە نەجم ناوی نهێنیی هاوڕێ ئیبراهیم عەلاوی بوو لە حیزبدا، بێجگە لە خودی هاوڕێ ئیبراهیم عەلاوی و من، هەر یەك لە هاوڕێیان شەهیدی نەمر خالید ئەحمەد زەکی و شەهید ڕەئوفی حاجی قادر و شەهید ئەمین خەیون و فوئاد ئەلئەمیر و سەباح گۆرگیس و یوسف ڕەزین و ماجید عەلاوی و ئیبراهیم ئیسماعیل و نوری کەمال و ئەبو ناجی لەو کیتلەیەدا بوون.

لە یاداشتەکەدا باسی دۆخی حیزب و زەرورەتی سوودوەرگرتنمان کردبوو لەو نسکۆیەی کە حیزب توشی بوو، هەروەها هۆکارەکان و چارەسەرەکەشیمان باس کردبوو. لەو بارودۆخە ورد و هەستیارەدا هێڵی گشتیی ڕێکخراوەکانی حیزب بەتەواوی جیاواز بوون لەیەکتری. لەکاتێکدا کە لایەنگرانی هێڵی ئاب ئەیانویست هاوپەیمانی بکەن بەڵکو تەنانەت حیزب بتوێننەوە لەناو ڕێکخراوێکی پان و پۆڕی نەتەوەییدا (ئیتحادی ئیشتراکی) و بە ئاشکرا بانگەشەیان بۆ ئەمە ئەکرد و ئەیانگوت ئەوە ڕێگە ڕاستەکەی گەشەکردنی ناسەرمایەداری و ڕۆحی سەردەمە. لەبەرامبەر ئەوەدا چەند ڕەوتێکی شۆڕشگێڕ هەبوون کە گرنگترینیان ئەوەبوو کە دواتر بوو بە کیتلەیەك لە شێواز و ناوەڕۆکدا جیاواز بوو لەو کۆمیتە ناوەندییەی کە بە ناڕەوا باڵی کێشابوو بەسەر حیزبدا. ئێمە لە

(تیمی کادر)دا هیچ مەبەستێك و رەوتێکی جیابوونەوەمان نەبوو لە حیزب بەڵکو لە روانگەی پێگە رێکخراوەییەکەمانەوە لەناو حیزبدا هەڵئەسوڕاین و لەسەر بناغەی یەکێتیی حیزب کارمان ئەکرد بۆ هەڵبژاردنی سەرکردایەتییەکی شۆڕشگێڕ کە رابەرایەتیی جەماوەری چەوساوەی گەل بکات بۆ بنیادنانی حوکمێکی دیموکراسی و نیشتمانی.




لە راستەوە: ئیبراهیم عەلاوی، قەحتان ئەلمەلاك، فوئاد ئەلئەمیر، ماجید عەلاوی، ئەبو زەر، لەسەر مەزاری شەهید خالید ئەحمەد زەکی، ٢٠٠٣/١٢/١٠

مـــن ئەوكاتـــە، مەبەســـتم ســـاڵی ١٩٦٤ه، وەك باســـم كـــرد بەرپرســـیاری رێكخراوەكانی زانكۆی بەغدا بووم كاتێك كـە لێپرسـراوەكەم حسـێن جـەواد گومـەر (وەلید) پێی راگەیاندم كـە ئـەبێت بەشـداری بكـەین لـە ئاهەنگـەكانی دامەزرانـدنی ئیتحـادی ئیشـتراكیدا، مـن قبـوڵم نـەكردو گـوتم: "ئـەوە ئـەڵێی چـی؟" گـوتی: "گاڵتەیان پێبكە و بڵێ بژی قارەمانی سێ شۆڕشەكە"، مەبەستیشی عەبدولسـەلام عارف بوو. بەڵێ هەندێك ئەندامی مەكتەبی سیاسی ئاوا بیریان ئەكردەوە كە هـەرە دیارەكەیان باقر ئیبراهیم و سەلام ناسری (ئەنوەر مستەفا) بوون، ئەم هێڵە بڵێن و نەڵێن لە خزمەتی جەلادەكانی دوێنێدا بوون – لە خزمەتی بكوژەكانی سەلام عادل و جەمال حەیدەری و حەسـەن عوێنـە و ئەبوئـەلعیس و محەمـەد ئەلعـەبلی و نـافع یـــونس و ســـەدان كـــادری ســـەركردایەتی – (تـــاقمی شـــەمەندەفەری مـــەرگ و بەیاننامـەی ژمـارە ١٣)[١]دا بـوون. لەلایـەكی دیكـەوە ئێمـە رێكخراوەكانمـان بـەوە

---

[١] بەیاننامەی ژمارە ١٣: لە یەكـەمین رۆژی كودەتـا رەشـەكەدا حـاكمی عەسـكەری عەقیـد رەشید موسڵیح ئەلتكریتی بەیاننامەیەكی خوێناوی دەركرد بە ژمارە ١٣، كە تیایدا خـوێنی هەموو كەسێك لەهەر شوێنێك بێت حەڵاڵ دەكات پشتیوانی نەكات لە كودەتـا رەشـەكەیان و رادیۆ و تەلەفزیۆنی بەغداش خوێندیانەوە كە ئەمـە دەقەكەیـەتی "لەبەرئـەوەی شـیوعیە بـــەكرێگیراوەكان و هاوبەشـــەكانی عەبدولكـــەریم قاســـم هـــەوڵی بـــێ ســـەمەریان دا بـــۆ دروســـتكردنی ئـاژاوە و نائـارامی لـەناو ریزەكـانی گەلـدا و ملكەچـنەبوونیان بـۆ فـەرمان و رێنماییـە رەسمییـەكان، بڕیـار درا دەسـەڵات بـدرێت بـە یەكـە سـەربازییەكان و هێزەكـانی پۆلیس و حەرەس قەومی هەركەسێك لەناو ببەن كە بیەوێت ئاسایش تێكبـدات و ئێمـە داوا ئەكـەین لـە هـەموو رۆڵـە دڵسـۆزەكانی گـەل هاوكـاری دەسـەڵاتە نیشـتمانییەكە بكـەن بـە رێنماییكردنیان بۆ دۆزینەوەی ئەو تاوانبارانە و لەناوبردنیان، رەشید موسـڵیح ئـەلتكریتی" پاشان بەیانێكی تری بەدوادا دەركرد كە تیایدا هەڕەشەی لە هاوڵاتیان كـرد لـە داڵـدەدان و شاردنەوە و ئاسانكاریكردن بۆ هەڵهاتنی هەركەسێك كە دەسەڵات بەدوایدا دەگەڕێ و ئێمـە بەیاننامـــەی دووهـــەمیش دەنوســـینەوە لەبـــەر ئـــەوەی كـــە بەیاننامەیـــەكی مەترســـیدار و خوێناویـیـە و ئەمـەش دەقەكەیـەتی "لەبەرئـەوەی گـەلی بەخشـندەی عێـراق بەڕاسـتی

پەروەردە ئەکرد کە پێویستە توێژینەوە لەسەر رابردوو بکەن لەپێناو ئایندەدا لە رێگەی هێڵێکی شۆڕشگێڕی ئامانجدار و باوەڕمان هەبوو بە پەیوەندی لەگەڵ ئەو هێزە نیشتمانییانەدا کە ئامانجگەلی هاوبەش کۆمان ئەکاتەوە لەگەڵیاندا نەك لەگەڵ ئیتحادی ئیشتراکیی عەرەبیدا. ناشیرینترین مەسەلە لەم سیاسەت و لەم هێڵە پاکتاوییەدا ئەوەبوو ئەوان بەردەوام بانگەوازیان بۆ ئەکرد هەرچەندە رژێمی عارف ئەوانی قبوڵ نەئەکرد و رازی نەبوو بە کلکایەتییەکەیان و درێژەی ئەدا بە جێبەجێکردنی حوکمی ئیعدامی ناهەق دژ بە تێکۆشەران.

ململانێکە لەناو حیزبدا پەرەی سەند و ئێمە وەك (تیمی کادر) برەومان دا بە کارکردن و قوتابیان وەکو زۆرینەیەکی ئاشکرا و رۆشنبیران و بەتایبەت رێکخراوەکانی ئەندازیاران لەلای ئێمە بوون، ئەمەش لەو هەڵبژاردنانەدا بەرجەستە بوو کە ئەنجامدران بۆ هەڵبژاردنی نوێنەرانی قوتابیان و لە زانکۆکانی عێراقدا پاڵێوراوەکانی ئێمە زۆرینەی دەنگەکانیان بەدەستهێنا و بەهەمان شێوەش هەڵبژاردنەکانی سەندیکای ئەندازیاران لە بەرژەوەندیی پاڵێوراوەکانی ئێمەدا بوون.

تا ئەهات ئەو دەنگانە بەهێز ئەبوون کە داوایان ئەکرد حیزب کۆنگرە ببەستێت و ئەمە لە هەموو رێکخراوەکاندا پەرەی سەند. من کاتێك بیرەوەریی هەندێك سەرکردە ئەخوێنمەوە پاش تێپەڕبوونی دەیان ساڵ و ئەبینم پڕن لە بابەتی سەیر

---

پشتیوانی لە شۆڕش کردووە، ئەو شۆڕشەی کە سەربڵندی و کەرامەتی گەڕاندەوە بۆ عێراق و لەبەرئەوەی دەمانەوێت هەموو ئەو تاوانبارانە دەستگیر بکەین کە هەوڵ دەدەن ئاسایش بشێوێنن، دەسەڵاتەکان رایدەگەیەنن کە توندترین سزای یاسایی دەرهەق بەوکەسانە دەگرنە بەر کە هەوڵ دەدەن هەڵاتنی تاوانباران بشارنەوە یان یارمەتیان بدەن یان ئاسانکارییان بۆ بکەن یان ئامادە نەبن شوێنی ئەو تاوانبارانە بدرکێنن".

(تالب شبیب)ی ئەندامی قیادەی قوتری حیزبی بەعس و یەکێك لە سەرکردەکانی کودەتا رەشەکە لە بیرەوەرییەکانیدا لە کتێبی (گفتوگۆی خوێن) کە ساڵی ١٩٩٩ لە لوبنان – بەیروت بڵاوکرایەوە، دەڵێت "ژمارەی کوژراوەکانی گەلی عێراق لە رۆژانی کودەتا رەشەکەی ٨ی شوباتی ١٩٦٣دا لەنێوان ٥٠٠٠ تا ١٢٠٠٠ کەس بوو."

و سـەمەرە و بـە خێرایـی بـە رووداوەکانـدا تێئەپـەڕن، ئـەو رووداوانـەی کـە کـاری خراپیـــان کـــردە ســـەر ڕێبـــازی حیـــزب و لـــەبری پـــەیڕەوکردنی سیاســـەتێکی شۆڕشگێڕانە بە قۆستنەوەی دەرفەتە گەورەکە پاش رووخـانی حـەرەس قـەومی و دوای ئەوەی جەماوەر جارێکیکە روویکردەوە حیزب، بە ئاشـکرا جیاوازییـەکی زۆر فراوان ئەبینم لەنێوان توانای سەرکردایەتی و ئاسـتە تیـۆری و پراکتیکییەکـەی بـە بـەراورد بـە قاعیـدەی حیـزب کـە کـۆڵی نـەدا و ملـی نـەدا بـۆ هێڵـە راسـتڕەوە خۆڕادەستکەرەکە. لەئەنجامی ئەوەشدا چەندین دابەشـبوونی گـەورە روویانـدا کـە دواتر بوونە هۆی کەرتکردنی ریزەکانی حیزب بەشێوەیەکی تەواو کاریگەر.

تەکەتولی لیژنەی ناوچەی بەغدا کە گـەورەترین رێکخـراو بـوو لـە بەغـدا رێگـەی ئـەوەی گرتەبـەر کـە داوای راپـەڕینی میللـی بکـات بـۆ رووخانـدنی حکومـەت و وەرگرتنـی دەسـەڵات. هەڵسـوڕاوانی ئـەم تەکەتولـە تـەواو یەکـدەنگ نـەبوون لـە چۆنێتی راپەڕین و میکانیزمەکانیدا، بەڵکو سەرکردەی وایان تێدا بـوو کـە لـە بـاڵی راستڕەو بوون و بەو هیوایە سواری شەپۆلە شۆڕشگێڕییەکە بووبوون کە کـۆنترۆڵی بکەن، لەوانە حسێن جواد گومەر و پیتەر یوسف. بۆ نمونـە خوالێخۆشـبوو حسـێن جـواد گومـەر یـەکێك بـوو لـە جێبـەجێکارە هـەرە دیارەکـانی هێڵـە بـەدناو و بـەد ناوەڕۆکەکـەی ئـاب. بـەڵام لـە نووسـینگەی رێکخـراوی بەغـدادا ئەنـدام و بگـرە چـالاکترین ئەندامیشـیان بـوو، عـەزیز ئـەلحاجیش لـە ئـەوروپاوە گـەڕابووەوە و بیروبۆچونی وای هەبوو جیاواز لە بیروبۆچونی مەکتەبی سیاسی لەبەرئەوە سـواری شەپۆلەکە بوو چونکە ئەندامی مەکتەبی سیاسی و نووسەرێکی بەناوبانگ و کـۆنترین ئەندامیش بوو لەچاو هاوڕێکانیدا لە ناوچەی بەغدا کە سەرپەرشتی ئەکرد.

لەلایـەکی دیکـەوە رەوتێکـی دیکـە دەرکـەوت بانگـەوازی ئـەوەی ئـەکرد کـە گۆڕانکـاری تـەنیا بـە شـۆڕش دێتـە دی لـە رێگـەی کودەتایـەکی سـەربازی پشتیوانیلێکراو بە راپەڕینی میللی. رێکخراوەکانی حیزب کەوتنـە مشـتومڕی گـەرم سەبارەت بە هێڵی راپەڕینی میللی و هێڵی کاری یەکلاکەرەوە (کودەتای سـەربازی

و شۆڕش) و لایەنگرانی ئەم بیروبۆچونە پێیان وابوو کە ئەوە پێی ناگوترێت کودەتا بەڵکو شۆڕشێکە لە ڕێگەی کردەوەی سەربازی هاوڕێ لەگەڵ ڕاپەڕینی میللی کە پشتیوانی لێ ئەکات.

هەر وەك باسیشم کرد، هێڵی (تیمی کادر)یش وەك ئاراستەیەکی دیکە دەرکەوت و بانگەوازی ئەکرد بۆ خەباتی چەکداری وەك ڕێگەیەك بۆ ڕووخاندنی دەسەڵاتە دیکتاتۆرییەکە.

ئا لەم کاتەدا من پەیوەندیم کرد بە ژمارەیەك هاوڕێوە لە ڕێکخراوەکانی لقی کوردستان و ئەم ڕێکخراوە تاڕادەیەك شۆڕشگێڕ بوو کە حیزب سەدان چەکداری هەبوو هاوپەیمان بوون لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستان لە شۆڕشی کوردستاندا. جەنگاوەرەکانی حیزب لە قۆناغە جیاجیاکاندا گەلێك قارەمانێتییان تۆمار کردووە و ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە شیوعیەکان خاوەنی وزەی شۆڕشگێڕین. بێگومان پاش کودەتاکەی ٨ی شوباتی ١٩٦٣ و قەڵاچۆکردنی شیوعییەکان لەسەردەستی کودەتاچییەکان، حیزبی شیوعی پەیوەندی کرد بە شۆڕشی کوردستانەوە. ئەم بابەتەش بەشێکی دیکەی هەیە کە لە بیرەوەرییەکانمدا تۆماری ئەکەم بەڵام پێویستە لێرەدا بەپەلە ئاماژە بکەم بۆ ئەوەی کە هەڵوێستی پارتی دیموکراتی کوردستان بە سەرۆکایەتیی مەلا مستەفای بارزانی نەمر لە مێژوودا بیرناچێتەوە چونکە سەدان و هەزاران شیوعیی هەڵاتووی دەستی چەوساندنەوەی بەعسی لەئامێز گرت.

هاوڕێی شەهیدی سەرکردەی هەڵکەوتوو لە کوردستان (ڕەوفی حاجی قادر)م ڕازی کرد پەیوەندی بکات بە تیمەکەی ئێمەوە، ئەویش هاوڕێ ئیبراهیم عەلاوی بینی و بوو بە کەسێکی زۆر نزیك لە تیمی کادر بگرە بوو بە یەکێك لە ئێمە.

ڕەوفی حاجی قادر ئەندامی لقی حیزبی شیوعی و کرێکارێکی بەتوانای میکانیك و کەسێکی کۆمەڵایەتی و شیوعییەکی هەرە بەناوبانگ بوو. هەرچەندە لە سەردەمی (نوری سەعید)ەوە شیوعی و خاوەنی بیری شۆڕشگێڕانە و

خۆشەویستی لیژنـەی لـق و شـیوعییەکانی کوردسـتان بـوو، بـەڵام دواجـار و دوای ساڵانێکی زۆر ژیانی موختەفێتی لەسەردەستی بەکرێگیراوانی ئەمن و ئیستیخبارات لە سـلێمانی شـەهید کـرا و ئەگـەر شـەهید نەکرایـە لەبارییـدابوو ڕۆڵێکـی گـەورەی بگێڕایە لە کوردستاندا. لەو ڕۆژانەدا حیزب ڕۆڵەی ئازا و نەبەزی هەبوو لە سـلێمانی کە بەرەنگاری هێرشەکانی ئەمن و ئیسـتخبارات ئەبوونـەوە و نموونەیـەکی گەنجـە شۆڕشگێڕەکان بوون لە ڕێبازی ڕاستی حیزبدا.. ئـەبێت نـاوی شـەهیدان ئـەکرەمی حەپسە و جەمالی عەلی فایز و هـەروەها تێکۆشـەران مسـتەفا چاوڕەش و کـەمال شاکیر و حەمـە ئـەمینی بەریـد و تایـەر و عـەلی و سـەڵاح لـەبیر نەکـەم.. ئـەمان و دەیان هاوڕێی ئازای تر.

## سەرکردە سەرەکییەکانی ئـابی ١٩٦٤ کێ بوون؟

لێـرەوە ئـەبێت بگەڕێمـەوە سـەر مێـژووی دروسـتبوونی بـەرەی یـەمینیی نـاو سـەرکردایەتیی حیـزب کـە بـە هێڵـی ریڤیـژنیزم ناومـان ئـەبردن کـە سـەرەتای سەرهەڵدانی ئاشکرایان لە دەرکەوتنی سیاسەتی خرۆشۆفەوە سەرچاوە ئەگرێت.

کوتلەی سێ قۆڵیی بەهادین نوری و زەکـی خـەیری و عـامیر عەبـدوڵلا کـە ئەنـدامی مەکتەبی سیاسیی حیزب بوون، لەو کاتەوە ڕۆڵی گەورەیان هەبوو لە وەرچـەرخانی ڕێبـازی شۆرشگێڕیی حیزبی شیوعیی عێراقدا بەرەو جێبەجێ کردنی ڕێبازی نوێی خرۆشۆف.

ئەم سێ کوچکەیە بوونە گەورەترین کۆسـپ لـە ڕێـی شۆررشـگێڕێتیی حیـزب و جەماوەری عێراقیشدا و ئەم سیاسەتە ملهوڕییەی ئەمان بۆ لادەرە تەحریفییەکانی سۆڤێت گـورزی کوشـندەی لـە حیـزب دا و هێڵـی ئـابی ١٩٦٤یـش بەرهـەمی ئـەو سیاسەتە بوو کە سوارچاکانی دیکەیان هێنایە کایـەوە وەك سـەلام ناسـری و بـاقر ئیبراهیم کە دوو کەسی سەرەکی بوون لەم ڕێبازە کوشندەیەدا.

هەرچـــەندە هێڵـــی ریڤیـــژنیزمی (تـــەحریفی) لـــە تـــەموزی ١٩٥٩-١٩٦١ەوە دەستپێئەکات، لەو کاتەوە کە عەبدولکەریم قاسم دەستی کـرد بـە شـاڵاو بـۆ سـەر

ڕێکخستنەکانی حیزبی شیوعی، بە ڕێخۆشکردن بۆ هێزە کۆنەپەرستە شکاوەکان بـۆ گەڕانــەوە ســەر شــانۆ و هێرشــکردنیان بــۆ ســەر حیزبــی شــیوعی و هێــزە دیموکراتییەکان، لە هەمانکاتدا قاسم پەیوەندیی هاوکـاریی ڕەسمیشـی بـە حیزبـی شیوعییەوە هێشتبووەوە بۆ مەرامی خۆی.

بەرامبەر بەم بارە ئـاڵۆزە، حیـزب سیاسـەتێکی شۆرشـگێڕانەی نەگرتەبـەر و بـەهۆی جیاوازیی بیروڕای سەرکردایەتی و پارچە پارچە بوونیان لـە نێـوان هێڵێکـی شۆرشـگێڕانە بـۆ دەسـەڵات وەرگـرتن و هێڵـی دیکـەی بـەهێزتر کـە پێچـەوانەی ئەمـە بـوون و هێڵـی خۆبەستنەوەبوون بە ڕاوێژکاریی حیزبی شیوعیی سۆڤێت و بەرژەوەندییەکانییـەوە. ئـەو کاتە حکومەت دەستی دایە لێدانی ڕێکخستنەکانی حیزب و دۆستەکانی لـە نـاو سـوپادا و بە پەرش وبڵاوکردنەوە و دەرکردنیان گورزێکی کوشندەی لەو ڕێکخستنە پتەوە وەشاند.

هەر ناوەرۆکی ئەم سیاسەت و فیکرە بوو کە هەمان تاقمی سێ کوچکەی عامیر و زەکی و بەهادین پێشڕەوی بوون و لە ساڵی ١٩٦٤ دا لە هێڵی ئابدا سەری هەڵدایەوە و بووە هەڵدێرێکی گەورەی نوێ بۆ ئەو حیزبە تێکۆشەرەی کە دوای کوشتن و بـڕین و لەناوبردنی ئەندام ولایەنگرەکانی، دوای شوباتی ١٩٦٣، ئازایانـە هەڵسـایەوە و بـە هیوای ڕێبازێکی شۆرشگێڕانەی نوێ دەست بە ڕێکخستنەوەی ریزەکانی کرایەوە.

چەند قورسە لام و چەند ئـازارم هەیـەکاتێك کـە بـیر لـەو ڕۆژانـە ئەکەمـەوە کـە بەتـەمای هــەڵهاتنی ڕۆژێکــی نــوێ بــووین لــە مێــژووی بزووتنــەوەی نیشــتمانی و شۆڕشگێریی عێراق، کە ئەگەر ئەو ڕێبازە سەربکەوتایە و دەسەڵاتمان وەربگرتایە، نەك عێراق بەڵکو گۆرانکاریی گەورە لە ناوچەکە و جیهانیشدا رووی ئەدا.

کوتلە سێ قۆڵییەکە پـێش سـاڵی ١٩٦٣، هـەولّیان دا شـەهید سـەلام عـادل لـە سکرتێری لابدەن و هادی هاشم بخەنە جێگای، ئەوە بوو هەردوو ڕابـەری گـەورەی مێــژوویی حیزبــی شــیوعی لــە عێراقــدا ســەلام عــادل و جــەمال حەیــدەرییان دوورخستەوە و ڕەوانـەی مۆسـکۆیان کـردن بـۆ ئـەوەی گۆرەپانەکـە بـۆ خۆیـان و ڕابەرە سۆڤێتییەکانیشیان تەخت ببێت.

هێڵــی ئــابی ١٩٦٤ وەرچــەرخانێکی کەمەرشــکێنی گــەورە بــوو کــە ئــەبێت هەتاهەتایــە نــاوی نەخشەکێشــەکان و جێبەجێکــەرەکانی لــە لیســتی رەشــی جوڵانەوەی شیوعی و نیشتمانیی عێراقدا بمێنێت.

بەرامبەر بەم هێڵە یەمینییە ئەڵقە لەگوێیە، رێکخسـتنەکانی حیـزب و جـەماوەر ملیان بۆ نەدا، بەڵکو بە توندی بەرهەڵستیان کرد و بە هـەموو شـێوەیەك دژی ئـەم لادانە راوەستان.

لەم بارودۆخەدا من زۆر چالاکانە و بە توندی دژی ئەم رێبازە چـەوتە کـارم کـرد و نەمهێشت تەنیا یەك کەسیش لە ئەندامانی ئەو لیژنـە و رێکخسـتنانەی بـەرپێوەم ئەبردن لەگەڵ ئەم رێڕەوە یەمینی و هەلپەرستەدا بڕۆن.

لە ئەنجامی ئەم سیاسەتە چەوتەدا رێکخستنەکانی حیزب لە واقیعدا پارچـە پارچـە بوو، لە رووی تێگەیشتن لـە ئامانجـەکانی حیـزب، لـە هەڵوێسـت بەرامبـەر بـە حـوکمی عێـراق، لـە شـێوەی کـارکردن بـۆ هێنانـەدی ئامانجـە نزیـك و دوورەکـانی حیـزب، لـە ناسینی دۆست و دوژمندا، لە تاکتیك و ستراتیجیدا، لە ناسین و هەڵوێست بەرامبـەر بـە یەکێتیی سۆڤێت و حیزبی شیوعیی سۆڤێت و بەگشتی جوڵانەوەی شیوعی لە جیهاندا.

کەواتە بە هیچ جۆرێك نە فیکری یەکگرتوو و نە رێکخستنی یـەکگرتوو لـە حیزبـدا نەما. بەرەڵڵایی و درکاندن و باسکردنی هەڵەکانی حیـزب و ناوهێنـانی سـەرکردەکان لە هەموو شوێنێکدا بووبووە کارێکی ئاشکرای دوور لە گشت پەیڕەوە لینینییەکان و بگرە دوور لە دابونەریتی ئاسایی نێوان هاوڕێیان. کەسـانی وەك ئێمـەش کـە شـەو و رۆژ خـەریکی دامەزراندنـەوەی رێکخسـتنەکانی حیـزب بـووین و ئامـادە بـووین بـۆ قوربانیدان و خۆبەکوشتندان لە رێگای حیزب و میللەتدا، بە خوێنگەرمییەکی یەکجار دەگمەنەوە، هیوامان بەو سەرکردایەتییە نەما و ئەگـەڕاین بـۆ چارەسـەرکردنێکی وەهـا کـە شۆرشـگێڕێتی و سـەربەخۆیی حیـزب بپـارێزین و کـار و تێکۆشـانمان بـە رێگـای راستدا بەرەو بەدیهێنانی ئامانجەکانمان ببەین کە رووخاندنی حوکمی کۆنەپەرست و دڕندەکان و بە کورتی وەرگرتنی دەسەڵات بوو لە سەروو هەموویانەوە.

بەو شێوەیە چەند بیروڕایەك لە ناو حیزبدا دروست بوو. هەندێك باوەڕیان بە گرتنە بەری ڕێبازی کودەتای سەربازی بوو کە لەگەڵیدا ڕاپەڕینێکی میللی ڕوو ئەدات و ئەبێتە شۆڕشێکی ڕاستەقینەی گەلی عێراق. بەرامبەر ئەمەش هەندێك ڕێکخستنی دیکەی ناو حیزب کە ناوەندەکەی لیژنەی ناوچەی بەغدا بوو و ڕێکخستنێکی زۆر فراوان بوو باوەڕیان بە ڕاپەڕینی میللی هەبوو، و بۆ ئەم ڕێبازەشیان پەنایان ئەبردە بەر بیروباوەڕ و ئەزموونی گەلان و حیزبە شیوعی وشۆڕشگێڕەکان لە مێژوودا.

لایەنی سێیەمیش لە ناو حیزبدا دروستبوو، کە بە ناوی ئەو یادداشتەوە ناونراین کە لە ژێر ناوی (فریق من کوادر الحزب)[1] واتە تیمێك لە کادرەکانی حیزب دامان بە مەکتەبی سیاسی. کادرەکانی ئەم تاقمە کادرە لە زۆر شوێنی جیا جیای ڕێکخستنەکاندا ڕۆڵی دیارمان هەبوو.

ڕێبازی ئەم ڕێگایەی سێیەم، خەباتی چەکدارانە بوو و لە پێناو ئەو ئامانجەدا چەندین شەهید و قوربانیی دیکەمان بەخشی خەباتەکەمان بووە بەشێکی دیار لە مێژووی جولانەوەی شیوعی لە عێراقدا. ڕاپەڕینی زۆنگاوەکانی خوارووی عێراق داستانێکە هەتا هەتایە ناوی ئازایەتی و لە خۆبووردنی تێکۆشەرەکانی ئەمێنێت و ئەچێتە پاڵ ڕاپەرینە مێژووییەکانی دیکەی حیزبی شیوعیی عێراقەوە.

[1] د. عەلی کەریم سەعید، لە کتێبی (العراق البیریة المسلحة – حرکة حسن السریع و قطار الموت ١٩٦٣) لاپەڕە ٢٠٨دا بەم جۆرە باس لە گروپی (فەریق ئەلکادر) ئەکات:

"تیمی کادر کۆمەڵێك بوون پێکهاتبوون لە (٤٠–٥٠) تێکۆشەری بەئەزموونی حیزبی کە ئەندازیار و نووسەر و دواتر بزنسمان ئیبراهیم عەلاوی سەرکردایەتی ئەکردن. ئەندامە دیارەکانی ئەم گروپە بریتی بوون لە ئەمین خەیون و مولازم فازیڵ عەباس و فاروق مەلا مستەفا. ئەم تیمە بەرهەڵستیی بزووتنەوەکەی ٨ی شوباتی ١٩٦٣یان کرد لە ناوچەی کازمییە، ئینجا پاشەکشەیان کرد بەرەو باشوور. تیمی کادر پێش جیابوونەوەی قیادەی مەرکەزی هەمان ڕەخنە و تێبینییەکانی قیادەیان هەبووە و لەژێر پەردەی نووسینگەیەکی ئەندازیاریدا کە لە گۆڕەپانی (نەصر) بوو لە بەغدا و ئیبراهیم عەلاوی و ماجید عەلاوی برای خاوەنی بوون، چالاکییان ئەنواند."

## ڕێکخستنەکانی تیمێك لە کادیرەکانی حیزب ( فریق من كوادر الحزب )

ڕێکخستنەکانی (فەریق) لەناو قوتابیان و ڕۆشنبیران و سوپا و کرێکاران و جوتیاراندا لە بەغدا و خوارووی عێراقدا هەبووین.

بۆ باسکردن لە هەندێك ڕاستیی مێژوویی ئەو کارەساتەی بەسەر گەورەترین و تێکۆشەرترین حیزبدا هات، پێویستە زیاتر باسی ئەو بارودۆخە بکەم کە تیایدا ڕوویدا لە ناو عێراق و لە دەرەوەی وڵاتیشدا کە دەیان ساڵ بەسەر ئەو ڕووداوانەدا تێپەڕیوە بەڵام من و هەزارانی دیکە بە ئازاری ئەو ڕۆژانەوە ئەتلێینەوە.

لە مانگی مایسی ١٩٦٤دا خرۆشۆف سەردانی قاهیرەی کرد و سیاسەتی نوێی سۆڤیت ڕووی لەسەر هەڵماڵرا. لە ناوەڕاستی مانگی ئابی ١٩٦٤دا بەیاننامە بەدناوەکەی حیزب وەك هاوتاییەك لەگەڵ سیاسەتی سوڤێت بە سەرکردەیی خرۆشۆف دەرچوو. لەو ڕۆژەوە بەرامبەر بەمانە بەرهەڵستیکردنی کۆمەڵە بچووکەکانی دژ بە ریڤیژنیزم و هێڵی یەمینی لە ناوچە جیاجیاکانی عێراقدا سەری هەڵدا و بە ئاشکرا لە ناو هاوڕێیانی ناو زیندانەکان و ڕێکخستنەکانی حیزب لە کوردستان و بەغدا و ناوەڕاست و خوارووی عێراق و دەرەوەی عێراقیشدا و تێکۆشانیان گەشەی سەند.

لە سەرەتادا، دژایەتیکردنی ریڤیژنیزم شێوازێکی نەرێنی (سەلبی) وەرگرت کە خۆی لە وازهێنانی بە کۆمەڵدا دەرخست لە ئەندامێتیی حیزب کە لە هەندێ جار و شوێندا ئەو دەستکێشانەوەیە گەیشتە ڕێژەیەکی زۆر بەرز، هەر بۆ نموونە لە بڵاوکرایەوەیەکی لیژنەی ناوەندی ڕێکخستن (لتم) کە لە ١٩٦٥/٠٩/١٠دا دەریکرد، ڕێژەکە گەیشتە ئاستێکی سەرسوڕهێنەر، بەجۆرێك کە بەیاننامەکە ئەڵێت:

"لە هەندێك ڕێکخراودا بۆ نمونە لە بەغدا (نەهرەین) ڕێژەی وازهێنان گەیشتۆتە ٥٠٪ و لە ڕێکخراوی (ب) باشووردا گەیشتۆتە ٢٥٪ و لە ڕێکخراوی حەیدەریشدا (واتە فورات) هەمان ڕێژە بوو."

حیزبی شیوعیی عێراق لە هەموو مێژوویدا وازهێنانی وای بەخۆوە نەدیبوو. تەنانەت ستەم و چەوساندنەوە دڕندە و بێبەزەییەکانی دژی حیزبیش نەیانتوانیبوو

تا ئەو کاتە ورەی شیوعییەکانی عێراق تێك بشکێنن و هەزاران بەندکراو مردنیان هەڵئەبژارد نەك وازهێنان لە حیزب یاخود راگەیاندنی بەرائە لە حیزب و لە شیوعێتی.

کەواتە نهێنی ئەم جۆرە وازهێنانە چی بوو؟ بە دڵنیاییەوە نە ئەنجامی سەرکوتکردنە درندانەکانی دوژمن و نە ترسنۆکیی ئەم ژمارە زۆرەی ئەندامان بوو، بەڵکو نارەزایی و نائومێدی و نەمانی متمانەیان بوو بەو سەرکردایەتییەی کۆنترۆڵی حیزبی کردبوو.

دژایەتیکردنی یەمینییەکان و ریڤیژنیزم بە گشتی لە هەندێك شوێندا یاخیبوونی رێکخراوەیشیی وەرگرت، هەر بۆ نموونە رێکخراوە کرێکارییەکانی چنین و خواردنەوە گازییەکان و پیشەسازیی پێڵاو لە حیزب جیابوونەوە. هەروەها لە ساڵی ١٩٦٤ دا گروپێکی بچکۆلە لە کادیرە حیزبییەکانی ناو رێکخراوی قوتابیان و هەندێك رێکخراوی دیکە کە یاداشتیان دژی سەرکردایەتیی حیزب بڵاوکردەوە، هەمان گروپ وتارێکی مونیر ئەحمەد (واتە بەهادین نوری)یان وەرگێرا و بڵاویان کردەوە. ئەو وتارەی بەهادین نوری لە گۆڤاری (مەسەلەکانی ئاشتی و سوشیالیزم)دا نووسیبووی و سەرکردایەتییە یەمینییەکەی حیزب هەوڵیدا ئەو وتارە لە ریزەکانی خوارەوەی حیزب بشارێتەوە، چونکە وتارەکە روخساری راستەقینەی سەرکردایەتییە ریڤیژنیستەکەی دەرخستبوو. لە پایزی ١٩٦٤ دا خرۆشۆف دارما و سەرکردایەتییەکەی حیزبیش کە بە رێی کلکایەتیکردنی حوکمی عەبدولسەلام عارفدا ملی رێگای گرتبوو، وردە وردە پاشەکشەی لە هەڵوێستە پڕ ریسواییەکانی کرد ئەوەش بە هیوای پاراستنی پێگەی خۆی و مانەوەی لە سەرکردایەتیدا.

بێجگە لەوە، لە ساڵی ١٩٦٥دا شەڕ لە کوردستاندا بەرپابووەوە کە ئەمەش گورزێکی دیکە بوو دژی درۆ و دەلەسەکانی ریڤیژنیستەکان کە باسی ١١ ئاسۆی درەوشاوەی گۆڕانی ناسەرمایەدارییان ئەکرد لە عێراقدا و خرۆشۆفیش پشتگیری ئەکرد. ئەو شەڕەی لە کوردستاندا بە فەرمانڕەوایی عەبدولسەلام عارف

دەستپێکردەوە شکاندن و ژێرکەوتنی سەرکردە یەمینییەکانی (ح.ش.ع) بوو کە هەموو سیاسەتەکانیان لەم روانگەیەشدا شکستی هێنا و ئینجا کەوتنە پێشبرکێ کردن لەگەڵ یەکتریدا بۆ وازهێنان لە هەڵوێستەکانی پێشوویان و بۆ ئەوەش ئەو دۆخە لە ناو حیزبدا نەتەقێتەوە، ئەوە بوو لە ئاکامی شەپۆلی ناڕەزایی بەرفراوان و لە ئەنجامی مایەپووچبوونی تەواوی هێڵی ئابی ١٩٦٤دا، سەرکردایەتییە ریڤیژنیستەکەی حیزب کە لە مۆسکو نیشتەجێ بوو بڕیاریدا سواری شەپۆلە شۆرشگێرە تازەکە ببێت و خۆی وا نیشان بدات کە وازی لەو رێبازە چەوتەی هێڵی ئابی ١٩٦٤ هێناوە، بۆ ئەو مەبەستەش رەشنووسی بەیاننامەیەکیان ئامادە کرد کە هەندێك رەخنەی لە دەسەڵاتی عەبدولسەلام عارف گرتبوو بەڵام کرۆکی هێڵە ریڤیژنیستەکەی لە چەند دەربڕینێکی لاستیکیدا هێشتبووەوە بە مەبەستی سەرلێشێواندن.

ئەو سەرکردایەتییە هەموو رێگایەکی پێچاوپێچیان ئەگرتە بەر بۆ رازیکردنی قاهیرە و ئیتحادی ئیشتراکی و رازی کردنی عەبدولسەلام عارف، بەڵام قاعیدەی حیزب بە گشتی و بە یەکدەنگی هەموو ئەو هەوڵانەیان پووچەڵ کردەوە و ئەو سەرکردایەتییەیان ناچار کرد کە دروشمی رووخاندنی دەسەڵاتی عەبدولسەلام عارف و ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستانی عێراق بەرز بکاتەوە.

## چەند راستییەکی دیکەی ململانێی ناو حیزب

لە سەرەتای ساڵی ١٩٦٧دا هێڵە گشتییەکانی ململانێ ناوخۆییەکانی حیزب ئاشکرا بوون و هەڵوێستی هەریەك لە کۆمیتەی هەلپەرستی بەغدا و کۆمیتەی ناوەندی (ریڤیژنیست) دەرکەوت.

هەر لەم کاتەدا عەزیز ئەلحاج دوای دوودڵییەکی زۆر و پاش چەندین ئاسانکاری کە هاوڕێ زافر (خالید ئەحمەد زەکی) پێشکەشی کرد لەپێناو بەهێزکردنی لایەنەکانی دژ بە هێڵی ئابی ١٩٦٤، گەڕایەوە بۆ عێراق، لەبەرئەوە کۆمیتەی ناوەندی پێی باش بوو گۆڕانکاری بکات لە پێکهاتەی دەستەکانی سەرۆکایەتیدا بۆ

دەربازبوون لەو ئیفلیجییەی کە لە ساڵی ١٩٦٥ەوە تێی کەوتبوو، زەکی خەیری (جەندەل)یش بۆ هەمان مەبەست گەڕایەوە. لەو روانگەیەوە بڕیار درا مەکتەبێکی سیاسی سەر بە کۆمیتەی ناوەندی پێك بهێنرێت کە زەکی و عەزیز و بەهادین نوری (مونیر ئەحمەد) بێجگە لە سکرتێر عەزیز محەمەد (نازم عەلی) کە لە دەرەوەی وڵات بوو لەخۆبگرێت. ئەمە لەو کۆبوونەوەیەی کۆمیتەی ناوەندیدا بڕیاری لەسەردرا کە لە مانگی شوباتی ١٩٦٧دا بە ئامادەبوونی هەموو ئەندامەکانی بەسترا. شانبەشانی ئەمەش لێپرسینەوە لەگەڵ هەندێك ئەندامی لیژنەی بەغدا کرا و بەرپرسە سەرەکییەکان دوورخرانەوە، بەڵام دەسەڵاتی سیاسییان هەروەك خۆی مایەوە چونکە لایەنگریان لەناو دەستەکانی سەر بە کۆمیتەی بەغدادا مابوون.

کۆمیتەی ناوەندی بۆ کەمکردنەوەی ناڕەزایی قاعیدەی حیزب بڕیاری دا (کودەتای سەربازی وەك سیاسەتێکی رەسمی حیزب رابگەیەنێت). هەر لەو ماوەیەشدا رێکخراوەکان بۆیان دەرکەوت کە ئامادەسازی ئەکرێت بۆ بەستنی کۆنگرەی نیشتمانیی حیزب. دەستپێکی کارەکانی ئەم مەکتەبە سیاسییە نوێیە دەرکردنی بڵاوکراوەیەکی ناوخۆ بوو لە ناوەڕاستی مانگی ئازاری ١٩٦٧دا دەربارەی (مەسەلەی کۆمیتەی بەغدا) و تیایدا ئاماژەی کردبوو بەو بارودۆخە تایبەتەی کە قەیرانە ناوخۆییەکەی حیزبیان قوڵ کردبووەوە و بە دەق ئەڵێت:

"یەکەمجارە لە ژیانی حیزبدا قاعیدەی حیزب رۆڵێکی کاریگەر و ئەرێنی بگێڕێت لە راستکردنەوەی سیاسەتە پراکتیکییە هەڵەکەی حیزبدا، هەرچەندە نەیتوانیبوو رۆبچێتە ناو رەگوڕیشە فیکرییە قووڵەکانی ئەو سیاسەتەوە."

پاشان مەکتەبی سیاسی لە ناوەڕاستی مانگی ئازاری ١٩٦٧دا و بە ناونیشانی (لەپێناو چالاککردن و ئاڕاستەکردنی ململانێ فیکرییەکان) لەناو حیزبماندا بڵاوکراوەیەکی ناوخۆی دیکەی دەرکرد کە ئەم بڵاوکراوەیە دەنگدانەوەیەکی باشی هەبوو بەتایبەت پاش کۆبوونەوەکەی نیسانی ١٩٦٥ چونکە بە رێژەیەك لە

ئاشکرایی و بە ناوی مەکتەبی سیاسییەوە رەخنەی لە هێڵە تەحریفییەکە ئەگرت، ئەمەش ریزەکانی خوارەوەی حیزبی هاندا ئەم رەخنەگرتنە فراوان بکەن و داوای دوورخستنەوەی ئەوانە بکەن کە لە دەزگا سەرکردایەتییەکانی حیزبدا بەرپرسیارن لە هێڵی ئاب، شایەنی باسە بڵاوکراوەکەی مەکتەبی سیاسی هەرچەندە لە پێشەکییەکەیدا بەشێوەیەکی راست مەسەلەکەی باس کردبوو بەڵام لە کۆتاییدا کەوتە پاساو هێنانەوە بۆ هەڵوێستە پڕ لە هەڵەکەی کۆمیتەی بەغدا و ئەڵێت: "دواکەوتن و هەڵئەنگوتنی بەردەوام لە هەڵسەنگاندنی سیاسەتەکانی پێشوودا و دارشتنی رێبازی حیزب، هۆکار بوون بۆ گۆڕینی وتی وتی و نائارامییەکە بۆ قەیرانێکی قووڵی ناوخۆیی. لەڕاستیدا قەیرانەکە قوڵتربووەوە لە ئاکامی ئەو هەڵانەی کە روویاندا لەکاتی هەڵمەتی رۆشنبیرکردنی هاوڕێیان بە تەکتیکە رەسمییەکەوە (واتە شێوازەکانی خەبات) و ئەمەش بووە هۆی دابڕان لە خەباتی جەماوەریی و لەلایەکی دیکەشەوە بووە هۆی خولقاندنی کەشوهەوایەکی تازەی گونجاو بۆ بوژاندنەوەی چەمکە راسترەوەکان بە بیانووی قەڵاچۆکردنی هەڕەشەی (چەپڕەوی) و گشت ئەم بارودۆخانە کێشەی تیژ و قووڵیان دروستکرد لە هەندێك رێکخراوی گەورەدا."

دواجار بڵاوکراوەکە هێرشی کردە سەر "فیکر و رێبازە هەڵەکان لە مەسەلە نێونەتەوەییەکاندا" و ئەڵێت: "هەندێك هاوڕێمان لە ریزەکانی خوارەوەی حیزب هەروەها لەناو خودی ئەو کادیرانەدا بە خرۆشەوە کەوتنە برینداركردنی هەڵوێستی هەندێك وڵاتی شۆسیالیست لە هەموو جێگایەك."

ئەم بڵاوکراوەیە کە شێوازی نوسینی (عەزیز) و (زەکی)ی پێوە ئەبینرێت، دەریئەخات کە نووسەرەکانی دەستیان کردووە بە پاشەکشێ لە هەڵوێستە رەخنەییەکانی پێشوویان سەبارەت بە هەندێك سیاسەتی سۆڤێتی. پێشتر عەزیز لە نامیلکەیەکدا بە ناونیشانی (دەربارەی گەشەکردنی ناسەرمایەداری لە عێرقدا – شوباتی ١٩٦٥) غەمباریی خۆی راگەیاندبوو لە نووسینەکانی عەلی خانۆڤا و

هەڵوێستەکانی گۆڤاری (نیوتایمز)ی سۆڤێتی کە ستایشی حوکمی عارف و داوای هەڵوەشاندنی حیزبی شیوعیی عێراقییان کردبوو. هەروەها رەخنەشی گرتبوو لە رۆژنامەی ئەلئەخباری بێروتی چونکە لایەنگری حوکمی عارف بوو لە عێراقدا (بڕوانە نامیلکەی: الاستعمار الجدید ١٩٦٦)، بەڵام پاش ١٩٦٧ زەکی خەیری (جەندەل) پاشەکشێی کرد لە هەڵوێستە کاتییەکانی و دواتر عەزیز ئەلحاجیش شوێنی کەوت، کە تەنانەت پاش راپەڕینەکەی پاکسازی دژی هەموو رەخنەگرتنێکی ئاشکرابوو لە (ریڤیژنیزمی سۆڤێتی). هەڵسوکەوت و رێبازی ئەم دوو کەسە هەوڵی رازیکردنی ئاڕاستە شۆڕشگێڕییەکەی قاعیدەی حیزب و هەڵوێستە ریڤیژنیستەکانی حیزب بوو لە یەککاتدا، باشترین بەڵگەش لە رەشنووسی (بەرنامەی حیزبی شیوعیی عێراقی)دا دەرئەکەوێت کە هاوینی ١٩٦٧ بڵاوکرایەوە و دروشمە سەرەکییەکەی بریتی بوو لە: "کۆمارێکی دیموکراسیی شۆڕشگێڕ لەژێر سەرکردایەتیی چینی کرێکار بۆ تەواوکردنی شۆڕشە نیشتمانییە دیموکراسییەکە و دەستپێکردنی شۆڕشە سۆشیالیستییەکە". دیارە ئەمەش لەژێر کاریگەریی دروشمەکەی خرۆشۆفدایە کە لە کۆتایی ساڵی ١٩٦٣دا رایگەیاند و ئەڵێت حکومەتە بۆرجوازییەکان لە ئاسیا و ئەفریقادا (دیموکراسیی شۆڕشگێڕن) و هەوڵ ئەدەن بە رێگەی گەشەکردنی ناسەرمایەدارییەوە بگەنە سۆشیالیزم.

لەدوای بڵاوکراوەی (ململانێی فیکری)، مەکتەبی سیاسی بڵاوکراوەیەکی دەرکرد دەربارەی چەمکەکانی (ستراتیج و تەکتیك) کە ئەمە دوایین بڵاوکراوەی حیزبییە لەو ماوەیەدا و ئەمەش لەگەڵ دوو بڵاوکراوەکەی پێش خۆیدا ئەیانتوانی قاعیدەی حیزب جۆش بدەن بۆ یەکلاییکردنەوەی مەسەلەکە لەگەڵ جەمسەرەکانی هێڵی ئابی ١٩٦٤، بەرپرسیارانی ئەو بڵاوکراوەیە خێرا هەستیان بە مەترسییەکە کرد و لە مانگی ئازاری ١٩٦٧دا دەستیان کرد بە دژەهێرش بە ئەنجامدانی گۆڕانکاری لە هەندێك رێکخستندا و بە دەرکردنی ئامۆژگاری دژ بە هێڵی ئاب ئەجووڵایەوە، بەمەش کێشە ناوخۆییەکان لە تەقینەوە نزیکبوونەوە.

# راپەڕینی پاکسازی

کە دەستدرێژییە زایۆنییەکە لە ٥ی حوزەیرانی ١٩٦٧دا دەستیپێکرد بارودۆخی سیاسی لە عێراقدا ئاڵۆزبوو، بۆیە جەماوەری عێراق دژی دەسەڵاتی عارف کەوتە جووڵە چونکە ئەو دەسەڵاتە نەچوو بەدەنگ هەردوو گەلی میسری و سورییەوە و لەهەمان کاتیشدا هێزە دیموکراسییەکانی ئەچەوساندەوە و سەرکوتی ئەکردن.

لەم بارودۆخە روو لە تەقینەوەیەدا سەرکردایەتی حیزبی شیوعیی عێراقی نەیئەتوانی لەپشت کۆمەڵە دروشمێکی شۆڕشگێڕیی بەتاڵەوە سیاسەتی کلکایەتی خۆی بشارێتەوە یاخود داوا لە ئەندامانی خوارەوەی حیزب بکات چاوەڕوان بن هەتا ئامادەسازییەکان تەواو ئەبن گوایە بۆ رووخاندنی دەسەڵات چونکە ئەم سەرکردایەتییە بە جدی داوای لێ ئەکرا هەڵوێستی راستەقینەی خۆی ئاشکرا بکات کە یان لەپێشەوەی جەماوەری شۆڕشگێڕەوە بڕوات بۆ روخاندنی حوکمی عارف یاخود دەمامکە شۆڕشگێڕیی و کودەتاییەکەی دابکەنێت. بەڵام ئەوەی کە ئەم سەرکردایەتییە ریڤیژنیستە کردی مەسەلەیەکە ئەیسەلمێنێت کە بەشێوەیەکی کۆتایی لەڕووی سیاسییەوە نابووت بووە، چونکە بە درێژایی شەش رۆژەکەی جەنگ کۆمیتەی ناوەندی خۆی شاردەوە لە رێکخراوەکانی حیزب و بەناوی زنجیرەیەك کۆبوونەوەی نەزۆکەوە گۆڕەپانە سیاسییەکەی بۆ هێزەکانی دیکە و بۆ بزووتنەوەی خۆڕسکی جەماوەر جێهێشت.

پاشان لە کۆتایی جەنگەکەدا کۆبوونەوەکە بانگەوازێکی نامۆی لێکەوتەوە کە داوای ئەکرد پشتگیریی دەسەڵاتی عارف بکرێت و دروشمی رووخاندنی دەسەڵات رەت بکرێتەوە، ئەو دروشمەی کە قاعیدەی حیزب لە مانگی نیسانی ١٩٦٥دا سەپاندنی، ئەمە قەیرانە ناوخۆییەکەی حیزب و ململانێی نێوان ئاڕاستە و تەکەتولە جیاجیاکانی گەیاندە ئاستێکی هێندە ترسناك کە لە مێژووی حیزبدا بێوێنە بوون. یەکێك لە ئەنجامەکان هەرەسهێنانی هاوپەیمانێتیەکەی نێوان هەریەك لە عەزیز ئەلحاج و زەکی خەیری بوو کە بە تەواوی کۆنترۆڵی مەکتەبی

سیاسی و سیاسەتی هەموو حیزبی کردبوو. زەکی بە تەواوی روویکردە تاقمی هێڵی ئاب کە پێکهاتبوون لە بەهادین نوری و عامیر عەبدوڵلا و سەلام ئەلناسری و لایەنگرەکانیان، لەکاتێکدا کە عەزیز ئەلحاج چووە باوەشی تاقمەکەی بەغدا و هێڵە سیاسییە هەلپەرستەکەی ئەوانی گرتەبەر و وازی هێنا لە هەموو رەخنەگرتنێك لە ریڤیژنیستی جیهانی.

لەگەڵ سەرهەڵدانە خێراکەی تەکەتولە کۆنەکاندا یاخیبوونێکی دەستبەجێ لەناو ریزی کادیرە ناوەندییەکاندا دەرکەوت کە هاوپەیمان بوون لەگەڵ لێپرسراوی هێڵە سەربازییەکەدا و لە رۆژانی جەنگەکەدا بەیاننامەیەکیان دەرکرد رەخنەی لە کۆمیتەی ناوەندی گرت و بە ناوی (کۆنگرەی شیوعیی عێراقی) ئیمزایان کرد، کە ئەمە رێکخراوێکە لە راستیدا بوونی نەبوو. بەیاننامەکە ناڕاستەوخۆ رەخنەی لە کلکایەتیکردنی یەکێتی سۆڤێت ئەگرت و داوای کرد پشت ببەسترێت بە هێزە خودییەکانی گەلانی عەرەبی.

هەرچەندە ئەم بەیاننامەیە کاریگەرییەکی ئەوتۆی دروست نەکرد لەسەر رێکخستنەکانی حیزب بەڵام رۆڵی هەبوو لە تەقاندنەوەی ململانێکەی نێوان باڵە جیاجیاکانی ناو کۆمیتەی ناوەندی و هەروەها لە تەقاندنەوەی ململانێ لەنێوان کۆمیتەی ناوەندی و کۆمیتەی بەغدادا. ئەوەبوو کۆمەڵێك لە کادری حیزب کە دژ بە ریڤیژنیزم و دواتر بە ناوی (فەریق ئەلکادر) ناسران دەستپێشخەرییان کرد لە رێکخستنی ریزە ناڕازییەکانی ناو حیزب و کردیان بە هێزێکی ئەوتۆ کە بتوانێت سەرکردایەتییە ریڤیژنیستەکە بەرکەنار بکات.

فەریق ئەلکادر، کە من رۆڵێکی زۆر دیارم هەبوو تیایدا، هەوڵی رێگرتنەبەری سیاسەتێکی شۆڕشگێڕانەی راستەقینەی دا لەناو حیزبدا وەك لە شوێنێکی تردا بە درێژی باسی ئەکەم.

## کۆنفرانسی ( فریق من کوادر الحزب - تیمێك لە کادیرەکانی حیزب )

بۆ لێکۆڵینەوە لە باری نوێی حیزب و ناکۆکییەکانی، ڕێکخستنەکەمان بڕیاری دا کۆنفرانسێك ببەستێت، ئەوە بوو لە سەرەتای ساڵی ١٩٦٨دا لە گەڕەکی عامل (حی العامل) لە بەغدا کۆنفرانس بەسترا. لە کۆنفرانسەکەدا ٣٠ هاوڕێ بەشدار بوون، ئیبراهیم عەلاوی، خالید ئەحمەد زەکی، فاروق مەلا مستەفا، ماجید عەلاوی، نوری کەمال ئەلعانی، ئەبو سەبری، ئیبراهیم ئیسماعیل ..تاد. هەموو ئەندامانی کۆنفرانس لە شوێنی جیاجیای ناو بەغداوە بەهۆی هاوڕێ ماجید عەلاوییەوە ئەگەیەنرانە شوێنی کۆبوونەوەکە و چەند هاوڕێیەکیش پاسەوانیی چەکدارانەی کۆبوونەوەکەیان کرد.

پاش لێدوان لە باری سیاسیی عێراق و دەرەوەی وڵات بە درێژی، ئامادەبووان بەشدارییەکی تێروتەسەلی گیروگرفتەکانی حیزبیان کرد و بەگشتی و بە کۆی دەنگ ئیدانەی هەڵوێستی یەمینیی سەرکردایەتیی لیژنەی مەرکەزییان کرد و هەموو ئەگەڕاین بەدوای چارەسەرێکی وەهادا کە یەکێتیی ناو قاعیدەی حیزب و پەیوەندیی توندوتۆڵ بە جەماوەری گەلەوە بپارێزین.

کۆنفرانسەکە لەبارەی بوونی دوو لایەن کە یەکێکیان بەناوی حیزبی شیوعیی عێراق – لیژنەی مەرکەزی و ئەویتریان بەناوی حیزبی شیوعیی عێراق – سەرکردایەتیی کاتی کار ئەکەن، ئێمەش کە لە ساڵانی پێشووەوە هەڵوێستمان بەرامبەر سیاسەتی حیزب و هێڵی گشتیی ئێستا و ڕەچاوکردنی ئەرکەکانی ئەم حیزبە تێکۆشەرە هەیە لە دواڕۆژدا، ئەمانە هەموویان گەیاندنینە ئەوەی کە ڕاسترین بڕیار ئەوەیە بکەوینە گفتوگۆ لەگەڵ سەرکردایەتیی کاتی بۆ یەکخستنی تێکۆشانمان بەرەو سیاسەتێکی شۆڕشگێڕانەی پشتبەستوو بە پەیڕەوە مارکسیزم – لینینیزمەکان.

بۆ ئەو مەبەستە سێ کەس هەڵبژێردرا: ئیبراهیم عەلاوی، خالید ئەحمەد زەکی، فاروق مەلا مستەفا. ئەوەبوو لە چەند ڕۆژێکدا دەستمان کرد بە گفتوگۆ لەگەڵ: عەزیز ئەلحاج، حسێن جواد گومەر، مالیك مەنسوور و حەمید ئەلساقی وە ئەنجام بەیاننامەی (یەکگرتنی حیزب – وحدة الحزب) لەنێوان سەرکردایەتیی کاتی و تیمی کادرەکانی حیزبدا دەرچوو کە بووین بە یەك و کاروباری ڕێکخستن درایە دەست لیژنەیەکی هاوبەش بۆ یەکخستنەوەی ناو ڕێکخراوەکان.

## سەرەتاکان

هەنگاوە سەرەتاییەکانی ئەم کارە لە ساڵی ١٩٦٤دا بە بڵاوکردنەوەی یاداشتێك دەرکەوت کە دابەشکرا بەسەر رێکخراوەکانی حیزبدا و رەخنەی لە رێبازە ریڤیژنیستەکە ئەگرت. پاشان ئەم کۆمەڵە کادیرە لە مانگی مایسی ١٩٦٧دا هەنگاوێکی تریان دەستپێکرد. ئەوەبوو لە بارودۆخی پاش دەستدرێژییەکەی ٥ی حوزەیراندا هەندێك کادری حیزب لە مانگی ٣٠ی حوزەیرانی ١٩٦٧دا کۆبوونەوە و تیایدا بڕیار درا ئامانجەکانی ریزەکانی خوارەوەی حیزب رابگەیەنرێت کە بریتییە لە دوورخستنەوەی سەرکردایەتییە لادەرەکە و بەستنی کۆنگرەی نیشتمانیی حیزب و هەڵبژاردنی سەرکردایەتییەکی نوێ کە قاعیدەی حیزب پشتیوانی لێ بکات و حیزب بە ئاڕاستەی شۆڕشێکی مارکسی لینینیدا ببات و ئەوە دەستەبەربکات کە حیزب هەر پێشەنگی چینی کرێکاری عێراق بێت لەڕێی خەباتێکی جدی و راستەقینەوە بۆ رووخاندنی دەسەڵاتە عارفییە کۆنەپەرستەکە و دامەزراندنی کۆمارە دیموکراسییە میللییەکە. دوای چەند رۆژێك کۆبوونەوە، رەشنووسی یاداشتە پێشنیارکراوەکان ئامادەکرا و نیشانی هەندێك کادری حیزب درا بۆ دەستەبەرکردنی بەشداربوونی زۆرترین ژمارەیان. لەهەمان کاتیشدا هاوڕێ زافر کە هەمان خالید ئەحمەد زەکی کەسی دووەمی حیزب بوو یاداشتێکی نووسی بۆ کۆمیتەی ناوەندی (تەموزی ١٩٦٧) کە ئەو خاڵانەی لەخۆگرتبوو کە لە کۆبوونەوەکەی ٣٠ی حوزەیراندا پەسەندکرابوو. جا لەبەر گرنگی ئەم یاداشتە و لەبەرئەوەی یەکێکە لەو بەڵگەنامە سەرەتاییانەی کە هەوڵیان دا حیزب بگەڕێتەوە بۆ هێڵە مارکسی – لینینییەکە و ئامانجەکانی جەماوەری حیزبی بەشێوەیەکی راست و دروست داڕشت و یەکێك بوو لە گوللە تەقێنراوەکان لە جەنگی یەکلاکەرەوە دژی سەرکردایەتییە ریڤیژنیستەکە، ئێمە لێرەدا چەند بڕگەیەکی بە نمونە ئەهێنینەوە:

"لەسەرەتای پەنجاکانەوە، واتە پاش قۆناغی سەرکردایەتی هاوڕێ فەهد، حیزبمان گیرۆدەی بیروبۆچون و سیاسەتە راستڕەوەکان بووە و لە ناوەڕاستی

١٩٥٩وە ئەم بیروبۆچوون و سیاسەتانە بەرجەستەتر بوون، بەڵام لەماوەی نێوان حوزەیران – ئابی ١٩٦٤دا بەرەو کامڵبوون چوو لە رەوتێکی ریڤیژنیستیدا کە رووخسار و سنوورێکی ئاشکرای هەبوو. ئەم ئاراستەیە نەك هەر لە مەسەلە تەکتیکییەکاندا بەڵکو لە ستراتیجیشدا لە مارکسییزم و لینینیزم لایدا. ئێمە لێرەدا کارمان تاوتوێکردن و بەدرۆخستنەوەی ئەم رەوتە پاکتاوخوازە نییە بەڵام پێمان خۆشە ئاماژە بکەین بۆ ئەو راستییەی کە سەرباری تێپەڕبوونی زیاتر لە دوو ساڵ و نیو بەسەر هەوڵی هەموارکردنەوەیدا کەچی تا ئێستا بە جدی رەگوڕیشە هزرییەکانی و هۆکارە بابەتی و خودییەکانی روون نەکراونەتەوە و بە هیچ شێوەیەك رەخنە لەخۆگرتن پەیڕەو نەکراوە و حیزب ئەندامەکانی هوشیار نەکردووەتەوە لەو هەڵە گەورانە. بەڵام ئایا چۆن ئەتوانین تەنانەت هەر بیریش لە کاری وا بکەینەوە لەکاتێکدا کە زوربەی هاوڕێ بەرپرسیارەکان لەو دۆخە و لە جێبەجێکردنی ئەو رەوتە خۆیان لە پێگە باڵاکانیاندا ماونەتەوە و دوورن لە لێپرسینەوە قورسەکەی کە شایستەیانە. هەر ئەوە نا بەڵکو لەوەش خراپتر کە زوربەی ئەوانە و لە ئەنجامی سروشتە راڕا و رەنگاوڕەنگ و بێ پرنسیپەکەیان، دروشمی شۆڕشیان زۆر بەرز کردەوە و خۆیان لەگەڵ بارودۆخە تازەکاندا گونجاند. پاش هەموو ئەمانە ئایا شتێکی نامۆ نییە کە ئاسەوارەکانی هێڵی ئابی ١٩٦٤ تائێستا بمێننەوە و حیزبمان بڕزێنن بە ناوی جیاجیا و دیمەنی جۆراوجۆرەوە؟ ئایا ئەگەر تەنیا هەر بە بیرکردنەوەش باس لە ریفۆڕمی ریشەیی بکەین بۆ قەیرانە ناوخۆییەکانی حیزب، نابێ بە شوێنکەوتووی رامانە شۆڕشگێڕییە هەرزەکارییەکان لەکاتێکدا کە پاڵەوانەکانی هێڵی ئاب هێشتا، لە جەوهەردا و بەشێوەیەکی گشتی، لەهەمان پێگەی سەرکردایەتییەکانی جارانیاندا بن؟"

یاداشتەکەی هاوڕێ زافر بە دیاریکراوی ئەم ئەرکانەی خوارەوەی ریزبەندی کرد کە جێبەجێکردنیان پێویستن بۆ رزگارکردنی حیزب لە قەیرانەکە و بۆ ئەوەی ببێتە پێشەنگێکی مارکسی – لینینی بۆ شۆڕشە پرۆلیتارییەکە لە عێراقدا، لەوانە

سـرکردن و دەرکردنــی تێکـڕای ئـەو ئەندامانــەی کـە بەشـداربوون لـە داڕشــتن و جێبەجێکردنی هێڵی ئـابی ١٩٦٤ و چاوخشـاندنەوە بـە هـەموو لیژنـە و دامـەزراوە حیزبییـــەکان و دروســـتکردنی دەســـتەیەکی چـــاودێریی ناوەنـــدی بـــۆ سەرکردایەتیکردنی حیزب تـا وادەی بەسـتنی کـۆنگرەی نیشـتمانی و ئـەوەش کـە پێویستە کاری جدی بکرێت لە ماوەی دوو مانگدا ئەو کۆنگرەیە ببەسـترێت. دیـارە بارودۆخی ئەو سەردەمە هاوکار نەبوو بۆ جێبـەجێکردنی نەخشـەکە بەوشـێوەیەی کە بۆی دیاریکراوە. جگە لەوەش (تاقمە هەلپەرستەکەی لیژنـەی بەغـدا) هەسـتی کردبوو بە چالاکییەکانی هاوڕێ مارکسی – لینینییەکان کە ئەم تاقمـە پێـی وابـوو هەڕەشەن بۆسەر کورسییە سەرکردایەتییەکانی ناو حیزب بۆیە دەستپێشـخەرییان کرد و نەخشە تایبەتەکەی خۆیـان جێبـەجێکرد بـەبێ رەچـاوکردنی بەرژەوەندییـە مەبدەئییـەکانی دژی ریڤیـژنیزم. لەئـەنجامی ئەمەشـدا راپـەڕینی پاکسـازی زیـانی پێگەیشـت و دواتـریش پەکیکـەوت. کـاتێکیش کـە کۆمیتـەی بەغـدا هەسـتی بـە گۆشەگیربوونی خۆی کرد و لایەنگرەکانی لێی تەکینەوە، دەستی کـرد بـە هانـدانی سەرکردایەتییە ریڤیژنیستەکە دژی (فەریق ئەلکادر) کە لە مـانگی حـوزەیرانی ئـەو ساڵەوە بەشـێوەیەکی فـراوان گەشـەی ئـەکرد. لەناوەڕاسـتی تـەموزدا (تاقمەکـەی بەغدا) راپۆرتێکیان پێشکەشی کۆمیتەی ناوەندی کرد، تیایدا داوایان کردبـوو سـزای (فەریق ئەلکادر) بدات، کە ئەو تاقمە لـە راپۆرتەکەیـدا تۆمـەتباری کردبـوون بـەوەی هەوڵی (دابەشبوون و تێکدان) ئەدەن، راپۆرتەکە چالاکییەکانی فەریق ئـەلکادری بـۆ کۆمیتەی ناوەندی دەرخست و بە هەڕەشەی لەقەڵەمـدا بۆسـەر ئـەو سـەرکردایەتییە ریڤیژنیستە. راپۆرتەکە ئەڵێت کـە بزووتنـەوە دیموکراسـییەکەی قوتابیـان کەوتووەتـە ژێر کـۆنترۆڵی فـەریق ئـەلکادرەوە، پـاش هەڵبژاردنـە قوتابییەکـە کـە لـە ٣١ی ئـازاری ١٩٦٧دا لە هەموو زانکۆکانی عێراقدا رێکخران و لیستە دیموکراتـەکان رێـژەی نزیکـەی لـە ٨٠٪ی دەنگـەکانی هــەموو قوتابیـانی زانکۆکـانی عێراقیـان بەدەسـت هێنـابوو. تاقمەکەی بەغدا، فەریق ئەلکادری بە (توخمـە جیابووەوەکـان – العناصـر المنشـقة)

ناوئـەبرد، پاشـان ڕووداوێکـی چـاوەڕواننەکراو ڕوویـدا کاتێـك کـە کۆپییـەك لـە یاداشـتێکی نهێنـی (فـەریق ئـەلکادر) کەوتـە دەسـت یـەکێك لـە بەشـداربووانی کۆبوونەوەکـەی ٣٠ی حـوزەیرانی ١٩٦٧. ئـەو یاداشـتە لـەناو هەنـدێك کـادیری حیزبیی دژ بە ڕیڤیژنیزم دەستاودەستی پێئەکرا. بەڵام ئەمە بـە بۆچـوونی لیژنـەی ناوبراو بەڵگەیەك بوو بۆ ئەو شتەی کە لێی ئەترسان. لەبەرئـەوە تاقمەکـەی بەغـدا بڕیـاری دا پەلــە بکــات لــە جێبــەجێکردنی نەخشــە کودەتاییەکــەی بــەبێ بەشدارییپێکردنی قاعیدەی حیزب. بەڵام عەزیز ئـەلحاج کـە بـەم دواییـە پەیوەنـدی کردبوو بەو تاقمەوە لەژێر گوشاری لێپرسینەوەدا کە لیژنەی جەمسەرەکانی هێڵـی ئاب و (جەندەل)ی هاوپەیمانی نوێیان گرتبوویانە بەر، گومانی هـەبوو لـەوەی ئـەو کردەوە کودەتاییەی کە بڕیاربوو جێبەجێ بکرێت، سـەرکەوتن بەدەسـت بهێنێـت، لەبەرئەوە کتوپڕ بڕیاری دا لەگەڵ (فەریق ئەلکادر)دا دیـدار بکـات کـە لەسـەرەتای ١٩٦٧ەوە ئەم بەردەوام خۆی بەدوور ئەگرت لێیان. عەزیز ئـەلحاج پێشـنیاری بـۆ (فەریق ئەلکادر) کرد کە لەگەڵ کۆمیتەی بەغدادا هاوکاری بکەن بـۆ جێبـەجێکردنی نەخشەیەك کە پێکهاتبێت لە دەستگیرکردن و زینـدانکردنی ئـەو ئەندامانـەی لیژنـەی ناوەنـدی کـە لـە بەغـدان و دوای ئـەوە سـەرکردایەتییەکی تـازە بـۆ حیـزب دروسـت بکرێت. بەڵام نوێنەرانی (فـەریق ئـەلکادر) ڕازی نـەبوون هـیچ دیـدارێك بکـەن لەگـەڵ کۆمەڵێکدا کە جێبەجێکەری سەرەکی هێڵی ئابی ١٩٦٤ بوون و جـەختیانکردەوە کـە قەیرانەکەی حیزب بەوە چارەسـەرنابێت کـە سـەرکردایەتییەکی ڕیڤیژنیسـت بخرێتـە جێگەی یەکێکی دیکـەی ڕیڤیژنیسـت، هـەروەها شـێوازە کودەتاییـە گۆشـەگیرەکەی تاقمەکەی بەغدایان ڕەتکـردەوە و جـەختیان کـردەوە لەسـەر ئـەوەی کـە پێویسـتە قاعیدەی حیزب بەشداری بکات لە چارەسـەکردنی قەیرانەکـە و لـە دوورخسـتنەوەی شێوازە پیلانگێڕییەکان. بەڵام عـەزیز ئـەلحاج ئـەم بۆچـونەی قبـوڵ نەئـەکرد و پێـی وابوو هەر ڕێگە چارەیەك خێرا و یەکلاکەرەوە نەبێت تەواوی نەخشەکە پەك ئەخات و کارئەکاتە سەر بەردەوامبوونی پەیوەندییەکان لەگەڵ ناوەندە سـۆڤێتییەکاندا. بۆیـە

پێی باش بوو قەیرانەکە بەشێوەیەکی غافڵگیر و بەبێ دەنگەدەنگ چارەسەر بکرێت بەشێوەیەك کە مەسەلەکە وەك کێشەیەکی ناوخۆیی مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت کە تەنیا کەسەکانی کۆمیتەی ناوەندی بگرێتەوە. کە ئەمەش نیشانەی ئەوەیە عەزیز ئەلحاج و هاوپەیمانەکانی هێشتا دیلی ئەقڵییەتە ریڤیژنیستییەکەن کە بەچاوی سوك ئەڕوانێتە خەباتی جەماوەر و لە پلەی یەکەمدا پەیوەندییە دەرەکییەکان بەهەند وەرئەگرێت. پاش شکستهێنانی ئەم دیدارانە لە گەیشتن بە رێکەوتندا کۆمیتەی بەغدا پڕۆژە کودەتاییەکەی جێبەجێ کرد.

ئەوەبوو رۆژی ١٢ی ئەیلولی ١٩٦٧ تاقمەکەی بەغدا بە سەرۆکایەتی عەزیز ئەلحاج هەوڵیاندا خۆیان وەکو پۆلیس نیشان بدەن و سەرجەم ئەندامانی مەکتەبی سیاسی و کۆمیتەی ناوەندی دەستگیر بکەن. بەڵام ئەم هەوڵە سەری نەگرت چونکە تەنیا توانرا دوو کەس لە گەورە ریڤیژنیستەکان دەستگیر بکرێن کە ئەوانیش (زەکی خەیری) و (بەهادین نوری) بوون و دواتر ئەوانیش بەئاسانی هەڵهاتن. پاش شکستهێنانی ئەم شانۆگەرییە لاوازە، ئیتر تاقمەکەی بەغدا و عەزیز ئەلحاج هەر ئەو رێگەیان بۆ مایەوە کە رووبکەنە قاعیدەی حیزب و داوای پشتگیرییان لێ بکەن بۆ لابردنی سەرکردایەتییە ریڤیژنیستەکە و گردبوونەوە لەدەوری هێڵێکی شۆڕشگێڕی کە کاربکات بۆ روخاندنی دەسەڵاتە کۆنەپەرستەکە و دامەزراندنی حکومەتێکی دیموکراسی بە سەرکردایەتیی چینی کرێکار، شکستهێنانی ئەم پڕۆژەیە بوو بە سەرەتای راستەقینەی راپەڕینی پاکسازی. ئەوەبوو لە ١٧ی ئەیلولی ١٩٦٧دا کۆبوونەوەیەکی نائاسایی کادری پێشکەوتوو لە بەیاننامەیەکدا بڕیاری دا کۆمیتەی ناوەندی هەڵپەرست دەربکات و سەرکردایەتییەکی ناوەندیی کاتی (قیادة مرکزیة مؤقتة) پێك بهێنێت بۆ حیزب.

راپەڕینی پاکسازی سەردەمێکی نوێی لە مێژووی حیزبدا دروست کرد و ئاڕاستە شۆڕشگێڕییە پرۆلیتارییەکەی بۆ گەڕاندەوە و توانای پێبەخشی بە رێبازە خەباتکەرەکەیەوە بێتەوە مەیدانەوە.

بە ئاشكرا دەرئەكەوت كە تاقمە هەلپەرستەكەی بەغدا بیریان لەم گۆڕانكارییە گەورانە نەكردبووەوە، چونكە چاویان لەوەبوو بە پیلان و دەسیسە لە پێگەی خۆیاندا بمێننەوە و هاوكاریی دەرەكی مسۆگەر بێت بۆیان. بۆیە چیتر نەیانتوانی بەردەوام بن لە هەلۆیستە شاراوەكانیان و ناچار بوون مەبەستەكانیان ئاشكرا بكەن. سەرەتا هەولیاندا بگەڕێنەوە بۆ باوەشی سەركردایەتییە ریڤیژنستەكە.

لەڕاستیدا پێكهاتەی تایبەتی سەركردایەتییە ناوەندییە كاتییەكە و بوونی زۆرێك لە ئەندامانی لیژنە كۆنەكەی بەغدا تیایدا رەنگی دایەوە لەو هێڵە سیاسییەی كە سەركردایەتیی كاتی گرتییەبەر. ئەمەش یەكەمجار لەوەدا دەركەوت كە راپۆرتە سیاسییەكەی كۆبوونەوە نائاساییەكە ئەو بەشەی پشتگوێ خستبوو كە پەیوەست بوو بە مەسەلە نێونەتەوەییەكانەوە. بەشە بڵاونەكراوەكە ئەوەی پشتگوێ خست كە ریڤیژنیستی سۆڤێتی دەستنیشان بكات و ئەوەی دیاری نەكرد كە ریڤیژنیستی راسترەو بووەتە رێبازی بنەڕەتی لە بزووتنەوەی شیوعیی جیهانیدا. بەڵام هەوڵەكانی تاقمەكەی بەغدا بۆ سەپاندنی رێبازی تایبەتی خۆی بەسەر حیزبدا پاش راپەڕینی پاكسازی لەڕێی نوێنەرەكانییەوە لە سەركردایەتییە ناوەندییە كاتییەكەدا هێندەی پێ نەچوو لەبەردەم هۆشیاریی ریزەكانی خوارەوەی حیزب و لەبەردەم ئەو ململانێ فیكرییەی كە لە جاران زیاتر پەرەی سەندبوو شكستی هێنا.

* * *

پاش ئەوەی بەكردەوە دوو حیزب هاتنە ئاراوە كە هەردووكیان ناوی حیزبی شیوعی عێراقییان هەڵگرتبوو، دەستەی (فەریق ئەلكادر) لە روانگەی ئەوەی كە یەكێك لە ئامانجە سەركییەكانی هاتووەتە دی و تەنها ئەوە ماوە تاقمە هەلپەرستەكەی بەغدا بۆ قاعیدەی حیزب دەربخات و ریزەكانی حیزبی لێ پاك بكاتەوە، لەبەرئەوە ئەم دەستەیە لە ٢٦ی ئەیلولی ١٩٦٧دا لە یاداشتێكی نهێنیدا خۆی راگەیاند كە كۆبوونەوەكەی ٣٠ی حوزەیرانی ١٩٦٧ پەسەندی كردبوو. یاداشتەكە لەشێوەی بەیاننامەیەك بڵاو كرایەوە بە ناوی (فریق من كوادر الحزب)

جەختی کردەوە کە کۆمیتە ریڤیژنیستە ناوەندییەکە بەرپرسیارە لە قوڵبوونەوەی قەیرانە ناوخۆییەکەی حیزب و هەر ئەم رێبازە ریڤیژنیستەش بووە کە کۆمیتەی ناوەندی وای لێ کرد هێڵی ئابی ١٩٦٤ بسەپێنێت و دەست بکات بە هەڵوەشاندنی حیزبی شیوعیی عێراقی و هەوڵ بدات بیتوێنێتەوە لە زەلکاوی رێکخراوە کۆنەپەرستەکاندا.

پاش ئەمە، یاداشتەکە دروشمە سیاسی و فیکرییە بنەڕەتییەکانی خۆی ئاشکرا کرد کە بریتین لە خەباتی میللیی چەکدار بۆ رووخاندنی حوکمی کۆنەپەرست و دامەزراندنی حکومەتێکی دیموکراتیی میللی بەسەرکردایەتیی چینی کرێکار و رووبەڕووبوونەوەی بەهێزی ریڤیژنیستی جیهانی و رەخنەگرتن لە هێزە سیاسییە جیهانییەکەی. بەڵام چالاکییەکانی فەریق ئەلکادر تەنیا هەر لە مەسەلەی بانگەشەی فیکرییدا کورت نەبووەوە چونکە بوونی تاقمەکەی بەغدا لە دۆخێکدا کە کۆنترۆڵی سەرکردایەتییە ناوەندە تازەکەی کردبوو ئەمی ناچار کرد بەردەوامی ببەخشێت بە چالاکیی سیاسیی شۆڕشگێڕ. بۆیە دەستپێشخەری کرد لە رێکخستنی مەفرەزەی چەکدار لە هۆڕەکانی باشووری عێراق و دێهاتەکانی فوراتی ناوەڕاستدا. بەڵام چالاکییەکانی لە کوردستاندا توشی قۆرتێکی گەورە ئەهات لە ئاکامی تیرۆرکردنی تێکۆشەری شیوعیی رەوف حاجی قادر کە لە کۆبوونەوەکەی ٣٠ی حوزەیرانی ١٩٦٧دا راسپێردرابوو ئەندامە شۆڕشگێڕەکانی ئەوێ رێکبخات.

## بە بۆنەی یادکردنەوەی را پەڕینی زۆنگاوەکانی خوارووی عێراق لە مانگی ئایاری ١٩٦٨دا

راپەڕینەکان کە ئەڵقەیەکی گرنگ بوون لە سووربوون لەسەر گیانی خۆبەختکردنی شۆڕشگێڕیی ئەو حیزبەی ئێمە. لەگەڵ ئەوەشدا، سەرەتا هەندێك سەرکەوتنی بینی بەڵام هێزەکانی حکومەت بە توانا و ژمارەیەکی زۆر و چەکی سەر زەوی و هێزی ئاسمانی بەرەنگاری شۆڕشگێڕەکانمان بوون. ئەم راپەڕینە بووە جێگای سەرنجی زۆر نووسەر و چیرۆکنووس و شاعیر کە ناوی پاڵەوانەکانیان

بە هەڵۆ و بە شێر بردووە. راپەڕینەکە و رێکخەرەکانی و قارەمانەکانی چوونە لاپەڕەیەکی روونـاکی مێـژووی بزووتنـەوەی شۆڕشـگێڕیی چەوسـاوەکانی گەلەکەمانەوە. جوتیارانی زۆنگاوەکانی غموگە و حەممار تا ئێستا و نەوە لەپاش نەوە ئازایەتیی خالید ئەحمەد زەکی و هاوڕێکانی بۆ یەك دەگێڕنەوە، کە سەرەتای داستانێکی خوێناوی بوو دژ بە دەسەڵاتی دیکتاتۆری و فاشیستی کرا.

هاوڕێکانم.. خالید ئەحمەد زەکی و شەلەش و موحسین حەواس و کازم مونعەسیر سوادی، ئێوە شەهیدی لەیادنەچووی ئێمە و گشت جەماوەری گەلەکەمانن کە فیداکاریی ئێوەمان لەیادە و لە ویژدانماندا ئەمێننەوە.

لەو داستانەدا فڕۆکەیەکی حکومەت خرایە خوارەوە و فڕۆکەوانەکە روتبەی نەقیبی هەبوو لەگەڵ پێنج پۆلیسدا کوژران. بێجگە لە هاوڕێ شەهیدەکان، ژمارەیەك هاوڕێ دەستگیر کران، زۆر ئازایانە بەرگەی ئەشکەنجە و لێکۆڵینەوە جۆربەجۆرەکانی بەعسیان گرت.

هاوڕێ عەقیل حەبەش یەکێك بوو لەو تێکۆشەرانەی کە فەرمانی لەسێدارەدانیان بەسەردا درا، پاش ماوەیەك لە دەرچوونی لێبوردنی گشتیی ساڵی ١٩٦٩ ئازاد کران. لە نامیلکەیەکی تایبەت بە راپەڕینەکەدا کە لە بڵاوکراوەکانی (دار الغد) دەرچووە، چیرۆکی راپەڕینەکەی بە درێژی نووسیوە و لە شوێنێکیشدا باسی شەهید موتتەشەر حەواس ئەکات. من لە گۆڕەپانی سیاسیدا کەریم حەواس و موتتەشەر حەواسم ئەناسی کە دوو برای تێکۆشەر بوون لە ریزەکانی حیزبدا و ئەنجامی لەسێدارەدانی موتتەشەر بەمجۆرە ئەگێڕێتەوە: "موتتەشەر گوتوویەتی: کاتێك لە کۆلێج ئەهاتمە دەرەوە تووشی بەریەککەوتنێك بووم لەگەڵ چەند قوتابییەکی بەعسیدا، لە ئەنجامدا خۆم بە ئوتومبیلێکدا هەڵواسی بەڵام تەقەیان لێ کردم و منیش تەقەم لێ کردنەوە و یەکێکیانم کوشت و دەستگیر کرام."

لە رۆژی ٤ی کانوونی دووەمی ١٩٦٩دا بە هاوڕێ موتتەشەر راگەیەنرا کە بڕیاری جێبەجێکردنی لەسێدارەدانی دەرچووە. بەڕاستی موتتەشەر پاڵەوان بوو.

لە کاتژمێر پێنجی بەرەبەیاندا ئەو دڵە شۆڕشگێڕە قارەمانە لە جووڵە کەوت و مۆمێك لە مۆمەکانی گەلە خەباتکەرەکەمان کوژایەوە.

ئێمەش بە سروودی شۆڕشگێڕانە و سروودی ئومەمییەت لەو کاتژمێرەدا خواحافیزیمان لێ کرد. هاوڕێ موتتەشەر حەواس سەعاتەکەی دەستی بە دیاری دا بە من بۆ یادگار و نامەیەکیشی بە خەتی خۆی دابوومێ کە لە دەفتەری بیرەوەرییەکانمدا نووسراوە.

لە چرکەی لەسێدارەدانیدا ئەم لاوە قارەمانە هوتاف کێشا کە: "قسەی زیاترم نییە بیکەم بێجگە لەوەی هاوڕێ فەهد: (شیوعێتی بەهێزترە لە مردن و بەرزترە لە کۆڵەکەکانی لەسێدارەدان)." ئەمە یەکێك لەو پۆلیسانە بۆی گێڕاینەوە کە لە مەراسیمی لەسێدارەدانەکەیدا بەشدار بوو.

❊ ❊ ❊

دوای راگەیاندنی سەرکردایەتی ناوەندیی کاتییەوە لە ١٧ی ئەیلولی ١٩٦٧، هێندەی نەبرد زیاتر لە نیوەی رێکخراوەکانی بەغدا و زوربەی رێکخراوەکانی لقی کوردستان و چەندین رێکخراوی گەورەی بەسرە و کوت پەیوەندییان کرد بە قیادەی موەقەتەوە. پاشان لە ئاکامی ئەو ململانێ فیکرییەدا تا ئەهات داخوازیی قاعیدەی حیزب زیاد ئەبوو بۆ پەیڕەوکردنی دروشمی خەباتی میللی چەکداری و داخوازیی دەرکردنی وەلید (حسێن جواد گومەر) لە قیادەی موەقەتە. ئەم داخوازییە تا ئەندازەیەك رۆڵی فەریق ئەلکادری تێدابوو. لەو ماوەیەشدا دەرفەت رەخسا کە سەرکردایەتیی کاتی نوێنەرانی فەریق ئەلکادر گفتوگۆ بکەن بۆ دیاریکردنی ئەو خاڵانەی کە لەسەری ناکۆکن. ئەو کۆبوونەوەیەی کە لایەنی یەکەم: عەزیز ئەلحاج و حسێن جواد گومەر (وەلید) و حەمید سافی و مالیك مەنسوور و لایەنی ئێمەش: ئیبراهیم عەلاوی و خالید ئەحمەد زەکی و من بووین، و لە ماڵی هاوڕێ (م. ج) لە کەڕادە مەریەم لە بەغدا بەڕێوەچوو. هەردوولا رێککەوتین لەسەر دادگاییکردنی حسێن جواد گومەر لە دادگایەکی هاوبەشدا بۆ

دیـاریکردنی بەرپرسـیاریێتیی نـاوبراو لـە جێبـەجێکردنی هێڵـی ئـابی ١٩٦٤. ئـەم رێککەوتنـە بـوو بـە سـەرەتای رووخـانی حسـێن جـواد و تاقمـە هەلپەرسـتەکەی. لەسەرەتای ساڵی ١٩٦٨دا سـەرکردایەتیی ناوەنـدیی کـاتی بـە پشـتیوانیی فـەریق ئەلکادر کۆبوونەوەیەکی فراوانی رێکخست بۆ کادری پێشکەوتووی حیزب کە تیایدا حسێن جواد وەك سەرکردەی تاقمە هەلپەرستەکەی بەغدا ریسوا کـرا و هەڵبـژاردن ئەنجامدرا بـۆ سـەرکردایەتیی ناوەنـدیی نـوێ، نـاوبراو خـۆی پـالاوت بـەلام هیچـی بەدەست نەهێنا. کۆبوونەوەکە رێبازی خەباتی میللیـی چـەکدارانەی پەسـەند کـرد لە روانگـەی بەڵگەنامەیەکـەوە کـە هـاورێ زافـر (خالیـد ئەحمـەد زەکـی) ئامـادەی کردبوو. هەرچەندە عەزیز ئـەلحاج ئـەو بەڵگەنامەیـەی پێشـکەش کـرد بـێ ئـەوەی ناوی سەرچاوەکەی ببات بۆ ئەوەی بە هی خۆی لە قەڵەم بدرێت.

لــە ئاکــامی دەرکردنــی ئــەم بەیاننامەیــەدا رێکخراوەکــانی فــەریق ئــەلکادر پەیوەندییان کرد بە حیزبەوە و دەستکرا بە ئامادەسازی بۆ خـەباتی چـەکدارانەی میللـی، ئـەوەبوو کـە هـەموو ئامادەسـازییەکانی هۆرەکـانی باشـوور خرایـە ژێـر دەسەلاتی سەرکردایەتیی ناوەندەوە و هەر لەم کاتەدا لـە ١ی حـوزەیرانی ١٩٦٨دا هەواڵی راپەرینی هۆرەکان بلاوبووەوە وەك سەرەتای سەردەمێکی نوێ لە خەباتی حیزبی شیوعیی عێراقدا. راپەرینی هۆرەکـان کـە هـاورێی شـەهید خالیـد ئەحمـەد زەکـی سـەرکردایەتی ئـەکرد لـە بـارودۆخێکی دژوار و لەکاتێکـدا کـە کاروبـاری رێکخستن لەناو حیزبدا شێواو بوو، ئەم راپەرینە کۆتایی بەو ململانێ خۆپەرستانانە هێنا کە پێشتر برەویان پەیدا کردبوو. ئیتر خەباتی حیزبی شیوعی عێراق سنوری دروشمـی رووتوقـووتی تێپەرانـد و چـووە قۆنـاغی خـەباتی شۆرشـگێرەوە. ئـەم راپەرینە بە بەڵگەی مادییەوە سەلماندی کە ئەو هێڵـە شۆرشـگێرە چـەند راسـت و دروستە کە قاعیدەی حیزب و کادیرە هوشیارەکانی لەمێژەوە داوای ئەکەن.

هەرچــەندە ئــەو راپەرینــە بزووتنــەوەی جــەماوەریی لەسەرتاســەری عێراقــدا بووژاندەوە، بەلام مەرجەکانی بەردەوامبوون و رووبەرووبوونەوەی هێزەکانی رژێمـی

لەگەڵدا نەبوو. بەتایبەت کە هێشتا هەندێك کەسی خۆپەرست لەناو ریزەکانی سەرکردایەتیی ناوەندا مابوون و هەوڵیان ئەدا یارمەتی لە راپەڕینەکە ببڕن. هێزە کۆنەپەرست و ئیمپریالییەکانیش لە عێراقدا ئەوپەڕی ترسیان لێ نیشتبوو بۆیە راپەڕینەکەی هۆڕەکان رەنگدانەوەی خێرای هەبوو لەو نەخشەیەدا کە ناوەندە ئیمپریالییەکان و توخمە بەکرێگیراوەکانی سوپای عێراق دایانڕشت بەوەی کە کورسیی دەسەڵات لە کودەتایەکی سپیدا رادەستی تاقمە فاشییەکەی بەعس بکەن لە ١٧ی تەموزی ١٩٦٨دا، واتە تەنیا چەند هەفتەیەك پاش دەستپێکردنی راپەڕینەکە.

لە ئاکامی ئەم بارودۆخانەدا حیزب رووبەڕووی کۆمەڵێك ئەرکی گەلێك ئاڵۆز و دژوار بووەوە لەکاتێکدا کە هێشتا نەیتوانیبوو کێشە ناوخۆییەکانی چارەسەر بکات و پاشماوەکانی تاقمەکەی بەغدا دووربخاتەوە. هێندەی پێ نەچوو هەڵمەتێکی خوێناوی لەلایەن رژێمە تازەکەی بەعسەوە دەستی پێ کرد کە ئەرکی یەکەمی بریتی بوو لە سەرکوتکردنی بزووتنەوە شۆڕشگێڕییە روو لەهەڵکشانەکە. لەهەمان کاتیشدا توخمە هەلپەرستەکانی ناو سەرکردایەتیی ناوەندی بەدزیی حیزبەوە پەیوەندییان ئەکرد بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە ناو حیزبە ریڤیژنیستەکە لەکاتێکدا کە عەزیز ئەلحاج وەك هەمیشە دوودڵی نیشان ئەدا و نەیئەتوانی هەنگاوێکی یەکلاکەرەوە بنێت. ئەوەبوو سەرەڕای بڕیاری سەرکردایەتی بۆ کشانەوەی کادیرە پێشکەوتووەکان بەرەو دێهاتەکان بۆ ئەوەی دووربن لە زەبرەکانی دوژمن بەڵام ناوبراو ژیانی ناوشاری بەباشتر زانی لە جێبەجێکردنی بڕیارەکانی سەرکردایەتی و لەئاکامی هەموو ئەمانەدا لە مانگی شوباتی ١٩٦٩دا زوربەی ئەندامە سەرکردەکان کەوتنە دەست پۆلیسی بەعسەوە و دەیان کەسیش لە هەڵمەتەکەی ئەو رژێمە فاشییەدا شەهید بوون. بەعس هەوڵی دا ئەم شکستە بەکاربهێنێت بۆ سەپاندنی کەشوهەوای رادەستبوون و ماڵیبوونی جەماوەری گەل بە سوودوەرگرتن لە پێخۆشبوونی حیزبە ریڤیژنیستەکان لە عێراق و دەرەوەدا. بەڵام سەرەڕای هەموو دژواری و تۆقاندنێك حیزب درێژەی دا بە رێبازەکەی خۆی

و ڕێکخراوەکـــانی حیـــزب و کادیرەکـــانی کـــە نەکەوتبوونـــە دەســـت دوژمـــن دەستپێشـخەرییان کـرد لـە دروسـتکردنی دەسـتەیەکی لێپرسـراوی حیزبـی بـۆ سـەرکردایەتیکردنی کارەکـانی حیـزب. لـە کۆتـایی مـانگی ئـابی ١٩٦٩شـدا لـە شاخەکانی کوردستان کۆبوونەوەیـەکی فـراوان ئەنجامـدرا بـۆ کـادری پێشـکەوتوی حیزب بە مەبەستی هەڵسەنگاندنی ئەزمونەکەی حیـزب و دیـاریکردنی هۆکارەکـانی ئـەم شکسـتەی دوایـی و هەڵبـژاردنی سـەرکردایەتییەکی نـوێ. لـە ئاکـامی ئەمـەدا سەرکردایەتیی ناوەندی ڕەشنوسی بەڵگەنامەیەکی ئامادە کرد لـە کۆتـایی ١٩٧٠دا و پاش گفتوگۆیـەکی تێروتەسـەل لەسـەری لەلایـەن ڕێکخراوەکـانی حیزبـەوە وەك پرۆژەی بەڵگەنامەیـەکی نـوێ پێشـکەش کـرا بـە کۆنفرانسـی سـێیەمی حیـزب کـە لەسەرەتای ١٩٧٤دا ئەنجامدرا.

کۆنفرانسـی ١٩٧٤ لـە (کـانی سـپیندار)ی ناوچـەی باڵـەك گـیرا، کـە بارەگـای سـەرکردایەتیی قیـادەی مەرکـەزی سـاڵانێك بـوو لـەو ناوچـەیە بـووین. مـن لـەو کۆنگرەیەدا بە کۆی دەنگ بووم بە ئەندامی سەرکردایەتیی قیادەی مەرکەزی.

## وردەکاریی دیکە لەسەر کودەتاکەی ١٨ی تشرینی ١٩٦٣ و ڕووخانی بەعس

لەپاش کودەتاکە هەناسەیەکی ئیسـراحەتم هەڵکێشـا و لـە خۆشـاردنەوە هاتمـە دەرەوە و خۆم ئاشکرا کرد و چالاکییەکانم زیادیان کرد. لە ماوەیەکی کەمدا چـەند لیژنەیەکم لە زانکۆی بەغدا و لیژنەیەکم بۆ دواناوەندییەکانی بەغـدا دروسـت کـرد و پاشان لیژنەیەکی بنەڕەتیشم بۆ زانکۆ دروست کرد کە هاوڕێیان حیکمـەت زێبـاری لە کۆلێجی پەروەردە و جەمیل ئەلحەدیسی لە کۆلێجی بازرگانی و محەمـەد سـدیق لە کۆلێجی حقـوق تیایـدا بـوون. هـەر بـۆ مێـژووش، لـەناو هـاوڕێ چـالاکەکاندا لـە کۆلێجی بازرگانی لە دەرەوەی لیژنەکە شەهید زوهێر عەلاوی بوو کـە سـاڵی ١٩٧١ شەهید کرا و لەوکاتەدا بەرپرسیاری ڕێکخراوەکانی فوراتی ناوەڕاست بوو.

لیژنەی سەرکردایەتیی قوتابیانەکە پێکهاتبوو لە من وەك بەرپرسیاری زانکۆ و هەردوو هاوڕێ حسێن عارف و سەباح گۆرگیس، دواتریش و پاش گەڕانەوەی لە دەرەوەی وڵات هاوڕێ (مەهدی ئەلحافز)یش. هاوڕێ حسێن جواد گومەر بوو بە لێپرسراوی ڕێکخراوەکە، کە من ئەوکاتە و دواتریش بەسەرهاتی زۆرم هەبوو لەگەڵیدا هەم لەڕووی ڕێکخستن و هەم لەڕووی فیکرییشەوە.

ڕێکخراوەکانمان گەشەکردنێکی خێرایان بەخۆوە بینی و هاوڕێیان و لایەنگران بەجۆشوخرۆش بوون بۆ گەڕانەوەی چالاکی و پەرەپێدانی حیزب، جۆشوخرۆشێکی وا کە لە مێژووی حیزبدا وێنەی نەبووە، پاش ئەوەی رووخانی بەعسیان بینی لەسەردەستی هاوڕێکانی دوێنێیان بێ هیچ بەرەنگارییەك.

من لەگەڵ کۆمەڵێك کادری تردا داوامان لە حیزب ئەکرد سەردەمی دەسەڵاتی عەبدولکەریم قاسم تاوتوێ بکات و چۆنێتی رووخانی ئەو رژێمە و شکستهێنانی حیزب لە رووبەڕووبوونەوەی کودەتاکەدا روون بکاتەوە و بۆچی ئێمە پاش ١٩٥٩ دەسەڵاتمان نەگرتەدەست و ئێستا چی ئەکەین و لەسەر چ بناغەیەك ڕێکخراوەکان دروست ئەکەینەوە و هێڵە گشتییەکەی حیزب چۆن ئەبێت. من ئەو رۆژگارانەم لەبیرە وەك ئەوەی دوێنێ بن و هەتا ئەمرۆش هەموو وردەکارییەکانم دێنەوە یاد و لەگەڵیاندا ئەژیم سەرەڕای تێپەڕبوونی دەیان ساڵ بەسەریاندا.

لە بەهاری ١٩٦٤دا بوو کە لەگەڵ عەزیز محەمەددا لە سلێمانییەوە گەڕامەوە بۆ بەغدا. لەو ماوەیەدا و لە چوارچێوەی چالاکییە جۆراوجۆرەکانیشمدا لە خەباتی نهێنیدا لە بەغدا چەندین هاوڕێی مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتیی حیزبم ناسی وەك عومەر عەلی ئەلشێخ کە ئەندامی مەکتەب سیاسی و ساڵح دوگلە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی و عەزیز ئەلحاج و دواتر ئارا خاچادۆر ئەندامی مەکتەب سیاسی و شەهید ستار خزەیر کۆمیتەی ناوەندی و تۆفیق ئەحمەد کۆمیتەی ناوەندی و وێنایەکی فراوانم بۆ دروست بوو سەبارەت بە بارودۆخی ئەوسای حیزب و تێگەیشتم بۆچی ئەوە روویدا کە سەربازی ئەوەی ژمارەیەکی زۆر

ئەندام و سەدان هەزار لایەنگر و جەماوەرێكی فراوان لەسەر حیزب حساب ئەكران.

سەرباری هەموو كارەساتەكان و شەهیدبوونی دەستەیەكی پرشنگداری سەركردایەتیی حیزب كە پاڵەوانی راستەقینە بوون و سەلماندیان ئەوانە كۆمەڵە پیاوێك بوون شەڕەقۆچیان لەگەڵ هەوردا كردووە وەك ماركس وەسفی سەركردەكانی كۆمۆنەی پاریسی پێ ئەكات پاش رووخانی ئەو كۆمۆنەیە لە ساڵی ١٨٧١دا، بەڵام ئەو قارەمانانە یاخود زوربەیان دیلی فیكرێكی راستڕەو بوون كە لە حیزبی شیوعیی سۆڤێتییەوە خۆی سەپاندبوو بەسەریاندا و هەندێكیان پێیان وابوو نێونەتەوەییبوونی حیزب ئەوەیە ملكەچی فەرمانەكانی حیزبی شیوعیی سۆڤێتی بێت بە دەردی خوالێخۆشبوو زەكی خەیری ئەندامی مەكتەبی سیاسی بە ئاشكرا دەری ئەبڕی.

## خۆم لەناو ئەو ململانێ و بۆچوونانەدا هەڵوێست و تێگەیشتنم لەكوێدا گیرسابووەوە

كاتێك كە ئەو هەموو بەیەكداچوون و زۆرانبازییەی ناو ریزەكانی حیزب بەرەورووی هەموو ئەندامان و لایەنگرانی حیزب بوونەوە، وەك بە درێژی باسم كردوون، ئەمەوێت كورتەی رای خۆم لە ناخمدا دەربڕم كە رەنگە زۆر كادری دیكەش هەمان بۆچوون یا نزیك ئەوەی منیان هەبووبێت.

هەر لە سەرەتای بەشداربوونمەوە لە بزووتنەوەی سیاسی و بێگومان هەر لە یەكەم رۆژەوە بە رێبازێكدا ملی رێگام گرت، باوەڕی تەواوم بە شۆڕشگێڕی هەبوو، رەنگە لە سەرەتای لاوێتیدا تەعبیر بە ئازایەتی و چوون بەگژ زوڵم و زۆر و لایەنگیریی بزووتنەوە و شۆڕش بووبێت لەلام، دوای ئەوە بە خوێندنەوە و تێگەیشتنی ناو رێكخراوەكان بە تیۆری و بە كاركردنی ناو حیزب چەسپاوتر بووبێت.

كە حیزب لە ساڵی ١٩٥٨ بەدواوە و بەتایبەتی دوای ١٩٥٩ و وەرچەرخانی حكومەتی عەبدولكەریم قاسم بەلایەنی تاكڕەوی و رێگرتن لە چالاكییە دیموكراتییەكان، من زۆر بە ئاشكرا لەناو كۆبوونەوەی شانە و ئینجا لیژنە

حیزبییەكانی تیایدابووم لایەنگیریی هاتنە سەرحوكمی حیزبم ئەكرد.

دیسانەوە هەڵوێستم لە كودەتای ١٩٦٣ و رێگای بەرگریكردن لە دەستكەوتەكانی شۆڕشی ١٩٥٨ و بەرەنگاربوونەوەی ئەو كودەتایە بە چەك و تێكۆشانی بەردەوامی چەكداری تا رووخاندنی، رێگا و هەڵوێستم بوو.

لێرەوە ئەمەوێت ئەوە بخەمە ناو لاپەڕەكانی ئەم بیرەوەرییانەم كە هەڵوێستێكی نوێ و لە تەمەنێكی گەورەییتر و لە پلەیەكی حیزبیی پێشكەوتووی تازەدا تۆمار بكەم كە هەڵوێستمە لە ناكۆكییەكانی ناو حیزب لەپاش ساڵی ١٩٦٣ و بەتایبەتی لەدوای سەرهەڵدانی هێڵی ئابی ١٩٦٤ بەدواوە.

من كە بەدرێژیی ئەو ناكۆكییانەم خستەڕوو و هەندێ هەڵوێستی خۆمم تێدا ئاشكرا كرد ئەمەوێت پوختەیەكی روونتر بخەمە بەردەم خوێندەواران كە بێجگە لەوەی چی و چەند هەوڵ و تێكۆشانم هەبووە لەو ساڵانەدا، لەناخمدا چی ئەجوولا و كامەیانم بە راستتر و شۆڕشگێڕانە ئەبینی لەو ڕا جیاجیایانەدا:

لەنێوان هەوڵی كودەتای سەربازی و راپەڕینی تێكۆشانی چەكداریدا كە بەشێكی گرنگی تێكۆشانی چەكداری بوو لە زۆنگاوەكانی خوارووی عێراقدا: لەگەڵ زوربەی خۆبەستنەوەم بە ئیلتیزامی حیزبیی لینینییەوە بەجێبەجێكردنی فەرمانەكانی حیزب، بەڵام لە هەموو بوارەكاندا رای شەخسیی خۆم دەرئەبڕی.

هەڵوێستی خۆم بە كردار لەگەڵ بیر و پلانی كودەتای سەربازییدا بوو وەك بەشێكی سەرەكی و دەستپێكردنی شۆڕش، بە داگیركردنی سەربازگەكان و پاش دەستبەسەرداگرتنیان، هێرشبردنە سەر كۆشكی كۆماری و هەر شوێنێكی تری سەر بە حكومەت یا بەرگریكەر لە حكومەت لە هێزەكانی سوپا و پۆلیس و ئەمن و ئەوانی دیكە. ئەم هێرشەی هێزە شۆڕشگێڕە سوپاییەكە شانبەشان و بەشداربوون ئەبێت لەگەڵ چەكدارە مەدەنییەكانی ئەندامان و دۆست و جەماوەری حیزب و گەل بە چەك و بە خۆپیشاندانی گەورە و لە سەرانسەری وڵاتدا كە بەمە مانای شۆڕشەكە، كە شۆڕشی گەلە، جێگیر ئەكات و جەماوەر ئەبێتە خاوەن دەسەڵات.

ئەمە بە پێچەوانەی یەك لایەنەی یەكێك لەو دوو چارەسەرە: كودەتا یان راپەڕینی میللی – كە ئەو ماوەیە بووبوو بە جێگەی لێدوان و ناكۆكیی زۆر.

رێگەی سێیەم كە وەك (تەكەتول) لەناو رێكخستنی (فریق من كوادر الحزب) كە بە (فەریق) ناویان ئەبردین و من یەكێك بووم لە سەركردەكانی، هەرچیم پێ كرا بۆ خۆئامادەكردن لە زۆنگاوەكانی خواروو كردم، بەڵام لە موناقەشەی ناوخۆدا ئەوەم ئەگوت كە بەتەنیا بە راپەڕین لەوێدا سەركەوتن ناهێنینە دی، بەڵكو وەك بنكەیەكی شۆڕشگێڕی با هەبێت و تێكەڵ بە هەوڵدانە شۆڕشگێڕییەكە ببێت و هێزێكی دامەزراویش بێت لە ناوچەیەكی فراواندا، خۆی وەك هێز و وەك ناوچە بە راگری بهێڵێتەوە.

ئەمەش لە مشتومڕی ئەوەوە هات كە من باوەڕم بەوە نەبوو كە ئەزمونی (گیڤارا) و (دوبریە) جارێكی تر دووبارە ببێتەوە لە مێژوودا، بەوجۆرە (بوئرەی شۆڕشگێڕی) وەك چۆن بوو بە تاقیكردنەوە و سەركەوتنی گەورەی شۆڕشی مەزنی كوبا بە سەركردایەتیی كاسترۆ و گیڤارا، لە هەمانكاتدا بوو بە تاقیكردنەوەیەكی نوێ بۆ ئیمپریالیزم و دەوڵەتە دیكتاتۆری و كۆنەپەرستەكانیش كە نەهێڵن لەو جۆرە و بەو شێوەیە گروپێكی شۆڕشگێڕ بەو ژمارەیەوە بتوانن حیزب لەوێوە دامەزرێنن و وڵاتیش رزگار بكەن.

لەم گۆشەنیگایانەوە، لە رێكخستنی (فەریق) تووشی مشتومڕ زۆر ئەبووین، بەتایبەتی لەنێوان من، بەم تێگەیشتنەمەوە و شەهید ئەمین خەیون بەجۆرێكی پێچەوانەی منەوە و بە هەڵچوونێكی پڕ لە دەنگەدەنگەوە. ئەمین خەیون لاوێكی شۆڕشگێڕ بوو، زۆر ئازا بوو، لەگەڵ هەموو ئەو جیاوازییانەماندا خۆشەویستیی دیار بوو لەنێوانماندا.

ئەمین لە سەرەتای دەستپێكردنی راپەڕینەكەوە لەگەڵ چەند هاوڕێی تردا لە ئێمە جیابووەوە (سەباح گۆرگیس و یوسف رەزین) و لە مەیدانی شەڕ و شۆڕشیشدا بنكەی خۆی لە شەهیدی نەمر خالید ئەحمەد زەكی جیا كردەوە، خالید لێپرسراو و سەركردەی راپەڕینەكە بوو، ئەورووپای بەجێ هێشتبوو وە لە ژیانێكی سیاسی و زانستی بەرزەوە هاتەوە و گیانی پاكی بۆ گەلەكەی بەخت كرد.

## رێکخستنەکانی حیزب لە سوپای عێراقدا

من بەهۆی کودەتاکەی شوباتی ١٩٦٣وە ساڵێکی خوێندنەکەم فەوتا، بۆیە لە ٢٥ی حوزەیرانی ١٩٦٤ی خوێندنی زانکۆم تەواو کرد. دوای قۆناغی خوێندن، لەڕووی حیزبایەتییەوە گواسترامەوە بۆ رێکخراوەکانی سوپا و بە جۆشوخرۆشێکی زۆرەوە دەستم بە چالاکی کرد بە هیوای بەشداریکردن لە خەباتی شۆڕشگێڕیدا و ساڵی ١٩٦٥ چوومە کۆلێجی ئیحتیات. خوێندن و مەشقکردن لەو کۆلێجەدا ماوەی شەش مانگ و ساڵ و یان زیاتر بوو کە دەرچووی ئەو کۆلێجە لە سوپادا ئەبوو بە مولازم. دواتر بووم بە لێپرسراوی قوتابیانی کۆلێجی ئیحتیات و کۆلێجی سەربازی و ژمارەیەکی بەرچاو هاوڕێ و لایەنگرم کۆکردەوە، ئای چەند خۆشحاڵ و ئاسودە ئەبووم و ویژدانم چەند ئیسراحەتی ئەکرد هەموو رۆژێك کە ئەندامێکی نوێ یان لایەنگرێکی تازەم ئەبینی بۆ ئەوەی بیانخەمە ناو کاروانە شۆڕشگێڕەکەوە، بەڵام زوربەی پەیوەندییەکان لە رێکخستنی سوپادا لەبەر ئاشکرانەبوون ئەبووایە یەك یەك بیانبینم و رۆژانە کاتێکی زۆرم لە کاری حیزبیدا بەسەرئەبرد.

رێکخستنەکانی (هاشم)، کە ناوی خوازراوی رێکخستنەکانی سوپا و (حسێن) کە ناوی خوازراوی رێکخراوە شۆڕشگێڕە چەکدارە مەدەنییەکان دوو ناو بوون رۆژانە لە گوێما ئەزرنگانەوە و پەیوەندیم هەبوو بە هەردووکیانەوە.

شەهید (ستار خزەیر) ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی ماوەیەکی دووردرێژ بوو بە لێپرسراوم و هاوڕێ ئارا خاچادۆر ئەندامی مەکتەبی سیاسی ئەویش لە پەیوەندیدا بوو لەگەڵمدا و ئارا خاچادۆر چەندین ساڵ لێپرسراوی رێکخستنەکانی (هاشم) بوو. ستار خزەیر، نمونەی شیوعیی ئازا و پەرۆشی کارەکان و بەدواداچوونی چالاکییەکانم بوو. پەیوەندییشمان گەرم و لێوانلێو بوو لە دڵسۆزیی بێ کۆتا بۆ فیکرمان و بۆ ئایندەی بزووتنەوەکە لە وڵاتدا. بەکرێگیراوانی دەسەڵاتە خوێناوییەکە تیرۆریان کرد و کاتی خۆی وردەکاریی شەهیدبوونەکەیم نەزانی چونکە لەکاتی شەهیدبوونیدا ئێمە لە یەك رێکخراودا کارمان نەئەکرد.

گفتوگۆ جدی و گەرموگوڕەکان لە هەموو ڕێکخراوەکانی حیزبدا لەوپەڕی توندیدا بوون و ئەکرێت ئەو قۆناغە لە مێژووی ژیانی حیزبدا بە قۆناغێکی دیار ئەژمار بکرێت چونکە ململانێی فیکری تێدا بوو.

لەناو حیزبی شیوعیدا پێشکەوتم و گەیشتمە ئاستی ئەندامی لیژنەی محەلی و دواتر ئاستی لیژنەی ناوچە، واتە بەر لە کۆمیتەی ناوەندی. هەرگیز پەرۆش نەبووم بۆ وەرگرتنی پلە، زیاتر لەوەی بە باشترین شێوە ئەرکەکەم جێبەجێ بکەم بەڵام چالاکییەکان و پێزانینی لیژنە پێشکەوتووەکان پاڵنەر بوون بە ئاڕاستەی پێشکەوتنم لە حیزبدا.

لە ساڵی ١٩٦٥دا بەرپرسیارێتیی ڕێکخستنەکانی حیزبم لە سەربازگەی ئەبوغرێب وەرگرت کە گرنگترین ئۆردوگای سوپا بوو لە بەغدا و عێراقدا بەهۆی پێکهاتە هەرە گرنگەکانیەوە کە هەموو بەشە گرنگەکانی سوپای تێدا بوو (دوو کەتیبەی تۆپهاوێژی ١٧ و ٣١ و کەتیبەی تانکەکان و پیادە و ئێستگەی رادیۆ و ئەنباری چەك و تەقەمەنی و کارگەی بەتاریات).

یەکێك لە ئەنجومەنە بنەڕەتییەکانم وەرگرت و لە یەکەمین کۆبوونەوەدا ڕووبەڕووی مشتومڕی توند بوومەوە لەلایەن تێکڕای هاوڕێیانی لیژنەکەوە و ڕوونیان کردەوە کە ئەوان باوەڕیان بەم سەرکردایەتییەی ئێستای حیزب نییە چونکە سەرکردایەتییەکی ناشۆڕشگێڕە و تەنانەت باوەڕی بەوەش نییە هەر بە قسە باسی کاری شۆڕشگێڕی بکرێت لەناو سوپادا و هەوڵ و چالاکییەکانی تەنیا هەر هەڵمژینی کار و جۆشوخرۆشە جدییەکەی ڕێکخراوەکەمانە. چەندین بەڵگەشیان لەسەر ئەوە هەبوو.

من هاوڕێیانم قەناعەت پێهێنا کە ئێمە لە کارەکەماندا جدین لانی کەم لیژنە حیزبییەکەی سوپا و بۆم ئاشکراکردن کە خۆم دژی هەموو ڕەوتێکی ڕاستڕەو و هەلپەرست و سازشکارم.

کاتێکیش بە قسە و بە کردەوە ئەوەم بۆ سەلماندن ئیتر کارەکە لەنێوانماندا ڕەوتێکی شۆڕشگێڕ و ڕێکخراوی وەرگرت و کاتێکیش کە بە جلی سەربازییەوە وەك ئەفسەر لەگەڵ هاوڕێیانی ئۆردوگاکەدا مامەوە بۆ ئەوەی دڵنیا بم لە دۆخە

ئەمنییەکە، پەرۆشی و جدیبوون زیادیان کرد لەناو هاوڕێیاندا.

ئـای ئـەو ڕۆژگـارە چـەند پڕبـوون لـەو خەونانـەی کـە هیوامـان بـوو بێنـە دی و مـن و هاوڕێکانی تری ئەو ڕێکخستنە بیرمان لێ ئەکردنەوە و بە وردی نەخشـەمان بـۆ دائەڕشـتن و بە هەڵوێستی گەرم و گوڕی ئەو گەنجانەوە کە ئەیانویسـت خـەونی ئـەو قارەمانانـە بهێننـە دی کە لەم ڕێگەیەدا شەهید بوون. باسی بزووتنەوەکەی شـەهید حەسـەن سـەریع و ئـەو جورئەتە ناوازەیەمان ئەکرد کە ڕێکخراوێکی بچکۆلە لە سەربازگەی ڕەشـید هـەوڵی بـۆ دا لە ٣ی تەموزی ١٩٦٣ کاتێك کە دەسەڵاتی بەعس لەوپەڕی ملهوڕی و لەخۆباییبووندا بوو. قسـەمان ئـەکرد و ئازایـەتیمان لـە حەسـەن سـەریع و هـاوڕێ قارەمانەکانییـەوە ئـەکردە ئیلهام لە یەکەمین هەوڵی جدی دا بۆ ئەوەی حیزبی شیوعیی عێراق دەسەڵات بگرێتە دەست.

لەم ماوەیەدا ئێمە خۆمان بە پڕۆژەی شەهیدبوون ئـەژمار ئـەکرد و بڕوامـان بـە سەرکەوتن بڕوایەکی بەهێز بوو. نەخشەی ئەو کـارەی کـە دامانـابوو ئـەوەبوو کـە جووڵەکەمان لە ئۆردوگای ئەبوغرێبەوە دەستپێبکات بە کـۆنترۆڵکردنی ئۆردوگاکـە و خوێندنـــەوەی یەکـــەمین بەیاننامـــەی شـــۆڕش لـــەناو ئۆردوگاکـــەوە کـــە پەخشـکەرەکانی رادیـۆ لـەوێ بـوون و بەسـترابوونەوە بـە کۆشـکی کۆمارییـەوە. هاوڕێیان زانییان کە چەند کەرەسـتەیەکی تـەکنیکی هەیـە کـە ئەگـەر بەدەسـتیان بهێنین ئەتوانین ڕێگری بکەین لە بێدەنگ کردنی دەنگەکە لە کۆشکی کۆمارییـەوە. بە دەردی هاوڕێ ئارا خاچادۆر گـوتی "ئێمـە هـەموو شـتێکمان بـۆ ئـەو مەبەسـتە ئامادە کرد." ئینجا پاش کۆنترۆڵکردنی ئەبوغرێب ڕەتلێـك تانـك بـەرەو ئۆردوگـای وەشاش ئەڕوات و لە ئۆردوگاکەدا کەتیبەیەکی ئیستمکانی لێیە. لەلایەکی دیکـەوە ژمارەیـەك هـاوڕێی فڕۆکـەوانی دوورخـراوە هـەبوون کـە ئەوەنـدەی مـن بـزانم گەڕابوونەوە بۆ کاری جدی، لەوانە هاوڕێ و برادەرانم هەردوو فڕۆکەوان فەرەیـدون عارف و بەهزاد صائب. نەخشەکە ئـەوەبوو کـە پـاش کـۆنترۆڵکردنی فڕۆکەخانـەی سەربازگەی ڕەشید ئەڵقەکان ببەسترێن بە یەکترییەوە.

مەترسی ئەوە لـەئارادا بـوو ئـەو لیـوا میسـرییە بێتـە نـاو مەسـەلەکەوە کـە لـە

ئۆردوگای تاجی جێگیر کرابوو. زانیاریم پێگەیشت کە ڕێوشوێنی باش گیراوەتە بەر بۆ ڕێگریکردن لە جووڵەی لیوا میسرییەکە و گەیشتنی بە ناوەندە گرنگەکان. هەر حیزبێك یەك ریز نەبێت ناوەندێتی نامێنێت و دیسپلینی ئاسنین نامێنێت و حیزبی شیوعییش لەم یاسایە بەدەر نییە چونکە یاسایەکە هەموو حیزبێك ئەگرێتەوە لە هەموو شوێنێك و هەموو کاتێکدا، نەمانی ناوەندێتی و دیسپلینیش ئەبێتە هۆی ئەوەی نهێنییەکان بەشێوەیەکی فراوان لەناو حیزبدا بڵاوببنەوە.

بەداخەوە ئەیڵێم کە لەگەڵ ئەم هەموو خۆ ئامادەکردنەدا بۆ سەرکەوتن، من ئەمزانی کە مەکتەبی سیاسی و لانی کەم لێپرسراوە گرنگەکانی، دژی کردەوەکەن و هەموو هەوڵێکیان ئەخەنەگەڕ بۆ ئەوەی ئەم دەستکەوتە گەورەیە نەهێنینە دی.

## ململانێی سەرکردایەتی و کاریگەرییەکانی

ئەو ململانێ توندەی لە ساڵی ١٩٥٦ەوە و لەدوای کۆنگرەی ٢٠ی حیزبی شیوعی لە یەکێتیی سۆڤێت دروست بووبوو، لەناو سەرکردەکانی حیزبدا قووڵتر بووبووەوە و بە تەواوی گەیشتبووە ناو هەموو لیژنەکانی حیزب و بگرە گشت شانەکانی ڕێکخستنەکانەوە. هەروەها گەیشتبووە رادەیەکی ئەوتۆ کە بۆنی دوژمنایەتی لێ ئەهات. هەموو ئەمانەش رەنگدانەوەی جیاوازییە فیکری و هێڵە جیاجیاکانی ناو حیزب بوون چ لە تێگەیشتن و چ لە ڕێگای هەرلایەك بۆ کۆنترۆڵکردنی دەسەڵاتی سەرکردایەتی و لە کۆتاییشدا ڕێگا گرتنەبەری ئەو سیاسەتەی ئەیانەوێت حیزبی لەسەر بڕوات. سەلام عادل کە دواتر بووە سکرتێری حیزب و ئازایانەش شەهید بوو، توانی حیزب کۆ بکاتەوە. کوتلە سێ قۆڵییەکەی زەکی خەیری و بەهادین نوری و عامیر عەبدوڵلا لەم قۆناغەدا گۆڕانێکی بەسەرداهات و عامیر، زەکی و بەهادین نوریی بەجێ هێشت.

لەو کارە ناپەسەندە دوور لە باری سیاسییەوە لەپڕ وەك هەورە تریشقەیەك بدات بە تەوقی سەرماندا، لە مەکتەبی سیاسییەوە فەرمانێك هاتە ناو ڕێکخستنەکانی

حیزب لە سوپادا داوای (جەرد)ی ئەکرد لە هەموو ڕێکخستنەکاندا و لە فۆڕمێك دا کە زانیاریی زۆر و وردی ئەویست لەسەر هەموو ئەندامەکان. ئەمە دوور بوو لە هەموو پەیڕەو و دابونەریتی حیزبێکی نهێنیی تەنانەت لەکاتی ئاساییدا چ جای ئەوەی لەکاتی چاوەڕێی ڕۆژانەی بەرپارکردنی شۆڕشێك بێت کە پێشڕەوەکەی ڕێکخستنەکانی سوپا بێت.

ئەمە لەلایەکەوە بێ باوەڕیی ئەو سەرکردانە بوو بە کارە شۆڕشگێڕییەکە وەك ستراتیژ و وەك تەکتیکیش، کات بردنەسەر و دواخستنی هەر ئەگەرێکی دەستپێکردنی پرۆسەکە بوو. ئەم فڕوفێڵەی ئەکرا، کاریگەریی یەکجار کوشندەی هەبوو بۆ دوا باوەڕی هەندێك کادر و ئەندام بەو سەرکردایەتییە راستڕەوە کە هەمان ئەو کەسانە بوون کە ڕێکخستنەکانی حیزبیان لە سوپادا پەرش و بڵاو کردەوە لەکاتی فەرمانڕەوایی عەبدولکەریم قاسمدا. هەمان تاقم و هەمان فیکری باوەڕنەبوو بە ڕێبازی شۆڕش. خاوەن بیروباوەڕە بەستراوەکان بە سیاسەتی حیزبی شیوعیی سۆڤێتەوە کە لەباتی شۆڕش ڕێگای ئاشتی و هاوکارییان گرتبووە بەر و باوەڕیان وابوو کە بە ڕێگای بەرەوپێشچوونی نا سەرمایەداری (التطور اللارأسمالي) گەلان ئەگەنە ئامانجی خۆیان. وەك تووتی خوێندن و ئاوازەکانی نووسەرە سۆڤێتییەکانیان ئەگوتەوە و کۆپییان ئەکرد.

بەمجۆرە زۆرانبازییەکانی ناو حیزب بەردەوام بوو. من ئەفسەر بووم لە سوپادا و بێجگە لە پەیوەندیم بە ڕێکخستنەکانی حیزبەوە لە ئۆردوگای ئەبوغرێب، ژمارەیەکیش لە ئەفسەرەکانی شوێنە جیاجیاکانیش پەیوەندییان بە منەوە هەبوو، هەر بۆ یادگار و وەفا و باسی سەربەرزییان لەوانە موقەدەم عەلی محەمەد شەریف (عەلی خاڵە) کە لە مەوقیعی شاری حلە بوو و ڕەئیس مستەفا حاجی عەبدوڵڵا کە خانەنشین بوو و لە بەغدا بوو هەریەکەشیان لێپرسراوی ژمارەیەك ئەفسەری خاوەن ڕوتبەی گەورە بوون. پەیوەندییان بە منەوە هەبوو. کاك عەلی خاڵە یەکێك بوو لە ١١ کەسی سەرەکیی ئەفسەرانی ئازادیخواز و سەرکردەکانی


فاروق مەلا مستەفا، ١٩٦٥

شۆڕشـــی ١٤ی تـــەموز و ڕۆژی ١٤ی تـــەموزی ١٩٥٨ یـــەکێك لـــە شـــوێنە گرنگەکانی نـاو بەغدا بـە سـەرکردایەتی کـاك عـەلی دەسـتی بەسـەردا گـیرا. کـاك مســتەفا حــاجی عەبــدوڵڵا کــە ڕوتبــەی ڕەئیسی هەبوو لە ١٤ی تـەموزی ١٩٥٨دا لـــە هێرشبردنەســـەر کۆشـــکی مـــەلیك و عەبدولئیلاهی (وەصی)ی مـەلیك، برینـدار بوو و ئـەم دوو گـەورە پیـاوە تێکۆشـەرە جێگـــای شـــانازی حیزبـــی شـــیوعی و کـــوردیش بـــوون کـــە بەشـــداریی ڕاســتەوخۆیان هــەبوو لــە بەرەبــەیانی ڕۆژی ١٤ی تەموزدا.

لەو بیرەوەرییانەی ڕۆژانی ئەبو غرێب (ص) کە دەرکـەوت جاسوسـی حکومەتـە لەناو ڕێکخستنی حیزبدا لە گەڕەکی (الثورة) کـوژرا. یەکسـەر فـەرمانی گرتنـی دوو هاوڕێی ڕێکخستنی سوپا لـە ئـەبوغرێب، (قاسـم) و (مـونیر) دەرچـوو، ئـەو کەسـە تەنیا ئەو دوو برادەرەی ئەناسی لەناو حیزبدا، کە ئەمە بوو بە بەڵگەیـەکی دیکـەی ئەو تاوانبارکردنە، و وەك هاوڕێیان گوتیان ئەو کەسە ڕوتبـەی (ڕەئـیس عورەفـای وەحدە)ی هەبوو بەڵام بە پلەی (مولازمی دووەم) خانەنشـین کـرا. ئینجـا ئـەو دوو برادەرەم نارد بۆ سلێمانی لەوێشەوە بۆ لقی (١٠)ی پێشمەرگەی حیزب کـە هـاوڕێ مەلا عەلی (عەبـدوڵڵای مـەلا فـەرەج) سـەرلقی بـوو و فەرمانـدەی هێزێکـی چـالاکی (پ.م)ی حیزب بوو لەو ساڵانەدا.

سەردەمی سەرپەرشتیکردنی ڕێکخستنەکانی سوپا، ماوەیەکی گـرنگ بـوو لـە ژیانمدا. پڕبوو لـە خۆشـی و خـەم و خـەیاڵ. مـن کـە شـەرمم ئـەکرد لێپرسـراوی

هـاوڕێ موقـەدەم عـەلی محەمـەد شـەریف بم و ڕەفتـارم وەك لێپرسـراو نەئـەکرد بەڵکو وەك قوتابییەکی ئەو قسەم لەگەڵ ئەکرد، ئەویش پیاوێکی بێفیز بوو، کـە ئەچوومە لای بۆ شاری حلە بە زەردەخەنەیەکی پڕ باوەڕبـەخۆوە ئـەیگوت ئێمـە نـەك تـەنها حلـە مسـۆگەرە بـەڵکو ئـەتوانین لـەکاتی پێویسـتدا هەنـدێ هێـز و توانامان بگەیەنینە بەغداش. مـن کـە ئەنـدامی لیژنـەی سـوپا بـووم، ڕاسـتەوخۆ پەیوەندیم بـە ڕێکخسـتنی سـەربازگەی ڕەشـیدەوە نـەبوو، بێجگـە لـە ڕاگەیاندنـە نهێنیەکانی حیـزب، بـەهۆی هـاوڕێی لەیادنەچـووم موقـەدەمی فڕۆکـەوان فەریـدون عارفیشەوە ئەمزانی کە دەسـەڵاتگرتن بەسـەر سـەربازگەی ڕەشـید و بـە تایبـەتی بنکە ئاسمانییەکەی کارێکە هەموو حسـابێکی بـۆ کـراوە. فڕۆکەوانـە ناسـراوەکانی عێراق فەریدون و بەهزاد سائیب و عەبدولنەبی جەمیل و صەباح و نوری کەمال لەو تێکۆشـەرانە بـوون کـە چـاوەڕێی ڕۆژی هەڵمـەت و ڕووخانـدنی حـوکمی نالـەبار و دوژمن بە دیموکراسی و گەل بوون.

هەر بۆ بەرزنرخاندنی هەندێك برادەری ئەوسا، لەبیرم ناچێت لەگەڵ هـاوڕێ ئـارا خاچادۆردا زوربەی کۆبوونەوەکانمان لە ماڵی خوالێخۆشبوو (حـافز مسـتەقا قـازی) ئـەکرا. کـاك حـافز شـیوعییەکی کـۆن و کەسـایەتییەکی دیـاری کۆمەڵایـەتی و ئـەدەبییش بـوو لـەناو کـورد دا، خـاوەنی گۆڤـاری ڕوونـاهی بـوو کـە لـە بەغـدا دەرئەچوو، ئەشمبینی زۆر بە ئومێدی سەرکەوتنی حیزبەوەیە.

بە درێژایی ساڵی ١٩٦٥ و تا حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٦ جموجوڵێکی پڕ لە هیـوای ڕووداوە چاوەڕوانکراوەکە هەموو توانا و هۆش و هەستمانی داگیرکردبـوو. لەبـەر خۆمەوە و بەبێ دەنگی لە گۆڕەپانی مەشقکردنەکەی نەجەف کە لـەوێ ئەفسـەر بووم، بەیاننامەی ژمارە یەکی شۆڕشم ئەخوێندەوە و خوێن بـە پاڵەپەسـتۆیەکی بە تەوژم بـە لەشـەمدا ئەگـەڕا. بـیرم ئـەکردەوە تـۆ بڵێـی شـەرەفی ئـەوەم پـێ ببەخشرێت من ئەم ئیعلانە بکـەم بـۆ گـەلی عێـراق، یـان مـن ڕۆڵێکـی گونجـاوترم ئەدرێتێ ئەو ڕۆژە کە پاش دەسەڵاتگرتنمان بەسەر سەربازگەی ئەبوغرێب دا لـە

دەبابەی یەکەمدا ئەبم بۆ هێرشبردنە سەر کۆشکی کۆماری. سەرکەوتن ئەبینم یاخود وەك پاڵەوانی مێژوویی، حەسەن سەریع و سەڵاحی حەمە جەمیل ئەچمە کاروانی شەهیدانی ئەم گەلە نەبەزەوە.

ئەمە هەستی سەدان و هەزاران تێکۆشەری حیزب و دۆستەکانمان بوو کە لە ناخەوە ئامادەی قوربانیدان بوون بۆ هێنانە دیی ئامانجەکانمان.

حیزبی شیوعی کارگەیەکی گەورەی پێگەیاندن و پەروەردەکردنی کادری شۆڕشگێڕ و رۆشنبیر بوو کە لە رێڕەوی تێکۆشان بۆ بەدیهێنانی دروشمی نیشتمانێکی ئازاد و گەلێکی بەختیاردا ئامادەی قوربانیدان بوون بە هەموو خۆشییەکی ژیان و بەختکردنی گیانیشیان لەم رێگایەدا.

## پەرەسەندنی رووداوەکان بە ئاراستەیەکی جیاوازدا

رۆژ لەدوای رۆژ و مانگ لەدوای مانگ لە چاوەڕوانییەکی پڕ ئومێد دا بووین بۆ فەرمانی حیزب.

لە باتی ئێمە و لە رۆژی ٣٠ی حوزەیرانی ١٩٦٦دا لەهەمان سەربازگەی ئەبوغرێبەوە بانگەوازی کودەتای نەتەوەییە عەرەبەکان لە ئێستگەی رادیۆی بەغداوە بڵاوکرایەوە کە بە سەرکردایەتی عارف عەبدولڕەزاق بوو، و بە دەنگی عەقید هادی خەماس بەیاننامەی یەکەمیان خوێندەوە.

بۆ من و هاوڕێکانم ئەمە گورزێکی کوشندە بوو دای بە تەوقی سەرماندا و هیوا و ئاواتێکی گەورەی دوورخستینەوە.

ئەم تاقمە هەمان پلانی ئێمەیان هەبوو. لە ئەبو غرێبەوە دەستپێکردن، بەرەو سەربازگەی وەشاش، گرتنی ئەمانە و بەرەو داگیرکردنی کۆشکی کۆمار.

هێزەکانی عارف عەبدولڕەزاق نەیانتوانی دەستبگرن بەسەر مەخزەنەکانی تەقەمەنی ئەبوغرێب دا، چونکە هێزی پاسەوانان بەربەستیان کرد، لەبەرئەوە بە چەند دەبابەیەکی بێ چەك و تەقەمەنی بەرەو (وەشاش) هێرشیان دەستپێکرد،

لەوێوە کە بەرهەڵستییان کردن دەبابەکان بەرەو دواوە کشانەوە، ئەو دەبابانە دەبابەی مەشقکردن بوون، بۆیە بە بەتاڵی ڕۆیشتن و گەڕانەوە.

هادی خەماس خۆی بەڕێوەبەری ئیستیخباراتی سوپا بوو لە عێراقدا و بە ناوی لیوای ئاسمانی عارف عەبدولڕەزاقەوە بەیانەکانی ئەخوێندەوە کە سەرۆك وەزیرانی پێشووی عێراق بوو، پێش ئەمجارە لە ١٩٦٥/٩/١٥دا سەرۆکی وەزیران و وەزیری بەرگریی عێراق بوو، هەوڵی کودەتای دا بەسەر عەبدولسەلام عارفی هاوڕێیدا کە سەرۆك کۆماری عێراق بوو و لەو ڕۆژەدا لە سەردانی (مەغریب) بوو بۆ بەشداریکردن لە کۆنگرەی لوتکەی عەرەبیدا لە شاری (دارلبەیزا). هێزەکانی سوپا بە سەرکردایەتی سەعید سلێبی کە لایەنگری سەرۆك کۆمار عەبدولسەلام عارف بوو هەوڵەکانی عارف عەبدولڕەزاقیان لەبار برد و بەسەریدا سەرکەوتن. ئەوەبوو عارف عەبدولڕەزاق و کۆمەڵێك لە هاوکارەکانی لە ئەفسەرانی عێراق کە لە نەتەوەییە عەرەبەکان و نزیك جەمال عەبدولناسر بوون رایانکرد بۆ میسر و لە قاهیرە جێگیر بوون.

عەقید هادی خەماس کە لە سەرەکییەکانی سەرکردایەتی هەوڵی کودەتاکە بوو، دەستگیرکرا و لەکاتی لێکۆڵینەوە لەگەڵیدا گوتبووی: "دڵتان خۆش نەبێت کە سەرکەوتوون بەسەرماندا، بەرهەڵستیی شیوعییەکان لە ئەبوغرێب پشتی ئێمەی شکاند."

ئەمە بەشێکی ژێرکەوتنەکەیان بوو، بەشێکی گرنگی دیکەشی ئەوەبوو هێزەکەیان زۆر سنوردار بوو، و جەماوەریان لەگەڵ نەبوو کە لەهەمان کاتدا بەشداری بکەن و بە خۆپیشاندانێکی گەورە لایەنگرییان دەربڕن.

پاش ئەم ژێرکەوتنە و هەڵهاتن و گیرانی سەرکردەکانیان، حکومەتی عێراق کەوتە لێکۆڵینەوە لەبارەی ناو سەربازگەکەی ئەبو غرێب و لەسەر ئەو زانیارییانەی دەستی کەوتبوو، گۆڕانکارییەکی گەورەی لە بەشە سەربازییەکانی ئەبو غرێبدا کرد و بۆ ڕێگرتن لە هەر جموجوڵێکی داهاتووی حیزبی شیوعی تیایدا، گەلێك حسابی خۆی کرد کە بووە هۆی هەڵوەشاندنەوە و پچڕپچڕبوونی بەرنامەکانی ئێمە و ئەو گرنگییەی سەربازگەی ئەبوغرێب هەیبوو وەك جاران نەما.

## کەشوهەوا سیاسییەکە

کۆبوونەوەکەی کۆمیتەی ناوەندییش لە ناوخۆی وڵاتدا لە مانگی نیسانی ١٩٦٥ کرا و کۆبوونەوەکە ناچار بوو ئەم دروشمانە پەسەند بکات، هەرچەندە سکرتێر نازم عەلی (واتە عەزیز محەمەد) یەکێك لە هاوکارەکانی خۆی بە تایبەت ناردبوو بۆ ئەوەی نەهێڵێت دروشمی رووخاندنی حکومەت بەرزبکرێتەوە.

لە ئاکامی ئەم دەستێوەردانانەدا بەیاننامەکەی کۆمیتەی ناوەندی لە مانگی نیسانی ١٩٦٥دا دروشمی شۆڕشگێڕ و لێکدانەوەی ریڤیژنیستی تێدا بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ناوەندە سۆڤێتییەکان پێیان وابوو ئەو بەیاننامەیەی کە سەردێڕەکەی دروشمی روخاندنی حوکمی عارفییە شکاندنی ئەو بەڵێنە نهێنییانەیە کە مۆسکۆ داونی بە حکومەتی میسر، بەوەی کە حیزبە شیوعییە عەرەبییەکان ناچاربکات ملکەچی ئەو حکومەتانە بن کە پەیوەستن بە قاهیرەوە. ئەوە بوو پاش دەرچوونی بەیاننامەکە و دابەشکردنی بەسەر رێکخراوەکانی حیزبدا لە ناوخۆی وڵاتدا، رادیۆی (دەنگی گەلی عێراق) دەستی کرد بە پەخشکردنی زنجیرەیەکی درێژ لە وتاری سۆڤێتیی وەرگێڕدراو کە بە ئاشکرا بانگەوازیان ئەکرد بۆ هێڵی ئابی ١٩٦٤ سەبارەت بە نکۆڵیکردن لە پرەنسیپی دیکتاتۆریی پرۆلیتاریا و وازهێنان لە رۆڵی پێشەنگی چینی کرێکار لە شۆڕشی دیموکراسیدا و ستایشی حکومەتی میسر و ئاراستە سۆشیالیستەکانی و ئەو هەڵوێستانەی ئەکرد کە پشتیوانن بۆ حکومەتی عارف لە عێراقدا. بەڵام بەهەرحاڵ، هێڵی ئاب هیچ پێگەیەکی نەبوو لە ناو حیزبدا بەڵکو بە گوشاری دەرەکی و بە دەستپێشخەریی توخمە هەلپەرستەکان سەپێنرا و ئەو سەرکردایەتییەی حیزب کە لە موسکۆ نیشتەجێ بوو هەر گرنگی بەوە ئەدا خۆی بگونجێنێت لەگەڵ بۆچوونەکانی ناوەندە سۆڤێتییەکاندا، لە کاتێکدا کە ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی لەناوخۆی وڵاتدا نەیانئەتوانی بۆچونەکانیان بسەپێنن لەئاکامی شەپۆلی بەهێزی ناڕەزایەتیی قاعیدەی حیزب و جەماوەر بەگشتی.

لەڕاستیدا هەندێك ئەندامی سەرکردایەتی لەدەرەوەی وڵات لەژێر گوشاری بەردەوامی ناوەندە سۆڤێتییەکاندا بۆ پاشگەزبوونەوە لە بەیاننامەی نیسان ناچاربوون ئەم راستییە ئاشکرا بکەن. بۆنمونە لە وتارێکدا بەناوی بەهادین نوری (ناجی)یەوە کە مانگی حوزەیرانی ١٩٦٥ لە گۆڤاری (مەسەلەکانی ئاشتی و سۆشیالیزم)دا بلاوکرایەوە نووسەرەکە پێی لێنا کە دەستپێشخەری بۆ گۆڕینی هێڵی حیزبی شیوعی عێراق لە قاعیدەی حیزبەوە هاتووە نەك ئارەزووی کۆمیتەی ناوەندی بێت و بە جۆرە داوای لێبوردنێکەوە لە بەیاننامەی نیسانی ١٩٦٥ دا ئەڵێت (لەماوەی ساڵی رابردوودا بەردەوام گفتوگۆی توندوتیژ هەبووە سەبارەت بە هێڵی سیاسیی حیزبمان، ئەمەش نەك تەنیا لەناو ریزی ئەندامەکانیدا بەڵکو لەناو ئەو جەماوەرەشدا کە ئاڕاستەیەکی نیشتمانییان هەیە، لەبەر ئەوە ئەتوانین بڵێین وێناکردنی ئەم هێڵە سیاسییە تەنیا دەرەنجامی هۆشیاری و درك پێکردنی کۆمیتەی ناوەندی حیزب نییە، بەڵکو مولکی هەموو شیوعییە هۆشیارەکان و جەماوەری شۆڕشگێڕە کە لەماوەی شۆڕشی ١٩٥٨ تا ١٩٥٩دا دیکتاتۆرییە سەربازییەکەی قاسم و رژێمە بەعسییەکەی دژ بە شۆڕش و هەروەها لەژێر دەسەڵاتی ئێستای عارف یەحیادا بە کۆمەڵێك تاقیکردنەوەی سەختدا تێپەڕی.)

هەروەها قاعیدەی حیزب و ئاڕاستە باڵادەستەکە لەناو جەماوەری گەلدا دژی رژێمە کۆنەپەرستەکەی عارف هەڵکشان بۆ ئاستێکی تازەی وا کە لەوەوپێش نەیگەیشتبوونێ و بوونە هێزێك کە کەس نەیئەتوانی روبەڕوی بوەستێتەوە. بۆیە لایەنگرانی خۆڕادەستکردن و پاکتاوکردن و پشتیوانانی هێڵی گەشەکردنی ناسەرمایەداری هەڵگەڕانەوە و بوون بە (شۆڕشگێڕ)!!

رێك لەم بارودۆخەدا بوو جەندەل (واتە زەکی خەیری)، کە جەمسەری کوتلە سێ قۆڵییەکە بوو، لە ٢٢ی حوزەیرانی ١٩٦٥دا نامە بەناوبانگەکەی نووسی بۆ کادیرە پێشکەوتووەکانی حیزب بۆ ئەوەی رۆڵی خۆی و هاوڕێکانی لەو کوتلە هەلپەرستەدا ئاشکرا بکات کە باڵی کێشابوو بەسەر سەرکردایەتیی حیزبی شیوعیی

عێراقیدا لـە بـارودۆخێکی کارەسـاتباری بێوێنـەدا و دەرفەتـە مێژووییـە گـەورەکانی شۆڕشــی خەســار کــرد و رێگــەی خۆشــکرد بــۆ ســەرکەوتنی دژە شــۆڕش. بــەڵام مەسەلەکە هەر لەوەدا نەوەستا کە هەوڵ بدەن تۆبە لـە گوناهـەکانیان بکـەن، بـەڵکو جەمسەرەکانی پاکتاوکاری کە ترسناکترین رۆڵیان گێڕا لەخاوکردنەوەی مەسـەلەی شۆڕش و تەسلیمبوون بە دوژمنـە چـینایەتییەکە، دەستپێشـخەرییان کـرد لـەوەی خۆیان بکەنە پێشەنگی شـەپۆلە شۆڕشـگێڕە تازەکـە و ئەوانـەی کـە جـاران داوای هەڵوەشاندنەوەی حیزبی شیوعییان ئـەکرد و مژدەبـەری سۆشـیالیزمەکەی عەبدولسـەلام عارف بوون هەڵگەڕانەوە و بە تەکتیك بوون بە فەیلەسوفی کودەتای سەربازیی شۆڕشگێڕ.

بەم شێوەیە و لـە ئاکـامی نـاڕەزایی روو لـە هەڵکشـانی جـەماوەر و نـابووتبوونی توندی هەموو هێڵە ریڤیژنیستەکە، لە مانگی ئەیلولی ١٩٦٥دا کۆبوونـەوەی کۆمیتـەی ناوەندیی دەستپێشخەری کرد لـە دەرکردنـی بڕیارێکـدا بـۆ رێکخسـتنی کودەتایـەکی سەربازی بەمەبەستی رووخانـدنی دەسـەڵاتی عـارف و وەرگرتنـی کلیلـی دەسـەڵات، ئەوان هەر بەم بڕیارە نەوەستان کە ئەگەر بەڕاستیان بووایە پێویست بـوو بـە نهێنـی بیانهێشتایەتەوە بەڵکو لەسەر لاپەڕەکانی رۆژنامەکانی حیزبدا بڵاویان کردەوە.

ئەوەبوو لەبەیاننامەی تایبەت بە کۆبوونەوەی کۆمیتەی ناوەنـدی لـە ئـەیلولی ١٩٦٥دا نووســراوە: "ئێمـــەش وەکـــو هێـــزە کۆمەڵایەتییـــەکانی دیکـــە بـــەو ئاڕاستەیەدا ئەڕۆین کە توانا تاییەتەکانمان کۆبکەینەوە و کارێکی شۆڕشگێڕانەی یەکلاکـەرەوە ئـەنجام بـدەین بـۆ رووخانـدنی دەسـەڵات بـە پشـتیوانیی رێکخـراوە حیزبی و جەماوەرییەکان".

گومـانی تێـدا نییـە کـە حـوکمی عـارف لاواز و تـەواو دابـڕاو بـوو لـە جـەماوەر، دەستپێکردنەوەی شەڕ لە کوردستاندا کە لـە نیسـانی ١٩٦٥ەوە هەڵگیرسـابووەوە کەشوهەوایەکی گونجاوی خولقاند بۆ زیـادکردنی چـالاکیی شۆڕشـگێڕانە و ئەمـەش بەئاشکرا لە گەشەکردنی رێکخـراوە سـەربازییەکانی حیـزب و کـۆنترۆڵکردنی پێگـە سـتراتیژییەکانی پایتەختـدا رەنگـی دایـەوە، بـەڵام ئـەوەی پێشـوەخت نەخشـەی

کودەتایەکی سەربازی رابگەیەنرێت لە لاپەڕەکانی رۆژنامە تایبەتەکانی خۆیدا کە حیزبێکی شیوعی ئەنجامی بدات لەڕاستیدا بە مەبەستی ئامادەکاری نەبووە بۆ جێبەجێکردنی نەخشەیەك کە هێشتا پێنەگەیشتبوو بەڵکو بۆ بێدەنگکردنی قاعیدەی حیزب بووە کە داوایان ئەکرد هێڵە ریڤیژنیستەکە رووتبکرێتەوە و لێپرسراوەکانی ئەو هێڵە دووربخرێنەوە.

موزایەدەکردن بە دروشمەکەوە وایکرد دوژمن وریا ببێتەوە و دواتریش زەبرێکی کوشندە بوەشێنرێت لە رێکخراوە سەربازییەکانی حیزب.

بەهەرحاڵ کۆمیتەی ناوەندی لەناوخۆی وڵاتدا (واتە ئەو ئەندامانەی کۆمیتەی ناوەندی کە لە عێراقدا بوون و راسپێردرابوون کارەکانی حیزب بەڕێوەببەن) وا خۆی نیشان ئەدا کە پەرۆشە بۆ جێبەجێکردنی نەخشەی کودەتاکە بۆیە لە پایزی ساڵی ١٩٦٥ دا لەنامەیەکیدا بۆ مەکتەبی سیاسیی حیزب کە لە دەرەوەی وڵات ئەژیا، داوای لێکرد رەزامەندی نیشان بدات بۆ جێبەجێکردنی کودەتاکە و گوتی: "چارەنوسی وڵات لەم رۆژانەدا دیاری ئەکرێت" و پێویستە کاری خێرا بکرێت بەرلەوەی "لایەنێك سەرکێشی بکات و بە هێز و توانای کەمترەوە ئەو کارە ئەنجام بدات کە کۆمیتەی ناوەندی ئەتوانێت دابینیان بکات و سەرکەوتن بەدەست بهێنێت لە هەوڵەکانیدا".

لەپێناوی ئەوەدا کۆمیتەی ناوەندی بڕیاری دا داوای کۆبوونەوەیەکی فراوان بکات بۆ تاوتوێ کردنی سیاسەتی حیزب پاش ئەوەی کە بۆی دەرکەوت بەتەواوی بێتوانایە لە کۆنترۆڵکردنی دۆخە تەقیوەکەی ناوخۆدا.

ئەمە لە مانگی ئەیلولی ١٩٦٥دا بوو کە کۆبوونەوەکەی کۆمیتەی ناوەندی بڕیارێکی دەرکرد لەپێناو "بەشداریکردنی ژمارەیەکی گونجاوی کادیرە سەرکردایەتییەکانی حیزب لە توێژینەوە و دیاریکردنی ئەرکە هەنوکەییەکانمان لەدۆخی ئێستادا و لەپێناو بەدیهێنانی ئەم مەبەستە بڕیاردرا کۆبوونەوەیەکی فراوان ببەسترێت کە بێجگە لە هاوڕێیانی کۆمیتەی ناوەندی ژمارەیەکی بەرچاوی سەرکردەی رێکخراوەکانی حیزبیش بەشداری تێدا بکەن".

کۆبوونەوە فراوانەکە وەك کۆنفرانسێکی حیزبی وابوو لە کۆتاییەکانی تشرینی یەکەمی ١٩٦٥دا لە گوندی داربەسەر لە ناوچەی خۆشناوەتی بەسترا. ٢٥ کەس لە بەرپرسانی رێکخراوە حیزبییەکان بەشداریان تێدا کرد بەو ئەندامانەی کۆمیتەی ناوەندییشەوە کە لەعێراقدا بوون، دواتر کۆبوونەوەکە بە (کۆبوونەوەی ٢٥) ناسرا.

کۆمیتەی ناوەندی لەم کۆبوونەوەیەدا رەچاوی ئەوەی کرد هیچ کەسێك لەوانە بەشدار نەکات کە هەر لە سەرەتاوە رووبەڕووی هێڵی ئاب بوونەوە و رۆڵی گرنگیان هەبووە لە دروستکردنەوەی رێکخستنەکانی حیزب لە دوای کودەتاکەی ٨ی شوبات.

بەشداربوونەکە تەنیا بەرپرسانی رێکخراوە حیزبییە هەرە گرنگەکانی گرتەوە لەوانەی کە بەشی زۆریان بەرپرسیاریەتییەکانیان لەلایەن هەیئەی ناوەندییەوە وەرگرتبوو کە سەرکردایەتیی حیزبیان بە پشتیوانیی ناوەندە سۆڤێتییەکان گرتبووە دەست.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کۆبوونەوەکە ئەو رەوتە بالادەستە تیایدا رەنگی دایەوە کە لە ریزەکانی خوارەوەی حیزبدا بالادەست بوون ئەمەش ئاماژەیەکە بۆ ئاستی قووڵیی ناڕەزایەتی قاعیدە لە سەرکردایەتیی حیزب و هێڵە سیاسییەکەی.

کۆبوونەوەکە دەستلەکارکێشانەوەی ئەو ئەندامانەی کۆمیتەی ناوەندی لێکەوتەوە کە لە عێراقدا بوون و سەرکردایەتییەکی نوێ هەڵبژێردرا ناوی لێنرا (قیادەی مەرکەزی)[1] کە کۆبوونەوەکە هەڵیبژارد بۆ بەڕێکردنی کارەکانی حیزب بەشێوەیەکی کاتی هەتا بەستنی کۆنگرەی نیشتمانی حیزب کە ئەرکی یەکلاییکردنەوەی ململانێ هزرییەکەی ناو حیزب و دیاریکردنی هێڵی روون و راشکاوی سیاسی رووبەڕوو کرابووەوە بەمەبەستی کۆتاییهێنان بەو وتە وتی و ئەو نائارامییە زۆرەی کە لەناو جەماوەر و گەلدا هەبوو. هەروەها بۆئەوەی حیزبیش بخاتە سەر رێگەی سەرکردایەتیکردنی شۆڕش.

هەروەها بڕیار وابوو کۆنگرەکە لەماوەی نۆ مانگی داهاتوودا لە کوردستان

---

[1] ئەم قیادەی مەرکەزییە ناوێك بوو بۆ ئەو پێشنیارەی ئەو رۆژانە و (قیادەی مەرکەزیی)یەکەی پاش ئەیلولی ١٩٦٧ نییە.

ببەسترێت، بەڵام هەست کرا کە ئەندامانی قیادەی مەرکەزی تازە ئەم نیازەیان پەکخست چونکە لێپرسراوە تازەکان دوودڵییان نواند لە گرتنەئەستۆی ئەرکەکانیان و قەناعەتیان بە بەشداربووانی کۆبوونەوەکە کرد ئەندامانی دەستلەکارکێشاوەی کۆمیتەی ناوەندی بگێڕنەوە شوێنی خۆیان.

ئەم بڕیارە و نیشانەکانی سەبارەت بە لاوازیی توخمە سەرکردایەتییەکان کە لە کۆبوونەوەکەدا دەرکەوتن لە یەکەمجاردا دەرفەتی رەخساند بۆ توخمە نیشتەجێکانی مۆسکۆ کە دواتر گشت بڕیارەکانی ئەو کۆبوونەوەیە رابگرن و پەکی بخەن.

ئەم بڕیارانە سەرەڕای ئەوەی کە رەنگدانەوەی هەڵوێستی یەکلانەکەرەوە و دوودڵیی سیاسی تێدابوو بە هاندانی رەوتە دەستڕۆیشتووەکەی حیزب لەناو عێراقدا، بەڵام زیاتر رۆڵی ئەو رەوتەی تێدابوو کە لەناو ریزەکانی حیزب و لەناوخۆی عێراقدا باڵادەست بوو، ئەمەش یارمەتیدەر بوو بۆ گەشەکردنی بزووتنەوەی دژ بە ریڤیژنیستی و رێکخستنەوەی لەسەر بناغەی تازە.

یەکێك لەو بڕیارانە بریتی بوو لە (بەهەڵە لەقەڵەمدانی ئەو هێڵە سیاسییە گشتییە کە حیزب لەناوەڕاستی ١٩٦٤ەوە هەتا نیسانی ١٩٦٥ گرتبوویە بەر).

ئەمە بە پێی بەیاننامەی نهێنی سەبارەت بە کۆبوونەوەکە بەڵام لەڕاستیدا بڕیارەکە جێبەجێ نەکرا بەهۆی هەژموونی ئەو توخمە ریڤیژنیستەی کە گەڕێنرایەوە بۆ سەرکردایەتی حیزب و هەروەها بەهۆی دوودڵی و لاوازی توخمە ئەلتەرناتیڤەکەی سەرکردایەتی، چونکە بەهەڵە ئەژمارکردنی هێڵی ئاب تەنیا بەشێوەیەکی راگوزەر راگەیەنرا بۆ قاعیدەی حیزب و جەماوەر ئەویش لە بەیاننامەیەکی کورتدا کە ٣ مانگ پاش کۆبوونەوەکە بڵاوکرایەوە لە (مناضل الحزب)دا. بڵاوکردنەوە کورتەکەش هیچ هەڵمەتێکی هزریی تێدا نەبوو دژی هێڵی ئاب هەروەها ئەو هۆکارانەش روون نەکراونەتەوە کە دەرفەتیان خوڵقاند ریڤیژنیزم کۆنترۆڵی سەرکردایەتی حیزب بکات و رێگا خۆش بکات بۆ لادانە کۆنەپەرستییەکە.

کۆبوونەوەی ٢٥ و چالاکییە حیزبییە فراوانەکەی پاش ئەو کۆبوونەوەیە جەختیان نەکردە سەر پاکتاوکردنی میراتییە خراپەکەی رابردوو، بەڵکو بایەخیان بە شتێکی دیکە ئەدا کە ئەویش نەخشەی (کاری یەکلاکەرەوە) بوو، واتە کارکردن بۆ ڕێکخستنی کودەتا سەربازییەکە، ئەم نەخشەیەش زوربەی هەرە زۆری لێپرسراوی ڕێکخراوە حیزبییەکانی سەرقاڵ کردبوو کە بە نیازپاکییەوە دەیانڕوانییە هەڵسوڕێنەرانی ئەم بانگەوازە و بەکردەوەش گەلێك گفتوگۆی درێژ کرا بۆ تاوتویێ کردنی توانا سەربازی و سیاسییەکە، بەڵام گەیشتنە بنبەست کاتێك بەرپرسیارانی نەخشەکە بڕیاری دواخستنیان دا و تێگەیشتن لەوەی کە بارودۆخی ڕێکخراوەیی حیزب و ئاستی ئامادەکردنی جەماوەر ڕێگە نادەن بە دەستبەکار بوونی خەڵك بۆ رووخاندنی رژێم هەرچەندە لاوازە و لە میللەتیش دابڕاوە، لەبەرئەوە بڕیاردرا هەوڵەکان چڕبکرێنەوە لەپێناو (ئامادەکردنی پێداویستییە سەرەکییەکان). ریڤیژنیستەکان هەستیانکرد ئەزانن کات بکوژن بەوەی وا خۆیان نیشان بدەن کە لایەنگری نەخشەی کودەتا سەربازییەکەن بەمەبەستی ئەوەی ئۆپۆزسیۆنە شۆڕشگێڕەکە پارچە پارچە بکەن، سەرەنجام بڕیارەکەی کۆبوونەوەی ٢٥ سەبارەت بە (کاری یەکلاکەرەوە) بوو بە بیانوویەك بۆ پوچەڵکردنەوەی هەموو داخوازییەك بۆ لێپرسینەوە لە لێپرسراوانی هێڵی ئاب و دوورخستنەوەیان لە سەرکردایەتیی حیزب. من و زوربەی کادر هەستمان ئەکرد کە سەرکردایەتییە یەمینییەکە هەر لە بنەڕەتەوە دژی ئەو کارەن.

زۆری پێنەچوو دەستەی سەرکردایەتی لە دەرەوەی عێراق دەرفەتی پەکخستنی بڕیاری کودەتاکەی بۆ رەخسا و سەرلەنوێ کۆنترۆڵی سیاسەتی حیزبی کردەوە لەناو عێراقدا بەڵام کۆبوونەوەکە بڕیارێکی وای دەرکرد کە هێندەی دیکە ململانێی هزری قووڵ کردەوە کە بڕیاری دا لیژنەیەکی یاریدەدەر دروست بکات بۆ قیادە مەرکەزی (ئەم قیادەی مەرکەزییە بڕیاری کۆبوونەوەی ٢٥ کەسییە نەك قیادەی مەرکەزیی دوایی) ئەرکەکەی بریتی بێت لە ئامادەکردنی نووسراوە هزری و سیاسییەکان بۆ کۆنگرەی نیشتمانیی داهاتوی حیزب.

بڕیاری کۆبوونەوەکە بەدەق ئەیگوت "پوختەکردنی ئەزموونی قۆناغەکانی رابردوو بەتایبەت قۆناغەکانی پاش شۆڕشی تەموزی ١٩٥٨، بەمەبەستی دابینکردنی پێداویستییەکانی بەهێزکردن و گەشەپێدانی دیموکراسیی ناوخۆ."

کۆبوونەوەی ٢٥ هەریەك لە عەزیز ئەلحاج و زەکی خەیری هەڵبژارد بۆ ئەندامێتی لیژنە یاریدەدەرەکەی قیادەی مەرکەزی کە راسپێردرا بۆ ئامادەکردنی نووسراوە بنەڕەتییەکانی کۆنگرە.

گرنگترین کاری ئەم لیژنەیە کە دواتر رۆڵێکی گرنگی گێڕا لەو ململانێ هزرییەی کە پاشان هاتە ئاراوە، ئامادەکردنی بەیاننامەیەکی سیاسی بوو کە دواتر لەژێر ناونیشانی (هەوڵێك بۆ هەڵسەنگاندنی حیزبمان لەماوەی نێوان ١٩٥٨ هەتا نیسانی ١٩٦٥) بڵاوکرایەوە.

یەکەمجار بەڵگەنامەکە لە کۆتایی ساڵی ١٩٦٥دا لە دەرەوەی عێراق بڵاوکرایەوە و بەشێوەیەکی نارەسمی دابەشکرا، هەرچەندە پێکهاتەکانی سەرکردایەتی پێیان ناخۆش بوو.

ئەو بەڵگەنامەیە هەتا شوباتی ١٩٦٧ بە رەسمی بڵاونەکرایەوە، واتە پاش دوو ساڵ لە نوسینی بڵاو کرایەوە و ئەویش کاتێك بوو کە ململانێکانی ناوخۆی حیزب لە تەقینەوەدا بوون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا توخمە ریڤیژنیستەکان توانیان سێ بەشی تەواوی لێ بسڕنەوە، ئەمەش بە رەزامەندیی نووسەرانی بەڵگەنامەکە بوو کە مانای وایە عەزیز و زەکی پاشگەز بوونەتەوە لە هەڵوێستی پێشوویان لەکاتێکدا کە رەوتی دژە ریڤیژنیستی لە ناو حیزبدا رووی لە هەڵکشان ئەکرد. ئەمەش راستییەکە دواتر بەباشی روون ئەبێتەوە کاتێك کە پەیوەندییە پێچەوانەکە ئاشکرا ئەبێت لەنێوان گەشەکردنی ئاراستەی شۆڕشگێری لە قاعیدەی حیزب و پاشەکشێکردنی سەرکردایەتییەکانی رێکخراو.

ئەو سێ بەشەی کە لادرابوون تەرخان بوون بۆ چارەسەرکردنی شێوازەکانی جەنگی میللی و رێکخستنی تیمە شۆڕشگێڕە چەکدارەکان لەبەر رۆشنایی ئەزمونی بەرگریی چەکدار لە گوندەکانی عێراقدا دژی کودەتا فاشییەکەی ساڵی ١٩٦٣.

من کە بە درێژیی باس لەم مێژووە ئەکەم ڕەنگە بۆ خوێنەری ئاسایی زیاد لە پێویست بێت، بەڵام بۆ ئەو شیوعی و دۆستانەی حیزب بەشێکە لە مێژوویەکی گرنگی حیزب و ئەو ململانێ و زۆرانبازییانەی ریزەکانی حیزب و بۆ شەخسی خۆیشم ساڵانیکی زۆر لەم گێرەوکێشەیەدا ژیانم بردە سەر، و هەندێك لەم زانیارییانە لە راپۆرتێکی حیزبەوە (قیادەی مەرکەزی) وەرگیراوە کە خۆیشم بەشدار بووم لە ئامادەکردنیدا.

گرنگە لێرەدا کەمێك رابوەستین بۆ تاوتوێکردنی نووسراوەکەی (هەوڵی هەڵسەنگاندن) و رێبازی سیاسی هەر کام لە نووسەرەکانیان لەساڵی ١٩٥٩وە.

وەك زانراوە زەکی خەیری (جەندەل) یەکێکە لە جەمسەرەکانی ئەو کوتلە سێ قۆڵییەی کە سەرکردایەتیکردنی حیزبی گرتە دەست لەکۆبوونەوە فراوانەکەی مانگی تەموزی ١٩٥٩دا و لەو کوتلەیەدا بەرپرسیارێتی یەکەمی گرتەدەست. جەندەل تا ئەندازەیەك خاوەنی مێژوویەکی سیاسی درێژە بەڵام هەتا ئەو دواییە لە ریزەکانی حیزبی شیوعیدا وەرنەگیرابوو، واتە هەتا پێش قەڵەمبازە نیشتمانییەکەی ١٩٤٨ (وثبة ١٩٤٨).

بەڵام عەزیز ئەلحاج کە وەك پاڵێوراوی ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی بەشداری کردبوو لەو کۆبوونەوە فراوانەدا، یەکێك بوو لە لایەنگرەکانی هێڵە خۆڕادەستکەرە کلکایەتیکەرەکە بۆ قاسم و ئەرکی پاساو هێنانەوەی ئەو هێڵە خۆڕادەستکەرەی کۆبوونەوە فراوانەکەی گرتە ئەستۆ، نەك هەرئەوە بەڵکو راپۆرتی کۆنفرانسی دووهەمی ساڵی ١٩٥٦ی کرد بە پاڵپشت بۆ ئەو راپۆرتەی کە حیزب رەخنەی لێگرت و بەفەرمی پاشەکشێی لێکرد.

لەڕاستیدا ئەم رەگوڕیشە ریڤیژنیستیانەی عەزیز دواتر دەرکەوت لەڕێگەی بەشداریکردنی لە تێپەڕاندنی هێڵی ئابی ١٩٦٤دا، هەرچەندە ئەم راستییە هەر شاردرابووەوە لە قاعیدەی حیزب. ناوبراو لە کۆبوونەوەکانی حوزەیران و ئابی ١٩٦٤دا بەشداریکرد و یەکێك بوو لە لایەنگرە دیارەکانی هێڵە ریڤیژنیستەکەی دەرەنجامی ئەو کۆبوونەوانە.

لەم رووەوە عەزیز ئەلحاج ژمارەیەك وتاری نووسی كە پاساویان ئەهێنایەوە بۆ هێڵەكەی خرۆشۆف، لەوانە وتارێك كە بەهاوبەشی لەگەڵ (فوئاد نەسار)دا لە ژمارەی سێیەمی گۆڤاری (مەسەلەكانی ئاشتی و سۆشیالیزم) لە مانگی ئازاری ١٩٦٤دا بڵاویان كردەوە. لەو وتارەدا داوای تیۆری (گواستنەوەی ئاشتیخوازانە) بەرەو سۆشیالیزم ئەكەن و هێرش ئەكەنە سەر حیزبەكانی دژی هێڵی خرۆشۆف.

لە ژمارە چواری هەمان ساڵی گۆڤاری ناوبراودا بە نووسینێك پشتگیری ئەكات لە رێككەوتنی راگرتنی شەڕ لە كوردستاندا كە مانگی شوباتی ١٩٦٤ راگەیەنرا. عەزیز ئەلحاج لەو رووەوە نووسیویەتی ئەو رێككەوتنە دەتوانێت "مەسەلەی ئاشتی و ئاسایش لە هەردوو خۆرهەڵاتی دوور و ناوەڕاستدا بەهێزتر بكات" و ئەم قسەیەی لە خرۆشۆفەوە وەرگرتبوو كاتێك خرۆشۆف لە بروسكەیەكدا بۆ عەبدولسەلام عارف پیرۆزبایی راگەیاندنی رێككەوتنەكەی كرد.

هەتا پاش كەوتنی خرۆشۆف، عەزیز ئەلحاج هەر دیلی هێڵە ریڤیژنیستە خرۆشۆڤییەكە بوو، ئەمەش بەڕوونی لە نامیلكەیەكدا دەرئەكەوێت كە لە مانگی شوباتی ١٩٦٥دا بڵاوی كردەوە بەناونیشانی (دەربارەی گەشەكردنی ناسەرمایەداری لە عێراقدا) كە تیایدا بیرۆكە بنەڕەتییەكەی ئاراستە ریڤیژنیستەكەی تاوتوێ كردووە سەبارەت بەتوانای بەدیهێنانی سۆشیالیزم لە وڵاتە تازە پێگەیشتووەكاندا بەسەركردایەتی چینی بۆرجوازی.

سەبارەت بە كۆماری عەرەبیی یەكگرتووش دۆخەكە جیاوازە، بۆ نمونە حیزبی وەفد دواكەوت و حیزبەكانی دیكە كۆنەپەرست بوون. بزووتنەوەی شیوعیی تیایدا پەرشو بڵاو بوو. عەزیز ئەلحاج ئەڵێت: "وەك زانراوە سەركردەكانی كۆماری عەرەبیی یەكگرتوو وردە وردە سوودیان وەرگرت لەرێگەی (ڕاست و هەڵە)، هەتا وایان لێهات بتوانن رێوشوێنی شۆڕشگێڕانەی قووڵ بگرنەبەر دژی بەرژەوەندییە ئیستیعماری و سەرمایەدارییەكان، ئینجا بڕیاری هەستپێكراویان وەرگرت بە ئاراستەی دیموكراسی سیاسی، و بیر و باوەڕ و میتۆدەكەشیان بەرەو پێشەوە رۆیشت و تائێستاش هەر گەشە ئەكات".

عەزیز ئەلحاج لە زوربەی زۆری شتەکانی پەیوەست بە عێراقەوە هاوبەشی کرد لەگەڵ ریڤیژنیستە عێراقییەکاندا و لەگەڵ ئەوەشدا تێبینی ئەکەین کە بەڵگەنامەی (هەوڵێك بۆ هەڵسەنگاندن) هەڵگەڕانەوەیەکە لە هەڵوێستی خۆی و (جەندەل)دا، بەڵام نەك بەو واتایەی کە ئەمە گوزارشتێك بێت لە ئارەزووی شۆڕشگێڕانە و پەیوەندی چینایەتییان بە ئاڕاستە شۆڕشگێڕە پرۆلیتارییەکەوە، بەڵکو دەرەنجامی هەڵکشانی رەوتە دژە ریڤیژنیستەکە بوو کە وردە وردە خۆی سەپاند بەسەر ژمارەیەك لە خودی لێپرسراوە ریڤیژنیستەکاندا، هەرچەندە زۆرێك لەوانە جارێکی دی پاشگەزبوونەوە چونکە مەیلە خۆپەرستییەکە تیایاندا مەیلێکی رەسەن و ریشەداربوو و کاتێك رەشەبا ریڤیژنیستەکە بەهێزبووایە ئەمان لەگەڵیدا ئەڕۆیشتن، بەڵام ئەم بەڵگەنامەیە بەرهەمێکی راستەوخۆی کۆبوونەوەی ٢٥ بوو، هەردوو نووسەرەکەش وازیان لە هەڵوێستە ریڤیژنیستەکەی جارانیان هێنا و پەیوەندییان کرد بە رەوتی ئۆپۆزسیۆنە شۆڕشگێڕەکەوە.

بەڵگەنامەکە سەرباری ئەو شوێن پەنجانەی هێڵە ریڤیژنیستەکە بەسەریەوە، بەڵام رۆڵێکی گەورەی گێڕا لە روونکردنەوەی ئەم هێڵە و قووڵکردنەوەی هۆشیاریی هزری لەناو حیزبدا و دواتر بوو بە چەکێکی گرنگ لە ململانێ کردن دژی ریڤیژنیزم لە ساڵی ١٩٦٧دا. بەڵگەنامەکە جەختیکردە سەر هۆکارە بنەڕەتییەکەی لەدەستدانی شۆڕشی تەموز: "ئەگەر حیزبمان خاوەنی گۆشەنیگایەکی شۆڕشگێڕیی راست بووایە لەپاش تەموز بە ئاڕاستەی وەبەرهێنانی توانا شۆڕشگێڕییەکان بۆ وەرگرتنی جڵەوی دەسەڵات لە وڵاتدا، ئەوا ئەیتوانی لەدۆخێکدا بێت لە ڕۆژانی هەڵسانەوەی ١٩٥٩دا ئەم ئامانجە بەدی بهێنێت و بە گفتار و بە کردار ببێتە سەرکردەی وڵات، ئەگەر سیاسەتی حیزب نەکەوتایە ژێر رکێفی ئەو ئەقڵییەتە راستڕەوەی کە زەندەقی چووبوو لە ئەگەری بەرپابوونی جەنگی ناوخۆ و دەستێوەردانی دەرەکی هەرچەندە ئەوە ئەگەرێکی واقیعی بوو".

ئەمەش دانپیانانە بە بەرپرسیاریەتی هێڵە ریڤیژنیستە راسترەوەکە سەبارەت بە لەدەستدانی شۆڕش بەحوکمی ئەوەی کۆنترۆڵی حیزبی کردبوو، هەرچەندە بەڵگەنامەکە لێرەدا هەوڵ دەدات بڕوبیانوو و بهێنێتەوە بۆ هەڵوێستی کلکایەتی لەژێر پەردەی سڵکردنەوە لە جەنگی ناوخۆ و دەستتێوەردانی بیانی، کە ئەم ترسانە بەبیری پەیڕەوکەرانی سیاسەتی کلکایەتیدا نەدەهاتن، واتە ئەوانەی کە شۆڕشیان کرد بەقوربانی بۆرجوازیی قاسمی.

## قووڵبوونەوەی قەیرانە ریڤیژنیستەکە و تیژبوونەوەی ململانێ هزرییەکە

کۆبوونەوەی ٢٥ خاڵی وەرچەرخان بوو لە گەشەکردنی ناکۆکییەکاندا لەناو ریزەکانی حیزبی شیوعیی عێراقیدا و لەبری ئەوەی وەك سەرکردایەتییە ریڤیژنیستەکە ئاواتی بۆ ئەخواست ئەو قەیرانە کەڵەکەبووانە چارەسەر بکات کە هەمو ئاستەکانی حیزبی گرتبووەوە، کەچی لەڕاستیدا ناکۆکییەکە قوڵتربووەوە چونکە لەناو کۆبوونەوەکەدا هێڵە ریڤیژنیستەکە گۆشەگیر کرا و پاش ئەوەش یەکسەر دوو تەوەر دەرکەوتن کە یەکێکیان لیژنەی ناوچەی بەغدا و ئەویتریان قیادەی مەرکەزی بوو کە لەو کۆبوونەوەیە دروست بوون.

سەرکردایەتیی ناوچەی بەغدا پێکهاتبوو لە چەند توخمێکی هەلپەرست کە لەڕووی رێکخراوەییەوە لە پلەی دووەمدا بوون و ساڵی ١٩٦٤ لەدەرەوە نێردرابوونەوە بۆ عێراق پاش ئەوەی لەقوتابخانە ریڤیژنیستەکاندا پڕکرابوون لە چەمکی خرۆشۆڤ سەبارەت بە (سروشتی سەردەم) و (سۆشیالیستی) بۆرجوازیی ناسری و (پێشکەوتنخوازی)ی عەبدولسەلام عارف و یەکێتییە سۆشیالیستەکەی. ئەمانە بەچاوی سوك ئەیانڕوانییە حیزبی شیوعیی عێراقی و بەسەرسامییەکی زۆرەوە تەماشای (زانا سۆڤێتییەکان) و لێکدانەوە تازەکانیان ئەکرد. بەڵام زۆری پێنەچوو ئەم توخمانە رووبەڕووی هەڵوێستی رێکخراوەکانی ژێر دەستیان بوونەوە

کە پەیوەندی هەمیشەییان هەبوو لەگەڵ جەماوەری بەغدادا، ئەو جەماوەرەی کە رقی لە رژێمی کۆنەپەرست و خوێناویی عارف بوو.

لەژێر کاریگەریی ئەمەدا، ئەو توخمانە هەڵوێستی خۆیان گۆڕی و بوون بە توندترین ناحەزی هێڵە ریڤیژنیستەکە لە کۆبوونەوەی ٢٥دا و مەبەستیان ئەوەبوو سواری شەپۆلە شۆڕشگێڕە هەڵکشاوەکە ببن پاش ئەوەی کە ئەستێرەی هێڵە ریڤیژنیستەکە ئاوابوو.

کاتێك کە مەسەلەی هەڵبژاردنی قیادەیەکی مەرکەزیی تازە لە کۆبوونەوەی ٢٥دا باسکرا ئەم سەرکردانە خۆیان بۆ ئەندامێتیی سەرکردایەتییە نوێیەکە پاڵاوت بەڵام هەموویان شکستیان خوارد و هەندێکیان لە دەنگی خۆیان زیاتر هیچ دەنگێکی دیکەیان نەهێنا.

ئەمان هەوڵیاندا پاساو بۆ ئەو شکستە بهێننەوە و وایان راگەیاند کە ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندیی سەرپەرشتیاری کۆبوونەوەکە پیلانیان لێ گێڕاون، واتە ئەو ئەندامانەی کە کتوپڕ دروشمی (کاری یەکلاکەرەوە) واتە کودەتای سەربازییان راگەیاند.

سروشتی ئەندامە بەزیوەکانی سەرکردایەتیی رێکخراوی بەغدا ئەوە نەبوو دیفاکتۆکە قبوڵ بکات و بەو پێگە حیزبییانەی خۆیان رازی ببن، بۆیە بڕیاریاندا هێرشێکی فراوان بکەنە سەر قیادەی مەرکەزی، بە پشتبەستن بەو رەوتە بالادەستەی کە لە رێکخراوەکانیاندا هەبوو لەپێناو رووخاندنی سەرکردایەتییە تازەکە و سەرکەوتنی خۆیان بۆ ناوەندەکانی بەرپرسیارێتی لەحیزبدا. جا لەبەر ئەوەی ئاسان نەبوو ململانێیەکی ئاشکرا بکرێت لەپێناو ئەم ئامانجە خۆپەرستانانە، لیژنەی بەغدا رایگەیاند دروشمی (کاری یەکلاکەرەوە) کە کۆبوونەوەی ٢٥ لە مانگی تشرینی یەکەمی ١٩٦٥دا پەسەندی کرد (دروشمێکی هەلپەرستانەیە) و لەبەرامبەر ئەوەدا دروشمی تایبەتی خۆیان راگەیاند: (راپەڕینی چەکداری میللی).

بەم شێوەیە ئەبینین پەیڕەوکەرە عێراقییەکانی سیاسەتی کلکایەتی لە شەو و رۆژێکدا بوون بە بانگەوازخوازی توندوتیژیی شۆڕشگێڕانە و فەیلەسوفی کودەتا سەربازییە شۆڕشگێڕییەکان. هەروەها ململانێ هزرییەکەش بوو بە شەڕێك لەنێوان

لایــەنگرانی (کودەتــا) و هــەڵگرانی دروشمــی (ڕاپــەڕینی چــەکدار) بــەڵام ململانــێ تازەکە هــەر لەچوارچـێوەی ئەقڵییەتــە ریفێژنیستــەکەدا دەخولایــەوە، هەرچــەندە بانگــەوازی گــەورە و پــڕ بــاقوبریقی بــۆ ئــەکرد لەڕاســتیدا پێویســتی بــەوە بــوو توێژینەوەیــەکی جــدی بکرێــت بــۆ بــارودۆخی تــازەی عێــراق و ئــەو گۆڕانکارییــە گەورانەی کە بەسەر نەخشەی ناکۆکیی چینایەتیدا هاتوون.

تاقمەکەی بەغدا پێی وابــوو (ڕاپەڕینــە میللیــە چــەکدارەکە) بریتییــە لــەکارێکی سیاســی کــە تــەنیا پێویســتی بــە ڕێکخســتنی چــەند خۆپیشــاندانێکی بچــووکە و ئەرکەکەی هەڵکردنی (ئەو پزیسکەیە کە ئاگرەکە دروست ئەکات) بەو حسابەی کــە ڕاپەڕینەکــە بەبۆچــوونی ئــەوان لەچــەند کــارێکی بچووکەوە گەشــە ئــەکات بــەبێ گوێدانە ئاستی گەشــەکردنی دۆخــە سیاســییەکە و ئامــادەیی جــەماوەر و هیوایــان لەسەر چەند نموونەیەك هەڵچنیبوو کە لە یەکێك لە ڕاپۆرتەکانیاندا باسیان کردبوون:

– مــانگرتنێکی ئــابوری گەشــەبکات بــۆ مــانگرتنێکی سیاســی و ببێتــە یەکــەم پزیسکی ڕاپەڕینەکە.

– خۆپیشــاندانێك کــە گەشــەبکات بــۆ بەریەککــەوتنی چــەکداری و شــەهیدی لێ بکەوێتەوە و جەماوەر بخرۆشێت.

– یاخیبوونی جوتیاران و گەشەکردنی یاخیبوونەکە و پەلهاویشتنی بۆ شارەکان.

خــاوەنی ئــەم ڕاپۆرتانــە خۆیــان گێــل کــرد لــە پەنــد و دەرســی ڕاپەڕینــە نیشتمانییەکان لــە عێراقــدا و هــەروەها گــۆڕانی دۆخــە سیاسییەکانیشــیان لــەپاش شۆڕشی تەموزی ١٩٥٨ەوە فەرامۆش کرد و چەمکی ڕاپەڕینی چەکدارییان شێواند.

ئەمــە پێچــەوانەی بیروبۆچــوونی مامۆســتایانی چــینی کرێکــاریی جیهــانی بــوو. بۆنمونە لینین پێی وایە لەسەدەی بیســتەمدا شــەڕی کۆتــایی یەکلاکەرەوەیــە واتــە دوایین قۆناغی (جەنگە درێژخایەنەکــەی نێــوان چــینەکانە و چــەکە بنەڕەتییــەکانی ئەم ڕاپەڕینە بریتین لە سوپای شۆڕشگێڕ و حکومەتی کاتی).[١]

---

[١] کۆی بەرهەمەکان بەرگی ١١ /لاپەڕە ٢٢٢

بەهەرحاڵ مەبەستی تاقمەکەی بەغدا ئەوە نەبوو ستراتیژ و تاکتیکی مارکسی تاوتوێ بکەن بەڵکو هەوڵێك بوو بۆ ئیحراجکردنی رکابەرەکانیان لەسەرکردایەتیی حیزبدا. لەڕاستیدا تاقمەکەی بەغدا لە بەیاننامەیەکدا لە دەرەنجامی کۆبوونەوەیەکدا لە مانگی حوزەیرانی ١٩٦٦ کە لیژنەی ناوچەی بەغدا ئەنجامیدا بەئاشکرا رەخنەی گرت لە کۆمیتەی ناوەندی و پاشان چەند رێوشوێنێکی گرتەبەر بۆ پتەو کردنی پێگەی خۆی و ناساندنی ناوچەی بەغدا وەك ناوەندێکی تازەی حیزب شانبەشانی کۆمیتەی ناوەندی.

لەپێناوی ئەمەدا لیژنەی ناوچەی بەغدا ژمارەیەك خۆپیشاندانی بچووکی رێکخست کە کادیرە حیزبییەکانی خۆی تێکرد چونکە جەماوەر بەشداری تێدا نەکرد. تاقمەکەی بەغدا ئەم خۆپیشاندانە گۆشەگیرانەیان وەك چەکێك بەکارهێنا لە ململانێی ناوخۆدا دژی کۆمیتەی ناوەندی کە نەیئەتوانی هیچ کارێکی دیسپلینی ئەنجام بدات و ئەرکە ناوەندییەکانی بچەسپێنێت و لێپرسراوێتیی خۆی دەرببڕێت، هەرچەندە لە مانگی ئابی ١٩٦٦ دا بەلاغێکی دەرکرد تیایدا رەخنەی گرتبوو لە لیژنەی بەغدا و وەڵامی تۆمەتەکانی دابووەوە.

بەئاشکرا دەرکەوت کە قەیرانەکەی حیزب مەترسیی تەقینەوەی لێ ئەکرێت و چیدیکە کۆمیتەی ناوەندی هیچ دەسەڵات و رێزی نەماوە لەناو قاعیدەی حیزب و تەنانەت لەلای رێکخراوە سەرەکییەکانیشی.

جا بۆئەوەی ئەم سەرکردایەتییە ریڤیژنیستە قاعیدەکەی خۆی بپارێزێت دروشمی (کودەتای سەربازی) بەکارهێنا بۆ خەڵەتاندنی ریزەکانی خوارەوەی حیزب و لەگەڵیشیدا لیژنەی بەغدادی تۆمەتبارکرد بە پەکخستنی (کاری یەکلاکەرەوە) و سەرقاڵکردنی حیزب و دوورخستنەوەی لە ئەرکە شۆڕشگێڕییەکانی.

لەڕاستیدا داخوازیی کودەتای سەربازی هەندێك پشتیوانی لێدەکرا لەلایەن رێکخراوە حیزبییەکانەوە بەو پێیەی کە نەخشەیەکی دیاریکراوە بۆ رووخاندنی رژێمی عارف و رزگارکردنی گەل لە چەوساندنەوە کۆنەپەرستییەکە. قاعیدەی

حیزب هێشتا بەباشی نەیئەزانی کێن ئەو کەسانەی ئەم بانگەوازە ئەکەن و چ مەبەستێکی نهێنییان هەیە لەپشتی ئەم بانگەوازەوە.

ریڤیژنیستەکان سوودیان لە بارودۆخی خەباتی نهێنی بینی بەوەی کە دەمامکێك زیاتریان ئەکرد بەبەر رووخساری راستەقینەی خۆیاندا و بەشێوەیەك دەرکەوتن زۆر دوور و جیاواز لە ئامانجە راستەقینەکانیان ئەمەش بەمەبەستی سوودوەرگرتن لە کات و چەواشەکردنی جەماوەر.

رەنگە ئەم خاڵە مایەی پێکەنین بێت کە نووسەری راپۆرتەکەی مانگی ئابی ١٩٦٤ هەرخۆی نووسەری (کودەتا سەربازییەکە) بوو کە دواتر لە حکومەتی بەعسدا بوو بە وەزیر و قەڵەمەکەی وەك عەریزەنوس و پارێزەر خستە خزمەتی ئەوەی پارەی زیاتر بدات. ئەم کەسە دەریخست کە توانایەکی زۆری هەیە رەنگەکانی بگۆڕێت و لە بانگەوازی هەڵوەشاندنەوەی حیزبی شیوعییەوە پاش چەند مانگێك خۆی لەژێر فەلسەفەی کودەتا سەربازییەکاندا بشارێتەوە.

بەڵگەنامەی (کودەتای سەربازی لە راپەڕینێکی میللیدا تەواو ئەگونجێت بەسەر بارودۆخی وڵاتماندا) کە ساڵی ١٩٦٧ بەسەر رێکخراوەکانی حیزبماندا دابەشکرا ئەڵێت: "کودەتای سەربازی راپەڕینێکی میللیە و ئەکرێت ببێتە دەستپێکی سەردەمی شۆڕشە کۆمەڵایەتییەکە." هەروەها ئەڵێت "بارودۆخی وڵاتەکەمان پێویستی بەدەستپێشخەرییەکی سەربازییە و مەرج نییە دەستپێشخەرییەکی جەماوەری بێت".

نووسەرەکە بیری چووبووەوە کە چەند مانگێك لەوەوبەر نووسیبووی کە سۆشیالیزمە ناسرییەکە "شەپۆلێکی مێژووییە عێراق لەگەڵ خۆیدا راپێچ دەکات" بەم جۆرە و پاش ئەوەی تەپڵیان بەئەزمونی یەکێتی سۆشیالیتی عەرەبی لێدا، گۆڕران و بوون بە مژدەبەری ئەوەی کە سوپای حکومەت کەرەسەیەکی سەرەکییە بۆ شۆڕشە کۆمەڵایەتییەکە لە عێراقدا و هەوڵیان ئەدا لەرێی ئەوەوە هەمو رێنماییەکانی مارکسیزم — لینینیزم دەربارەی شۆڕش و دەوڵەت لەناوببەن.

مـارکس و ئـەنگڵس جـەختیان ئـەکردەوە کـە سـوپا (کۆڵەکەیـەکی بنـەڕەتی دەوڵەتە)، لینینیش ئەڵێت: "یەکەمین ئامۆژگاری هـەموو شۆڕشـێکی سـەرکەوتوو، وەك مارکس و ئـەنگڵس جـەختی لەسـەر ئەکەنـەوە، لـەناوبردنی سـوپا کۆنەکـە و گۆڕینێتی بە سوپایەکی نوێ".[١]

بەپێچەوانەی ئەم ڕێنماییە بنەڕەتییانـەی مارکسـیزم – لینینیزمـەوە، خـاوەنی گوتاری (کودەتای سەربازی..) نووسیویەتی: "لەڕاستیدا سوپا بووەتـە ئـامرازێکی سـەرەکی لـە ململانێـی گەیشـتنە دەسـەڵاتدا ... و هـیچ چـینێك ناتوانێـت بگاتـە دەسەڵات ئەگەر پشت بەسوپا نەبەستێت وەك ئامرازێکی بنەڕەتی".

بەم شێوەیە ئەبینین کـە ململانێـی نێـوان دوو لایەنەکـە، تاقمەکـەی بەغـدا کـە دروشمــی (ڕاپــەڕین)ی بــەرزکردبووەوە و کۆمیتــەی ناوەنــدی خــاوەنی دروشمــی (کودەتا) لە بنەڕەتدا بریتییە لە کۆمەڵێك پاساوی دەستکرد بۆ داپۆشینی ئامانجە ڕاسـتەقینەکەیان کـە بەدەسـتهێنانی کورسـی سـەرکردایەتیی حیزبـە و دوورە لـە پرەنسیپەکانی مارکسیزم – لینینیزمەوە.

لەبەردەم ئەو دوو ئاڕاستە هەلپەرستانەیەدا ئاڕاسـتە شۆڕشـگێڕە مارکسـییەکە دەرکەوت بەخەباتکردن دژی هەردووکیان و دژی ئەو دوو تاقمەی نوێنەرایەتییان ئەکەن.

لـەم کەشـوهەوا پـڕ لـە ژاوەژاوە هـزری و موزایـەدەی درۆی شۆڕشـگێڕانەیەدا، هاوڕێی شەهید خالید ئەحمەد زەکی (زافر) هەڵکەوت وەك بەرگریکارێك لە ئاڕاستە شۆڕشگێڕییە مارکسی – لینینیەکەی کە ئیرادەی ڕاستەقینەی قاعیدەی حیزبی دەرئەبڕی.

هاوڕێ زافر بانگەوازی تاقمەکەی بەغدای سەبارەت بە (ڕاپەڕین) پوچـەڵکردەوە و دەریخست کە ئەم بیرۆکەیە بیرۆکەیەکی لاوازە و ئەوانەش کە بانگـەوازی بـۆ ئەکـەن بەڕاستیان نییە، بەڵام هاوڕێ خالید ڕەخنەکانی چڕکردەوە دژی بیرۆکەی (کودەتـای سەربازی) بەوپێیەی کە ئەمە بیرۆکەی تاقمە دەستڕۆیشتوەکەی نـاو سـەرکردایەتیی حیزبـە، ئـەو تاقمـەی کـە توانیـوێتی هەنـدێك لـە قاعیـدەکانی حیـزب و هەنـدێك لـە

---

[١] کۆبەندی بەرهەمەکانی بەرگی ٢٨ لاپەڕە ٢٨٤

ڕێکخراوە زەبروەشێنەکان بخەڵەتێنێت بە دروشمە درۆکانی و داوایان لێبکات واز لـە ململانێ هزرییەکە بهێنن و جەخت بکەنە سەر ئامادەکارییە سـەربازییەکان گوایـە بـۆ کودەتا چاوەڕوانکراوەکە. لەم بارەیەوە هاوڕێ زافر لـە یاداشـتێکدا لـە سـاڵی ١٩٦٧ کە وەڵامی راپۆرتێکی پێ دابووەوە دەربارەی (کودەتای سەربازی) ئەڵێت:

"راپۆرتەکـــە بـــەڕوونی مەســـەلەی (کودەتـــای ســـەربازیی شۆڕشـــگێڕ)ی چارەسەرکردووە و بەشـێوەیەکی سـەرەکی راپـۆرتی (ڕاپـەڕینی چـەکدار)ی تـاوتوێ کردووە وەك ئەوەی لە راپـۆرتی هـەر سـێ هاوڕێکـەدا هـاتووە، بـەڵام بەشـێوەیەکی جدی بیروڕا گرنگەکەی دیکەی تاوتوێ نەکردووە سـەبارەت بەجـەنگی نـاوخۆ." ئـەو لێرەدا ئاماژە ئەکات بۆ ئەو ئاڕاستە شۆڕشگێڕەی کە پێویست بوو حیزب جەماوەری پێ رۆشنبیر بکات و ئامادەی بکات بۆ جەنگێکی چەکدارانەی درێژخایەن کە شێوازی جەنگێکی ناوخۆ وەربگرێت و گەشە بکات هەتا دەسەڵاتی وڵات دەگرێتە دەست.

هاوڕێ زافر لە وەڵامی بانگەوازەکەی (کودەتـای سـەربازی)دا ئـەڵێت: "کودەتـا سەربازییەکان دیاردەیەکی تازە نین وەك ئـەوەی خاوەنـەکانی راپـۆرتی (کودەتـا) رایئەگەیەنن بەڵکو بیرۆکەیەکی کۆنە و هی پـێش سـەردەمی مـارکس و ئـەنگڵس و لینینە" و ئاماژە ئەکات بۆئەوەی کە "لینین رەخنەی گرتووە لە شـێوازی کودەتـا (بلانکیەکان)." جەختی کردووەتەوە کـە "کودەتـای سـەربازی شـێوازێکە توخمـە بۆرجوازییە جیاوازەکان بەکاری ئەهێنن بۆ تۆڵـە سـەندنەوە و پاکتـاوکردنی هـەقی سـەر یـەکترییان و شـێوازێك نییـە لەشـێوازەکانی بزووتنـەوەی شۆڕشـگێڕانەی پرۆلیتـاری"، بـۆ ئەمـەش دووخـاڵی بنـەڕەتی بـاس ئـەکات: "یەکـەم. کودەتـای سـەربازی پشـتگیریی فراوانـی گـەلی لەگەڵـدا نییـە. دووهـەم. هـەموو فەرمانـدە گەورەکانی سوپا و ئەفسەرەکانی دیکە سەر بە باڵە جیاجیاکانی ئۆردوگای دوژمـن بـە شـیوعی و چـینی کرێکـار و نەتـەوەی کـوردن". پاشـان بـەردەوام ئـەبێت لـە بانگـەواز کـردن بـۆ پشتبەسـتن بـە سـوپای حکومـەت وەك ئـامرازێکی سـەرەکیی شۆڕشە کۆمەڵایەتییەکە و ئەڵێت: "سوپا وەك ئامێرێـك لـە بنەڕەتـدا ناتوانێـت لـە

دەوڵەتێکی سەرمایەداریی دەرەبەگدا سیستەمێکی بێلایەن بێت، بەڵکو ئامرازێکی چینایەتی سەرەکی ئەبێت بۆ چەوساندنەوەی چینی کرێکار و بزووتنەوە شۆڕشگێڕەکە." هاوڕێ زافر لە کۆتاییدا ئەڵێت: "چارەسەری کۆتایی هەربەوە دێتەدی کە سوپا وەکو سیستەم هەڵبوەشێنرێتەوە و سەرلەنوێ لەسەر کۆمەڵێك بناغەی شۆڕشگێڕیی نوێ دروست بکرێتەوە."

بۆ ئێستا و دوارۆژی بزووتنەوەی چەپ بەگشتی لە کوردستان و عێراقدا.. پەندوەرگرتن و لێکۆڵینەوە لە مێژووی ئەم ململانێیەی ناو ریزەکانی حیزبی شیوعی کارێکی یەکجار پێویست و گرنگە بۆ تێگەیشتن لە ئامانجە سەرەکییەکانی حیزب و رەنگ رشتن بۆ رێگای راست بۆ گەیشتن بە ئامانجە نزیك و دوورەکان، روونی لە رەچاوکردن و دەستنیشانکردنی تاکتیك و ستراتیج دا.. لە رێڕەوی ئەم کارکردنە دوورکەوتنەوە لە رێگای دووبەرەکی و تێکدەر کە گیانی هاوڕێیەتی و بینینی راستییەکان لەبەرچاو و مێشکی تێکۆشەران ئەشێوێنێت و یەکگرتوویی ریزەکانی پەرش و بڵاو ئەکاتەوە. بۆ حیزب و رێکخراوە مارکسییەکان، خۆ بەستنەوەیەکی پرنسیپانەی دوور لە وشکی بە پەیڕەوە لینینیەکان مەرجی گەورەی بەرەو پێشچوونە، بەرەڵلایی لە رێکخستن و لە دەربڕینی را و بۆچووندا نەخرێتە جێگای رێکخستنی توندوتۆڵ ئەگەر نەڵێم پۆڵایین.. ئێمە لە قیادەی مەرکەزیدا و پێش ئەوە لە لیژنەی مەرکەزیدا بەو کەموکورپییانەوە ئەماننالاند و ئەنجامیشی ئەوەیە کە جێگای داخ و هەوڵدانە بۆ چارەسەر.. هەروەها لەو کاروانە درێژەی تێکۆشانماندا ئەوە دەرکەوت کە نەبوونی سەرکردە و سەرکردایەتیی بە توانا و خاوەن تێگەیشتن و لە پاش ئەوە خاوەن بڕیار رۆڵی زۆر گەورەی هەیە لە سەرکەوتن یا پێچەوانەکەی کە دۆڕان و ژێرکەوتنە.

لەو ئەزموونەی مندا لەوە گەیشتم کە رۆشنبیرێتی کادر و سەرکردە بە هەموو ماناکانیانەوە فاکتەرێکی گەورەی ئەو هۆ و ئەنجامەشە. نەبوونی زانیاری و رووناکبیری و زیرەکییەکی تەواو سەرکردەی هەر دەستە یا حیزب دەکات بە ئامانجی خوار خۆی

کە هەرچی را و بڕیاری راست هەیە لێی تێکدەن و یاری بە ئەقڵی بکەن. ئێمە لەو گرفتە گەورەیەی لە قیادەی مەرکەزیدا بەسەرمانهات، موسڵیح مستەفا کە بە هیچ جۆرێك مەرجی سەرکردەی تێدا نەبوو وە ئەیویست ئەو مەرجانە بە کەسانێك پڕبکاتەوە کە لە خۆی پێشکەوتووتر نەبوون.. قەیرانی سەرکردە و سەرکردایەتی کارێکی کوشندە ئەکاتە سەر ئەو رێکخراوە و سەر هەموو لایەنەکانی تری ژیان.. سیاسی بێت یا ئابووری.

نەبوونی سەرکردەی خاوەن توانا ئەبێتە هۆی هەڵوەشاندنەوەی پەیڕەوە راستەکانی رێکخستن وە دوای ئەوە بە سەرنەکەوتنی حەتمیی ئەو رێکخراو یاخود حیزبە.

## چەند بەسەرهاتێکی ژیانی سەربازی

ساڵ و نیوێك لە تەمەنم لە سوپای عێراقدا بردە سەر. شەش مانگ بە قوتابێتی و سەربازی لە کۆلیجی ئیحتیات و نزیکەی ساڵێکیش وەکو ئەفسەر لە سوپادا. لە شوباتی ١٩٦٥ تا ١٩٦٦/٧/٢٠ لە بەغدا و دەورەیەك لە سەلاحەدین و هەشت مانگ لە نەجەف و چوار مانگ لە عەمارە ژیانم بردە سەر. لە کۆلێجی ئیحتیات کە لەناو سەربازگەی رەشیددا بوو، مەشقی تەواوی سەربازییان پێ کردین، ئەو مەشقکردنە سوودی زۆری هەبوو بۆ پەروەردەکردنی توانا و بەرگەگرتنی مرۆڤ بە برسێتی و بە تینوێتی لە گەرما و سەرمادا و فێربوونی زەبت و رەبت و بەگوێکردنی فەرمانی فەرماندەکان، هەروەها فێربوونی بەکارهێنانی هەموو جۆرە چەکێك.

لێرەدا گرنگیی سەربازێتیی ئیلزامی دەرئەکەوێت کە زۆر پێویستە بۆ هەموو گەنجێك لە هەموو جیهاندا. ئێمە لە کوردستاندا راستتر وایە حکومەتی هەرێمی کوردستان پەیڕەوی ئەم پێویستی و ئەرکە گەورەیە بکات کە لە رووی نیشتمانی و بەرەوپێشچوونی کۆمەڵگادا رۆڵێکی گەورەی هەیە. ئێستاش لە هەموو کات زیاتر پێویستە ئەو نەریتە بەکەڵکە لەمە زیاتر نەخرێتە پشت گوێ.

دوای دەورەی سەلاحەدین ئەفسەرەکانیان دابەش کرد بەسەر یەکە سەربازییەکاندا. ئێمە هەشت ئەفسەر بووین دانراین بۆ ناوەندی مەشقکردنی

نەجەف. پێش چوونمان بۆ نەجەف بیستبوومان فەرماندەی ناوەند و مەوقیعی نەجەف عەقید (عەبدولئەمیر نایف ئەلهدیب)ە کە پیاوێکی تورە و شێتۆکەیە و گونجاندن لەگەڵیدا زۆر زەحمەتە. ئەم هەشت ئەفسەرە پاسێکمان گرت، خۆمان و جانتا و هەندێك پێویستیی تایبەتیمان تێکرد و بەرەو نەجەف کەوتینە رێ. کە گەیشتینە سەربازگەکە بردینیانە ژووری فەرماندە.

سڵاومان لێکرد، بە تورەییەوە گوتی: "ئێوە چین؟" گوتمان "ئەفسەرین و گواستراوینەتەوە بۆ ئێرە". شیراندی بەسەرماندا: "درۆ ئەکەن. هەشت ئەفسەر بە جارێك! من دوو ساڵە داوای دوو ئەفسەرم کردووە ئەم وەزارەتی بەرگرییە هیچوپووچەی بەغدا نایاننێرێت، دەی ئێوە لە حاڵەتی (ئیستیعداد)دا بوەستن با بزانم ئێوە چین؟ کێ ئێوەی ناردووە؟" دەرکەوت ئەوەی بیستبوومان لەسەر عەقید عەبدولئەمیر شتێکی زۆر کەمە. تەلەفۆنی کرد بۆ زەعیم نەجم ئەلعانی کە فەرماندەی لیوای ٩ بوو لە حلە و ناوەندی نەجەف سەر بەو لیوایە بوو پێی گوت ئایا ئاگاداریت هەشت کەس بە روتبەی مولازم بە جارێك هاتوون بۆ ئێرە؟ ئەمانە چین و چییان لێ بکەم؟ گوێمان لە زەعیم نەجم نەبوو، بەڵام دیار بوو زۆر خراپ تورە بوو بوو لێی. ئەمە یەکەم رۆژمان بوو لە نەجەف.

لە رووداوە خۆش و ناخۆشەکانی عەقید عەبدولئەمیر، یەکێکیان ئەوەبوو منی هەڵبژارد مەشق بە فەسیلێك بکەم و فلان رۆژ خۆم و فەسیلەکە کە ٣٠ سەرباز بوون بچین لە قایمقامییەتی نەجەف ئەوانەی ئەو ساڵە داواکراون بۆ سەربازی بە یەس یەم و تەپڵ و مۆسیقاوە بهێنم بۆ بنکە سەربازییەکەی نەجەف.

کە گەیشتمە لای قایمقام، ئەو لیستەم بینی کە سەروو دوانزە هەزار کەسی داواکراو بوون بۆ سەربازێتی لە دانیشتوانی نەجەف و کوفە. قایمقام گوتی مولازم فاروق رەنگە نەزانیت کە نەجەف و کوفە عەسکەری ناکەن، ئەمرۆ تەنیا ٩ کەس هاتوون لەو دوانزە هەزارە. ئەوە بوو بەم دەهۆڵ و زورنایەوە هێنامن بۆ ناوەندی مەشقکردنی سوپا لە نەجەف. جەنابی فەرماندە و ئەفسەرەکان لەسەر سەکۆ

دروستکراوەکە بۆ ئەم ئاهەنگە راوەستابوون، کاتێک گەیشتینە بەردەمیان وەك نەریتی سوپا هاوارم کرد "یمیناً انظر" واتە براوننە لای راست، بەرەو سەکۆکە. کاتێك فەرماندە ئەم نۆ کەسەی بینی بە پێچەوانەی دابونەریت هاواری کرد بوەستن. منیش ئیعازم دا بوەستن. گوتی وەرە پێشەوە مولازم. چووم. گوتی ئەمە چییە؟ پێم گوت گەورەم قایمقام ئەمەندە کەسی داوە بە من و ئەلێت هەموو کەس ئەزانێت نەجەف و کوفە عەسکەری ناکەن و هەموویان عەسکەری فیرارن! قیژاندی بەسەرمدا گوتی: تۆ نا، من بێ ئەقڵم تۆ ئەنێرم بۆ ئەم ئەرکەو لە.. دایکی هەمووتان.. قایمقام، حکومەت، عەبدولسەلام و ئینجا بە تورەییەوە چووە ژوورەکەی خۆی!

پاش سەعاتێك گوتیان لە نۆ سەربازەکەش پێنجیان ڕایان کرد! منیش هەر بۆ بەزم و خۆشی بەپەلە خۆم گەیاندە فەرماندە، گوتم قوربان لەو نۆیەش پێنجیان ڕایان کردووە. گوتی چوارەکەم بۆ بێنە. چوار کەسەکەم بۆ برد بە دارێکی زۆر ئەستوور تێیان کەوت و سەروگوێلاکی هەموویانی شکاند کە دەستمان گرت و پێمان گوت جەنابی فەرماندە هەر ئەم چوارە ئەرکی نیشتمانیان بەجێ هێناوە بۆچی لێیان ئەدەیت؟! گوتی ئەم سەگبابانە یەکی دە ریش درێژی ریش پانی هینیان بە دواوەیە بۆ واسیتە با ئەمانیش راکەن.

چیرۆکەکانی ئەو هەشت مانگەی نەجەف لەگەڵ عەقید عەبدولئەمیردا هەر یەکەیان شانۆگەرییەکی پێکەنیناوی هەڵئەگرێت کە حەیفە هەندێکیان تۆمار نەکەم.

لە ساڵی ١٩٦٥دا شەڕ لە کوردستان دەستی پێ کردەوە، ڕۆژێك عەقید عەبدولئەمیر بە مولازم محەمەد عەلی عەبدولحسێنی گوت خۆت ئامادە بکە سبەینێ زوو وەرە هەتا فەرمانی دەستهەڵگرتن (امر انفکاك)ت لێرە بۆ بنووسم و تۆ گواستراپتەوە بۆ (شیمال).

ڕۆژی دوایی و پاش ڕاهێنانی بەیانیان من ئەو ڕۆژە ئەفسەری ئێشکگر بووم بانگی کردم و گوتی ماڵی مولازم محەمەد عەلی ئەزانیت؟ گوتم نەخێر، گوتی ئەوە

ئوتومبیلەکەم ئامادە کردووە دوو سێ سەرباز بەرە لەگەڵ خۆت و بە بەندکراوی بیهێنە، دڵم خەبەری داوە را ئەکات و ناچێت بۆ (شیمال).. شۆفێرەکە ماڵیان ئەزانیت لە کوفەیە.

بەپەلە سێ سەربازی دوو خەت و سێ خەتم لەگەڵ خۆم سوار کرد و چووم بۆ ماڵی مولازم محەمەد عەلی کە لە راستیدا خۆم شارەزای بووم، تەماشام کرد خەریکی خۆکۆکردنەوەیە و پێم گوت فەرماندە ناردوومی بە حەپسی بتبەمە لای، تۆ چی ئەکەیت؟ گوتی کاك فاروق من خۆم تەبەعییەتی ئێرانیم و ئاییینیش رێگام نادات شەڕ لەگەڵ کورد بکەم، وا خۆم ئامادە کردووە رائەکەم بۆ ئێران. پێم گوت دە پەلە بکە من ئەڵێم لە ماڵ نەبوو.

نیو سەعات تا سەعاتێکی پێ چوو لای فەرماندە گوتم وەڵڵا تۆ زۆر زیرەکیت و پێشبینی شت باش ئەکەیت. محەمەد عەلی لە ماڵ نەماوە. گوتی: نەء وا نییە من سەگ و سەگباب و شێت و کەرم کە کوردێکی شیوعی ئەنێرم ئەفسەرێکم بۆ بگرێت کە نایەوێت بچێت بۆ شەڕ لەگەڵ کورد. گوتی ئەزانم درۆ ئەکەیت، وەرە مولازم ئوسامە تۆ بچۆ بیگرە، ئوسامەش سەر بە شیوعی بوو، تێم گەیاند کە ئەگەر تا تۆ ئەچیت رای نەکردبوو، نەیگریت و وەرەوە بڵێ رای کردووە !

کاتێك زانی رای کردووە گوتی وەرە مولازم فاروق، ئەو سەگبابە بە دار و تەختە و چادر حسێنییەی دروستکردووە لە ناو مەعەسکەردا و ئاوی بۆ ڕاکێشاوە برۆ بەپەلە تێکی بدە. عەقید عەبدولئەمیر خەڵکی حلە بوو و خۆشی وەك مولازم محەمەد عەلی شیعە بوو بەڵام بەدین نەبوو، پێم گوت قوربان من ئەوە ناکەم. گوتی نەخێر ئەیکەیت ئەگینا ئەتدەم بە دادگای سوپا. گوتم کەیفی خۆتە من کوڕە مەلا و عالمی دینی ئیسلامم چۆن کاری وا ئەکەم!! تاقمێکی دیکەی نارد و لە یەك دوو سەعاتدا حسێنییەکەی لەگەڵ زەویدا تەخت کرد و هەزار جنێوی بە شێخ و مەشایخی ئەو ناوە دا.

لە هاوڕێیانی نەجەف، عوسمان دزەیی و کامیل ئەحمەد مەعروفم لەگەڵ بوو. هەشت مانگی خۆش و ناخۆشمان بردە سەر.

ئینجا هەر بۆ تەواوکردنی ئەم باسەی عەقید عەبدولئەمیر ئەلهـدیب، ئـەم پیـاوە لە دەورەی عەبدولسەلام عارفدا بووە و برادەری نزیکی بووە، لـە سـوپا دەرکـراوە لەسەر دوو شت: جارێك لە حلە لەگەڵ ئەفسەرێکی لە خۆی بەرزتردا شەڕ ئـەکات و تەقەی لێئەکات، هۆکارەکەی دیکەش ئەوەبوو کە گەیشتبووە رادەی شێتێتی و بە هۆی ناتەندروستییەوە خانەنشـین بـوو بـوو، لەسـەر تەقـەکان سـاڵ و نیوێـك بەنـد کرابوو، پاش کودەتای ٨ی شوبات، عەبدولسەلام گێڕابوویەوە بۆ سوپا.

ئەو هەشت مانگەی لە نەجەف بووم، تێکەڵاوییەکی زۆرم هەبوو لەگـەڵ خـەڵکی نەجەفدا، کەسانێکی زۆر رۆشنبیر و زیرەك لـەم شـارەدا هـەبوون، تـا ئـەو کاتـەش حیزبی شیوعی لە نەجەفدا جەماوەرێکی زۆری هەبوو.

بەهۆی ئەوەوە کە مەرقەدی ئیمـام عـەلی لـە نەجەفدایـە، هەنـدێك تایبەتمەنـدیی لـەم شـارەدا دروسـت بـووە. سـەرۆکی ئـایینیی مەزهـەبی شـیعەی تێدایـە. هـەموو شیعەیەك لە عێراقدا ئەگەر کەسوکاری دەرامەتیان باش بێت کە ئەمرێت ئـەبرێت بـۆ ئـەو گۆڕسـتانە گەورەیـەی نەجـەف و لـەوێ ئەنێـژرێت و ئـەوە بووەتـە پیشـە بـۆ ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتووان، هەر لە ئۆتۆمبیلْ بۆ گواستنەوەیان تا قـەبر هەڵکـەن و پرسە بەڕێوەبردنەوە. بۆ منیش دوو ماڵی دوو خۆشەویستی سلێمانی لەوێ بـوون، مامۆستا حەمە ئەمین حەسەن کە مامۆستا بوو لە قۆناغی ناوەندیدا و لە پاش ئـەوە هەتا کۆچی دواییەکەی لە نزیکترین هاوڕێکانم بوو، هەرچەندە هاوڕێم بوو بـەڵام هـەر وەك مامۆستا و براگەورەش سەیرم ئەکرد.

هاوڕێی خۆشەویستم فەخری حاجی عەبدوڵڵای بۆسـکانیش مـاڵی لـە نەجـەف بـوو، ئەمیش مامۆستای قوتابخانە بوو، هەتا هەتایە قسە خۆشەکانیم لە یادە، ئنجا بە هۆی ئەو دوو ماڵە خانەدانەوە خۆم و هەندێ لە ئەفسەرەکانیش کـە لەگـەڵما بـوون، ماڵیـان وەك ماڵی خۆم وابوو. دانیشتنی زۆری عوسمان دزەیی خۆشەویست، لە نوکتە و باسی سیاسەت، ئەو دانیشتنانەی لەو دوو ماڵە و لەگەڵ ئەو خاوەن ماڵانـە خۆشـتر ئـەکرد و خۆمان بە غەریب و دوور لە سلێمانی نەئەزانی. یادی هەرسێکیان بە بەرزی لە ویژدانمدایە.

پاش هەشت مانگ لە نەجەف گواسترامەوە بۆ شاری عەمارە، بۆ ناوەندی مەشقکردنی عەمارە. چوار مانگێکیش لە عەمارە بووم هەتا ١٩٦٦/٧/٢٠ لەوێ تەسریح بووم.

هێشتا لە عەمارە بووم، عەقید سەلاحەدین کە فەرماندەی ناوەندی عەمارە بوو پێی ڕاگەیاندین کە سەرۆك کۆمار سبەینێ ئەگاتە عەمارە، ئێمەش چاوەڕێ بووین بۆ رۆژی داهاتوو سەرۆك کۆمار عەبدولسەلام عارف لە گەڕانەکەیدا بەسەر ناوچەی خوارووی عێراق بگاتە عەمارە و سەردانی مەعەسکەرەکەی ئێمە بکات. ئەوە بوو لەپڕ دەنگوباس گەیشتە ئێمە و هەموو دنیاش کە فرۆکەکەی کەوتووەتە خوارەوە و خۆی و چەند لێپرسراوێکی عێراق لەو ڕووداوەدا سووتان و گیانیان لە دەست دا. ئەمەش لە عێراقدا بۆ گاڵتەپێکردن بە سەرۆك کۆمار، گوترا: "صعد لحم نزل فحم" واتە: (کە سەرکەوت بۆ ناو فرۆکەکە گۆشت بوو، لە دابەزیندا بە خەڵوزی هاتە خوارەوە)! لە ڕاستیدا ئەمە دەنگوباسێکی زۆر دڵ فێنککەرەوەی ئەو ڕۆژانە بوو لەلام.

لە ئەنجامی ئەمەدا عەبدولڕەحمان عارفی برای کە وەزیری بەرگری بوو کرا بە سەرۆك کۆمار و قۆناغێکی تازە لە مێژووی فەرمانڕەوایی عێراقدا هاتە کایەوە. حکومەتێکی لاوازتر لەوەی عەبدولسەلام هاتە سەرکار.

## من و وەرزش

هەر لە منداڵییەوە حەزم بە وەرزش ئەکرد و هەواداری بووم. لە تۆپی پەڕۆوە تا بالە و فتبۆلێنی کۆڵان و گەڕەك و تا هەندێك جۆری پێشکەوتووی وەرزش. لە قۆناغی سەرەتاییدا لە ئیستیعرازی قوتابخانە سەرەتاییەکاندا مەدالیای یەکەمیی کورسی کورسییم وەرگرت. لە ناوەندیدا لە یاری یاخود نمایشی (هەرەم) بەشدار ئەبووم، و لەبەر ئەوەی من لە هەموویان بچووکتر بووم، بۆیە لە سەری سەرەوەی هەرەمدا ئەبووم. لە سەرەتایی و ناوەندیدا یاریکەرێکی پێشکەوتوو بووم لە تێنسی سەر مێز و لە قۆناغی زانکۆشدا هەر لە یاریکەرە دیارەکانی ئەم یارییە بووم، ئێستاش هەر بەردەوامم تیایدا.



دروستكردنی هەرەم، (سەرەوەی هەرەمی ناوەڕاست: فاروق مەلا مستەفا)، ١٩٥٤

لە فتبۆلێنیشدا لە منالییەوە تیپی گەڕەك و لە دواناوەندیدا لە تیپی (ئاكۆ) یارییم ئەكرد. دوای ئەوە لە كۆلێجی ئیحتیات لەم یارییەدا پێشكەوتم و بووم بە ئەندامی تیپی سریەكەمان. لەبەر ئەوەی لە ئیحتیات و پاشانیش كە بووم بە ئەفسەر كاتی زۆرمان هەبوو، و منیش ئارەزووەم تێدا بوو، بۆیە رۆژانە یان هەفتانە چەند رۆژێك لە بەغدا و نەجەف و عەمارە لە تیپەكانیاندا بووم و چەند جارێك مەدالیا و جامی سەركەوتنی تیپەكەمان من وەرمئەگرت.

## ژیانی بەغدا و هاوڕێكانم

لە ناوكێشی بیرەوەرییە سیاسییەكانیشدا ئەبێت چەند لاپەڕیەك لە ژیانی كەسێتیی خۆیشم بنووسم. پاش تەواوكردنی ماوەی ناو سوپا، لە بانكی بازرگانیی عێراق لە بەغدا بە فەرمانبەر دامەزرام، ئەو ماوەیە زۆر سوودم لە كاری بانق وەرگرت، بە تایبەتی كە من لە ناوەندی گشتیی بانقدا بووم و لەو سێ ساڵ و نیوەی خزمەتم تیایدا زۆر شت فێربووم چونكە بەرێوەبەرایەتیی گشتیی بانقەكە ئەیویست پێم بگەیەنێت بۆ بەڕێوەبردنی لقی سلێمانی كە لە پلانیدا هەبوو بیكاتەوە.

ئەو چەند ساڵەی زوربەی کاتم لە شوقە یاخود خانوو لەگەڵ هاوڕێیانم خەسرەو شاڵی و سەرداری برای و حەسەن زێوەر بەسەر برد، بە زۆرییش کە لەگەڵ سەرداردا ئەبووم، سەردار ئەندام بوو لە پارتی دیموکراتی کوردستان، بەڵام هیچ ڕێگری یا ناخۆشی دەرنەبڕی لە بەکارهێنانی ماڵەکەمان و چەندین سەرکردەی حیزب و چەکم ئەهێنایە ماڵەوە، زۆر گونجاو بوو لەگەڵمدا. هەر بۆ بیرەوەری و وەفاداری، لە ساڵی ١٩٦٣دا کە بە خۆشاراوەیی گەڕامەوە بەغدا، هەر ئەمان بوون باشترین هاوڕێ کە بەبێ ترس میوانداریيان کردم و لەپاش ماوەیەکی کەم لە گەڕەکی (کۆشکی سپی) لە بەغدا ژوورێکیان لە هەمان ئەو ماڵەدا بۆ گرتم کە خۆیان تیایدا ئەژیان، ژوورێکیان بۆ کۆشش و خواردن و خواردنەوەمان دانابوو، ئەویتر بۆ نووستنی هەرسێکمان. دکتۆر خەسرەو شاڵی بیروباوەڕی لە ئێمەوە نزیك بوو یا راستتر وایە بڵێم دۆستێکی ڕێکخراوی حیزب بوو. مرۆڤێکی دەروونپاك و راستگۆ و قسەخۆش، ئەو چەند ساڵێك لە من و لە سەرداری برای گەورەتر بوو. ئەو ساڵانەی هەرسێکمان پێکەوە ئەژیاین یەك مەسرەف و یەك گیرفانیش بووین، خەسرەوی کۆچکردوو ئەو ساڵە لە کۆلێجی کشتوکاڵ دەرسی ئەگوتەوە و پاش ماوەیەك چوو بۆ بریتانیا و دکتۆرای وەرگرت، لەو خانووە و چەند خانووی تردا کە ئەو چەند برادەرە پێکەوە ئەژیاین، من و خەسرەو لە ژوورێکدا ئەنووستین و بەقسەی خۆش و باسی سیاسەت و دڵدارییەوە دوا ساتەکانی شەومان بەڕێ ئەکرد. دوا فەرمانیشی کاکە خەسرەو سەرۆکی زانکۆی سەلاحەدین بوو لە هەولێر.. پیاوێکی ژیر و زانا بوو. حەسەنیش کە خۆی سەر بە حیزب بوو ئەو کاتانەی سەردار لە کەرکوك دامەزرا من و حەسەن پێکەوە ئەژیاین هەر لەو جۆرە بوو لەگەڵمدا. من هەموو ژیانم و تا ئێستا خۆشیم لە پەیوەندیی خۆم بە برادەرەکانمەوە ئەبینی، ئەو ساڵانەی بەغدا لە برادەرە نزیکەکانم بێجگە لەو کەسانەی ناوم هێنان کاکە عەبە (عەبدوڵڵای میرزا مارف) و ئەرجومەن قەرەداغی و دکتۆر ماجید ئەحمەد عەزیز و بەهزاد سائیب و فەرەیدون عارف کاتی زۆرمان پێکەوە ئەبردەسەر.



لەڕاستەوە، وەستاوەکان: فاروق مەلا مستەفا، خەسرەو شاڵی
دانیشتووەکان لەڕاستەوە: سەفوەت ڕەشید، ئەفراسیاب عەبدولحەمید، سەردار غەنی شاڵی
ریزی پێشەوە: کەمال ئیبراهیم، غەفور ئەمین، عەلی ئەحمەد حەمامچی
سەیرانی حەبانیە، ١٩٦٢/١١/٣

❊ ❊ ❊

**سالآنێك وەك ئەندامی (کۆمەڵەی ئابووریناسانی عێراق– جمعیة الاقتصادیین العراقیین) هاتووچۆی ئابووریناسانم ئەکرد و لە هەڵبژاردنەکاندا جموجۆڵی زۆرم هەبوو. دواجار کە من لە بەغدا بووم لە هەڵبژاردنی ئابووریناساندا لە ساڵی ١٩٦٧ من لە لیژنەی هاوبەشی لیستی دیموکراسییەکاندا بووم کە نوێنەری حیزبی شیوعیی عێراق — قیادە مەرکەزی بووم و د. سەباح دوڕە نوێنەری لیژنەی مەرکەزی بوو تیایدا. سنان شبیبی و ئیسماعیل ئەلراشد لە گەڵمان بوون، سەرۆکی لیستەکەی ئێمە زانای گەورە دکتۆر محەمەد سەلمان حەسەن بوو، کە بەو هۆیەوە**

زۆر جار چەند سەعات لەسەریەك لە ماڵی خۆیان من سەردانم ئەکرد. ئەو زانا گەورەیە لێکۆڵینەوەکانی ئۆسکار لانکەی گۆڕیبوو بۆ عەرەبی و لە کۆچی دوایی زانای گەورە ئۆسکاردا خۆی لێکۆڵینەوەکانی تەواو کرد، یەکێك لە کتێبە بە نرخەکانی دکتۆر محەمەد سەلمان حەسەن (دراسات في الاقتصاد العراقي)یە کە تا ئێستا نرخ و بەرزیی خۆی هەیە. دکتۆر محەمەد سەلمان حەسەن کە لە ساڵی ١٩٦٨دا کودەتاچییەکان داوایان لێکرد ببێت بە وەزیری نەوت، ڕەتی کردەوە. پاش ماوەیەك لە زیندانی بەعسدا باری دەروونییان تێکدا و کۆچی دوایی کرد.

## سلێمانی... گەڕانەوەم بۆ سلێمانی

لە کۆتایی ١٩٦٨ و سەرەتای شاڵاوی بەعس بۆسەر حیزبمان، لەسەر داوای حیزب بەغدام بەجێهێشت بۆ ئەوەی ڕێکخستنی حیزب لە سلێمانی وەربگرم. کازم سەفار کە شەخسی دووەم بوو لە حیزبدا داوای عەزیز ئەلحاجی سکرتێری حیزبی پێگەیاندم کە پێویستە واز لە ژیانی بەغدا بهێنم و بچم بۆ سلێمانی. ئەو ڕۆژانە شاڵاوی بەعس بۆ سەر ڕێکخستنەکانی حیزب لە سەرەتایدا بوو، ڕێکخراوی سلێمانی بەهێز و توانا بوو، ئەوە لێکدرایەوە کە کاتێك لە بەغدا لێبدرێین ئەبێت روو بکەینە کوردستان و خۆمان بۆ قۆناغێکی نوێ ئامادە بکەین. بەڵام گێروگرفتی سلێمانی خۆی چارەسەرێکی مەبدەئیانەی ئەوێت وەك هاوڕێ کازم گوتی: موسڵیح مستەفا ئەندامی سەرکردایەتیی حیزبە و لەگەڵ لیژنەی محەلیی سلێمانی زۆر ناڕێکە و پەیوەندییان گەیشتووەتە بنبەست و تۆمەت گۆڕینەوە بە شتی ناشیرین بۆ یەکتر. هەروەها گوتی: تۆ ببە بە مەسئولی سلێمانی و ئەتوانیت ڕۆڵێکی باش ببینیت لەم گێروگرفتەدا و بەرەو مەسئولیەتی گەورەتر هەنگاو بنێیت.

بۆ ئەم کارە چەند هەنگاوێکی پەلەمان پێویست بوو، من هێشتا فەرمانبەرم لە بەغدا و کەسێکی ئاشکرام لە ژیانێکی ئاساییدا و تا ئەو کاتە جێگری لێپرسراوی لیژنەی سوپای حیزبم.

هەوڵی گواستنەوەی کاری وەزیفیی خۆم دا و لە سلێمانی جێگام بۆ دابین بوو. ڕێکخستنەکانی حیزبم لە بەغدا هێشتەوە و بە هاوڕێیانی لیژنەکەم گوت با لای خۆم بمێنێت لەبەر ئەم سەرەتای شاڵاوەی بەعس بۆ سەرمان. لەسەر ئەوە ڕێککەوتین و بەرەو سلێمانی هاتمەوە.

شەشەم ڕۆژی دەوامم بوو لە کارگەی جگەرە لێپرسراوی ئیستیخباراتی عەسکەری کە ناوی عەقید عەبدولکەریم حەمدانی بوو لەگەڵ چەند سەربازێکیدا هاتن دەستگیرم بکەن، بەڵام دەرباز بووم و ئیتر کەوتمە قۆناغێکی تری ژیانەوە کە خۆشاردنەوە و خەباتی پێشمەرگایەتی بوو.

وەك بیرەوەرییەك، رۆژێك پێش ئەوە هـاوڕێم حەسـەن زێـوەر کـە لـە بەغـدا لـە شوققەیەك پێکەوە ئەژیاین هەواڵێکی بە عوسمانی حاجی ئەوڕەحمانی خزمیـدا بـۆ ناردم کە (ئەمن) هاتونەتە سەرمان و بۆ من گەڕاون، ئـەو رۆژەی هاتنـە سـەرم بـۆ کارگەی جگەرە، بـەفرێکی زۆر بـارییوو، و شـەوی پێشـوو لـە مـاڵی خوالێخۆشـبوو غەنی شاڵی دەعوەت بووم لای هـاوڕێی خۆشەویسـتم سـەردار. تـا درەنـگ قسـەی خۆشمان کرد لەگەڵ غەنی ئەفەندی و خوالێخۆشـبوو عـەتێ خـانی دایکـی سـەردار کە ژنێکی یەکجار قسەخۆش بوو و منیشی وەکو کوڕەکانی سەیر ئەکرد.

ئەوە دوا شەوی ئاشکرام بوو لەو قۆناغەی ژیانـدا و ئـەوە بـوو بـۆ چـەند سـاڵی داهاتوو ژیانم گۆڕڕا بە ژیانێکی خۆشاردنەوە لە شارەکان و ناو بارەگاکـانی حیـزب لە شاخ و لادێکانی کوردستاندا. لـە سـەرەتای یەکبینینمانـدا لەگـەڵ موسـڵێح بـۆم دەرکەوت کە زۆر دوورین لەیەك لە تێگەیشتنی هێڵی سیاسـیی حیزبـەوە. ئـیتر زۆر زوو کەوتە پیلانگێڕان و هەوڵدان بۆ جێبەجێ نەکردنی فەرمانی سـکرتێر و جێگـری سکرتێری حیزب کە پێش گەیشتنەوەی من نامەی سکرتێری حیزبـی پێگەیشـتبوو دەربارەی هاتنەوەی من بۆ سلێمانی و لێپرسراوێتی من لە سلێمانی و کوردستاندا.

باسی ناکۆکیی موسڵێح و تاقمەکـەی کـەوتبووە سـەر زمـانی هـەموو برادەرانـی رێکخستن و لایەنگرانی حیزب. ئەم بە هاوکـاریی یـەك دوو بـرادەری خـۆی ویسـتی رووبەڕووی زۆرینەی کادرەکـانی سـلێمانی ببێتـەوە کـە هاوڕێیـان حسـێن عـارف و خوالێخۆشبوو شێخ عـەلی بـەرزنجی سـەرکردەییان ئـەکرد و لـە راسـتیدا نوێنـەری راستگۆی رێکخستن و سیاسەتی شۆڕشگێڕانەی حیزب بوون.

ئەمە لە کاتێکدا بوو من فەرمانی گـرتنم لـە چـەند لایـەکی دەزگـا ئەمنییـەکانی بەعسەوە بۆ دەرچووە و توانای جووڵانی ئاشکرام نەمابوو.

موسڵێح گوتی من ئەزانم لە بەغدا لە مەرکەزێکی گەورەتر لە لقـی کوردستانیشـدا بوویت، بەڵام ماوەیەکە برادەرێکم لـە هـەولێرەوە هێنـاوە و بـا تـاقیی بکەینـەوە بـۆ لێپرسراوی سلێمانی، پاش ئەوە قسە لە رێ و شوێنی حیزبیی تۆ ئەکەین. پێم گـوت

پلەی حیزبی لەلای من گرنگ نییە، بەڵام پێش هێنانی ئەو برادەرە، ١٤ ئەندامی لیژنەی محەلی لە سلێمانی هەن هەموو یەکێکیان لەو برادەرە بە تواناترن. ئەمەی تۆ ئەیکەیت تێکدانە نەك چارەسەرکردن و بەرەوپێشبردنی رێکخراوەکانی حیزب.

پاش چەند دانیشتنێك لە سلێمانی، مەترسیی ئەوەم هەبوو تووشی گرتن ببم چونکە لە لایەك ئەمن و لە لایەکی تر ئیستیخباراتی سوپا بە دوامدا ئەگەڕان و لەملاشەوە موسڵیح کە هەزار فڕوفێڵ و پیلانم لە چاوە خێل وخوارەکانیدا ئەبینی، بڕیارمدا شار بەجێ بهێڵم و بەرەو لادێ ماڵئاوایی لە شارە خۆشەویستەکەم بکەم. بنکەی پێشمەرگەی حیزب لە گوندی گەڕەزیل بوو، بڕیار درا بچمە ئەوێ، گەڕەزیل نزیك گوندی جافەران و قەرەداغە.

ئەمە قۆناغێکی نوێ بوو لە ژیانمدا..

لە پایتەخت لە دوو شوێن: یەکەم ئیشی خۆم لە بانکێکی خۆش و پێشکەوتووەوە و لە رووی حیزبایەتیشەوە لە لیژنەیەکی هەرە بەرزی حیزبەوە گەڕابوومەوە بۆ سلێمانی بۆ بارێکی تری ژیان، بۆ یەکسەر فەرمانی گرتن و خۆشاردنەوە و ئینجا لەو پەیوەندییە حیزبییانەی لە بەغدا هەمانبوو کە بریتی بوو لە گیانی پاکی هاوڕێیەتی و تێکۆشانی فیداکارییەوە، بۆ بەردەم کار لەگەڵ کەسێکی ناڕۆشنبیر و پیلانگێر لە هاوڕێکانی خۆی. بەڕاستی رۆژانێکی یەکجار ناخۆش بوو، بەڵام من ئیرادەی تێکۆشان و هەستکردنم بە پێویستیی بەرەنگاریکردنی هەڵە و هەلپەرستان لە ناخمدا پەرەی ئەسەند و دڵم قرچەی ئەهات بۆ قوربانییەکانی ژێر ئازار و ئەشکەنجەی بەعسی فاشیست لە بەغدا. ئەمەم ئەدی و وێنەی تێکۆشەرانی وەك کازم سەفار و سامی ئەحمەد و ئەحمەدی دەلاك و مەتی هیندو و ساڵح عەسکەری بەبەرچاومدا ئەهاتن و ئەچوون کە ئەبێت ئێستا لە ژێر چ بارێکی ئازار و و ئەشکەنجەدا بن.

پەیوەندییم بە هاوڕێکانی دیکەی سلێمانییەوە کرد کە موسڵیح یان تەجمیدی کردبوون یاخود پلەیانی هێنابووە خوارەوە و تۆمەتی درۆی بۆ هەندێکیشیان

دروستکردبوو. ئەمانە هەمووی لە کاتێکدا بوون کە هێرشی دڕندانەی بەعس بۆ سەر هاوڕێیانمان دەستی پێکردبوو و زوربەی سەرکردەکانی حیزب لە بەغدا دەستگیر کرابوون.

لە ئەنجامی ئەو ناکۆکییەی موسڵیح و تاقمەکەی کە دوور لە بنەڕەت و پەیڕەو و پرۆگرام و نەریتی ناوخۆیی حیزب دروستیان کردبوو، زوربەی کادرە پێشکەوتووە تێکۆشەرەکان بەو شێوەیە دوور لە هەموو پێوەرە حیزبییەکان دوورخرابوونەوە.

لەو بارودۆخەدا ناچار بووم کە پەیوەندییان پێوە بکەم و هەوڵی ئەوە بدەم پەرشوبڵاو نەبنەوە و پێکەوە کار بۆ چارەسەرکردنی ئەو گیروگرفتانە بکەین، ئەوە بوو گشت توانای خۆمان بۆ ئەو مەبەستە خستە گەڕ. هاوڕێیان شێخ عەلی بەرزنجی و حسێن عارف و حامیدی شێخ حەمە نوری و حەمە غەریب رەشید و حەمە ئەمین رەشید (حەمە ئەمینی بەرید) و مامۆستا عومەر مستەفا و لیژنەی هەورامان کە بریتی بوون لە هاوڕێیان فاتح و حەمە کەریم و مامۆستا زاهیر و ئەحمەدی حاجی عەلی و یاسین لە ریزەکانی پێشەوەی ئەم چالاکییانەدا بوون.

تا ئەو کاتە، بێجگە لە حسێن عارف و شێخ عەلی بەرزنجی، هاوڕێ چالاکەکانی دیکەی سلێمانی بریتی بوون لە ئەکرەمی عیزەت نەجیب و حەمە سدیق و عەلی حامید و عەلی باراوی و سەدان ئەندامی حیزبی.

بە دیوە رەسمییەکەشدا شەوێك هەتا بەیانی بە ئامادەبوونی هاوڕێ سابیر عەزیز (سامی) کە موسڵیح کردبووی بە لێپرسراوی سلێمانی لەگەڵ چواردە ئەندام و پاڵێوراوی لیژنەی محەلیی سلێمانی لە ماڵی هاوڕێ ئەکرەم عیزەت نەجیب کۆبووینەوە بەبێ ئەوەی بگەینە ئەنجامێکی رەوا بۆ چارەسەری گرفتەکانی رێکخستن کە موسڵیح بۆ پاکتاوکردنی ئەو رێکخستنە تێکۆشەرە کاری بۆ کردبوو. یەکێك لەو ناخۆشییانەی بوو بووە جێی قسەوباس و هۆیەك بۆ دوودڵی خستنە ناو هاوڕێیانەوە ئەو تومەتبارکردنە بوو کە موسڵیح دابوویە پاڵ چەند تێکۆشەرێکیان کە گوایە لەو کردەوە حیزبییەی بۆ دەستبەسەراگرتنی پارەکەی پەروەردەی سلێمانی برێکی لێ دزراوە. ئەو کردەوەیەی کە وەك تێگەیشتم بە بەرنامەی شێخ

عەلی و حسێن عارف و شەهید حەمە کوڵەباڵ دانرابوو و دەستەیەك لە هاوڕێ ئازاكانی ئەو ڕۆژانە جێبەجێیان کردبوو لە عێراقدا دەنگێکی زۆری دایەوە وەك کردەوەیەکی شۆڕشگێڕانەی قیادەی مەرکەزی.

هاوڕێ حەمە کوڵەباڵ پاش سەرکەوتنی کارەکە بە دەستی حکومەت و هاوکارەکانی ئەو ڕۆژانەیان شەهید کرا. ئەو پارەیە گەیەنرابووە بەغدا و درابووە دەست سکرتاریەتی حیزب، وەك بۆمان دەرکەوت ئەو تومەتە بێ بنەما بوو و موسڵیح و تاقمەکەی ئەیانویست بۆ زڕاندنی ناوی ئەو هاوڕێیانە بەکاری بهێنن.

جێی دڵخۆشی زۆری من بوو کە بە هاوکاریی ئەو هاوڕێیانە توانیم ڕێگا لە داڕووخانی ئەو ڕێکخستنانەی سلێمانی بگرم و قەوارەی لیژنەی محەلی و لیژنەی شار و لیژنەی کرێکاران و لیژنەی گەڕەکەکان و لیژنەی ڕێکخستنی دەربەندیخان و بەمۆ و ..تاد بهێڵینەوە.

ئەو ڕۆژانە بێجگە لەو ناوانە، یادی تێکۆشەرانی وەك حەمە فەرەجی بانیبی و عەلی ڕەش و دەروێش و لە ناو شاریش ئەو لاوە ئازا و چاونەترسانەی وەك شەهید ئەکرەمی وەستا حەمە ئەمین (ئەکرەمی حەپسە) و شەهید جەمالی عەلی فایز و مستەفا چاوڕەش و کەمال شاکیر و شەهید لەتیفی حەمە مراد و شەهید بەکر هەورامی و شەهید عوسمانی نانەوا و شەهید کەمال جەمال (بەختیار) لە مێشك و ویژدانمدا ماون و ئەمێنن و بەشێکن لە هەزارەها ڕۆڵە نەبەزەکانی حیزبی شیوعیی عێراق — قیادەی مەرکەزی.

هەر لەو دەوروبەرەدا پەیوەندیم کرد بە ڕێکخستنی خانەقینەوە کە شەهید زۆران عەبدولعەزیز پشتیوان سەرکردایەتی ئەکردن و ئەو کاتە تا ئەو ڕووداوە دڵتەزێنانەی ڕوویدا وەك بەشێکی کاریگەر و نموونەی قارەمانێتی ناو شاری خانەقین و دەوروپشتی و تا بنکەی پێشمەرگەمان لە نزیك گوندی خەرکنێی نزیك دەربەندی بێلوولە ڕوویەکی گەشی حیزب بوون و هەڵمەتە شێرانەکانیان بۆ سەر دوژمن هاندەر بوو بۆ جەماوەری ناوچەکە بۆ نزیکبوونەوەیان لە ئێمە و دوژمنایەتییان بۆ حکومەتی بەعس.

کاتێك سەردانی ئەو بنکەیەم ئەکرد لە پاڵ شاخی بەمۆی سەرکەشدا وەك گەشتێکی خۆش و پڕ لە بیرەوەریی ئەو ناوچانە و قۆناغ بە قۆناغی ئەو ڕێگا دوورە تا خەرکنێ، زیاتر لە هەفتەیەك ڕێبڕینی پیادەی ئەویست کە ڕۆژی هەشت نۆ سەعات زیاتر ڕێمان ئەکرد، شەوان وامان ڕێکئەخست لەو گوندانە بمێنینەوە کە هاوڕێیانی خۆمانی تێدابوون.

## بەرەو گوندی گەڕەزیل

گوندی گەڕەزیل بنکەیەکی (پ.م)ی حیزب و ژمارەیەك هاوڕێی هەڵاتوو لە شارەکانەوەی لێ بوو. سەرلقەکەمان کەرکوکی بوو ناوی ئەبو عەلی بوو، کەسێکی چالاك و ڕۆح سووك بوو. لەو پێشمەرگانەی بیرم ناچن مەحمود فەرەج و حەمە شکور شوانی و ئەحمەد هەورامی بوون کە هەر یەکەیان سەرپەلێك بوون لە لقەکە. هەندێك ئەندامی لیژنەی محەلیی سلێمانیش لەوێ بوون. بارەگاکەمان مزگەوتەکەی گەڕەزیل بوو، کە بە هۆی میوانداریی ئێمەوە لە مزگەوتیی کەوتبوو و ئێمە لە ژوورە گەورەکەی نوێژکردندا بووین.

لەگەڵ گەیشتنمدا بۆ گەڕەزیل، موسڵیح بڕیاریدا تەجمیدم بکات. تەجمید لە حیزبدا ئەوە بوو کە هەر ئەندامی حیزبیت بەڵام لە ڕێکخستندا هیچ فەرمانێکت پێ ناسپێردرێت. سەرەڕای ئەو بارە، ڕۆژ دوای ڕۆژ هەواڵی ناخۆش و جەرگبڕی بەغدا و شارەکانی دیکەمان پێ ئەگەیشت. بۆ من کە ساڵانێکی زۆر لە ڕێکخستنەکانی بەغدا کارم کردبوو و سەدان هاوڕێم لە پایتەخت بەجێهێشتبوو، زۆر سەخت بوو. لە بارێکی یەکجار ناخۆشی دەروونیدا بووم و زۆر نیگەرانبووم بە نەزانینی هەواڵی هاوڕێکانم.

دوای دەستکردن بە شاڵاوی بەعس بۆ سەر قیادەی مەرکەزی لە ساڵی ١٩٦٨دا، موسڵیح دامودەزگایەکی چەند کەسیی هەلپەرست و بێتوانا و نەخوێندەواری بە دەوری خۆیدا دروستکردبوو، لیژنەی محەلیی سلێمانی و لیژنەی

شار و لیژنەی هەورامان و هەڵەبجە پشت گوێ خرابوون و زۆر دڵی بەوە خۆش بوو کە هاوڕێیانی سەرکردایەتی دەستگیر کراون و تەنیا ئەم لە سەرکردایەتی لە کوردستانە و بە هەلی زانی بانگی سکرتێریی بە گوێی خۆیدا بدات.



فاروق مەلا مستەفا، سەرەتای چوونە دەرەوە ١٩٦٨

لە ناو رێکخراوەکانی حیزبدا تەکەتولێکی بۆ خۆی دروستکردبوو، و زوربەی کادیرەکانی بە کردەوە لە کارخستبوو. یەك رۆژ نەمدی موسڵیح کتێبێکی بە دەستەوە بێت. رۆژانە خەریکی پاککردنەوە و ئالیکی ئەسپەکەی بوو. ئەسپەکەی موسڵیح زۆر بەختەوەر بوو، لە کاتێکدا لە بنکەکەدا کەمترین و هەرزانترین خواردنمان هەبوو کە نیسکێنە بە نانی تێگوشراوەوە ژەمی هەرە دڵخۆشکەرەمان بوو، جار جارێك ساوەر و زۆر جاریش نان و چا.. موسڵیح جۆی ئەکڕی، ئەیشتەوە و خوێی پێوە ئەکرد وچکلێتی ئەهێنا و ئەیکرد بەدەم ئەسپەکەوە، تاقە کەس کە هاوکاریی ئەکرد لەم کارە قیزەوەنەدا هاوڕێیەك بوو ناوی نادر بوو، نادر لەگەڵ موسڵێحدا لە هاوڕێی یەکتر نەئەچوون، بەڵکو وەك خزمەتکار و ئاغا وابوون.

هەر لە باسی نادردا، شەوێکیان لە بنکەکەمان دوور کەوتبووە و لەبەر ئەوەی رەبیەی جاشەکان زۆر نزیك بوون لێمانەوە لە گەڕانەوەیدا هاوڕێی حەرەس هاواری لێکردبوو "بوەستە.. تۆ کێیت؟" هاوڕێ نادر گوێی بە هاوارەکە نەدا و حەرەس تەقەی لێکرد و فیشەکێکی تفەنگە بڕنەوەکەی دابووی لە ڕانی و هەڵی تەکاندبوو. موسڵیح رووی کردە من گوتی "ئەمە لە ئیشی رێکەوت ناچێت!"

بۆ تیمارکردنی برینەکەی نادر، هاوار بۆ دکتۆر سلێمان (هاوڕێ عەلی کەریم) برا کە فریای بکەوێت، بەڵام دکتۆرم دکتۆر نیمچە بوورانەوەیەك بوورایەوە و ناچار هاوڕێ مستەفا چاوڕەش بە یاریدەدانی من دەستمان کرد بە تیمارکردنی برینداریيەکەی.

بێجگە لەم لایەنە، هاوڕێیانی دیکە زۆر ئیرادەیان بەهێز و ئازایانە بوو لەگەڵ هاوڕێیان مستەفا چاوڕەش و عەلی کەریم و شەهید جەمالی عەلی فایز و یوسف کە پ.م بوو لە گەڕەزیل، زۆر کاتمان بە قسەی خۆشی خوالێخۆشبوو یوسف قادر ناسراو بە (یوسفە لچە)وە ئەبردە سەر.

رۆژێك برادەرێك هات گوتی: کتێب ئەگرین بە دەستەوە حەمە شکور گاڵتەمان پێ ئەکات ئەڵێت ئەمە حوجرەیە.. مەکتەبە مردووتان مرێ یان هاتووین پێشمەرگایەتی بکەین، بانگم کرد گوتم هاوڕێ حەمە شکور وەرە. مەسئولییەتیشم نەبوو بەڵام بەڕاستی مەسئولی راستەقینە من بووم، گوتم بۆچی سەر ئەکەیتە سەر ئەم برادەرانە؟ شیوعێتی بەشێکی گەورەی خوێندنەوە و خوێندەوارییە و تێگەیشتنە لە کۆن و لە ئێستا و لە دواڕۆژ، بۆچی گاڵتەیان پێ ئەکەیت کە کتێبیان بە دەستەوەیە؟ خۆ لە شەڕدا نین ئێستا. گوتی راستییەکەت پێ بڵێم هاوڕێ فاروق (شایانی باسە کاتێك کە من چووم گەڕەزیل ناویان نام ئەمین، رۆژێك ئەم حەمە شکورە هات گوتی هاوڕێ ئەم بنکەیە هەمووی ئەزانێت تۆ ناوت فاروقی مەلا مستەفایە و ناویان ناویت ئەمین، هەر من نەم ئەزانی منیش تێگەیشتم تۆ فاروقی مەلا مستەفایت. زۆر پێکەنیم گوتم حەمە شکور باوەڕت بێت نەهاتووم خۆم بشارمەوە و ناوی خۆم بگۆڕم و هەتا هەتایە خۆم بەستووەتەوە بە

حیزبەوە، ئیتر بوومەوە بە فاروق) گوتم بۆچی ئیستیفزازی برادەران ئەکەیت؟ ئەی تۆ نازانیت وەکو بۆم باس کردیت خوێندنەوە چەند گرنگە؟ گوتی هاوڕێ هەمووی ئەزانم، من نەخوێندەوارم و بەڕاستی بەسەری تۆ لە رووم نایەت لای ئەوانی دیکە بیلێم، بەغیلییان پێ ئەبەم هەریەکەیان کتێبێکی بە دەستەوەیە و ئێوارە موناقەشەی ئەکات و من نایزانم، جەمالی عەلی فایز دێت بە ئەنقەست پرسیاری زۆرم لێ ئەکات نازانم جوابی بدەمەوە. زوربەی هاوڕێیان بە پەیوەندیی چاك و قسەی خۆش کاتیان بەسەر ئەبرد، گوتم ئەبێت لە بەیانییەوە کە کتێبیان بە دەستەوە بوو بلێیت ئەرێ هاوڕێ باسی چی ئەکەن شتێکیم لێی فێر بکەن. دوایی برادەرێکم کرد بە مەسئولی حەمە شکور بۆ ئەوەی خوێندنەوە و نووسینی فێر بکات. پاش مانگێك حەمە شکور هەموو پیت و ژمارەی بە دەستی خۆی ئەنووسی و زۆر دڵی خۆش ئەبوو کاتێك شتێکی ئەخوێندەوە.

هەر بەم بۆنەیەوە لە یەکەم رۆژی چوونە دەرەوەمەوە بۆ بنکەی گەڕەزیل هەستم کرد ئاستی رۆشنبیریی ناو هاوڕێکانی بنکەکە بە سیاسی و پێشمەرگەوە زۆر لاوازە و هیچ گرنگییەکی پێ نەدراوە. بە موسلێحم گوت: باشە تۆ بۆچی هەفتەی جارێك یان خۆت یاخود ئەم سوارچاکانەی قوتت کردوونەوە وەك لێپرسراو هەر جارەی دەربارەی لایەنێکی رووناکبیریی سیاسی یاخود فیکری یاخود موناقەشەی هێڵی سیاسی حیزب موحازەرەیەك نادەن بەم هاوڕێیانە؟ زۆر بە پێشنیارەکەم بێ تاقەت بوو و تەنیا بە گاڵتەپێکردنی زانی و هیچی تر.

لەو بنکەیە لە گەڕەزیل ماوەیەکی زۆر ماینەوە تا رۆژێك موسلێح لیژنەیەکی هێنا و بە ئارەزووی خۆی ناوی لیژنەی سلێمانی و لیژنەی فەرعی لێنابوون. بەڕاستی کە سەیری لیژنەکەم ئەکرد کە ئەمان سەرکردەی رێکخستنێکی فراوانی حیزب بن بەرچاوم تاریك ئەبوو و دوارۆژێکی پڕ لە نائومێدیم ئەهاتە بەرچاو.

ئەم چوار قۆڵییە لەسەر سەربانی بەردەم مزگەوتەکە کە بەشێك بوو لە تەوالێت و حەوزی دەست نوێژ گرتن، دانیشتبوون، گوتی هاوڕێ من ئیعتیزار بۆ تۆ

ئەهێنمەوە لەبەردەمی ئەم لیژنەیەی فەرعدا گوتم فەرع یان سلێمانی؟ درێژەی پێدا و گوتی: کە ئەم ماوەیە تەجمید بوویت بە هەڵە، تێگەیشتنەکەمان هەڵە بوو. گوتم من حەز ئەکەم یەکێك مەحزەر بنووسێت، ئێستا تۆ چیت ئەوێت؟ گوتی ئێمە هەڵە بووین، ئەتکەین بە مەسئولی گەورەترین رێکخراوی حیزب کە حیزبی شیوعیی عێراقی – قیادەی مەرکەزی ماویەتی رێکخراوی (کوت)ە، بچۆ بۆ ئەویێ، کوت چەند ئەوەندەی کوردستان ئەندامی تیایە، ئەمەی هەیە و ئەوەی هەیە. من ئەمزانی وایە بەڵام گوتم من لە ژیانمدا هیچ شتێکی حیزبیم پێ نەگوتراوە نەیکەم، بۆ نموونە وازم لە ژیانی بەغدا هێناوە، فەرمانبەرێکی مامناوەندیی بووم لە ژیانێکی خۆشدا بووم، لە بانقێك بووم شوێنێکی گەورەم هەبوو، هاتمەوە بۆ سلێمانی لەسەر فەرمانی حیزب و بۆ یەکەم جار لە ژیانمدا رەفزی قسەی تۆ ئەکەم چونکە تۆ پیاوێکی خائینیت. گوتی من خائینم؟ گوتم بەڵێ تۆ خائینیت محاوەلەی هیچ شتێك نەکەیت چونکە ئەم بنکەیە لەژێر دەسەڵاتی تۆدا نییە! ئێستا ئەم سێ برادەرە کە داتناون لەلای من لە داشی دامە بچووکترن. بە یەکێکیانم گوت مەحزەرەکە جوان بنووسە، چونکە خەتی زۆر ناخۆش بوو، ئەمە ئەمێنێت بۆ مێژوو. گوتم بەقسەت ناکەم چونکە تۆ ئەتەوێت من لەوێ بکوژرێم یا نیازێکی ترت هەیە.

لەسەر بابەتەکە رۆیشتم و گوتم تۆ بە مەسئوول نازانم و هەتا مردن ئەڵێم خائینێکی گەورەیت. گوتم تۆ لە ناو ئەم هەموو خەڵکانە نان نییە بیخۆین جۆ ئەشۆیتەوە خوێی پێوە ئەکەیت چوکلێتێکی تێ ئەخەیت و ئەیدەیت بە ئەسپەکەت، بوویت بە گاڵتەچی ئەم بنکەیە و بوویت بە گاڵتەچی هەموو خەڵك و برادەرە سیاسی و پێشمەرگەکان لەم گوندەدا کە خەڵکی زۆر زۆر ئاساییین، کەس نییە جۆ بەو شێوەیە بدات بە ماین یاخود ئەسپەکەی. کە تێگەیشت هیچی بۆ ناکرێت گوتی کۆبوونەوە تەواو.

لەو کاتەوە کۆمەڵێك شت روویدا و دوای ئەوەی بارێکی تازە دروست بوو لە ناو حیزبدا، هاورێ ئیبراهیم عەلاوی لە سەرەتای ساڵی ١٩٦٩دا بەرەو کوردستان هات. لەو رۆژەی ئیبراهیم عەلاوی هات قیادەی ئیبراهیم عەلاوی بوو بە ئەساس،

موسڵیح هەوڵی ئەدا ئیبراهیمیش لابـەرێت. کاتێـك کـۆنفرانس بەسـترا لـە قـەرەداغ منیان بانگ نەکرد. چەند کەسێك موسڵیحیان شکاند بەرامبەر بەوەی تەجمیدی کردبووم.

لە کۆتایی ساڵی ١٩٦٩دا، ناوچەی قەرەداغ کەوتە ئـاڵۆزانی گیروگـرفتی شـەڕی حکومەت و چەکدارەکانی بەرامبـەر پێشـمەرگەی کوردسـتان. ئـەوەبوو ئـەو هێـزە بچووکەی ئێمەش بەرەو ناوچەی شارباژێر کشایە دواوە. من ئەو ڕۆژانە لـە دێلێـژە بـووم. کاتێـك هێـرش بـەرەو ناوچـەکە هـات ئـەوێم بـەجێ هێشـت و نزیـك شـاری سلێمانی لەگەڵ هاوڕێ شێخ عەلی بـەرزنجی یـەکمان گرتـەوە و بـەو ئومێـدەی لـەو ناوچەیەدا بگەینەوە بە برادەران کە هاوڕێ ئیبراهیم عەلاویشی لێ بوو، بـە شـاخی گۆیژەدا هەڵگەراین و بەرەو گوندی کاژاو، لەوێوە بۆ بەرزنجـە. پـاش یـەك دوو ڕۆژ گەیشتینە حاجی مامەند. شەوێك لە حاجی مامەندماینەوە و ڕۆژی دوایـی چـووینە گوندی قوڵەگیسکێ کە (ئارۆزەر)یشیان پێ ئەگوت، لـە مـاڵی خوالێخۆشـبوو شـێخ عەبدوڵڵای خزمی شیخ عەلی ماینەوە کە تاقە ماڵی ئەو گوندە جوانە بوو.



هاوڕێ ئیبراهیم عەلاوی، فاروق مەلا مستەفا

بارەگای حیزب لە کانی سپیندار، ١٩٧٢

بۆ گەیشتن بە هاوڕێکانمان لە ڕێ بڕین بەردەوام بووین و بە هەموو گوندەکانی سرۆچکدا تێپەڕین، بەڵام وەك بۆمان دەرکەوت ئەوان ڕێگایەکی تریان گرتبووەبەر و بەیەك نەگەیشتین، بۆیە بە ناچاری بە موختەفێتی گەڕاینەوە سلێمانی.

برادەرانیش گەیشتبوونە (ناوکێلەکان)، ئەو گوندە مێژووییەی چەند ساڵێك دوای بنکەکەی ئێمە لە ناوچەی باڵەك، بارەگای حیزبی تێدا دروستکرابوو.

بەردەوام پەیوەندی و نامەگۆڕینەوەم بە هاوڕێ ئیبراهیمەوە هەبوو و ڕا و بۆچوونمان سەبارەت بە دوارۆژی حیزب دەگۆڕییەوە.

## قۆناغی دەرکردنی موسڵیح مستەفا لە حیزب

**هاوڕێ ئیبراهیم بە هاوڕێ کەمال شاکردا نامەیەکی بۆ ناردم، نووسیبووی:**

هاوڕێ دلێر (کە ئەوکاتە ناوی خوازراوی حیزبی من بوو):

بۆچوونەکانی تۆ لەسەر بارودۆخی حیزب و بە تایبەتی لەسەر موسڵیح مستەفا هەمووی ڕاست بوون. پاش گەیشتنمان بۆ ئەم ناوچەیە و بۆ بارەگای حیزب لە ناوکێلەکان، بڕیارماندا سەردانی سەرۆکی پارتی و شۆڕش، مەلا مستەفای بارزانی بکەین.

من و موسڵیح و ئەبو ئەنیس لە پێش بەڕێکەوتنماندا بۆ لای بارزانی دانیشتنێکمان کرد بۆ دەستنیشانکردنی ئەو خاڵانەی لەگەڵ بارزانیدا باسی ئەکەین، کە بریتی بوون لە باری سیاسیی کوردستان و عێراق و هەڵوێستمان لەبەرامبەر حیزبی بەعس و حکومەتەکەی. هەڵوێستمان لە شۆڕشی کوردستان و بەردەوامبوون لە هاوبەشیکردن تیایدا لە ناوەوەی وڵات و دەرەوەی وڵاتدا و لەئەنجامدا ڕێکخستنی پەیوەندیی ئێمە و پارتی دیموکراتی کوردستان و داوا کردنی چەك لێیان بۆ بەشداریکردنی فراوان لە شۆڕش دا.

موسڵیح لە پێش دانیشتنەکەدا گوتی: ئەگەر بارزانی داوا لە ئێمە بکات لە بەغدا و شارەکانی دیکەی کە توانامان هەیە لە جەلالییەکان بدەین و بە تایبەتی لە ئیبراهیم ئەحمەد و جەلال تاڵەبانی ئێمە هەڵوێستمان چی ئەبێت؟ ئێمەش واتە من و هاوڕێ ئەبو ئەنیس پێمان گوت: دەڵێین ئەوە ئیشی ئێمە نییە و بەوە ڕازی نابین. بەڵام کە چووینە

لای بارزانی و هەندێك قسەمان کرد، یەکسەر موسڵیح پێی گوت: ئێمە داوا ئەکەین چەکمان بدەیتێ بۆ ئەوەی هاوکاریی شۆرش بکەین.

بارزانی قسەکەی پێ بڕی و گوتی: ئەوە ئاسانە بەڵام من داوایەکم لە ئێوە هەیە.. بۆم بکەن.

موسڵیح بێ قەید و شەرت و بە پێچەوانەی بڕیاری پێش سەردانەکە و دوور لە سیاسەتی حیزب و بێ ئەوەی ڕوو بکاتە ئێمە ڕەزامەندیی نیشاندا.

منیش (هاوڕێ ئیبراهیم) گوتم: جەنابی بارزانی ئەگەر ڕای ئێمە وەرئەگرێت وەك حیزبی شیوعیی عێراق — قیادەی مەرکەزی، یەکەم ئەم قسانەی ئەم برادەرە ڕای شەخسیی خۆیەتی و هی حیزب نییە. دووەم، ئێوە لەگەڵ ئەو لایەنەی دیکەی جوڵانەوەی کورددا جیاوازییەکتان هەیە ئەگەر بە شێوەی گفتوگۆ چارەسەری ئەم شەڕەی نێوانتان بکەن قازانجی شۆڕشی کورد و هەموو گەلی کورد و عێراقیشە.

❊ ❊ ❊

**پاش لێکدانەوەی تەواوی هەڵوێستەکانی موسڵیح لە سەرەتای شاڵاوە فراوانەکەی بەعس بۆ سەر قیادەی مەرکەزی و گرتن و کوشتنی زۆر لە سەرکردەکان و بەبێ هیچ بڕیارێك، موسڵیح مستەفا خۆی ناو نا سکرتێری حیزب و کەوتە تەجمید کردن و سەرکوتکردنی هەموو ڕا و خاوەن ڕایەك لە لایەن کادرەکانی حیزبەوە کە بەگشتی بووبووە جێگای گومانی سەرکردە و کادری پێشکەوتووی حیزب و بەهۆی ناسکیی باری سیاسی و ئاڵۆزانی ڕێکخستنەکانی پاش ئەو گورزە کوشندەیەی بەر حیزب کەوت و لەسەر ئەو را و هەڵوێستانەی ئەو ماوەیە زوربەمان کە من رۆڵێکی سەرەکیم هەبوو تیایدا و داوای تەجمیدی موسڵیحمان کردبوو.**

**کە هەرسێکیان گەڕابوونەوە بارەگای حیزب هاوڕێ ئیبراهیم لەگەڵ هاوڕێکانی ئەوێدا کۆبووبوونەوە و بڕیاریان دابوو موسڵیح چەك بکەن و تەجمیدی بکەن تا کونفرانسێکی داهاتووی حیزب.**

❊ ❊ ❊

لقێکی پێشمەرگەی حیزب لە ناوکێلەکان بوو، بەکرە ڕەش سەرلق و عەزە ڕەش جێگری بوو. عەزە ڕەش ناوی عەزیز ئەنوەر بوو خەڵکی گەڕەکی کانێسکانی سلێمانی بوو، بە عەزەی بەهێش ناوئەبرا، باجی بەهێی دایکی ژنێکی تێکۆشەر بوو کە هەتا کۆچی دواییشی هەر لەگەڵ حیزبدا بوو. عەزیز خۆیشی لە سەرەتای لاوێتییەوە ڕۆڵەی حیزب و پێشمەرگەی بوو.

ئەو هاوڕێیانەی دیکەش کە لە ناوکێلەکان بوون بریتی بوون لە مستەفا چاوڕەش، کەمال شاکر، ئەکرەمی حەپسە، جەمالی عەلی فایز، بەکر هەورامی و مام برایم. ئەم تێکۆشەرانە ڕۆڵێکی مەردانەیان هەبوو لە بەرگری کردن لە بەرامبەر دوژمنەکانی حیزب و قارەمانانە و گیانفیدایانە چالاکییان ئەنواند. هەروەها هاوڕێ بەختیار (کەمال جەمال) و حەیدەر قەساب، تارق حاجی سەعید، سەعدون فەیلی، سامی فەیلی و ئەبو سەمیرە و ژمارەیەك پێشمەرگەی حیزبیشمان لەگەڵدا بوون.

هاوڕێ ئیبراهیم داوای لە من کرد لیژنەکانی سلێمانی ڕێکبخەمەوە و زۆر بەپەلە بچم بۆ ناوکێلەکان و لە چەند ڕۆژێکدا کاروبارە پەلەکانمان ڕێکخستەوە.

❊ ❊ ❊

لە جیابوونەوەکانی ناو ڕێکخستنەکانی حیزب و هەر حیزبێك کۆمەڵێ ڕا و هەڵوێستی جیاجیا پەیدا ئەبێت کە هەندێکیان لەسەر بنەڕەتی مەبدەئی نابن. هەرچەندە ئەوانەی لەگەڵ موسڵیح و تاقمەکەیدا مانەوە ژمارەیان کەم بوو، بەڵام هەندێك هاوڕێی تێدا بوو دڵسۆزی حیزب بوون کە من هەوڵمدا یەکە یەکە ئەو برادەرانە ببینم و هەڵوێستی ئەو تاقمەیان بۆ روون بکەمەوە کە چەند دوورن لە بەرژەوەندیی حیزبەوە و چۆن کردەوەکانیشیان بە تایبەتی ئەوەی دوو کەسی یەکەمیان جێگای گومانن.

لەو کاتانەدا کە حیزب لێی ئەدرێت و بەتایبەتی لە لایەن حکومەت و حیزبێکی فاشستیی وەك حیزبی بەعس، تەنیا کوشتن و بڕینی ئەوان نییە کە حیزب لاواز بکات بەڵکو ئەو کاتانە کەسانی لاواز لە فیکر و لە باوەڕ نەبوون یاخود هەندێکیان

بەهۆی بەرچاو روون نەبوون بە دواڕۆژی حیزبـەوە کاریگەرییـەکی تونـدیان ئـەبێت لەسەر یەکگرتوویی حیزب و پتەویی ڕێکخستنەکانی.

هەنـدێك هەلپەرسـتیش ئەکەونـە ملـەقوتێ بـۆ وەرگرتنــی پایـە و لێپرسـراویی سەرووتر لە توانا و لە شارەزایی حیزبایەتییان. ئەمەی دواییشیان یـەکێك بـوو لـەو گرفتانەی رووی دا، بۆ نموونە هاوڕێیەك ئەندامی لیژنەی گەڕەك بوو ئەوان سـەریان خستە لیژنەی لقی کوردستان! بەڵام کام لق!

هەندێك گیروگرفت و هەڵوێستی سەیرمان هاتە بەردەم. ئەو کادرانەی بـە تونـدی دژی موسـڵیح و تێگەیشـتنی و هەڵوێسـتەکانی بـوون لـەو زۆرانبازییـەی ئێمـە کردمـان لەگـەڵ موسڵیحدا و زۆر بچووکمان کردنەوە، ژمارەیەکی ناسراوی ئەو هاوڕێییانە بـەردەوام نـەبوون لەگەڵمان و هەندێکیان هەڵوێستی گۆشەگیرییان هەڵبژارد و چەند کەسێکیشـیان سـەرتاپا رێباز و بیروباوەڕیان گۆڕرا. ئەمانەش هەمووی چاوەڕوانکراوە لە ئەنجامی جیابوونەوەکانـدا لە هەموو حیزبێکدا کە ژمارەیەکی زۆر لە نێوان دانیشـتن و سـەنگەر گواسـتنەوەدا یان مێژووی خۆیان ئەدۆڕێنن یاخود لە بەردەوامبوونی تێکۆشانیاندا بێهیوا ئەبن.

بە پێچەوانەی ئەمانەشەوە کەسانێکی خاوەن بیروبـاوەڕ کـە لـە سـەرەتاوە بـۆ قوربانیدان ملی ئەو ڕێگەیەیان گرتووە، توندوتۆڵتر ئەبن و بیروڕایان پتەوتر ئـەبێت وەك لە زوربەی ئەندامەکان و کادرەکانی سلێمانی و کەرکوك و هەولێردا روویدا.

هەتا هەتایە نەبەزین و قارەمانێتیی دەیان هاوڕێ لە کادرە پێشکەوتووەکان لـە یاد ناچێت و لە خوار ئەمانیشەوە ئەو رێکخستنە پەرشوبڵاو پـێ کـراوەی دەسـتی ئەو کەسە هەلپەرست و دواتر (ناپاك)انەی کە بە چالاکی و هەوڵ و تەقەلای شـەو و رۆژی کارکردن توانیمان رێکخستنەکانیان لێ پاك بکەینەوە، پتەویان بکەین لەسـەر بنەڕەتی رێکخستن و فیکری مارکیسیزم – لینینیزمدا رێکخراوەکان دابمەزرێنینەوە.

ئەگەر رێکخستن بەبێ فیکر و فەلسەفەی باوەڕپێکراوی حیـزب بـە تیـۆری و بـە کردەوە دانەمەزرێت لە هەر شڵەقان یاخود هێرشێکی دوژمندا هەڵئەوەشێتەوە یان تووشی پچڕ یچڕی و ئاڵۆسکانێکی کوشندە ئەبێت.

## بەرەو ناوکێڵەکان

پێـنج ڕۆژ هـەر لـە بـەیانی زووەوە ئەکەوتینـە ڕێ هـەتا ئێـوارە و شـەوان لـە نزیکترین دێ لامان ئەدا. هەموو دێیەك لێپرسراوێکی هەڵبژێردراو یاخود دامـەزراوی لە لایەن هێزی پێشمەرگە و پارتییەوە تێدا بـوو. ئـەو پێشـمەرگانەی لـە گوندەکـە لایان ئەدا لێپرسراوە کە بەسەر ماڵـەکانی ئاواییـدا دابەشـی ئـەکردن. بـە گـوێرەی توانای ئەو ماڵە کە خانەخوێی ئەو شەوە ئەبوو خواردنیان پێشکەش بە میوانەکان ئـەکرد. بـە گشـتی دێهـاتی کوردسـتان ئـەرکی زۆر گـەورەی ژیـانی پێشـمەرگەیان لەسەر بوو. ساڵانێکی زۆر ماڵ بێ میوان نەئەبوو.

کـە گەیشـتمە ناوکێڵـەکان و هاوڕێیـانم بـینی، هەسـتێکی خۆشـم لـەلا پەیـدابوو، قۆنـاغێکی نـوێ پاککردنـەوەی حیـزب بـوو لـەو تاقمـەی کـە هەرچـی بـوون، ئـەوە نـەبوون لـە پێگـەی سـەرکردایەتیی ڕێکخسـتنێکی بچـوکی ئاساییشـدا بـن چ جـای پێشەنگی و ڕێبەرایەتیی حیزبێکی شۆڕشگێڕی ئازای وەکو قیادەی مەرکەزی بکەن.

ناوکێڵەکان ئەکەوێتە سەر ڕێگای گەڵاڵە و باڵـەك، گوندەکـە بەمبـەر و ئەوبـەری ڕێگا قیرتاوەکەدا بنیاد نراوە و هەر چواردەوری بـە چـیای بـەرزی پـڕ کەنـدەڵان و بەردەڵان و داربەڕوو گیراوە و لە بەری خوارووی ناوکێڵەکانـدا ئـەو ڕووبـارەی پێـدا دێتە خوارەوە کە لە هەر شوێنێك نـاوێکی جیـاوازی لێنـراوە. ڕووبـار زۆر بـەخوڕ و توندوتیژی ئەهاتە خوارەوە و لە هەندێ شوێنیشدا گۆمی بچووك بچووکی لـە پـاش خۆی بەجێ ئەهێشت. دەنگی خوڕەی ئاوی ڕووبارەکە لە دووریی دەیان مـەترەوە ئەبیسترا و خۆشییەکی پڕ جووڵان و چالاکیی بە گیانمان ئەبەخشی.

ساڵانێکی ژیانم لەگەڵ هاوڕێیاندا لـەم بارەگایـەی حیـزب بـردە سـەر و بـۆ هـەر لایەکی دیکەی کوردستان یاخود دەرەوەی وڵات بچوومایە دوا جار ئەگەڕامـەوە بـۆ ئەم مەڵبەندە خۆشەویستە.

لە ناوکێڵەکان و لە خوار بارەگاکەمانەوە کە بریتی بوو لە چـەند خانوویـەك کـە لە دانیشتووانی ئاواییمان بە کـرێ گرتبـوون، پارچـەیەك زەویـی گـەورەشمان بـەو

شێوەیە لێ گرتبوون بە کرێ کە لە وەرزی خۆیدا کشتوکاڵی پێویستمان تێدا ئەکرد. بامێ و باینجان و تەماتە و خەیار و کاڵەك. ئەمانە بەرهەمی بە کەڵکی ئەو کاتانە بوو کە بەشێکی زۆری خواردنی رۆژانەمانی مسۆگەر ئەکرد. نزیك رووباریش تەنوری نان و سەموونمان هەبوو کە سێ ژەمە برسێتیی ئەڕەواندەوە و تێری ئەکردین.

جارجاریش چەند بزنێکمان ئەبوو، هاوڕێیان ئەیاندۆشین و لە شیرەکەیان ماستمان دروست ئەکرد. کاتێك قەرەباڵغ بووینایە بەیانیان بۆ بەرچایی یەکی یەك کەوچکی چێشتمان لەو ماستە بەرئەکەوت، هەبوو بە یەك جار ئەیخوارد و هەندێکیشمان ئەمانسوو بە پارچەیەك نانی (تەنور)ەکەی خۆماندا و تۆزە تۆزە بە (چا)وە تام و لەزەتێکی یەکجار خۆشمان لێ ئەبینی.

* * *

ماوەیەك بەسەر دەرکردنی موسلێحدا تێپەڕی، بەڵام ناوبراو لە هەوڵدانیدا بۆ گەڕانەوە و کۆکردنەوەی ئەوەی ئەیتوانی لە هاوڕێیان و هەندێ پێشمەرگەی حیزب وازی نەئەهێنا و پارتی دیموکراتی کوردستان بە چەند شێوەیەك هاوکارییان ئەکرد.

رۆژێك هاوڕێ عەلە رەش گەیشتە ناوکێلەکان و هیلاکیی رێگابڕینێکی دوور و بەپێ رۆیشتنێکی خێرای چەند شەوورۆژی پێوە دیار بوو. پێی گوتین بۆیە وا بەپەلە هاتووم ئاگادارم موسلێح هێزێکی کۆکردووەتەوە و هێرش ئەکاتە سەرتان. بۆ ئاگادارکردنەوە و هاوکاریتان رێگای شەش حەوت رۆژم بە سێ رۆژ بڕیوە و خۆم گەیاندۆتە لاتان.

هاوڕێ عەلە رەش ئەندامێکی کۆنی حیزب و پێشمەرگەیەکی ئازا و قارەمان بوو.

چەند رۆژێکی پێچوو هەواڵێکمان بۆ هات کە شەو موسلێح و هێزەکەی و بە هاوکارییەکی نهێنییی پارتی هێرش ئەهێنن و هەرچییان پێ بکرێت لە دژمان ئەیکەن. ئێمەش خۆمان بۆ ئامادە کردن و ئامۆژگاریی ئەوەش درا بە هەموو هاوڕێکانمان کە تەنیا مەبەستمان بەرگرییە لە خۆمان و لە بارەگای سەرکردایەتیی حیزب و ئەو هاوڕێیانە بە موسلێح خەڵەتاون نابێت بە هیچ جۆرێك ببنە نیشانەی گوللەکانمان، تەنیا ئامانجمان لەم شەڕەدا ڕاونانیانە و رەنگە موسلێح وای

تێگەیانـدبن کـە دە پـانزە کەسـێکین و بـە ئاسـانی دەسـتگیرمان ئـەکات. هـاوڕێ ئیـبراهیم و مـن، یـەك بـە یـەکی پێشـمەرگەکانی خۆمـان لـەو بـارە ئاگـادار کـرد و ئـەمانزانی ئـەو هاوڕێیانـە زۆر زوو راسـتییان بـۆ دەرئەکـەوێت و واز لـەو ناپاکـە ئەهێنن. شەو لە گەلاڵەوە بە چەند ئوتومبیلێك بەرەو ناوکێلـەکان هـاتن. کـە نزیـك بوونەوە تەقەیەکی زۆرمان بەسـەریاندا کـرد و بـە پـێ دوایـان کـەوتین، هـەموویان بەرەو ژوور رایانکرد و هیچیان پێ نەکرا.

زۆر چاوم بۆ موسلێح خۆی ئەگێڕا، بەڵام لەبەر تـاریکی و راکەڕاکـەی هـەموویان کە راومانئەنان نەکەوتە بەرچاوم.

ئەمە سەرەتای کۆتایی موسلێح مستەفا بوو، ئەو کۆمەڵـە بچـووکەی لـە گەڵیـدا بـوون پـەرشـوبڵاو بوونـەوە و ژمارەیەکیشـیان هاتنـەوە ریزەکـانی حیزبـەوە. وەك چـاوەڕوانمان ئـەکرد، موسـلێح خـۆی و حەمـە ئـەمین چـوونە لای حکومـەت و هەریەکەیان لە شوێنێك وەك فەرمانبەری حکومەت دامەزران!

## بیرەوەرییەکانی رێکخستنەوەی رێکخراوەکانی حیزب

هیچ شتێك لەوە خۆشتر نەبوو لە لام کە پـاش ئـەو زەبروزەنگـە گەورانـەی بـەر حیزبمـان کـەوت، بتـوانین هاوڕێیـانی پچـڕاو لـە حیـزب و رێکخـراوە لێـدراو یـاخود پەرشوبڵاو پێکـراو یـا لاوازەکـان بگەڕێنینـەوە بـارێکی ئاسـایی نزیـك لـە حیـزب و دامەزراندنەوەی لیژنەکان و شانەکان.

ئەو کاتەی باسـی ئەکـەم، لـە حیزبێکدا تێکۆشـانمان ئـەکرد کـە فاشسـتەکانی بەغدا هەرچی لە توانایاندا بوو لە کوشتن و بڕین و قەنارە و گرتنی هـەزاران ئەنـدام و دۆستی قیادەی مەرکەزیدا دەستە چەپەڵەکانیان خویناوی بووبوو، ئـەتوانم بڵـێم هیچ دەنگێکی پاراستنی مافی مرۆڤ بەرامبەر ئەم شاڵاوە دڕندانەیە بـەرز نـەبووەوە. جوڵانەوەی شیوعیی جیهان کـە ریڤیژنیسـتەکانی سـۆڤێت سـەرکردەییان ئـەکرد و دەنگیان بۆ بچووکترین تاوانی وڵاتانی دیکە بەرز ئەکردەوە نـەك نووزەیـەکیان لـێ

نەهات بەڵکو بەهۆی ڕێبازی چەوتی حیزبی شیوعیی عێراق (لیژنەی مەرکەزی) پێخۆشحاڵبوون بەم خڵتانی خوێنکردنەی هاوڕێیانی ئێمە. سەرکردایەتیی (لیژنەی مەرکەزی) ئەم شالاوە خوێناوییەیان بە ئەنجامی چەپڕەویی ئێمە هەڵئەسەنگاند و چاویان بەرامبەر ئەم تاوانە گەورانە نوقاند و خەریکی ڕێککەوتن بوون لەگەڵ حوکمی فاشستیی بەغدا و ئەوە بوو ئەم ڕێگا پڕ سەرشۆڕییەیان بەرەو (بەرەی نیشتمانی) برد لەگەڵ حیزبی بەعسدا و دواجار چوونە حکومەتی بەعسیی عێراقەوە. بەعسییەکان بۆ ئەوەی زیاتر سەرشۆڕیان بکەن یەکێك لە وەزارەتەکانی دایان بە لیژنەی مەرکەزی (وەزارەتی داد) بوو! ! کە بە هەلهەلە لێدان قبووڵیان کرد و ئەمانیش بوونە بەشێك لەو شالاوە دڕندانەیە لە دژی ئێمە.

وەك باسیشم کرد لە ناوخۆشدا موسڵیح مستەفای ناپاك پەیدا بوو کە زیانی زۆری لێداین و ماوەیەکی زۆر خەریکی کردین بە کێشمەکێشی زۆرەوە و تا بەو جۆرەی باسم کرد کۆتایی هات.

لەم بارە ئاڵۆزاو و سەختەدا و بە نەبوونی هیچ سەرچاوەیەکی دەرەوەی دارایی ژیانی کولەمەرگی بەڵام سەربەرزییمان ئەبردە سەر. ئەگەر ئابوونە و هاوکاریی هاوڕێیانمان نەبوایە لە شارەکانی کوردستان و زیاتریش لە بەغداوە برسیتر ئەبووین و لە پەلوپۆی جووڵەی حیزبی ئەکەوتین بۆ ڕێکخستنەوەی ڕێکخراوەکانمان لە کوردستان و عێراقیشدا، چونکە هیچ بەڕێوەبردنێکی ئاوا پڕ زەحمەت و ڕێگیری لێکراو بەبێ پارە هەڵنەئەسوڕا.

لەو بارودۆخە سیاسی و ئابوری و ناکۆکییانەی خرابووە بەر ڕێگامان نەیاران و دوژمنانمان هەرچی لە توانایاندا بوو بۆ تەنگهەڵچنینی زیاتر پێمان گەمارۆیانداین. بۆ کوژاندنەوەی ئەو بڵێسەیەی لە ناو حیزبی شیوعی و جوڵانەوەی نیشتمانیی کوردستان و عێراق هەموو کردارێکی دوژمنانەی نامرۆڤانە و دوور لە ڕەوشتی سیاسییان بە ئەرکی سەر شانیان دائەنا، هەر لە ململانێ و دروستکردن و چاندنی خەڵکی خۆیان لە ناو ڕێکخستنەکان و بنکەکانمانەوە هەتا دوا شالاوی چەپەڵی ناردنی ژەهر و ئەلغام و هەوڵدان بۆ ئەنجامدانی تەقینەوە لە بارەگای سەرکردایەتیمانەوە کە لە شوێنێکی

دیکەی ئەم بیرەوەرییانە باسیان ئەکەم، گشت ئەمانـەمان بەرامبـەر کـرا بـەبێ ئـەوەی بتوانن لە ڕێگای ئازایەتی و شۆرشگێڕی لامان بدەن. من کە بە درێژی ئەم بیرەوەرییانە تۆمار ئەکەم تەنیا بۆ یادگار نییە بەڵکو بەشێکە لـەو مێـژووەی ڕوویـدا و بـە پێویسـتی ئەزانم نەوەی ئێستا و دواڕۆژ سوود لەم ئەزموونە ببینن و بزانن دوژمنـانی چینایەتی و فیکـری هـەموو چـەکێك بـۆ ئامـانجی خۆیـان بەکارئـەهێنن و سـڵ لـە هـیچ پـەیڕەوی دادپەروەری و مرۆڤایەتی ناکەنەوە کە لە بنەڕەتدا دوژمنی گشت ئەو پەیڕەوانەن.

## دەنگۆی گفتوگۆی شۆڕش و حکومەتی بەعس

لـە سـەرەتای سـاڵی ١٩٧٠دا، دەنگوباسـی پەیوەنـدیی پـارتی دیموکراسـی کوردسـتان لەگـەڵ حکومـەتی بەغـدا لـە پەرەسـەندندا بـوو بـەوەی کـە سـەرەتای گفتوگۆیەکی ئاستبەرز لە نێوانیاندا دەسـتی پێکـردووە. وا دیـارە ڕووداوەکـان بـە پەلـە بـەرەو پێشـەوە ئـەڕۆن. ئێمـەش بـە ڕاسـتەوخۆیی هەسـت بـەم بـارە نوێیـە ئەکەین. چەند جارێکە ئوتۆمبیلی لێپرسراوی عێراقی بـە بەردەممانـدا تێئەپـەڕێت، وا لەم ڕۆژانەدا سەدام حسێن و حەردان تکریتیشمان بینی. مـن برادەرانـی خۆمـانم ڕاسپاردبوو کە بازگەیەکی کاتی لە بـەردەم گونـدی ناوکێلەکانـدا دابنـێن و هەرچـی لەو جۆرە کەسانە دێن ڕۆژنامە و بەیاننامەکانی حیزبی خۆمانیان بدەنێ بۆ ئـەوەی بزانن ئێمە هەین و ئۆپۆزسیۆنین و حیزبی بەعس بە حیزبێکی خوێنڕێژی دوژمن بە گەلی کورد و کوردستان و هەموو گەلی عێراقیش ئەزانین.

ئێمە هەستمان ئـەکرد کـە حکومـەتی بـەعس بـەرەو لاوازبـوون ڕۆیشـتووە. لـە ڕووی سوپایی و لەشکرکێشی بۆ سەر کوردستان تـەواو هـیلاك بـووە و لـە ڕووی سیاسییشـەوە دوژمنی زۆری نـاوخۆیی و دەرەکـی هەیـە و لـە بـارەی داراییشـەوە شۆڕشـی کوردسـتان باری سەرشانی قورس کردووە بۆیە هەوڵی گفتوگۆ ئەدات و بە ئامـانجی سـوود وەرگـرتن لـە کـات و ڕێکخسـتنەوەی خـۆی لـە هـەموو لایەنـە سـوپایی و سیاسـی و داراییەکانـدا، ئەمەشی بەبێ ڕاوەستانی شەڕ لە کوردستاندا بە هیچ جۆرێك بۆ ناچێتە سەر.

## نامەیەك لە كاك ئیدریس بارزانییەوە و وەڵامی من بۆیان

پێش گەیشتنی هەردوولا، بەعس و پارتی، بە ڕێككەوتن و ڕاگەیاندنی بەیاننامەی ئازاری ١٩٧٠، ڕۆژێك نامەیەكمان لە كاك ئیدریس بارزانییەوە پێگەیشت كە بۆ منی ناردبوو، تیایدا فەرمانی ئەوەی دابوو كە ناوكێڵەكان چۆڵبكەین و لە ماوەی ٤٨ سەعاتدا بگوێزینەوە بۆ دۆڵی شەهیدان.

مانای فەرمانەكە ئەوەبوو كە لەو ناوچەیە دووربكەوینەوە و بچینە دۆڵی شەهیدان كە شوێنێكی سەختە و هاتوچۆمان بە خەڵكەوە زۆر زەحمەت ئەبێت و بەكورتی ئەم گواستنەوەیە جۆرە دوورخستنەوەیەك ئەبوو بۆ ئێمە.

من وەڵامی نامەكەم دایەوە كە ئێمە حیزبێكی سەربەخۆین و بە هیچ جۆرێك ئامادەنین فەرمانی ئێوە جێبەجێ بكەین. ئەگەر ئەتانەوێت ئێمە ئازاد نەبین لە ناوچە ڕزگاركراوەكانی كوردستاندا كە خۆمان بە ڕۆڵەی دڵسۆز و تێكۆشەری ئەم نیشتمانە ئەزانین، ئەوا ڕاگەیاندنێك بڵاو ئەكەینەوە كە لەمەولا لە كوردستانیشدا وەك هەموو ناوچەكانی دیكەی عێراق بە نهێنی لە ڕێكخستندا و لە چالاكیی پێشمەرگایەتیدا كار ئەكەین.

ئەو ساڵانە ئێمە و پارتی لە هاوكارییەكی ئاشكرادا بووین دژی حكومەت لە پێش ١١ی ئازاردا و من لێپرسراوی پەیوەندیی نێوان قیادەی مەركەزی و پارتی و شۆڕش بووم.

هەر هەمان ڕۆژ دەمەوئێوارە كاك عیزەتی سلێمان بەگی دەرگەڵە كە دۆستایەتیی لەگەڵ ئێمەدا هەبوو و خۆی كەسایەتییەكی ناسراو و گەورەی ناوچەكە بوو، هات بۆ بارەگای ئێمە و گوتی بارزانی ئەیەوێت ئەمشەو خۆت و یەكێكی تر بهێنیت لە سەركردەكانتان و لەبارەگای سەرۆك لە گوندی دیلمان بتانبینێت. شەو من و خدر سەید سەلمان (ئەبو جەعفەر) كە ئەندامی سەركردایەتیی حیزب بوو چووین بۆ دیلمان. لەوێ كاك ئیدریس پێشوازیی لێكردین و پێكەوە چووینە لای بارزانی.

## چاوپێکەوتنی مەلا مستەفا بارزانی

یەکەم جار بوو بە تەنیا یاخود بە دانیشتنی دوو سێ کەسی مەلا مستەفای بارزانی ببینم. زۆر شتم بە مێشکدا ئەهات کە چۆن پێشوازیم ئەکات، بە تایبەتی کە ئەم دانیشتنە دوابەدوای نامەکەی کاك ئیدریسی کوڕی بوو بۆم. ئایا بە فەرمان کردن و تووڕەبوون دەست پێ ئەکات یاخود ناردنەکەی بە شوێنماندا بۆ هێواش کردنەوەی ئەو گرژییەیە.

بارزانی پیاوێکی بەشەخسییەت و بەهەیبەت بوو، سەروسیمای سەرکردەیەکی خاوەن ئەزموونی پێوە دیار بوو، لەو ژوورە ئاساییەی دیلمانی پایتەختی شۆڕشدا مێز و کورسی و ئەو چەند کورسییەی بۆ میوان دانرابوو بە گوێرەی ئەوسا نەك ئێستا زۆر ئاسایی و دوور لە فەنتازی بوو. من لە نزیك مێزەکەوە دانیشتم کە ئەو هەندێك کاغەز و قەڵەمی لەبەردەستدا بوو. زۆر بەپەلە کەوتە پرسیار کردن لە من. گوتی: تۆ کوڕی مەلا مستەفای خۆمانیت؟[١] گوتم بەڵێ. گوتی ئەی بۆ وا ئەکەیت؟ گوتم قوربان چیم کردووە؟ گوتی: چیت نەکردووە؟ تۆ بۆچی سەیتەرەت داناوە بۆ حەردان و سەدام کە هاتوون بۆ لای من؟ تۆ چییت؟ هەر دەمم کردەوە وەڵام بدەمەوە بە تووڕە بوونێکی هێواشەوە گوتی: جارێ قسە مەکە با لێ ببمەوە. گوتم: فەرموو. گوتی: تۆ بۆچی تەلی تەلەفۆن ئەپچڕێنیت کە لە ڕەواندزەوە حکومەت رایکێشاوە بۆ من و ئێمە لە گفتوگۆداین؟ تۆ چییت وا ئەکەیت؟

– جەنابی بارزانی وەڵام بدەمەوە؟

– نەء.. پێم ناڵێیت تۆ پارەی شەکر و چا لە من وەرئەگریت پارەت لە کوێ بوو ١٥٠٠ کلاشینکۆفتمان گرتووە لەسەر سنووری سوریا بە چی کڕیوتە و لە کوێ؟ (هەموو جارێکیش بە گرژییەوە ئەیگوت تۆ چییت) ئینجا دەی وەڵام بدەرەوە.

---

[١] (مەلا مستەفای سەفوەت)ی باوکم یەکێك بوو لەو سێ کەسەی کە لەساڵی ١٩٤٣دا لە سلێمانی دەرسیان بە مەلا مستەفا بارزانی گوتووە. (بڕوانە فرانسۆ هەریری، گۆڤاری مەتین، ژمارە ١٠٠)

من ئەو کاتە گەنجێکی ٢٩ ساڵ و بارزانی پیاوێکی ٦٧ ساڵ بوو. گوتم ئەزبەنی راستە ئێمە سەیتەرەمان داناوە و بەیاننامە و رۆژنامەی خۆشمان داونەتێ بە زمانی عەرەبی بۆ ئەوەی تێبگەن. ئینجا من پرسیاری ئەوە لە جەنابت ئەکەم، لەباتی توڕەبوون لەوە بۆ سوود لەو کارەی ئێمە وەرناگرن. بارزانی گوتی: چۆن؟ گوتم: پێیان بڵێن خەڵك و حیزبی بێجگە لە ئێمە ناڕازین بە ڕێکەوتن لەگەڵ ئێوەدا و هەوڵ بدەن دەستکەوتی زیاتریان لێ بسێنن!

بەم قسەیە دەموچاوی بارزانی گۆڕڕا و گوتی: ئەی تەلی تەلەفۆن بۆ ئەپچڕێنن؟ لە وەڵامدا بۆم باس کرد کە ئەوە ئیشی ئێمە نییە و شوان و مەڕ و گورگ و هەموو شتێك بەو چیا سەختانەوەن و تەلەفونیان بەسەر ئەرز و هەندێ داردا و بەم مەسافە درێژەدا بۆ راکێشاون بزانە چی پچڕاندویەتی. ئەگەر ئێمە بمانەوێت ئەم گفتوگۆیانە لە ئێوە تێك بدەین لەو ڕێگا دوور درێژەی ڕەواندزەوە بۆ ئێرە کە ئەمانە بە ئۆتومبێل دێن ئەتوانین ڕێگایان لێ بگرین یا تەقەیان لێ بکەین. باوەڕ بکە ئەوە ئێمە نین.

ئەم وەڵامەشی بە دڵ بوو و هەندێکی تریش ڕووی خۆش بووەوە و گوتی: ئەی ئەم چەکانەی گرتوومانە لەسەر سنووری سوریا؟ من زۆر بە دڵتەنگییەوە گوتم: گرتتان؟ بارزانی بە پێکەنینەوە گوتی: بەڵێ گرتمان دە پێم بڵێ لە کوێوە هێناوتانە؟

گوتم: جەنابی بارزانی پێش ئەوەی ئەم وەڵامەت بدەمەوە با پرسیارێك لە جەنابت بکەم.. هەموو جارێك بە من ئەڵێیت تۆ چییت و واتە من بە هیچ نازانیت، ئەی ئەگەر من بتوانم سەیتەرە بۆ حەردان و سەدام دابنێم و تەلی تەلەفونی تۆ بپچڕێنم و ١٥٠٠ کلاشینکۆف لە دەرەوەی وڵات بهێنم هەڵبەتە من شتم و شتێك هەم!

کە ئەم قسەیەم کرد بارزانی چەند چرکەیەك مات بوو و بێ چاوتروکاندن چاوی تێبڕیم و لە پڕ دایە پڕمەی پێکەنین.

گوتی: دەباشە ئینجا پێم بڵێ لە کوێوە هێناوتە. گوتم دەیان هەزار کلاشینکۆف بە دەست پێشمەرگە و هاووڵاتیانەوەیە ئایا ئێوە کریوتانە؟ کێ ئەم

هەموو چەکەی پێ ئەکڕێ؟ ئێـوە دەرگایـەکی گـەورەتان بـۆ کراوەتـەوە ئێمـەش پـەنجەرەیەکی بچووك، کە بە سوریادا هـاتووە، ئـەم پـەنجەرەیـە دامەخـەن رەنگـە رۆژێك بێت پێویستتان پێی بێت.

بارزانی ئەم قسانەی منی پێ خۆش بوو و بە تـەواوی شـێوەی قسـەکانی گـۆڕرا لە گەڵمدا. گوتم: ئینجا قوربان با راستییەکیشت بۆ باس بکەم. ئێمە لە دەرکردنـی موسڵێح مستەفاوە پەیوەندیی پارە وەرگرتنمان لەگەڵ ئێـوە نـەماوە، بزانـە لـە چ لیستەیەکدا ناوی ئێمەی تێداماوە لێیان بکۆڵەرەوە !

دوای ئەم قسانە دەستمانکرد بە باسی بارودۆخی سیاسی و ئەوەشم بە بـارزانی گوت کە تکایەکم هەیە لێت.. لەم مفاوەزاتەی هەتانە خۆت تا رەوانـدزیش نـەڕۆیت بۆ دانیشتن لەگەڵ حکومەتدا. لێی پرسیم بۆچـی؟ گـوتم چـونکە بـەعس غـەدارە و لەوانەیـە ئەمـە هـەمووی پـلان بێـت بـۆ کوشـتنی جـەنابت! زۆر پێکـەنی و پـاش ماوەیەك دەستی کردە ملـم و ماچـی کـردم و گـوتی: لـە شـوێنی خۆتـان نـەجولێن ئێـوە پیـاون. دڵسـۆزی مـنن. دڵسـۆزی کوردسـتانن. بـە دوا داواکردنـی مـن بـۆ چەکەکانمان دانیشتنەکە بڕایەوە و پەیوەندییەکانمان وەك جارانی لێ هاتەوە.

❊ ❊ ❊

لێرەدا بە پێویستی ئەزانم باسی ئەو چەکە گێراوانە بکەم کە ئێمـە لـە (یەمـەنی خـواروو)ەوە ئـەمانهێنا کاتێـك فـەرمانڕەوایی یەمـەنی خـواروی دیموکراسـی بـە دەست حیزبی ئیشتیراکییەوە بوو کە پەیوەندییەکی باشیان لەگەڵ ئێمەدا هـەبوو، ئـەو بـارەی دەسـتی بەسـەردا گـیرا، لـە سـوریاوە هـاوڕێ مسـتەفا چـاوڕەش کـە کادرێکی سیاسی و پێشمەرگەیەکی چالاکی حیزب بوو، هێنابووی.

❊ ❊ ❊

## ڕێککەوتنی ١١ی ئازاری ١٩٧٠

ئەم ڕێککەوتنە بە ڕووداوێکی گرنگ ئەژمێررێت لە مێژووی شۆرشی ئەیلول و کوردیشدا بەگشتی. بۆ گفتوگۆکان و پێش ١١ی ئازار چەند جارێك وەفدەکانی حکومەت بە فرۆکە ئەهاتنە رەواندز و لەوێوە بە ئوتوموبیل بە بەردەم ئێمەدا بە ناوکێلەکاندا ئەرۆیشتن بۆ بارەگاکانی پارتی لە ناوپردان و حاجی هۆمەران.

ئەم هاتوچۆیانەی بە سەرۆکایەتیی سەدام حسین ئەکران کە ئەوکاتە جێگری سەرۆکی کۆمار ئەحمەد حەسەن بەکر بوو، ڕێککەوتنی ١١ی ئازاری بە دوادا هات.

ئەم ڕێککەوتنە لە لایەن شۆرشەوە بە سەرکەوتنێکی گەورە دانرا و لە هەمان کاتیشدا لای حکومەتی عێراق و حیزبی بەعسی دەسەڵاتدارەوە سەرکەوتن بوو بۆ خۆیان کە بە شەڕ نەئەگەیشتنە ئەنجامی لە ناوبردنی شۆڕش و توانای دارایی و سوپاییان لە پەککەوتندا بوو. ئەم ڕێگایەیان گرتە بەر نەك لە باوەڕیانەوە بە مافی گەلی کورد بەڵکو وەك تاکتیکێکی نەخشە بۆکێشراو بۆ کۆتایی هێنان بە شۆڕش و دەسەڵات چەسپاندنی خۆیان بەسەر کوردستاندا کە بە ساڵانێکی دوور و درێژ نەیانتوانی لەناوی ببەن. بۆ یەکەمجار لە مێژووی عێراق و کوردستانی عێراقدا داننرا بە مافی کورد بە حوکمی زاتییەك کە کورد بەڕێوەی ببات و هاوکاریش بێت لەگەڵ حکومەتی بەغدا و بەو گوێرەیە چەند وەزیرێك لە پارتی دیموکراتی کوردستان خرانە وەزارەتی عێراقە و سێ پارێزگاریش بۆ سلێمانی و هەولێر و دهۆك لە ئەندامانی پارتی یاخود کەسانی باوەڕ پێکراوی شۆڕش دامەزران و گەلێك قایمقام و مودیری ناحیە و پۆستی ئیداری و پۆلیسیش ڕێککەوتنی لەسەر کرا.

لەگەڵ ئەم هەنگاوانەدا حیزبی بەعس دامودەزگا حیزبییەکانی خۆی لە کوردستاندا بڵاوتر و پتەوتر کرد و بوونە مەڵبەندی ویژدان کڕین و خۆئامادەکردن بۆ قۆناغێکی دیکەی جاش دروستکردنەوە بە شێوەیەکی بەرفراوان.

* * *

# ئێران و شای ئێران

ئێران و شای ئێران بە تەواوی تووشی سەرسوڕمان و راچڵەکینێکی زۆر بوون و چاوەڕوانی کاری وایان لە شۆڕش و بە تایبەتی لە بارزانی نەئەکرد.

ئینجا خوێنەری خۆشەویستی ئەم بیرەوەریانەی من، زۆر بە پێویستی ئەزانم کورتەیەك را و بۆچوون و زانیارییتان لەسەر ئەم بەیاننامە و رێککەوتنەی ١١ی ئازاری ١٩٧٠ بخەمە بەرچاو کە لە هەندێك بەڵگەنامەدا تۆمارکراون.

## هەندێك لە پیلانەكانی بەعس

ئامانجی حكومەتی بەعس وەك باسم كرد لێدان و بڕانەوەی شۆڕشی كورد بوو نەك لە باوەڕەوە دان بە مافەكانی گەلی كورددا بنێت. لە مانگی كانونی یەكەمی ١٩٧٠دا لە سەردانێكی وەفدێكی شۆڕشدا بۆ بەغدا كە خوالێخۆشبوو كاك ئیدریس بارزانی سەرۆكی بوو پیلانێكیان گێڕا بۆ كوشتنیان. كاك ئیدریس بەرنەكەوت بەڵام عەریف حەمید كە تێكۆشەر و قارەمانێكی ناسراوی پێشمەرگە بوو بە خەستی بریندار كرا.

## پیلانی ٢٩ی ئەیلولی ١٩٧١

ئەم پیلانە بە (پیلانی خۆ تەقاندنەوەی مەلاكان) ناوبانگی دەركرد.

هەر لە سەرەتای رێككەوتنەكەوە لێرە و لەوێ گێروگرفت و گرژی زۆر لە ناوچە جیاوازەكانی كوردستاندا رووی ئەدا، بۆ داپۆشینی دەستدرێژییەكانی بەری حكومەت لەسەرەتاوە هەندێك وەفدی ناڕەسمییان ئەنارد بۆ دەربڕینی رای حكومەت و پاكانەكردن كە ئەم رووداوانە بە فەرمان و ئاگاداریی خۆیان نییە.

پاش ئەوەی دوو مەلا لە رۆژی ١٥ی ئەیلولدا كە یەكێكیان عەبدولجەبار ئەعزەمی بوو پێشنیاری حكومەتیان هێنابوو بۆ بارزانی و ئەویش بەگوێرەی رای خۆی وەڵامی دابوونەوە و دوای ئەوەی مەلاكان گەڕابوونەوە بەغدا، ئەمجارە وەفدێكی هەشت نۆ كەسییان گەڕانەوە بۆ ناوچە رزگاركراوەكان و لە گەیشتنیاندا بۆ حاجی هۆمەران، وەك ئەو كاتە گوترا لە كاتی عەسردا مەلا مستەفا گەیشتە لایان بۆ میوانخانەكەی حاجی هۆمەران.

عەبدولجەبار ئەعزەمی دەستیكردبوو بە باسكردن لە را و راسپاردەكانی حكومەت بۆ چارەسەركردنی ئەو گێرەوكێشانەی لە نێوان هەردوولادا پەیدا بووبوون. هەر كە بارزانی دەمی كردبووەوە تەقینەوەكە روویدا بوو.

لەو كاتەدا چایچیی میوانخانەكە كە ناوی شەریف بوو، چووبووە ژوورەوە و لە كاتی تەقینەوەكەدا بەركەوت و كوژرا و بە ڕێكەوت بووە سوپەرێك بۆ بارزانی.

لە ئەنجامدا دەركەوت كە یەكێك لەو مەلایانە كە ناوی ئیبراهیم خوزاعی بوو تەقیبووەوە.

لە سەرەتا و لە لێکۆلینەوەکانیشدا دەرکەوت خوزاعیش نەیزانیوە ئـەم ئـامێری ریکۆردەر (مسجلە)یەی پێوەی بەستراوە، بۆمبڕێژ کراوە.

من کە بەدەنگ رووداوەکەوە چووم بۆ حاجی هۆمەران، لە دانیشتنێکدا بـارزانی چـەند جارێـك بـە زەردەخەنـەوە تەماشـای منـی ئـەکرد کـە بیرکەوتنـەوەی ئـەو قسەیەی من بوو کە پێم گوتبوو بەعس غەدارە و هەوڵی کوشتنی جـەنابت ئـەدەن. لە ئەنجامی تەقینەوەکەدا پارچـەیەك بـەر ناوچـەوانی کـەوتبوو و بـە پلاسـتەرێکی راست و چەپ شوێنی زامەکە داپۆشرابوو.

رۆژ لە دوای رۆژ دەرئەکەوت کە بەعس بە باوەڕەوە مـافی رەوای گـەلی کـوردی ناوێت و لەکاتی لاوازیـی خۆیـدا ئـەم رێککەوتنـەی کـرد و لەگـەڵ بەهێزبوونەوەیـدا ئـەوە بـوو کـە رووی دا، بـەڵام بـۆ کـوردیش سـەرکەوتنێك بـوو کـە ئـەو دوژمنـە سەرسـەختە دان بـە مـافی حـوکمی زاتیـدا بنێـت و بـووە قۆنـاغێکی نـوێ لـە پێشکەوتنی خەباتی گەلی کورد دا.

## گەڕانەوەی سەرکردەکانی باڵی (م.س)ی پدك بۆ ناو شۆڕش

ئەو دووبەرکی و کوشتارەی لە نێوان پارتی دیمـوکراتی کوردسـتاندا هـەبوو کـە سـەرەتاکەی لـە جیابوونـەوەی مەکتـەبی سیاسـیی ئەوسـا بـوو لـە پـارتی و هـەتا ماوەیەك پێش راگەیاندنی ١١ی ئازار ئەو بەربەرەکانییە خوێناویە بەردەوام بوو.

ئەم دوو لایەنە رێککەوتنەوە و باڵی مەکتەبی سیاسـی رێگـای ئاشـتبوونەوەیان هەڵبژارد لەگەڵ پارتیدا و بـە گـوێرەی رێککەوتنەکـەیان سـەرکردە ناسـراوەکانیان هاتنەوە بۆ ناوچەی سەرکردایەتیی شۆرش.

لەگـەڵ هاتنەوەیانـدا کـە لـە گونـدی قەسـرێ و لـە ناوچـەی بابـەکراوای رایـات دامەزرابوون و من زۆر زوو سەردانم کردن و مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد و مام جەلال و عەلی عەسکەری و عومەر دەبابە و نەوشیروان مستەفا بـوون و کـاك حامیـد قـادر ناسراو بە حامید قەرەشیان لەگەڵدا هاتبووە دەرەوە.

كاك نەوشیروان مستەفا لە ناو هەموویاندا، نزیكتر بوو بە من و لە قۆناغی خوێندنی ناوەندی و دواناوەندییەوە لە سلێمانی دۆستایەتیمان هەبوو. باسی نەوشیروان لە بیرەوەرییەكانمدا لەمەو دوا زۆر دێتە پێشەوە. مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەدم چەند جارێك لە بەغدا بینیبوو و دۆستایەتیی لەگەڵ باوكمدا هەبوو و چەند جارێك باسی كوردایەتیی باوكمی بە خۆشییەوە بۆ ئەكردم.

عەلی عەسكەری و عومەر دەبابەم كەمتر دیبوو، دوای ئەو ساڵانە بە تایبەتی لەگەڵ كاك عەلیدا دۆستایەتیمان زۆر زیادی كرد.

سەبارەت بە مام جەلال، كە لە ساڵی ١٩٦٨دا فەرمانی گرتنم لە لایەن حكومەتەوە بۆ دەركرا، مام جەلال لە ناوچەی سلێمانی بوو. بە هۆی فوئادی مەلا مەحمودی ئامۆزامەوە كە كادرێكی پێشكەوتووی باڵی م.س بوو و زۆر نزیكی مام جەلال بوو، داوای بینینی كردم و ئەیویست كە ئەگەر لە توانای دابێت هاوكاریم بكات. من سوپاسم بۆ نارد و ئەمزانی تۆمەتی من گەورەیە و ئەوە بوو كەوتمە ژیانی خۆشاردنەوە و پێشمەرگایەتی. پاش ئەوە لە بێروت یەكترمان بینی و هەر لەیەكەم دانیشتنمانەوە سەرەتای هاوڕێیەتییەكی گەرم و خۆشەویستی لە نێوانماندا پەیدا بوو.

❊ ❊ ❊

هەر لە ڕۆژانی یەكەمی هاتنەوەیانەوە لە قەسری سەردانم كردن، دەعوەتم كردن بۆ ناوكێلەكان. ڕۆژێك لە بەیانییەوە هەتا ئێوارە لە گوێ ڕووبار و چەمەكەی بەردەم بارەگاكەمانەوە كە كەپر و ساباتێكی جوانمان دروستكردبوو نانی نیوەڕۆمان لەوێ خوارد و چەند سەعاتیك لەگەڵ هاوڕێ ئیبراهیم عەلاوی و چەند هاوڕێیەكی دیكە كاتمان بە باسی سیاسەت لەگەڵیاندا بردەسەر.

پاش ماوەیەك كاك نەوشیروان سەفەری كرد و لە ڤیەننا جێگیر بوو. ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لەگەڵ مام جەلالدا پەیوەندیمان پەرەی ئەسەند و زۆر جار كە من ئەچووم بۆ لای ئەو كە بە تایبەتی نزیك (ناوپردان) جێگیر بووبوو، شەوانیش لەوێ

ئەمامەوە و هەردووکیشمان حەزمان لە قسە بوو. من زۆر لەزەتم لە قسە خۆشەکان و باسی مێژووی ژیانی سیاسیی و رۆشنبیریی ئەو پیاوە هەڵکەوتووە ئەبینی.

لە شوێنی تردا دەربارەی هاورێیەتی مام جەلال و خۆم باس ئەکەم لە کاتی جیا جیا و لە شوێنانی جیاوازدا. هەتا ئەمڕۆ کە ئەم چەند دێڕە ئەنووسم ئەو خۆشەویستییە هەر قووڵتر بووەتەوە و ئەو سیفەتە شەخسییانەی بە مام جەلالەوە هەیە و بە درێژایی ساڵانێك کە تا ئەمڕۆ ئەگاتە نزیك ٤٩ ساڵ، کە کۆی ئەکەمەوە بە کەسەوە نەمدیومە لە ژیانمدا.

هەر لەو کاتەشەوە لەگەڵ شەهید عەلی عەسکەریش بووینە دۆستی نزیك. رۆژێك پێی گوتم: فاروق ئەمەوێت بە راشکاوی باسێك هەیە بۆت بکەم.. پێش چوونە ناو باسەکە حەز ئەکەم بە دڵێکی پاك و ڕاستگۆیانە لە من بگەیت، نە من ئەمەندە زەعیفم و نە ئێوەش ئەوەندە دەسەڵاتدارن لێتان بترسم. قسەیەك لەسەر من هەیە بۆ مێژوو بۆت ئەگێڕمەوە: گوترابوو من لە شەڕێك لەگەڵ شیوعییەکاندا ساڵی ١٩٦٣ لە ناوچەی بەمۆ شیوعییەکی دەستگیرکراوم هێناوە و فیشەکێکم ناوە بە ناو دەمییەوە، ئەم چیرۆکە هەڵبەستراوە و بە هیچ جۆرێك راست نییە، ئەوەشت پێ بڵێم من قەت کۆنەپەرست نەبووم و ئەو ساڵانەی لە بەغداش بووین چەند وتار و وتاری وەرگێڕاوی رێبازی مارکسی و سۆشیالیزمم لە رۆژنامەی هاوکاریدا بە ناوی خوازراوی (شالاو)ەوە بڵاو کردووەتەوە.

## دیسانەوە ناوکێڵەکان

کە باسی ناوکێڵەکان ئەکەین وەك گوندێکی بچکۆلەی دەور گیراو لە هەر چوار لاوە بە چیای بەرز و سەختەوە، ئەگەر بارەگای ئێمە نەبووایە لەوێ و ئەو فەرمانانەی نەدیبایە و ئەو رووداوانەی لە ناوخۆی و بەهۆی ئەوەی بوو بووە بنکەیەکی شۆڕشگێری لە کوردستان و عێراقدا بەسەر نەهاتایە، ئەمەندە ناو و ناوبانگی نەئەبوو و وەك هەرگوندێکی ئاسایی ئەو ناوچەیە ئەبوو. لە

ناوکێلەکانەوە دەستمان کردەوە بە جموجۆڵێکی فراوان بۆ بەیەکبەستنەوەی ڕێکخراوەکانی حیزب لە کوردستاندا و چالاکی نوێش بۆ گەشەپێدانی حیزب لە هەموو ڕوویەکەوە ئەنجام ئەدرا. هەروەها ئەو گوندە بووە بنکەی ڕێکخستنەوەی حیزب لە عێراقیشدا و پەیوەندییەکانمان بە گشت شارەکانی بەغدا و فوراتی ناوەڕاست و خوارووی عێراقەوە لەوێوە ئەنجام ئەدرا.

حکومەتی بەعس کاتێك توانی (ح.ش.ع – لیژنەی مەرکەزی) بخاتە ناو بەرەی نیشتمانی! و حکومەتیشەوە، و بە ئاگر و ئاسن بەرەوڕووی هێزە نەیارەکانی ئۆپۆزسیۆن ببێتەوە لە عێراقدا بارودۆخێکی وەهای بەرپا کرد کە بێجگە لە شۆڕشی کورد و پارتی دیموکراتی کوردستان تەنیا ئێمە وەك حیزب و هێزێکی دیار لە عێراقدا مابووینەوە کە بەرەنگاری ئەو دەسەڵاتە ببێتەوە و بە هیچ جۆرێك سازشی لەگەڵدا نەکەین.

یەکێك لە هەوڵدانەکانی بەعس بۆ نزیکبوونەوەی ئێمە لێیان راسپاردنی چەند کەسایەتییەکی عێراقی بوو کە پەیوەندیمان پێوە بکەن بۆ گفتوگۆ لە گەڵیاندا و هەوڵەکان گەیشتە رادەیەکی وا کە شەوێکی درەنگ کەسایەتییەکی گەورە و ناودار هاتە لامان بۆ ناوکێلەکان و پەیامێکی زارەکیی سەدام حسینی پێ گەیاندین کە ئێمە تەنیا هێزین لە عێراق و کوردستاندا رازی نابین بە تەنانەت گفتوگۆش لە گەڵیاندا. ئەمە لە کاتێکدا بوو لیژنەی مەرکەزی چووبووە حکومەتەوە لە گەڵیاندا و پارتی دیموکراتی کوردستانیش ڕێککەوتنی ١١ی ئازاری ١٩٧٠ ی لەگەڵدا مۆر کردبوون. راسپاردەکە ئەوە بوو قیادەی مەرکەزی بچێتە بەرەی نیشتمانییەوە و دوو وەزیریشمان هەبێت لە وەزارەتی بەعسدا، وەزارەتی پلاندانانیش یەکێك ئەبێت لەو دووانە. هاوڕێ ئیبراهیم عەلاوی و من لەم دانیشتنەدا بووین و بە بێ لێکدانەوە و تاوتوێ کردن ئەو داوایەمان رەتکردەوە.

هەر لەو کۆششەی بەعس بۆ راکێشانی قیادەی مەرکەزی، جارێکی تر کەسێکی دیکەیان لەلایەن نازم گزارەوە نارد بۆ لامان کە یان ئەوەتا قبووڵی بەشداریکردنی حوکم بکەین لەگەڵیان یاخود چاوەڕێ بین هەموومان لەناو ئەبەن. ئەمجارەیان من

لە بارەگای حیزب بووم و هاوڕێ ئیبراهیم بەرەو دەرەوەی وڵات بەڕێوە بوو. بەهەمان شێوە وەڵامی ئەو برادەرەم دایەوە.

پاش ئەمانە زنجیرەیەك شاڵاوی چەپەڵی توند کرایە سەرمان.

بۆ نموونە چەند جارێك توانییان خواردەمەنیی ژەهراویمان بۆ بنێرنە ناوکێلەکان و ژەهرخواردمان بکەن. ژەهر خواردن و نەخۆشکەوتنی هەندێ هاوڕێشمان باوەڕی لاواز نەکردین، بەڵکو رق و کینەی بەرامبەر فاشستەکانی لەناوماندا قووڵتر کردەوە.

بەناوی دیارییەوە چەند جارێك لوغمیان بۆ ناردین کە لە کردنەوەیدا هەرچی لەوێدا بێت بیکوژێت.

لەسەر ئەو رێگایەی لە ناوکێلەکانەوە بەرەو گەڵاڵە و هەموو بنکە و بارەگاکانی پارتی و سەرکردایەتیی شۆڕش ئەچوو چایخانەیەك هەبوو خاوەنەکەی ناوی قادر بێکەس بوو. کاك قادر کوردی کوردستانی ئێران بوو، لەگەڵ خێزانەکەیدا لە ناوکێلەکان دائەنیشت. ئەم پیاوە هەندێ شێوە و رێکردن و جموجۆڵی لە شارلی شاپلن ئەچوو. پیاوێکی رووخۆش و قسەخۆش بوو.

گومانی ئەوەمان هەبوو کە پەیوەندیی بە دەزگای پاراستنی پارتیشەوە هەبێت. زۆر جار وەك دیاریی بە تایبەتی لە هەولێرەوە خواردەمەنی و برنج و رۆن و شەکر و چاشمان بە ناوونیشانی قادر بێکەسەوە بۆ ئەهات.

ئەمە لە کاتێکدا بوو بەعس چەند جارێك جاسوس یاخود ئەندامی شیوعیی رووخاوی لە ژێر ئازار و ئەشکەنجەدا ئەنارد بۆ ناومان بۆ چەند مەرامی جیاواز — یەکێکیان ئەوەبوو کە بنەی پتەو دروستبکات لە ناو بنکە و رێکخستنی حیزبدا. ئێمەش کە گومانمان هەبوایە لەم جۆر کەسانە لێکۆڵینەوەمان لەگەڵدا ئەکردن بۆ وەرگرتنی زانیاریی دوژمن و جۆری جوڵانەوەیان بەرامبەرمان.

رۆژێك بە قادر بێکەسم گوت، کاك قادر دوژمن لوغمی چێنراومان بە ناوی دیارییەوە بۆ ئەنێرێت، ئاگادار بەو دەست لە هیچیانەوە نەدەیت، من ئاگادار بکە تا برادەرانی شارەزامان هەیە لێی وردبنەوە نەك بتەقێتەوە.

## هەوڵدانێك بۆ كوشتنی من ١٩٧١/١٢/٢٦

هەر لـەو چـەند رۆژەدا بـوو برادەرێكمـان هـات گـوتی قـادر بێكـەس ئـەڵێت بـە هاوڕێ فاروق بڵێن دیاریی بۆ هاتووە، هەر بەو برادەرەی خۆمانم گـوت بـە ڕاكـردن بگەرەوە لای كاك قـادر بڵـێ دەسـت لـە هـیچ نـەدات وا خۆیشـم دێـم. نێـوان مـن و چاپخانەكە هـەر سـەد یـان سـەد و پـەنجا مـەترێك ئـەبوو، خۆیشـم بەپەلـە بـەرەو چاپخانەكە رۆیشتم، لە نیوەی ڕێگادا بووم گرمەیـەكی گـەورە و ئـاگر و دوكـەڵ لـە چاپخانەكەوە بەرز بووەوە. پاش ماوەیەك زانیمان ئەو هەوڵە بۆ كوشتنی من بوو.

چەند كەسێك كوژران و چەند كەس نابینا و چەند كەسێكی دیكە بریندار بـوون. قادر بێكەس گوتبووی ئا بابزانم ئەو دیارییە چییە هاتووە بۆ هاوڕێ فـاروق. لەبـەر ئەوەی خۆی نزیكترین كەس بوو لە تەقینەوەكەوە، سەری لـە گیـانی بووبـووەوە. ئەویش بوو بە شەهیدێكی رێگای ئازادیخوازیی ئەم گەلە. هاوڕێ سامی فـەیلی لـەو ڕووداوەدا چاوێكی لەدەست دا.

هەر لەو رۆژانەدا لە بازگەی بەرزێوە كە یەكەم بازگـەی پێشـمەرگە بـوو لەسـەر رێگای رەوانـدز بـەرەو ناوچـەی كوردسـتانی ئـازادكراو ئوتومبیلێـك ئەپشـكنن كـە پێناسەی خاوەنەكـەی لـە دواییـدا گەیشـتە دەسـت ئێمـە، جانتایـەك لـە سـنووقی ئوتومبیلەكـەدا ئـەبێت، پێشـمەرگە لێـی ئەپرسـێت بـۆ كـوێ ئەچـێت؟ گوتبـووی شیوعیم و ئەچم بۆ ناوكێلەكان. پـێی گوتبوو وەرە ئەم جانتایەت بكـەرەوە، كـابرا بە قسەی نەكردبوو، خۆی كردبوویەوە و بە داخەوە پیایدا تـەقیبووەوە و یەكسـەر شـەهید بـوو، نۆكەرەكـەی حكومـەتیش رایكردبـوو، بـەڵام پێشـمەرگەكانی دیكـە تەقەیان لێ كرد و بەسزایان گەیاند.

بوونی ئێمە لە ناوكێلەكان ئـەبووە هـۆی دروسـتكردنی گیروگرفتـی جیاجیـا بـۆ خۆمان و بۆ شۆڕشیش.

بۆ خۆمان بەهۆی ئەوەی تاقە رێگای گەلاڵە و حاجی هۆمـەران و هـەموو شارۆچـكە و گوندەكانی ناوچەكە بوو كە زوربەیان بارەگـای سیاسـی و پێشـمەرگایەتیی شۆڕشـی

تێدا بوو و ئەو ساڵانەی ڕێککەوتنی ١١ی ئازار بەری ناوچەکە بەرەڵڵا بوو بۆ هاتووچۆی هەموو کەس، بۆ ئێمە هاوڕێیانی خۆمان بە ئاسانی ئەگەیشتنە لامان بەڵام لەهەمان کاتدا دوژمنیش ئەیتوانی بە ئاسانی بگاتە ناومان.

بۆ شۆڕشیش گرفتی ئەوە هەبوو کە ئەوان لەگەڵ حکومەتدا لە ئاشتیدان و بگرە هاوکارن لە حوکمدا و چەند وەزیرێکیان لە حکومەتی بەغدا و ئیدارەی شارەکانی کوردستانیشدا هەیە. بوونی بارەگای ئێمەش لە چەقی ئەو تاقە ڕێگایەدا کە دوژمنی حکومەتین و چالاکیمان هەیە دژی بەعس لە کوردستان و عێراقیشدا، ئەمە ناکۆکییەکی دروست کردبوو لە هەڵوێستەکاندا بۆ بەڕێوەبەرانی شۆرش، حکومەتیش پارتیی ئاگادار ئەکردەوە لەو بارودۆخە و بێگومان داوای لێ ئەکردن کە هیچ نەبێت سنوورێك دابنێن بۆ چالاکی و جموجۆڵی ئێمە.

بەرامبەر بەو ژەهر و ئەلغامانەی بۆیان ئەناردین ئێمەش ئەوەندەی لە توانامانـدا بوو بە چەندەها کردەوەی شۆڕشگێڕانە بەرپەرچی شاڵاوەکانی حکومەتمان ئەدایەوە، بە تایبەتی لە بەغدا کە چەند بنکەی نهێنی و ئاشکرایانمان ئەدایە بەر دەستڕێژ و نارنجۆك و زیانی زۆرمان پێ ئەگەیاندن و هەوڵمان ئەدا بە تایبەتی لە ناوچەی لادێکانی ناوەڕاست و خوارووی عێراقدا پەرە بە تێکۆشانی خۆمان بدەین و خۆ ئامادە بکەین بۆ تێکۆشانی چەکدار. ئەوە بوو چەندەها بەیەکدادانی چەکدارانەمان بوو لەگەڵ هێزەکانی حکومەتدا بە تایبەتی لە لادێکانی حلە و دیوانیە و بەسرە.

## مەشق لەسەر چەکی جیاواز

لە بنکەی ناوکێلەکاندا پۆل پۆل هاوڕێیانی (پ.م) بە تایبەتی و هاوڕێیانی حیزبیش بە گشتی لەسەر بەکارهێنانی چەکی جیا جیا مەشقمان پێ ئەکردن.

لە هەمان کاتدا ئەو هاوڕێیانەی لەو خولانەدا بەشدار ئەبوون موحازەرەیان لەسەر بابەتە جیاجیاکانی سیاسەت و ئابووری و مێژووی بزووتنەوەی نیشتمانیی کوردستان و عێراق وەرئەگرت. خۆم یەکێك بووم لە بەڕێوەبەرانی ئەم خولانە، بە

تایبەتی بەکارهێنانی ئار پی جی (RPG) لەبەر ئەوەی پێشتر ئەفسەر بووم لە سوپادا پەیوەندیی بە منەوە هەبوو.

کاری دروستکردنی ئەلغام و بەکارهێنانی و پووچەڵ کردنەوەی لە لای هاوڕێی شەهید ئەبو سەمیرە بوو. ئەو هاوڕێیانەی لە ڕێکخستنەکانی بەغدا و ناوەڕاست و خوارووی عێراقەوە ئەهاتن، لەگەڵ هاوڕێیانی ڕێکخستنەکانی سلێمانی و هەولێر و کەرکوك و خانەقین بە یەك ئەگەیشتن و سوودیان لە ئەزموونی یەکتریش وەرئەگرت لە هەموو ڕوویەکەوە.

هەمیشە لە یادمە و بیرم ناچێت چوار هاوڕێ کە لە ناوچەی شوانەوە ئامادەی دوو خولی فێرکردن بوون پەیوەندییان بە خوالێخۆشبوو سەرۆکی لایەنی دووەمی (حەقە) حەمە سوورەوە هەبوو، و دوو ساڵ لەسەر یەك جەنابی حەمە سوور تەزبیحی قەزوانی تایبەتیی بەواندا بۆ ئەناردم لەگەڵ سڵاو و خۆشەویستیی ئەو پیاوە مەزنە بۆ قیادەی مەرکەزی.

فەخری (خەلیل ئەلغەزالی) هاوڕێیەکی خوێندەوار و ئازا بوو لە ناوەڕاستی خوێندنی پزیشکیی بەغداوە لە دەستی بەعس هەڵات و لێپرسراوی عەسکەریی بنکەی ناوکێلەکان و دوای ئەویش هەر لێپرسراو بوو کە زوربەی بنکەکەمان لە ناوکێلەکان گواستەوە بۆ کانی سپیندار. فەخری هەموو کارەکانی خۆی ئازایانە جێبەجێ ئەکرد و یەکێك بوو لە مامۆستاکانی خولەکانی مەشق پێکردن.

هاوڕێیەکمان بەناوی خوازراوی مەهدییەوە، لە ڕێکخراوی جەلەولا (قەرەغان)ەوە بۆ مەشقکردن بۆ ماوەی مانگێك هاتبوو بۆلامان. ئێوارەیەك لە کاتی نانخواردندا دیار نەبوو لەسەر سفرە بەکۆمەڵەکەمان، دوای پرسین بۆم دەرکەوت مانی گرتووە لە خواردن، لەبەر ئەوەی هاوڕێ فەخری سزای داوە بە هێنانی سێ بار دار کە لە چیاکانی نزیك بارەگاکەمانەوە ئەهێنرا. هاوڕێیان گوتیان فەخری لەسەر زۆر خواردن سزای داوە. بەو ڕووداوە زۆر دڵگیر بووم و هاوڕێ فەخرییم بانگ کرد پێم گوت خواردنی ئێمە چییە تا سزای هاوڕێیەك بدەیت لەسەر

زۆر خواردن؟ مەهدی ئامادەی هەموو وانە و مەشقەکانە و بۆ ماوەی مانگێك لێرە میوانە. بەپێکەنینەوە گوتی: هاوڕێ بەشی چوار پێنج کەس سەموون و نیسکێنەی خواردووە و ئەمە یەکەمجاری نییە، ئەبێت خۆی بە جۆرێکی تر رابهێنێت!

پاش ئەوە دوو سێ رۆژ لەسەر یەك مەهدی لە کاتی نانخواردنی نیوەڕۆ دیار نەئەما. کە پرسیم باشە ئەم هاوڕێیە بە قەلافەتیشە چۆن بەبێ خواردن هەڵئەکات و بزانن تا کەی ئەم مانگرتنەی بەردەوام ئەبێت؟ چەند هاوڕێیەکی ئەو خولە بە پێکەنینەوە پێیان گوتم هیچ خەمی مەخۆ، لە کاتی حەوانەوەی نیوەڕۆدا مەهدی لە گوێ رووبار قرژاڵ ئەکوژێت و گۆشتەکەی دەرئەهێنێت و ئەیخوات. یەکەمجار بوو ببیستم کەسێك قرژاڵ بخوات.

هاوڕێ مەهدی کاری خۆی تەواو کرد و گەڕایەوە شوێنی خۆی، دەرکەوت لە رووی داراییەوە وەزعی زۆر باشە، بۆیە پیاوانە پەنجا جووت پێڵاوی تایبەتی نارد بۆ ناوکێلەکان وەك دەربڕینی سوپاس و خۆشەویستی بۆ هاوڕێکانی.

هەر دەربارەی ژیانی ناو بنکەکانی حیزب. ئێمە بە کەمترین و هەرزانترین خواردن و زۆر بە خۆشییەوە ژیانمان ئەبردەسەر. راوەماسیش لە سەر رووباری بەردەممان هەندێ کات سەرچاوەیەکی دیکەی خۆراکمان بوو. راوەماسییەکە لە هاویندا ئاسان بوو بەڵام ئەو راوەماسییەی لە زستاندا ئەکرا جێی سەرسورمان بوو.

بەو سەرما و بەستەڵەکی سەهۆڵە، چەند هاوڕێیەکمان نارنجۆکی دەستکردی خۆمانیان هەڵئەدایە ئاوەکەوە و بە مەلەوانی لەو ئاوە ساردەدا ماسییان ئەگرت و لە گوێ ئاوەکە ئەیانبرژاند. پاڵەوانی ئەم چالاکییە هاوڕێیەکی عەرەبی خوارووی عێراق بوو کە ناوی (جاسم) بوو.

هەرچەندیش باسی ئەو فرنی سەمون و نانە بکەم کە هاوڕێ مستەفا چاوڕەش وەك وەستای (بەنا) دروستی کرد هێشتا کەمە. چونکە ئەو نان وسەمونەی ئەو فرنە بە گەرمی ئەمانخوارد تامێکی یەکجار خۆشی هەبوو، بە تایبەتی لە هاویندا کە بە باینجان و تەماتەی تازە بە تازەی هاوڕێ عەزە رەشەوە ئەمانخوارد.

ژمارەیەك لە هاوڕێیانی هەڵاتوو یاخود ئەوانەی هاتبوون بۆ بارەگـای حیـزب بـۆ کاروباری ڕێکخستن وپێشمەرگایەتی لە بەغدا و شارەکانی دیکەی عێراقـەوە پـەیتا پەیتا ئەگەیشتنە ناوکێڵەکان، هەندێکیان ئەو ئەندامانەی حیزب بوون کـە بـە هـۆی شاڵاوی بەردەوامی بـەعس لەسـەرمان پەیوەنـدییان بـە ڕێکخسـتنەکانی خۆیانـەوە نـەمابوو، چـونکە زوربـەی ڕێکخسـتنەکان لێـدرا بـوون و زۆریـش لـە هاوڕێکـان لـە زیندانەکانی بەعسدا بوون.

ئەم هاتووانە، ژمارەیەکی زۆریان لای ئێمە و هاوڕێیـانی پێشـکەوتووی دیکـەوە نەناسرابوون، بۆیە دەزگاکانی بەعس لە زۆر شـوێنەوە هـەوڵی نـاردنی جاسوسـیان ئەدا بۆ جێگیرکردنیان، هەندێکیش رووخاو بوون و لـە ترسـا هـاتبوون و ئەمانـەش دوو جۆر بوون: بەشـێکیان راسـتییەکانیان پـێ ئەگەیانـدین و هەنـدێکیش هـەبوون خۆیان مەڵاس دابوو بۆ داهاتوویەك کە ڕۆڵێکی دوژمنانەمان بەرامبەر ببینن.

لـەو بارودۆخـە پـڕ گرێیـەدا بـە چـاودێری خـدر سـەید سـەلمان کـە ئەنـدامی سەرکردایەتی بوو و بە (ئەبو جەعفەر) ناو ئەبرا قسەوقسەلۆك و جموجۆڵێکی دوور لـــە پـــەیرەوی حیـــزب و پەیوەنـــدیی هاوڕێیانـــەیان دروســـت کـــرد کـــە گوایـــە سەرکردایەتیی لقی کوردستان پەیوەندی بە پارتی دیموکراتی کوردستانەوە هەیە. چـەند جارێـك مـن و هاوڕێیـانی دیکـەی کـورد و عـەرەب کۆبوونـەوەی گشـتیی ئاشکرامان لەگـەڵ کـردن بـۆ وازهێنـان لـەو بۆچـوونە چـەوتەیان بـەڵام هەنـدێکیان گوێیـان گـران بـوو و بـە هـیچ جۆرێـك رای خۆیـان نەئـەگۆڕی. ئـەبو جەعفـەر کـە بەرپرسـیارێتیی خـۆی هـەبوو لـە ڕێکخسـتنەکانی بەغـدا و ناوەڕاسـتدا ڕۆڵێکـی تێکدەرانەی ئاشکرای هەبوو. هەرچەندە ئەبو جەعفـەر کـورد بـوو و خـەڵکی زاخـۆ بـوو و ژیـانێکی دوور و درێـژی حیزبایـەتی و تێکۆشـانی هـەبوو، بـەڵام هـەموو کردارەکانی جێگای گومانی زۆرمان بوو کە پەیوەندیی بە دەزگاکـانی حکومەتـەوە هـەبێت. لەبـەر ئـەوەی بەیناوبـەینیش ون ئـەبوو، کـە خـۆی ئـەیگوت خـەریکی ڕێکخستنەکانی حیزبم لە بەغدا. لەو کاتانەدا، هاوڕێ ئیبراهیم عەلاوی لە دەرەوەی

وڵات بوو، سەردانی چین و یەمەن و سوریای ئەکرد بۆ پتەو کردنی پەیوەندیی سیاسی و ئینتەرناسیۆنالیزمی حیزب.

ئەو هاوڕێیانە داوایان کرد لە بارەگای ناوکێڵەکان بچنە دەرەوە و لە نزیک گوندەکە و لەسەر رووبار چەند کەپرێکیان دروستکرد. بە ناردنی ئازۆخە و چەك توانیمان پەیوەندییان لەگەڵدا بهێڵینەوە و هەندێکیان رابکێشینەوە، بەڵام ئەو جیابوونەوەیەیان هەتا گەڕانەوەی هاوڕێ ئیبراهیم بەردەوام بوو.

ئەوەی سەرنجی رائەکێشاین ئەوەبوو لەو کاتی هەوڵی کەرتکردنەدا چەند هاوڕێیەکی پێشکەوتوومان لە فوراتی ناوەراست شەهید بوون.

لە دانیشتنێکدا کە من وەك لێپرسراوی پەیوەندییەکانی حیزب لەگەڵ پارتی و شۆڕشدا ئامادەی بووم، کاك مەسعود بارزانی پێی راگەیاندم کە کەسێکی پێشکەوتوتان لە ناودایە، زانیاریی تەواومان هەیە بووە بە پیاوی حکومەت!

کاتێك هاوڕێ ئیبراهیم هاتەوە ئەوەم پێ راگەیاند و لێی پرسیم خۆت رات چییە؟ گوتم بەبێ ئەو زانیارییەی کاك مەسعود خۆم دەمێکە گومانی تەواوم هەیە لەو پیاوە.

یەکێك لە ناکۆکییەکانی ئێمە لە گەڵیدا، ئەوە بوو کە بەو شەڕەشەق و هەوڵدانە زۆرەی بۆ پەیداکردنی چەك ئەماندا، ئەبو جەعفەر بێ هیچ بوونی پلان و نەخشەیەك بڕێکی زۆر لەو چەکانەی ناردە فوراتی ناوەڕاست و لە ئەنجامدا چەند هاوڕێیەکی تێکۆشەر و ئازا و چەکەکانیشمان لە دەست ئەچوو.

لە لایەکی دیکەشەوە، پیلان و شاڵاوی حکومەت بۆ سەرمان بۆ ئەم بارەگایەی ناوکێڵەکان پەرەی سەند و کەوتینە بەردەم مەترسیی زۆری ناردنی خەڵکی گومانلێکراو. بۆیە بڕیارماندا ناوکێڵەکان وەك بنکەیەکی بچووك بهێڵینەوە و لە بارێکی زۆر ناخۆشدا بارەگامان گواستەوە بۆ گوندی گوێزان، کە گوندێك بوو لەسەر رێگە خۆڵەکەی نێوان گەڵاڵە و شێرکاوە و بەرەو بارزان.

لە گوێزان چەند خانوو و گەوڕ و تەویلەیەکمان دەستکەوت، لەگەڵ هەوڵ و تەقەلای زۆردا بۆ پاککردنەوەیان، ژوورەکان هێشتا پڕ بوون لە کێچ و ڕشك و

ئەسپێ و بۆنی ریخ و پاشماوەی تەپاڵە و پاشەڕۆی ئاژەڵانی خانەخوێی ئەو شوێنانە بۆ ئێمەی میوانی تازەیان مابووەوە.

کە چووینە (گوێزان) دوو بەرەکیی ئەو بارەی ناوکێڵەکان چارەسەر کرا.

لە سەروو گوندی (دارلسەلام) و خوار گوندی گوێزان لە ناو ئەو چیایانەدا دەستمان کرد بە دروستکردنی گوندێکی بچکۆلە بۆ خۆمان و بە ماوەیەکی کەم بە کرێکاری و وەستایی و ئەندازیاریی هاوڕێیان بارەگای نوێمان دوور لە هەموو گوندەکان دروستکرد. تەنیا مام ئەحمەدی جووتیار لە سەروو ئێمە کە تەنیا خۆی و خێزانەکەی و تاقە کچەکەی خانوویەکییان لە ناو موڵکی خۆیاندا هەبوو، دراوسێی گوندەکەی ئێمە بوون.

بارەگاکەمان بێجگە لە چەند هۆڵ و ژوورێکی گەورە و بچووك، ژووری چاپخانە و گەرماو و چەند تەوالێتێك و فڕن و جێگای چێشت لێنان و چا لێنانی هەبوو.

زەوییەکی گەورەشمان هەبوو لەسەر هەمان ڕێ و شوێنی ناوکێڵەکان بەڵام زۆر بە فراوانی هاوڕێ عەزە ڕەش کە لێپرسراوی ئیداریی بارەگا بوو، بە هاوکاریی هاوڕێیانی دیکە سەرقاڵی کشتوکاڵی هەمە چەشنە بوو لە هەواری نوێماندا.

باری ژیان و شوێنی ئیسراحەتمان گۆڕرا و کەوتینەوە چالاکیی زۆر و ڕێکخستنەوەی کاروبارمان. بەهۆی ئەوەی لە ڕێگەی گشتییەوە دوور بووین و تەنیا ڕێگایەکی خۆڵ بە سەرووی بارەگای ئێمەوە لە گەڵاڵەوە ئەچوو بۆ بارزان، پۆل پۆل هاوڕێیانی ڕێکخراوەکان پێشوازییان لێ ئەکرا و هەموو وەك کوورەهەنگ لە چالاکیدا گڤەمان ئەهات.

لیژنە محەلییەکانی هەولێر و بادینان و کەرکوك و سلێمانی و خانەقین بە شێوەیەکی دامەزراوتر لە پێشوو کەوتنە جێبەجێ کردنی فەرمانە حیزبی و جەماوەرییەکان. لە هەمان کاتدا هاوڕێیانی ناوچەکانی بەغدا و ناوەڕاست و خوارووی بەغدا پێشکەوتنیان بە خۆوە دی.

بوونی سکرتێری حیزب لە بارەگاکەدا و پێداچوونەوەی ناکۆکیی دروستکراوی ماوەی پێشوو ئێمەی خستەوە بەردەم لێپرسراوێتی زۆرەوە. پاش لێکۆڵینەوەی

ورد و لەسەر بنەڕەتی بەڵگە و شایەت و دانپیانانی چەند ناپاکێك توانیمان ئەو گومانانەی هەمانبووە بخەینە بەر رۆشنایی تەواو. بە گشتی و تایبەتیش بۆ وەڵامدانەوەی هەندێك لە سەرکردەکانی (لیژنەی مەرکەزی) بە پڕوپاگەندەی زۆر و بە قسە و بە نووسین بووبوون بە پارێزەر و فرمێسکڕێژی ئەبو جەعفەر. لێرەدا ئەم راستییەی ئەنووسم: هەر کە یەکێك لە جاسوسە گرنگەکانی حکومەتی بەعسمان گرت، ئەبو جەعفەر خۆی ون کرد و دەرکەوت کە رایکردووەتە لای پارتی و پەنای بۆ بردوون کە بیپارێزن. کاتێك داوامان کرد رادەستمان بکەنەوە کە هەندێك لێکۆڵینەوەمان هەیە لە گەڵیدا و خۆتان بە ئێمەتان گوتووە ئەم پیاوە پەیوەندیی بە حکومەتەوە هەیە، برادەرانی پارتی گوتیان ئەوە راستە، بەڵام پەنای بۆ ئێمە هێناوە و ئێوە ئەتوانن لای ئێمە لێکۆڵینەوەی لەگەڵ بکەن. ئێمە بەوە رازی نەبووین و هۆیەکی سەرەکیشمان ئەوە بوو کە بەو هۆیەوە پاراستن نەچێتە بنج و بناوانی نهێنییەکی زۆری ناو حیزبی ئێمەوە. ماوەیەك دەستبەسەر بوو لای پارتی، ئێمە بە هیچ جۆرێك نە نیازمان هەبوو نە بڕیارمان دابوو دژی ئەبو جەعفەر شتێك بکەین و بگاتە رادەی کوشتنی.

لەو رۆژانەدا لیژنەی مەرکەزی لە گڕوگاڵی گفتوگۆ و چوونە ناو وەزارەت و بەرەی نیشتمانیی بەعسدا بوون، وەك دوایی دەرکەوت ئەبو جەعفەر پەیوەندیی بەوانەوە کردووە لە بەرسیرین بەو شێوەیەی کاك کەریم ئەحمەد لە بیرەوەرییەکانیدا باسی ئەکات، ئیتر بۆ لای ئەوان یا حکومەت بە دزییەوە لە پێشی پیکابێکی گواستنەوەی بەردی مەڕمەڕدا لە رێی گەڵاڵەوە بەرەو خوار هاتبوو و تاقە رێگاش هەر ئەوەبوو کە بە بەر بنکەکەی ئێمەدا ئەڕۆیشت لە ناوکێلەکان. دیبوویان بە جامانەکەی لای دەموچاوی داپۆشیبوو کە ئەو هاوڕێیانە نەیبینن، بەڵام چاویان پێی کەوتبوو وە دوای کەوتبوون و لە گوندی بەرسیرین لە نزیك بنکەی لیژنەی مەرکەزییەوە تەقەیان لێکردبوو. بێ ئەوەی هیچ فەرمانێکیان پێ بێت بۆ ئەو کارە، تەنیا دڵگەرمییان لەوەی ئەو بەینە چەند هاوڕێیەکمان لە

بەغدا و ناوچەکانی حلە و دیوانیە شەهید بووبوون و گومان هەبوو کە ئەبو جەعفەر دەستی هەبێت تیایدا بۆیە کە ئەو جاسوسە گیرا یەکسەر ئەم رایکردە لای پارتی وەك دەسەڵاتداری رەسمی لە ناوچەکەدا.

بەم دوورودرێژییە ئەم باسەم نووسی وەك وەڵامێك بۆ ئەو کەسانەی کە زوربەیان لە سەرکردەکانی لیژنەی مەرکەزی بوون و تا ئێستاش ئەو باسە بە جۆرێکی دیکە بڵاو ئەکەنەوە. ئەمە لە کاتێکدا دەیان هاوڕێیان کە بە دەستی بەعس و دامودەزگاکانیان شەهید کران ئەمەندەی ئەم رووداوە باسیان نەکرد چونکە لە شاییولۆغانی رێککەوتنیاندا بوون لەگەڵ بەعسدا.

هەر بۆ مێژوو: هاوڕێ ئیبراهیم عەلاوی لە هەمووومان زیاتر بە داخ بوو بۆ ئەو کوشتنە بێ بڕیارە، هەتا ساڵی ٢٠٠٣ و کەوتنی سەدام، کاتێك فایلەکانی ئاسایش کەوتە بەردەست و بەداخەوە ئەو گومانەی لەسەر ئەبو جەعفەر هەبوو، راست دەرچوو.

پارتیش وەك دەسەڵات دوو هاوڕێی ئێمەیان گرت و لەجیاتی ئەبو جەعفەر ئیعدامیان کردن و هەر دیسانەوە بۆ مێژوو یەکێکیان ئاگاداری هیچ نەبوو و بووە قوربانیی حوکمێکی سەر پێیی پارتی کە بگوترێت دەسەڵاتیان لە دەست نادەن و ئەم کارەیان بەبێ گوێدانە ئەو هەموو پەیوەندییەی هەمانبوو لەگەڵیاندا ئەنجام دا. سڵاو لە گیانی پاکی هاوڕێ رەشید مەخموری و هاوڕێ حسێن (عەبدولڕەزاق) کە کادرێکی پێشکەوتووی حیزب بوو.

ئەوەی پارتی کردی دوور بوو لە دادپەروەری و دوور بوو لە پەیوەندیی دوو حیزبی هاوکار بە یەکتر، ئەمەندە پەلەیان بوو بۆ ئەوەی دەسەڵاتداری خۆیان رابگەیەنن، بەبێ لێکۆڵینەوە لە گیراوەکان و بە بێ پرسێك لە ئێمە ئەو دوو هاوڕێیەیان کوشت کە یەکێکیان هیچ پەیوەندیی بەو کارەوە نەبوو.

## سەرنجێکی سەرە ڕێ.. لە کاروانی بەردەوام

هەموو کات من باوەڕم وابووە کە پەیوەندیی شەخسی و سیاسی لەگەڵ خەڵکدا یاخود بە مانای فراوانتر لەگەڵ جەماوەردا بەشێکی گرنگە لە ژیان و ڕۆڵی گەورەشی هەیە بۆ ڕێڕەوی سیاسیی ئەو کەسە. مرۆڤی گۆشەگیر و دوور لە جەماوەر، دوور لە برادەرانی خوێندن یاخود ئیشوکار ناتوانێت خزمەتی دیار و پێشکەوتووی هەبێت بۆ حیزبەکەی و بۆ گەلەکەشی بە گشتی. هەر وەك ئەزموونی خۆم یەکێك لە سیفەتە چاکەکانی ئەندام یا کادر ئەوەیە خۆی دەستپێشکەر بێت بۆ ئەو جۆرە پەیوەندییانە نەك بە فەرمانی لێپرسراو یا حیزبەکەی. ئەگەر تاکەکەس ئەو سیفەتانەی لە سروشتیدا یا سەرەتای پەروەردە بوونی لە تەمەنی منالییدا تێدا نەبێت، کە کەوتە بەردەم ئەو جۆرە ژیانە یاخود پەیوەندییە سیاسییە، ئەرکێکی هەرە پێویستی سەرشانێتی هەوڵبدات بەرەو گۆڕان، گۆڕانی کۆمەلایەتیی خۆی لە ڕێگای پەیوەندیکردنی فراوانەوە بە خەڵك و ڕێکخراوە جیاجیا کۆمەلایەتی و ڕۆشنبیرییەکان، ببێت بە هاوڕێی بەردەوامی (کتێب) کە بێجگە لەم سیفەتەی باسی ئەکەم، خۆی بە شێوەیەکی گشتی بنیاد بنێت لە گشت ڕوویەکەوە. وەك لە ژیانماندا ئەبینین، کەسانێك هەن گەیشتوونەتە پایە و پلەی بەرزی سەرکردایەتیی جیاوازی فەرمانڕەوایی، حیزبی، حکومەتی.. بە چەند پێوانەیەك هەڵیانئەسەنگێنین: ئایا شایستەی ئەو شوێنەن یا نا؟ بەڵێ فلان کە ڕۆشنبیرە و سوودی لە ئەزموونی خۆی و خەڵك بینیوە لە ڕووی پەیوەندیی کۆمەلایەتییەوە، هەر لە بەتەنگ خەڵك هاتنەوە لە خۆشی و ناخۆشیدا کە بووەتە هۆی ئەوەی خەڵك خۆشی بوێت و شتی لێوە فێر ببێت، هەر لە زانیارییەکانییەوە هەتا ئەگاتە بێفیزی و دەستپاکی و دەم و زمان پاکیی بەرامبەر هاوڕێ و دراوسێ و کارمەندانی و دەورووپشتی و سەروو خۆی و خوارووی خۆی.

من لەم تەمەنە درێژەدا هەموو جۆرەکانم دیوە و یەکە یەکە ئەزانم و ئێوەی خوێنەری ئەم چەند دێڕە ڕاستی و دروستیی ئەم قسانە لێك بدەنەوە. هەیە گەیشتووەتە ئەو پلە بەرزە کەچی چوار برادەری شەخسیی خۆی نییە، نە لە

شەكراو و نە لە تەعزێی دراوسێ و ناسیاوەكانیدا نایبینیت، لە شەش وشەدا سێ چوارێكی زەم و تانووتە لە هەموو كەس، ئەوەی باری ئابووریشی باشە لەم جۆرە كەسانەدا، بە هیچ رادەیەك هاوكاری كەس نین. ئەم جۆرە كەسانە نابنە پێشڕەو یا سەركردەی لێهاتوو، یاخود تەنیا ئەندامی بە كەڵك لە ناو كۆمەڵدا.

پێچەوانەكانی ئەمانەش بێگومان جۆرەكەی تر ئەبن، خاوەن چاكە و لە پێشكەوتن و سەركەوتندا ئەبن و برادەر و هاووڵاتی و گەل و نیشتمان كەڵكیان لێ وەرئەگرن.

هەندێك هاوڕێم لە حیزبدا دیوە و ئەیبینین ئەمەندە وشك و گۆشەگیر بوون نەیانتوانی و ناتوانن چەند ئەندامێك بەرەوپێش پەروەردە بكەن و خۆیشیان لە قاوغێكی زۆر سنووورداردا مانەوە و نەبوونە ئەو پێشڕەوەی كە بە هۆی پلەی حیزبی و تەمەنی درێژیشیان لە ناو ریزەكانی حیزبدا لێیان چاوەڕوان ئەكرا. من باوەڕی تەواوم بەو پەیوەندییە فراوانە هەبوو كە باسی ئەكەم، لە قۆناغەكانی خوێندنی ناوەندی و دوا ناوەندی و زانكۆشدا دەیان هاورێی نزیكم هەبوون و سەدان دۆست و ناسیاوی رۆژانەی ترم هەبوو.. ئێستاش كە لە ژیانێكی كار و ئابووری و دارایی و سیاسیشدا ئەژیم ئەو پەیوەندییانەم دەیان ئەوەندەیە.

## چاپ و چاپخانە و یەكەم بینینی مام جەلال

پەیوەندیی من بە مام جەلالەوە هەر لە یەكەم بینین و دانیشتندا كە لە ساڵی ١٩٦٨دا بوو، ئاسۆیەكی كراوە و جوانی پێوە دیار بوو. كەسێكی خوێندەوار و ئەدەب دۆست بەڵكو ئەدیب و نووسەرێكی هەڵكەوتوو، سیاسییەكی خاكی و بێ فیز.

مام جەلال بووبووە هاوڕێی نزیكی كەسایەتیی فیكری و سیاسیی كۆمەڵە تێكۆشەرێكی ئێرانی كە لە ژێر ناوی رێكخستنێكی ماركسیی لینینیدا و باوەڕبوون بە هێڵی فیكری و سیاسیی ماو تسیتۆنگدا كاریان ئەكرد.

بەهۆی مام جەلالەوە منیش بوومە دۆستی ئەم هاورێیانە و رێكخستنەكەیان: سازمانی ئینقیلابیی تودەی ئێران كە دكتۆر جەلال و دكتۆر ئیبراهیم و ئیسماعیل

لە سەرکردە سەرەکییەکانیان بوون. دکتۆر جەلال کە پزیشك بوو ناوی کورش لاشایی بوو. رۆژنامەکەیان ناوی (ستارەی سورخ) بوو، رادەی تێگەیشتن و پلەی بەرزی تێگەیشتنی بیر و باوەڕی مارکسیزم — لینینیزمی پێوە دیار بوو.

هەرچەندە ئەنجامی ناخۆش لە ژیانی هەندێك لەم تێکۆشەرە ئازایانە روویدا بەلاّم پێوانەی سەرکەوتن یاخود هاتنە سەر حوکم تەنیا پێوانە نییە بۆ هەڵسەنگاندنێکی پڕ ویژدانی هەر بزووتنەوەیەك، بەڵکو رۆڵیان لەو ماوە و سالاّنی کارکردنیان لە بەرەوپێشبردنی رادەی هۆشیاری و رووناکبیریی چینایەتی و میللیدا چۆن و چەند بووە، پێوانەیەکی ریالیستیی راست و رەوانە. چەند توانیویانە لەو قۆناغەدا رێکخستن و رێکخراوەکانیان بەرەوپێشەوە ببەن و رۆڵی مێژووییان تیایدا دیار و ئاشکرا بێت و خزمەتی کاروانی خەباتی گەلەکەیان کردبێت.

فەهد خۆی و سەرکردایەتییەکەی وەك دامەزرێنەر و بزووتنەوەی فیکری و کارکردن لە جوولاّنەوەی چینایەتی و نیشتمانی لە هەموو مێژووی عێراقدا بەجیاواز لە هەموو کەس و کەسان و تاقمێکی سەرکردایەتیی هەموو عێراق جێگای بەرزی خۆی گرت لە سەراپای مێژووی عێراق و جولاّنەوەی شیوعیی ناوچەکە و جیهاندا.

❊ ❊ ❊

بۆ یەکەمجار کۆبوونەوەی من بە رەسمی لەگەڵ ئەو هاوڕێیانەدا وەك نوێنەری حیزبی شیوعیی عێراق — قیادەی مەرکەزی لە کەرکوك لە ماڵی هاوڕێی شەهیدمان پارێزەر فەتحوڵلا عیزەت بوو کە چەند شەو و رۆژێکی خایاند. ماڵی فەتحوڵلا لە ئیمام قاسم بوو، خانووەکەیان دوو دەرگای هەبوو هەر دەرگایەکی لەسەر کۆلاّنێکی جیاوازدا بوو. هاوڕێیانی سازمانی ئینقیلابی دکتۆر جەلال و دکتۆر ئیبراهیم و ئیسماعیل بوون.

لەو دانیشتنەدا بە درێژی باسمان لە پەیوەندیی هەردوو حیزب و جولاّنەوەی شیوعی لە عێراق و ئێراندا کرد.

بیروڕای هەردوولامان زۆر نزیك بوو لەبارەی مەترسیی گەورەی ریڤیژنیزمی جیهانی بۆ سەر بزووتنەوەی شیوعی و سۆشیالیزمی جیهان و نەهێشتنی

سەربەخۆیی حیزب و ڕێکخراوە شیوعییەکان لە جیهاندا و بەستنەوەی بە ناوەندەوە کە حیزبی شیوعیی سۆڤێت بوو، کە ئەم جۆرە پەیوەندییەی (ح.ش.ع) ویستیان و حیزبەکانی بووبوون بە پاشکۆی دووربوون لە پەیڕەوە (مارکسی – لینینی)یەکانەوە و لە بواری جێبەجێ کردنی ئەو ئامۆژگاری و فەرمانانەی لە ناوەندەوە دەرئەچوو گەورەترین زیانی بە ڕێڕەوی بزووتنەوەی شیوعیی جیهان گەیاند و دیارترینیان داڕووخانی ڕژێمەکانی خۆرهەڵاتی ئەورووپا بوون بە یەکێتیی سۆڤێت خۆیشییەوە.

هەروەها کاریگەرێتیی ئەو ڕێبازە چەوتە لە لای ئێمەش لە کۆتاییدا وەك ئەنجامی حیزبی شیوعیی عێراق و حیزبی تودەی ئێران خۆی نواند.

سازمانی ئینقلابی زۆر دۆستی مام جەلال بوون زۆریش خۆشیان ئەویست و سوپاسیان ئەکرد بۆ ئەو هەموو هەرەوەز و هاوکارییانەی ئەیکردن. باسمان لە چاپ و چاپەمەنییەکانی خۆمان کرد، ئەوان دەزگای چاپی چاکیان هەبوو دەرهەق بەو زەمانە.

وەك بۆم دەرکەوت ئەو هاوڕێیانە و پاش ئەو کۆبوونەوەیەی کەرکوك پێخۆشحاڵبوونی خۆیان بۆ مام جەلال دەربڕیبوو بەو ناسینە هەروەها پێکەوە باسی چاپخانەیەکیان کردبوو بۆ ئێمە.

## دەزگای چاپ و چاپخانە

تێکۆشانی ئێمە لە ریزەکانی قیادەی مەرکەزیدا بە گێروگرفت و کەندوکۆسپ و نەبوونی و ناکۆکیی هەمە جۆرەی زۆردا تێپەڕی. لەگەڵ ئەو کوشتن و بڕینەی بەسەر سەرکردایەتیی حیزبدا هات بە تایبەتیی لە بەغدا و لە دوای کودەتا خوێناوییەکەی دووهەمی بەعسەوە لە ساڵی ١٩٦٨دا، شاڵاوی بەعس هەموو دامودەزگاکانی چاپخانە و ڕاگەیاندنەکانیشی گرتەوە.

لە کوردستانیشدا تەنیا چەند ئامێرێکی ڕۆنیۆ هەبوو کە ئەوانیش لە گێرەوکێشەکاندا لەگەڵ موسڵیح مستەفا بەر تێکچوون و لەناوبردن کەوتن بە

جۆرێك ئەو کاتەی بەیاننامەی دەرکردنی موسڵیحمان دەرکرد لە سلێمانی بە ئامێرێکی دەستکرد چاپمان کرد. ئامێرەکە! بریتی بوو لە چوارچێوەیەکی تەختە و پارچەیەك قوماشی کریشەی پێوە قایم ئەکرا کە تۆزێك لە پەڕەی نووسینی A4 گەورەتر بوو، لەسەر کاغەزی ستێنسڵ نووسینەکەمان ئەنووسی و ستێنسڵەکەمان ئەنووساند بە چوارچێوەکەوە، مەرەکەبەکەمان ئەڕشت بە سەریدا و بە رۆڵەیەکی بە قەدەر پانایی دەزگاکەمان پێماندا ئەهێنا و لاپەرەیەك چاپ ئەکرا و بەو جۆرە لاپەڕە لەدوای لاپەڕە.

چەند ژمارەیەکی رێگای کوردستان بەو جۆرە چاپکرا. یاریدەدەری من لەو کارانەدا هاوڕێیان حامید شێخ حەمە نوری و مەلا عەزیز و عەلی کەریم بوون. دوای ئەوە چەند رۆنیۆیەکمان پەیدا کرد و کارمان بە چوارچێوەکە نەما!

## چاپ وچاپخانەی نوێ

لە یەکەم دیدارم لەگەڵ مام جەلالدا پاش ئەو کۆبوونەوەیەی من و برادەرانی سازمانی ئینقیلابی، مام جەلال گوتی: دەزگایەکی چاپی جۆری کۆنمان هەیە پێم خۆشە بە دیاری بتاندەمێ. بێگومان سوپاسیم کرد.

چیرۆکی ئەو چاپخانەیە و وەرگرتنی و گەیاندنی بۆ بارەگای حیزب ئەوە ئەهێنێت بە شێوەیەکی درێژ تۆماری بکەم.

بۆ ڕاپەڕاندنی ئەو کارە سەردانێکی نهێنیم کرد بۆ سلێمانی. وەك چەند جاری تر شەو گەیشتمە سەرچنار و لە دەرگای پشتەوەی ماڵی هاوڕێم سەردار مستەفاوە خۆم کرد بە ماڵدا. سەردار ئەندامی حیزبمان بوو و زۆر بە دڵسۆزی کاری ئەکرد و بۆ منیش کە لە پۆلی یەکەمی سەرەتاییەوە لە قوتابخانەی فەیسەڵییە برادەربووین، خۆی و خێزانەکەی، ئەڵوەن خانی خوشکی بەرزم زۆر خزمەتیان ئەکردم بێ هیچ ترسێك لەکاتێکدا کە ئەیانزانی من فەرمانی گرتنم لەسەرە و حوکمی ئیعدامی غیابییشم لەولاوە بوەستێت.

هەموو قۆناغەکانی خوێندن من و سەردار پێکەوە بووین هەتا دەرچوونمان لە کۆلێجی بازرگانی و ئابووریی بەغدا. سەردار لە دوای شۆرشی تەموزی ١٩٥٨ەوە بووە ئەندامی حیزبی شیوعیی عێراق.

شەو باسی چاپخانەیەکم کرد کە ئەبێت وەریبگرم و لە ماڵێکدا بۆ چەند رۆژێك خەریکی پێچانەوەیەکی گونجاو بین کە بە باری ئێستر بیگوێزمەوە بۆ دەرەوە. سەردار گوتی باشترین شوێن ماڵی دایکمە لە گەڕەکی عەقاری.

ئایشە خانی دایکی و نەسرین خانی خوشکی پێکەوە ئەژیان و پاش ئەوەی نەسرین خانمان تێگەیاند، شەوێك ئوتومبیلەکەی سەردارم وەرگرت کە ئۆپڵێکی تازە بوو، بێ ئەوەی بزانێت ئەو چاپخانەیە لە کوێوە ئەهێنم، لە ماڵی دایکی چاوەڕێی ئەکردم.

چاپخانەکە لە ماڵی کۆچکردووی خۆشەویستمان کاکە حەمە چاوشین بوو: بریتی بوو لە دەزگایەکی قورسی چاپ و دوو قاڵبی گەورە کە ئەوەی بیرم بێت هەریەکەیان ٦٠ × ٨٠ سانتیمەترێك ئەبوون، هەر تەبەقەی زیاتر لە سەد خانەی پچووکی تێدا دروستکرابوو، پیتەکانی تێدا جیاکرابووەوە زوربەی پیتەکانی سێ جۆری هەبوو: بۆ نموونە پیتی ب: (بـ ، ـبـ ، ب) بێی سەرەتا و ناوەڕاست و کۆتایی وشە. بە خۆم و کاکە حەمە و کاك تەهای برای پارچە پارچەی ئەو چاپخانەیەمان خستە سنووقی دواوە و سەر کوشنی دواوەی ئۆپڵەکەی سەردارەوە و لێم خوڕی بۆ ماڵی سەردار.

حەمە چاوشین لە قۆناغی ناوەندیدا شیوعی بوو و لەو کاتەوە ئەمناسی و دواییش تا کۆچی دوایی کرد هاوڕێیەکی خۆشەویستم بوو، پاش ماوەیەك چووە ریزەکانی پارتی و ئینجا یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانەوە.

چاپخانەمان لە ماڵی نەسرین خانی مستەفا مەزهەر داگرت. ئەویش و سەرداریش زۆر هاوکارییان کردم هەر لە داگرتنەوە و لە پاشدا پیتەکانمان لە قاڵب و خانەکاندا دەرهێنا و کیسەی قوماشمان بۆ دروست کرد و هەر جۆرێکمان ئەخستە کیسەیەکەوە.

پاش چەند رۆژێك خۆم و هاوڕێ ئەحمەدی حەمە ساڵح کە ئەندامی لیژنەی

کرێکارانی حیزب بوو و ساڵانی دوایش گەیشتە لیژنەی شاری سلێمانی بە ئوتومبیلێکی فۆکسوڵی کۆن کە هاوڕێ ئەحمەد لێی ئەخوڕی ئەم چاپخانەیەمان گەیاندە دەرەوەی شار. لەوێدا لەگەڵ هاوڕێ جەمالی عەلی فایز و هاوڕێیەکی پێشمەرگەی دیکەی خۆمان نامانە سەر پشتی ئەو دوو ئێسترەی ئامادە کرابوون. بە پێ ڕێگامان گرتە بەر بە پێنج شەو و پێنج ڕۆژ بەو شاخانەدا گەیاندمانە بارەگای حیزب لە گوندی گوێزان.

* * *

گەیشتنی چاپخانەکە شادمانییەکی خستە ناو هاوڕێیانەوە لە بارەگامان لە گوندی گوێزان. دەستبەجێ دەستمان کرد بە ئامادە کردنی شوێنێکی کاتی بۆ دەستبەکاربوون و فێرکردنی چەند هاوڕێیەك وەك کرێکاری چاپخانە بۆ چنینی پیت و کردنی بە وشە و جێگیرکردنی لەسەر ئەو قاڵبە ئاسنانە بۆ چاپکردنی لاپەڕە لە دوای لاپەڕە. ئەڵێم شوێنێك بە (کاتی) چونکە لە هەمان کاتدا هاوڕێیان خەریکی بیناکردنی بارەگاکە بوون لە کانی سپیندار نزیك گوندی گوێزان.

## کۆنفرانسەکانی ئەو ساڵانەی حیزب

کۆنفرانسی ڕێکخراوی پارێزگای سلێمانی

پاش دەرکردنی موسڵیح لە حیزب و وەك ئەرکێکی ئاسایی بۆ پەرەپێدانی ڕێکخستنەکانی حیزب، بڕیارماندا کۆنفرانسێك بۆ ڕێکخراوی سلێمانی بگرین.

لە مانگی تشرینی یەکەمی ١٩٧٠دا لە ناو گردەکانی توونی بابای دیوی دەریاچەی دەربەندیخان نزیك ئاوەکە شەوێك و دوو ڕۆژ کۆنفرانسمان بەست، تیایدا نەخشەی داهاتووی لیژنەی محەلیی سلێمانی و فراوانکردن و بەرەوپێشبردنی حیزبمان لە پارێزگای سلێمانیدا داڕشت. باسی زۆر لە یەکگرتوویی حیزب و گرنگیدان بە پەرەپێدانی فیکریی شانە و لیژنەکان بە گشتی و هێڵی شۆڕشگێڕیی حیزب لە کوردستان و عێراقدا کرا.

کۆنفرانسەکە بە سەرپەرشتیاریی من وەك لێپرسراوی لقی کوردستان و شێخ

عەلی بەرزنجی ئەندامی لق بـەڕێوە چـوو. ڕەنگـە لەبـەر ئـەوەی نووسـینەوەی ئـەم بیرەوەرییانــە پــاش تێپــەڕبوونی دەیــان ســاڵە و تــەنیا پشتبەســتنم بــە یادەوەرییەکانە، هەندێ لایەن و بەشێك لە ناوەکانم لە یاد نەبێت.

هەندێك لە ئامادە بووان بریتی بـوون لـە هاوڕێیـان: حامیـد شـێخ حەمـە نـوری، حەمە غەریب ڕەشید، ئەحمەد حەمە ساڵح، شـێخ محێـدین، مـەلا عـەزیز، ئـەکرەم محەمەد ئەمین (ئـەکرەمی حەپسـە)، مـەلا ڕەوف، فـاتیح، مامۆسـتا زاهـیر، حەمـە کەریم، یاسین حەمە فەرەج بانیبی، ئەحمەد حاجی عەلی، عەلـە ڕەش، دەروێـش و حەمە ئەمین ڕەشید (بەرید).

لە کۆتاییدا لیژنەیەکی محەلیی نوێ هەڵبژێردرا کە بریتی بوون لـە حامیـد شـێخ محەمەد نوری و حەمە غەریب ڕەشید و شێخ باقیر بەرزنجی چەند هاوڕێیەکی تر. لەوەبەدوا کاروباری ڕێکخستن لە پارێزگای سلێمانیدا زۆر بەرەو پێشکەوتن ئەڕۆیشت.

## دیمەنێکی لەیادنەچووی یاداشتی چەند ساڵە..

من لە کاتی خۆیدا وەسفێکی ئەو بیرەوەرییەم کردبوو وە بە ناوی (زەریـا)وە و لە گۆڤارێکیشدا بڵاوم کردبووەوە. هەر بەو یـادەوە بـەو شـێوە ئەدەبییـە تۆمـاری ئەکەمەوە لەگەڵ هەندێك گۆڕینی ناوەکاندا بۆ ناوی ڕاستەقینەی خاوەنەکانیان.

لە بارەگای سەرکردایەتیی حیـزب بـووین، هـەواڵێکمان پێگەیشـت کـە موسـڵیح مستەفای هەڕەشەی زۆر ئەنێرێت بۆ چەند برادەرێکمان. ئەوەی نـاوی هـەبوو لـەو هەڕەشـانەدا نـاوی مـن و فــەتحوڵڵا عیــزەت بـوو. مـن دوور بـووم لــە توانــای دەستگەیشتنی ئەو، کە ئەو کاتـە لـە دەزگـای هەیئـەی فاشسـتی بەعسـدا بـوو لـە کەرکوك، بەڵام هاوڕێ فەتحوڵڵا عیزەت پارێزەرێکی ناسراو بوو لە شاری کـەرکوك، لە هەمان کاتدا بە نهێنی لێپرسراوی لیژنـەی محـەلیی حیزبمـان بـوو لـە کـەرکوك و ئەندامی لقی کوردستان بوو. لەگەڵ بیستنی ئەو هەواڵـەدا بـە باشـم زانـی خـۆم بـە پەلـە بگەیەنمـە سـلێمانی و بنێـرم بـە دوای هـاوڕێ فـەتحوڵڵادا. بـەیانی زوو لـە

بارەگای حیزبەوە لە کانی سپینداری نزیك گوندی گوێزان لەگەڵ هاوڕێ ئەکرەم حەمە ئەمین (شەهید ئەکرەمی حەپسە)دا بەڕێکەوتین و بەرەو گەلاڵە و ئینجا بۆ گوندی وەرتێ، لەو ڕۆژە سارد و سەرمایەدا کە بەفر ئەباری و تۆزە تۆزە ڕەشایی بە شاخەکان و ڕێگاکانیشمانەوە نەئەهێشت و ئەبووە تابلۆیەکی گەورەی سپی، پاش چوار سەعاتێك یا کەمێك زیاتر بەپێ ڕۆیشتن نزیك نیوەڕۆ لە ماڵی کوێخا عەبدوڵڵا موختاری وەرتێ لامان دا.

چوار سەعات بە ڕێدا ڕۆیشتبووین، لەنزیك ئەو گوندە گەیشتین بە چەند برادەرێك و هەندێك پێکەوە راوەستاین. ئێمە ڕێگای زینۆی ئەستێرەکانمان لە بەرە و ئەوان بەوێدا هاتوون. هەر کە من و ئەکرەمی برادەرمیان دی بەرەو ئەو ڕێیە ئەڕۆین، پێش هەواڵ پرسینی خۆمان و ئەو برادەرانەی لەلایانەوە هاتووین و ئەوانەی ئەچین بۆ دیدەنییان، یەکسەر بە سەرسووڕمانێکەوە ڕوویان تێ کردین و هەر چواریان ویستیان پێکەوە هەمان پرسیار بکەن، هاوڕێ تاریق حاجی سەعید گوتی: "ئەوە بەم بەفرە بۆ کوێ ئەچن؟! بەم پاشنیوەڕۆ درەنگە؟! قەت ناهێڵین بەرەو زینۆ و پڵنگان بڕۆن چونکە مردن نەبێت نە هیچی تر ئەبینن و نە ئەگەنە کەس، با بگەڕێینەوە بۆ ئەم گوندە نزیکە و ئەمشەو لەوێ بن هەتا سبەینێ بزانن چۆن ئەبێت."

ڕۆژەکە ڕۆژێکی زستانی زۆر تووش بوو. بەفر کڵۆ کڵۆ ئەهاتە خوارەوە، دەمێ ساڵ بوو سەرمای وامان نەدیبوو، بەفرەکە بە جۆرێك دای ئەکرد کە ئەو دۆڵ و چیا گەردن کەش و بڵندانەیان وا سپی کردبوو کە هیچی دیکەت نە ئەدی. ئەو چیا بەرز و سەختانەی ئەو ناوچەیە، ڕووبەرێکی گەورەی دارستان قەدپاڵ و لوتکەیانی داپۆشیوە، کەچی نە ئەو دارستانە چڕە و نە دەیان دۆڵی گەورە گەورەی نێوانیان لەبەر بەفر خاڵێکی ڕەشییان پێوە دیار نەمابوو، و زوربەی دۆڵەکان بە هەرەسی بەفر پڕ بووبوونەوە.

گوێمان نەدایە قسەی برادەرەکانمان. ملی ڕێگامان گرتە بەر و بە هیوای ئەوەی سوود لە جێ پێی ئەوان وەربگرین لە هاتنە خوارەوەیان دا، بەرەو ژوور بووینەوە.

بەفرەکە بەرە بەرە زیادی ئەکرد و هەتا سەریش ئەکەوتین هـەوای سـارد زیـاتر سـەری لـووت ودەموچـاومانی ئەتەزانـد، جامانـەکانمان کـرد بـە لەچـك و هـەر بەرەوژوور ئەبووینەوە.

ئەکرەم گوتی: من لە هەموو ژیانمدا لـە هـیچ نەترسـاوم، بـەلام زۆر لـەم بـەفرە ئەترسم. ترسی ئەوەشم زۆرە ڕێگا ون بکەین، باوەڕیشم نییە بەم عەسـرە درەنگـە کەسی تر هەبێت بەم ڕێگە سامناکەدا بڕوات.

من نەك بلێم لە ئەکرەم ئازاتر یا شارەزاتر بووبم، بەلام من خۆم ئەمزانی بۆچـی بەو ڕۆژە ناخۆشە ئەبێ ئەو ڕێگایە ببڕین. بۆیە بـە پێکـەنینێکی دروسـت کـراوەوە پێم گوت: کاکە برا من و تۆ هەر هیچ نەبێت دەیـان جـار بـەم ڕێیـەدا هاتووچـۆمان کـردووە و شـارەزای دار و بـەردی ئـەم شـاخانەین، ئـەی هـەموو جارێـك نـالێین چاویشـمان ببەسـتنەوە و بـەڕەڵلای ئـەو ڕێگایـەمان بکـەن ون نـابین؟ ئەمـەم لـە کاتێکدا گوت کە ئیتر بەرە بەرە جێ پێی برادەرەکانمان لەژێر بەفری تـازەتردا ون ئـەبوون و نەئەدۆزرانـەوە. بـەفری زۆر پـەیتا پـەیتا هـەموو جـێ پـێ و ڕێچـکە و ڕێگاکانی بێ شوێنەوار کردبوو.

ناخۆشتر لە سەرما و ترسی ڕێ ون کردن، ئەو تەمـە زۆرە بـوو کـە وای کردبـوو چەند مەترێك زیاتر لە بەردەم خۆمانەوە نەبینین.

هەرچەند هەنگاوێکیش ئەڕۆیشتین قاچمان بـە نـاو قـوولایی ئـەو بـەفرە زۆرەدا ڕۆئەچوون تاکێك لەو پێلاوە لاستیکە بێ ناوکەف و بێ بـەرگی ناوەوەیـەمان لـەناو بەفرەکـەدا لـە پـێ دا ئەکـەنرا و ناچـار ئـەبووین ئـەژنۆ دادەیـن و قـۆڵ درێژبکـەین بـۆ دەرهێنانـەوەی و لـەپێ کردنـەوەی بـۆ چـەند هـەنگاوێکی تـر. لـەو کاتانەشـدا کـە دانەئەکەنران پڕ ئەبوون لە بەفر و تۆزە تۆزە بە هۆی جوولانی پێوە بەفرەکە لـە ناویـا ئەتوایەوە و ئەبووە بەفراوێکی سارد و سەری پەنجـەکانی ئەتـەزان، هـەتا بـەرە بـەرە گەرمیی قاچ بەفراوەکەی لە ناو پێلاوە لاستیکەکەدا شـیلەتێن ئـەکرد و ئەگـەر بـەفری تازە خۆی نەکردایەوە بەناویا، کەمێك لە ناخۆشی ڕێگاکە بەو گەرمابیە کەم ئەبووەوە.

هەرچۆنێك بوو بەسەر سەختی و بەرزیی ڕێگاکەدا زاڵ بووین و نزیك لووتکەی (زینۆ) بووینەوە. لام وابێت هەر سەد مەترێکمان مابوو بگەینە سەرەوە کە لەبەر دەممانەوە شتێك ڕەشی ئەکردەوە، هەر یەکەمان گومانی شتێکی لێ ئەکرد، بەپەلە و بێدەنگی گەیشتینە سەری، تەماشا ئەکەین لاوێکە ڕاست لەسەر پشت کەوتووە، شەرواڵێك و کراسێك و قەمسەڵەیەکی لەبەردایە و ئەویش سەرمای ئەودیوی شاخەکەی کە پێیدا هاتبوو جامانەکەی پێ کردبووە لەچك، دەستی ڕاستی خستبووە سەر دڵی و هەناسەی لێ بڕا بوو. هەر چەند جوڵانماند بێ سوود بوو. دیاربوو ماندوویی زۆر و سەرما لەو دیوەوە تەنگیان پێ هەڵچنیوە و کە گەیشتۆتە سەر لووتکەی زینۆش (زینۆی ئەستێرەکان) ئەو با توندە هەمیشەییەی لەوێدا هەیە داوێتی لە گیانی ئارەق کردووی و ڕەقی کردووەتەوە و لەگەڵ ئازاری دڵیدا دوا هەناسەی لەسەر ئەو چیا مەزنە دابوو.

ئەکرەم بە چاوێکی پڕ لە بەزەییەوە سەیری ئەکرد و سەری بۆ من هەڵبڕی و لە چاویدا دیار بوو پرسیار لە من ئەکات کە چی بکەین؟ منیش بەو هەستەی ئەوەوە دوا تەماشای ئەو بەستەزمانەم کرد کە گیانی سپاردبوو، بە ناچاری بەجێمان هێشت و بە ئەکرەمم گوت بەڵکو ئیتر پێ هەڵگرین چونکە وا شەو داهات و ڕێگەی دوو سەعات زیاترمان لەبەردەمدا ماوە بۆ گەیشتن بە گوندی پڵنگان.

شەو داهات بەڵام دنیا هەمووی سپی ئەکردەوە، قسەوباسی ئەم بەشەی لای ڕێگاشمان زوربەی هەر باسی ئەو کوڕە بوو کە ڕەق بووبووەوە. نزیك پڵنگان بووینەوە سەگوەڕ بەرەو پیرمان هات، خۆمان گەیاندە ناو دێ و بانگمان لە کاکەوڕەحمانی خانەخوێی هاوین و زستانی ئەو گوندەمان کرد و بە رووخۆشی و قسە خۆشەکانییەوە کردینی بە ژووردا و لەبەر ئەو زۆپا گەورەی دارەدا دانیشتین کە هەموو لایەکی وەك پشکۆی ئاگر سوور هەڵگەڕابوو، دەستمان کرد بە خۆ گەرم کردنەوە و جلوبەرگ وشك کردنەوە و ئەوسا بەدەم خواردنی لەپە ساوەرە بەتامولەزەتەکەوە باسی ڕێگامان بۆ کاکەوڕەحمان ئەکرد. پێش ئێمە ئەو هەواڵی

زەلامێکی لەو حاڵە و لەو ڕەنگەی لێ پرسین کە ئێمە یەکەم دوو کەس بووین بە مردوویی دیبوومان.

گوتی: زۆرم هەوڵ لەگەڵ دا کە نەڕوات کەچی ئەیوت خاڵە پیاو پیاو بێت چۆن لە بەفر ئەترسێت. کە بە کاکەوڕەحمانمان گوت ئەو کوڕەی تۆ ئەڵێیت بەمردوویی لەودیو لووتکەی چیاکەوە بینیومانە، قاقا دەستی کرد بە پێکەنین. پێکەنینێکی بە کوڵ و سەیر. دیارە قسەی هاتبووە دی کە بەو جوانەمەرگەی گوتبوو ڕەق ئەبیتەوە و ناگەیتە جێ و ئەو بە قسەی نەکردبوو!

منیش بە ئەکرەمم گوت: تۆ بڵێی ئەو برادەرانەی هەوڵیان لەگەڵ ئێمەش دا کە بەم رۆژە ئەم ڕێگایە نەگرینە بەر با ڕەق نەبینەوە بە مردنمان قاقای وەك کاکەوڕەحمانیان لێ بدایە؟

❊ ❊ ❊

ڕۆژی دوایی بەیانی زوو لە پڵنگانەوە بەرەو گوندی (کانی ماران) بەناو بەفردا چوار سەعاتێك ڕێگامان بڕی و پاش ئەوە پچڕ پچڕ شەش حەوت سەعاتێکی تر ڕێگەمان بەرەو سلێمانی بڕی.

شەو گەیشتینە نزیك شار و بە ڕێگای دوور لە بازگەکاندا خۆمان کرد بە شاردا. بۆ سبەینێ زوو هاوڕێکەم نارد بۆ کەرکوك، بۆ لای شەهید فەتحوڵلا عیزەت و ئەویش بەپەلە هات بۆ سلێمانی.

پێم گوت هەواڵێکمان پێ گەیشتووە کە موسڵیح مستەفا هەڕەشەیەکی وەهای کردووە، لەبەر ئەوە خۆم هاتمە ناو شارەوە، پێویستە لێرە بمێنیتەوە و نەگەڕێیتەوە بۆ کەرکوك.

گوتی من فەرمانەکەتان بەجێ ئەهێنم بەڵام با چەند ڕۆژێکی پێ بچێت ئەچمەوە کەرکوك و دەعوای زۆری دادگاکانم لەلایە کە زوربەیان خەڵکی هەژارن، پاکتاوی کارەکان ئەکەم و بە یەکجاری دێمە شاخ یا هەر شوێنێك حیزب بڕیاری ئەدات.

فەتحوڵڵا لە خێزانێکی دەوڵەمەندی خاوەن موڵکی زۆر و گەورە بوو بە هیچ جۆرێك بیری لە پارە و ژیانی پڕ لە خۆشی و دەوڵەمەندی نەئەکردەوە. ئەندامی حیزب بوو لە پێش شۆرشی ١٤ی تەموزی ١٩٥٨ەوە. هەموو ژیانی لە قوتابێتیی کەرکوك و ئینجا لە کۆلێجی حقوق لە بەغدا و دوای دەرچوونیش لە زانکۆ، هەمووی وەك تێکۆشەرێکی مەرد و ئازا بردە سەر. چەند رۆژێك دوای ئەوە ئێوارەیەك لە نووسینگەی پارێزەرێتییەکەی خۆی هاتبووە خوارەوە، چەند دڕندەیەکی نۆکەری حکومەتی بەعس پەلاماریان دابوو و فڕاندبوویان. هاواری کردبوو خەڵکینە ئاگادار بن من پارێزەر فەتحوڵڵا عیزەتم وا ئەمانە ئەمڕفێنن.



شەهید فەتحوڵڵا عیزەت

شەهید فەتحوڵڵا هیچ هەواڵێکی نەگەیشتە دەرەوە و بێگومان لە ژێر ئەشکەنجەدا گیانی پاکی بە حیزب و گەلەکەی بەخشیبوو، تا ئێستاش کەس نەیزانی چۆن کوژراوە و لە کوێ نێژراوە ئەگەر گۆڕی هەبێت. من کە ماوەیەکی زۆر لێپرسراوی رێکخستنەکانی لقی کوردستانی حیزبمان بووم کاتێك ئەچوومە کەرکوك لە یەکێك لە خانووەکانی حاجی عیزەت ئاغای باوکی فەتحوڵڵا خۆم ئەشاردەوە و ئەبووە مەڵبەندێکی نهێنی کۆبوونەوەکانی لیژنەی محەلیی کەرکوك و لیژنەکانی دیکەی حیزب کە بۆ سەرپەرشتییان کۆئەبووینەوە.

* * *

لەو لێپرسراوێتییەمدا وەك بەرپرسی لقی کوردستانی حیزب، سەردانی هەولێریشم ئەکرد و زوربەی جار لە ماڵی ئیسماعیل خۆشناو یاخود حاجی تاهیر کە ئەمیان بادینانی و خزمی خۆیشمان بوو، ئەمامەوە و خزمەتێکی زۆر ئەکرام.

جارێكیان كە چوومە ماڵی هاوڕێ ئیسماعیل، دایكی لێی پرسیم چەند ڕۆژ ئەمێنیتەوە؟ گوتم دە ڕۆژ. گوتی لەچیدایت لەگەڵ ساوەر خواردنی پێشمەرگەییدا؟ منیش كە بە نان و ماست و نیسكی مەقەڕ ڕاهاتبووم، ساوەرم بەلاوە خۆش بوو و گوتم پورێ ساوەر زۆر خۆشە. ئێوارەی یەكەم دوو برنج و شلە و مریشكیان ریز كرد. ئێوارەی دووەم لەسەر داوای خۆم بوو بە برنج و شلەیەك. ئێوارەی سێیەم بوو بە ساوەر. بۆ سبەینێ خۆم كۆ كردەوە بڕۆم، دایكی هاوڕێ ئیسماعیل گوتی: بۆچی ئەڕۆیت، خۆ گوتت دە ڕۆژ ئەمێنمەوە؟ بە پێكەنینەوە گوتم: لە دوو برنجەوە هاتووەتە سەر ساوەر، هەتا نەبووە بە نان و ماست ئەڕۆم. دایكی هاوڕێ ئیسماعیل گوتی خۆت گوتت حەزت لە ساوەرە بۆیە لێم ناوە. منیش تێم گەیاند كە ئەو قسەیە هەر گاڵتە بووە و لەو دە ڕۆژەدا ئەبێت سەردانی شوێنی تریش بكەم بۆیە ئەڕۆم. ئیسماعیل خۆشناوی هاوڕێم و دایكە پڕ سۆز و چاكەكەی زۆر خزمەتیان كردم.

## سەفەرەكانم بۆ سوریا

چەند سەفەرێكم بۆ سوریا كرد. یەكەمجاریان لەگەڵ كاك مستەفا چاوڕەشدا بوو وەكو خۆی ئەڵێت چاوساغم بوو بۆ ڕێگاوبان. حەز ئەكەم و بۆ وردی و بۆ بیرەوەریی ئەویش لەگەڵمدا لەو سەفەرەدا ئەوەی كاك مستەفا نووسیویەتی وەك خۆی بینووسمەوە. پاش ئەوە چەند تێبینییەك هەیە لەو بارەیەوە و ئینجا باسی مانەوە و كارە حیزبییەكانم بكەم لە سوریا و لوبنان. كاك مستەفا لە لاپەڕە ٩٣ی (یادەوەرییەكان)یدا نووسیویەتی:

### دیسان سەفەر بۆ سوریا

پاش ڕێككەوتنی ١١ی ئازار هاتوچۆم ئاسان بوو بوو. بازگەكان كەمتر زەختیان ئەكرد و كەمتر رایانئەگرتیت. ئەمجارە هاوڕێ (فاروق مەلا مستەفا) هاوڕێی سەفەرمە، بەڵام چاوساغ منم كە بچین بۆ سوریا بۆ ئەوەی هاوڕێ فاروق كارەكانی ئەوێ جێبەجێ

بکات. دووقۆڵی بۆ سەفەری سوریا کەوتینە ڕێ. هاتینە هەولێر، هەردووکمان جامانەی سوورمان بەست. ئاسان بوو، خەڵکی سیاسیش هەمیشە ئەگەڕێت فێڵ لە دوژمنەکەی بکات بە هەر ڕێگەیەك بێت. لە هەولێرەوە چووینە موسڵ و چووینە ئەو گەراجەی ئوتومبیل کە خەتی دێی (تاوس) دێت و ئەگەڕێتەوە. بەیانیان ئەهات و دوای نیوەڕوان ئەگەڕایەوە. لە ناو موسڵ لەسەر شەقامەکەی ئەچووین بۆ گەراج، چاومان بە (بەهادین ئەحمەد) کەوت، کە لە مەجلیسی تەشریعی بوو. کاك فاروقی ئەناسی، بەڵام منی نەئەناسی. خۆمان لێ لادا چونکە لەگەڵ دەوڵەت بوو. تاکسییەکمان گرت بۆ دێی تاوس، ئەو ڕۆژە سەیارەی خەتەکەیان نەهاتبوو. زۆر شارەزای ئەو ڕێگەیە نەبووین، کە تەکسییەکە لێوەی ڕۆیشت. تاکسییەکە بەرەو ڕەبیعە ڕۆیشت، ئێمەش زۆر ترساین، کاك فاروق گوتی ئەگەر زانیمان مەبەستێکی هەیە سایەقی تاکسییەکە ئەکوژین. پێش ئەوەی بگەینە ڕەبیعە، بە لای ڕاستدا لای دا بۆ دێی تاوس. گەیشتینە ماڵی کاك حەمید و هات بە پیرمانەوە. ماڵی حەمید خانەخوێمان بوون، دەمەدەمی ئێوارە بوو چووینە ژوورەوە. پاش هەواڵپرسی کاك فاروقم پێناساندن، ژنەکەی کاك حەمید هات زۆپاکەی بە پشقل داخست. لەوێ دار نییە. بە دەستی پشقلی کردە زۆپاکەوە، بە هەمان دەستیش بێ ئەوەی بیشوات چای کردە قۆرییەکەوە. کەچای تێکرد کاك فاروق نەیخواردەوە، گوتم کاکە ئەوە شتێکی ئاساییە، بەڵام من چایەکەم خواردەوە. دوای نانخواردنی ئێوارە یەکێك تاکو دێی (قۆڵدمان) کە دێیەکی سوریایە، لەگەڵماندا هات. بە پشتی مەخفەرەکەی تاوسدا بردیانین. بە کەمتر لە سەعاتێك گەیشتینە ئەوێ، لەوێش پێشوازییەکی گەرمیان لێکردین و ڕێزێکی زۆریان لێگرتین. شەومان ڕۆژ کردەوە، بەیانییەکەی سواری جێب بووین بەرەو قامشلۆ. ئیتر وەك جاران قۆناغ بە قۆناغ بۆ حەلەب و دیمەشق. کە گەیشتینە دیمەشق ژەمبوردە بووبووین. پێکەوە دووقۆڵی چووینە ڕێستورانتێك و نانمان خوارد. دوایی هاوڕێکانی خۆمان دۆزییەوە. ئەو ماوەیەی سوریا هەر پێکەوە بووین. کاك فاروق ئیشەکانی حیزبی جێبەجێ ئەکرد و من ڕێنماییم ئەکرد بۆ شوێنەکان. جا لێرەدا حەقە بوەستم: لە گەڵاڵەی حاجی هۆمەرانەوە حیزب دە دیناری

داینیّ، حساب کرابوو. لە موسڵ بایی دینار و نیوێك گۆشتم کڕی بۆ ماڵی کاك حەمید کە خانەخوێمان بوو و هاوکاریی پەڕینەوەی ئەکردین. ڕەنگە کاك فاروق شتێکی زیاتر پێ بووبێت، دۆخی دارایی ماڵیان باشتر بوو. ئێمە ئاوا دەروێشی حیزب بووین، بە دە دینار بۆ دیمەشق، ڕەنگە هەبێت بڕوا نەکات.

**سەرنجێك لە نووسینەکەی کاك مستەفا:**

**لە گەراجەکەی موسڵ: (یەحیا ڕەشید جاف) مان لە دوورەوە دی نەك (بەهادین مەلا ئەحمەد). یەحیا ئەو کاتە قایمقامی قەزای شێخان بوو، دوای ئەوە بوو بە پارێزگاری دهۆك و.. یەحیام لە ڕۆژانی زانکۆی بەغدا و پێش ئەوەش لە خانەقینەوە ئەناسی. نەمانهێشت بمانبینیّ.**

**لە گوندی تاوس و لە ماڵی کاك حەمید زۆپا نەبوو، ئاگردانێك بوو ژنەکە بە پشقل ئاگری کردەوە و ئینجا چاکەی بە هەمان دەست کردە قۆریی چاکەوە. زۆر بە ڕووی خۆشەوە میوانداریيان کردین.**

❊ ❊ ❊

## شام

**ئیشوکارەکانم لە شام و بێروت پەیوەندیکردن بوو بە چەند لایەنێکی سیاسییەوە و بینین و کۆبوونەوەش بوو لەگەڵ هاوڕێیانی ڕێکخراوەکانی حیزبی خۆمانەوە لە شام بە تایبەتی و هەندێك وڵاتی دیکەوە.**

**لە شام دوو خانوومان هەبوو حیزب بەکرێی گرتبوون، یەکێکیان (موزەفەر نەواب)ی شاعیری تێدا بوو، ئەوی دیکەیان ژمارەیەك هاوڕێی تر، یەکێکیان هاوڕێ حەسەن بوو کە قوتابیی کۆلیجی پزیشکیی بەغدا بوو، بۆ کاری حیزب وازی لە خوێندن هێنابوو.**

**مونیر چەلەبی لێپرسراوی سوریا بوو. مونیر ئەندازیار و برای شەهید محەمەد چەلەبی بوو.**

عەلی شبیبی و عادل وەسفی کە لە ساڵانێکی دوایـیتردا بـە نـاوی عـادل عێراقـی ناوبانگی پەیدا کردبوو، و لە شـاری بێـروت بـە دەسـتی بـەعس شـەهید کـرا لـەوێ بوون. ڕۆژانێکی زۆر عادل کـە قوتـابیی کـۆلێجی بازرگـانی بـوو لـە زانکـۆی شـام و ئەندامی لیژنەی سوریای قیادەی مەرکەزی بوو میوانداریی ئەکردم.

لە شام خزمەکانمانم دۆزییەوە، هەندێکیانم لە سلێمانییەوە بە نـاو ئەناسـی کـە کوڕ و کچ و نەوەکانی دکتۆر (مەحمود ساحیب)ن، من منالٚ بـووم دکتـۆر مـەحمود ساڵانێك لە سلێمانی بە دکتۆری ژیا و بیری خالید و حەسانم مابوو. نزیکترینیان لـە منەوە (یەسار فەخرەدین ساحیب) بوو کە خۆی و ژن و باوك و خوشـکان و دایکـی زۆر حەزیان بە بینینم ئەکرد و زۆر خزمەتیان کردم.

یەسـار ئەفسـەر بـوو، بـە هـۆی سیاسـەتەوە لـە سـوپاوە گواسـترابووەوە بـۆ فـەرمانێکی مـەدەنی. ئـەو خزمانـەمان ئەگـەر مـن بمتوانیایـە ڕۆژانـە دەعوەتیـان ئەکردم و هەستی خزمایەتییان زۆر بەرز بوو پێمانەوە.

یەکێك لە کەسـە نزیکـەکانی مـاڵی دکتـۆر فـەخرەدین ژنێکـی قسـە خـۆش بـوو بـەناوی (ئـوم ئەحمـەد)، زۆر نوکتـە و بەسـەر هـاتی سـەیری لـەلابوو. شـەوێك لـە بلـودان کـە خانوویـەکی هاوینـەی مـاڵی د. فـەخرەدینی تێـدا بـوو ئـەیگوت ئـەبێت گۆرانی کوردیم بۆ بڵێیـت. منـیش بـەو دەنگـە ناخۆشـەم هـەوڵی جێبـەجێ کردنـی داواکەیم دا. دەستی کرد بە گریان. کچ و کوڕەکانی د.فـەخرەدین سـەریان سـوڕما کاتێك ئوم ئەحمەدیان بینی ئەگری. گوتیان چی قەوماوە؟ گـوتی: "بـەم فاروقـەدا ئەو کوڕەم دێتەوە یاد کە ناوی فاروق بوو، کەسوکارم نەیانهێشت شووی پێ بکـەم و بە زۆر منیانـدا بـە ئـەبو ئەحمـەد خـوا لێـی خـۆش نـەبێت.. هـەر لەبـەر ئـەوەی دەوڵەمەند بوو. پیاوێکی پـیر بـوو، بیـانووی پـێ ئـەگرتم. کـە جلوبـەرگی ئاسـاییم لەبەر ئەکرد ئەیوت تۆ حەز لە من ناکەیت و خـۆتم بـۆ ناگۆڕیـت. کـاتێکیش بـەرگی تەنکم بۆ ئەپۆشی و ماکیاجی جوانم ئـەکرد، ئـەیوت ئەمـە بـۆ کـێ خـۆت لـە تـەل داوە! خوا عافوی نەکات و لەوەلاتر چێت."

لەگەڵ مستەفادا سەردانی مەرقەدی مەولانا خالیدم کرد کە لە گەڕەکی کوردانی شامدایە و ئێستاش بە ئاواتەوەم باری سیاسی ڕێگا بدات بچمە شام و ئەو مەرقەدە گەورە و قەشەنگ بکەم و منارەیەکی تێدا دروستبکەم لە هەموو شاری شامەوە دیار بێت، بە تایبەتی کە مەزارەکە خۆی بە قەدپاڵی شاخێکەوەیە. ئەوە ئەبێتە رەمزێکی دیارتری گەورەیی مەولانا خالید کە بیرمەندێکی گەورەی کوردە لە هەموو مێژوودا و رۆڵەیەکی سلیمانیش بوو لە زۆر وڵاتانی ئیسلامیدا ناوبانگی دەرکرد و ئێستا زیاتر لە هەموو کات لە دنیادا باسی خۆی و تەریقەتی نەقشبەندیی مەولانا پەرەی سەندووە.



فاروق مەلا مستەفا
بێروت، ١٩٧٢

لە بێروت چەند لایەنێکی سیاسیی فەلەستینی و لوبنانیم دی، بۆ ئەوەی پەیوەندییەکانمان بەرەو پێش بچێت لە گەڵیاندا. لە چەند بنکەیەکی فیدایی فەلەستینیدا رۆڵێکی باشمان هەبوو بە تایبەتی لەگەڵ بەرەی دیموکراسیی نایف حەواتمە و لە بنکەی (بیئرلحەسەن) رۆڵێکی سەرەکیمان هەبوو.

پەیوەندیمان هەبوو بە (بەرەی دیموکراسیی میللی) جۆرج حەبەش و هەروەها بە (فەتح)ەوە کە گەورەترین رێکخراوی فەلەستینی بوو وە تا ئێستاش فەتح هەر گەورەترین رێکخراوێتی. من بە پێناسەیەکی (فەتح) هاتووچۆم ئەکرد و روتبەی نەقیبی لێنووسرابوو بە ناوێکی خوازراوەوە.

جارێك کە بە تەکسی لە شامەوە ئەچوومە بێروت، شۆفێرەکە فەلەستینی بوو. لێی پرسیم ئەرێ تۆ بە پێناسەکەت کە ئەیدەیتە دەست بازگەکان فەلەستینیت کەچی لەهجەی قسەکردنت تەواو عێراقییە؟ گوتم: براکەم.. ئەی ئێمەی فەلەستینیی دەرکراو لە نیشتمانی داگیرکراوی خۆمان پەرتەوازەی دنیا نەکراوین؟ من لە دایکبووی سالّی ١٩٤٨ی شاری یافام و هەر لە منالّییەوە باوکم و دایکم رایانکردە عێراق وا من هاتوومەتەوە وەك پێشمەرگەیەك بەشداری ئەکەم بۆ مافی گەلەکەم. کابرای شۆفێر ئاو بە چاویدا ئەهاتە خوارەوە و بە راستی منیش چاوم پڕ بوو لە ئاو، ئەو بۆ فەلەستین و منیش بۆ سلێمانی.

* * *

ئەمجارە و جارانی داهاتووش کە ئەچوومە بێروت کۆچکردووی لە یاد نەچوو (مستەفا جاف)م ئەبینی. کاك مستەفا ئەندازیارێکی بە توانا بوو و لە رێکخراوی UN کاری ئەکرد و ناسینی من بۆی بە هۆی هاوڕێ ئیبراهیم عەلاوییەوە بوو کە هەردووکیان لە لەندن خوێندبوویان و هاوڕێی زۆر نزیکی یەکتر بوون. میوانداری و کورد وتەنیش ماریفەت لە نازەنین قەفتانی خێزانی ئەهات کە شاژنێکی رووخۆش و بە خزمەت بوو، و مالّەکەیان بووبووە میوانخانەی تێکۆشەرانی کورد و عەرەب.

## جارێکی تر بۆ سوریا و لوبنان - هاوینی ١٩٧٣

ئەمجارە لەگەلّ هاوڕێ عەزە رەشدا بە پێ رۆیشتین. بە چەند رۆژێك گەیشتینە زاخۆ.

کاك ئیدریس نامەی دابوومێ بۆ (عیسا سوار) لە زاخۆ کە لە پەڕینەوەدا بۆ بەری سوریا هاوکاریمان بکات. عیسا سوار تەنیا هاوکارییەکی بچووکی کردین، بانگی (بەهجەت)ی کرد کە یەکێك بوو لە ستافەکانی (پ.م)ی لای خۆی و گوتی ئوتومبیلێکیان بۆ بگرە بە پارەی خۆیان بیانگەیەنێتە سەر ئاوی فیشخابور ئەچن بۆ سوریا، بەلاّم با شۆفێرەکە ناسراو بێت لەلات. شەو بە جێبە شەڕە کەوتینە ڕێ، ئەبوو پێش رۆژ هەلاّتن بگەینە ئەوبەر و ئەو مەخفەرە نزیکەی عێراق نەمانبینێت کە ئەپەڕینەوە.

لە ڕێگا تایەیەکی جێبەکە پەنچەر بوو، کە دابەزین بۆ گۆڕینی، سەیری کرد ویل ئیسپانەی پێ نییە تەنیا پلایسێکی گەورەی پێ بوو، بە عەزێت و هیلاك بوونێکی زۆر بە هەرسێکمان بە پلایس هەر پێنج برغوەکانمان کردەوە و تایەکەمان گۆڕی. کە گەیشتینە سەر ئاوی فیشخابور دنیا لە تاریکی و ڕوونیدا بوو. بەو شێوەیە بە کەڵەك پەڕینەوە ئەو بەرەوە بۆ گوندی (خانك).

لەوێوە بۆ قامیشلۆ و دوای ڕۆژێکی تر گەیشتینە شام.

ئەمجارە بێجگە لە بینینی هاوڕێکانمان و کارکردن بۆ هەڵبژاردنی چەند کەسێك کە ئامادەی کۆنفرانسی هەموو عێراقی حیزب بن، هاوڕێیان هەوڵی دەرهێنانی پاسپۆرت بوون بۆم بۆ سەفەرێکی حیزبی بۆ ئەلبانیا. داوایان لە هەردوو (بەرەی دیموکراتی بۆ رزگارکردنی فەلەستین) و (بەرەی میللی بۆ رزگارکردنی فەلەستین) واتە: (الجبهة الديمقراطية لتحرير فلسطين) و (الجبهة الشعبية لتحرير فلسطين) کردبوو. بۆ ئامادە کردنی پاسپۆرتیش ماوەیەکی پێ ئەچوو، لەبەرئەوە ئەمجارە زیاتر لە جاری پێشوو لە شام و لە بێروت کاتم بردە سەر.



مستەفا چاوڕەش، فاروق مەلا مستەفا، لە مزگەوتی ئەمەوی لە شام ١٩٧٢

نێوان بێروت و شام بە تەواوی بە قەدەر نێوان سلێمانی و کەرکوك بوو (١١٠ کم) و هاتووچۆمان بۆ بێروت زۆر دووبارە ئەبووەوە.

هاوڕێ ئیبراهیم عەلاوی لە دەرەوەی وڵات بوو بۆ کاری حیزب. ئێمە پەیوەندییەکی باشمان هەبوو لەگەڵ هاوڕێیانی (یەمەنی خوارو) کە شاری عەدەن پایتەختەکەی و حکومەتەکەی ناوی (حکومەتی یەمەنی دیموکراسیی میللی) بوو و حیزبی ئیشتراکی کە عەبدولفەتاح ئیسماعیل و سالم رەبیع عەلی ناسراو بە (سالمین) و عەلی ناسر سەرکردە سەرەکییەکانی ئەو حیزب و حکومەتە بوون. بە چەکی جۆراوجۆر هاوکاریی ئێمەیان ئەکرد و بە هۆی برا فەلەستینییەکانەوە ئەمانگەیاندە کوردستان بۆ پێشمەرگەکانی خۆمان لە کوردستان و بەشێکی زۆریشی ئەچوو بۆ ناوەڕاست و خوارووی عێراق. حیزبی بەرەی دیموکراسی یەمەن حیزبێك بوو باوەڕیان بە سۆشیالیزم و بیروباوەڕی مارکسیزم – لینینیزم هەبوو.

دوو گۆڕانکاری کە لە سوریا و یەمەن روویاندا گەورەترین زیان بوو لە ئێمە کەوت، رووخانی کۆماری یەمەنی دیموکراسیی میللی یاخود یەمەنی خواروو، ئەوی دیکە گۆڕانی حکومەتی نورەدین ئەتاسی و یوسف زەعەین بوو لە سوریا، ئەم رووداوانە کاریگەرییەکی نەرێنییان هەبوو لەسەر ئێمە، چونکە ئەو دوو لایەنەی کەوتن زۆر هاوکاریی ئێمەیان ئەکرد لە هاتووچۆ و مەشقی سەربازی و لەگەڵ یەمەنی خواروو وەك حیزب و حکومەت بیروڕاشیان نزیك بوو لە سۆشیالیزم و دیموکراسییەوە هەڵسەنگاندنیان بۆ هاوکاری لەگەڵ قیادەی مەرکەزیدا لە قازانجی ئێمە، واتە لە قازانجی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕیی عێراق بوو.

* * *

رۆژێك لە بێروت لەگەڵ موزەفەر نەواب کە ئەندامێکی ناسراوی ئێمە بوو، سەردانی قەیس سامەرائیمان کرد کە کەسایەتیی دووهەمی بەرەی دیموکراسیی فەلەستین بوو لە پاش نایف حەواتمە. من لەوەپێش لە بەغدا قەیسم دیبوو، ئەم سەردانە بەشێك بوو لە بەسەرکردنەوەی حیزب و رێکخراوە جیاجیاکان لە گۆڕەپانەکەدا.

من بە قەیس سامەرائیم گوت من و تۆ یەك جاری دیکە لە بەغدا یەکترمان لە کۆبوونەوەیەکی حیزب ورێکخراوەکاندا بینیوە. گوتی بۆچی بوو ئەو کۆبوونەوەیە؟ پێم گوت لە دوای شەڕی عەرەب و ئیسرائیل بوو لە ساڵی ١٩٦٧دا لە پێناوی پشتگیریی کردنی شۆڕشی فەلەستیندا بوو، کۆبوونەوەکە بێجگە لە من هەموو راتان وابوو کە بە ناوی چەند کەسایەتییەکی شیوعی و سۆشیالیست و نەتەوەیی عەرەبەوە مۆڵەتی رێکخراو یاخود کۆمەڵەیەك وەربگرین بۆ پشتگیریی بزووتنەوەی شۆڕشگێریی فەلەستینییەکان و ناوی د. سەفا حافز و ئیبراهیم عەلاوی و خەیرەدین حەسیب برا، تەنیا من گوتم ئەوە بە هیچ جۆرێك جێبەجێ نابێت و حکومەت بە ناوی ئێمە و ئەو ناوە ناسراوانە مۆڵەت نابەخشێت. بە سەرسوڕمانێکەوە گوتی یەعنی من ئەقڵییەتم وابوو کە مۆڵەت لە حکومەتی عێراق وەربگرین! ئەوە من نەبووم! بە پێکەنینەوە پێم گوت من و فایەق بەتی و د. سەباح دوڕە، ئەمانە بووین. کۆبوونەوەکەش لە ماڵی ئێوە بوو!! کە هاتینە دەرەوە بە هاوڕێ موزەفەرم گوت: بە تەمای وەعد و پەیمانی پیاوی وا نەبین باشە!

لە بێروت (موحسین ئیبراهیم)مان بینی کە سکرتێری پارتی کاری لوبنان و لە گۆڤارەکەیاندا (ئەلحوڕییە) وتارێکم لەسەر مافی گەلی کورد نووسی.

ئەو ماوەیە چاوەڕوانی پاسپۆرت بووین دەستمان بکەوێت، شەهید شەهابی شێخ نوری و من بە دوو رێگای جیاوازەوە، رۆژێك لە نزیك ناوچەی رەوشە لە بێروت لەسەر مەوعیدێك کە بۆمان دانرابوو، کاك شەهاب و من چاوەرێمان کرد.

مارسیدسێکی کۆن بۆمان راوەستا و هەردووکمانی سوار کرد. شەهید دکتۆر وەدیع حەداد بووکە ئەو کاتە کەسایەتیی دووهەمی بەرەی میللی بۆ رزگار کردنی فەلەستین بوو، پاش نیو سەعاتێك گەڕان بە ئۆتۆمبیل، دکتۆر وەدیع دوو پاسپۆرتی داینێ.

لە شام و بێروت نزیکەی مانگێك لەگەڵ کاك شەهابدا کاتی زۆر خۆشمان بردە سەر بە باسی سیاسەت و باسی زۆرتری یادگارییەکانمان لە سلێمانی. کاك شەهاب زۆر قسەخۆش و خۆشەویست بوو. لە دڵ و ناخەوە پێشکەوتنخواز بوو، بزووتنەوەی کۆمۆنیزمی خۆش ئەویست.

مام جەلال هات بۆ شام. نیوەڕۆیەك دەعوەتی کردین بۆ نانخواردن. لەوێ زۆر بە دڵگرانییەوە بە منی گوت کە لە شوێنێك دانیشتبووین لەگەڵ دە پانزە کەسدا موزەفەر نەواب درەنگ منی ناسیوەتەوە ! گوتم مام جەلال ئەوە شاعیرە و بزانە خەیاڵی لە کوێ بووە. ئەمشەو دەعوەتتان بۆ ئەکەم و وا ئەکەم ئیعتیزارت بۆ بهێنێتەوە چونکە من ئەزانم هاوڕێ موزەفەر جەنابتی زۆر خۆش ئەوێت.

لە ماڵی یەکێك لە هاوڕێکانی مندا ئەو شەوە تا بەرە بەیان موزەفەر بە شیعری خۆی و بە دەنگە خۆشەکەی گۆرانیی گوت و شەوێکی یەکجار خۆش و بەتام بوو. بێجگە لە من و کاك شەهاب، کاك شاسواری شێخ جەلالیش (شەهید ئارام) کە لە میهرەجانی لاوان لە ئەڵمانیاوە هاتبووەوە لە گەڵماندا بوو. ئەو ئەگەڕایەوە بۆ بەغدا و لە شام لایدابوو هەروەها لە هاوڕێیانی ئێمەش دکتۆر سلێمان ئەللوس و دکتۆر فەخری غەزالیمان لەگەڵدا بوو.

## لە سوریاوە بۆ ئەلبانیا

لە (شام)ەوە بە فڕۆکە گەیشتمە ڤیەننا.

(فوئادی مەلا مەحمود)ی ئامۆزا و هاوڕێی منداڵی و هەموو تەمەن، لە تشرینی یەکەمی ١٩٧٣دا لە ڤیەننا هات بەرەو پیرم بۆ فرۆکەخانەی ڤیەننا. ئەو بەیەکگەیشتنەمان لە ڤیەننا تام و چێژێکی خۆشی هەبوو چونکە دوو ساڵێك زیاتر بوو یەکمان نەدیبوو.

چەند ڕۆژ و شەوێکی خۆشمان بردە سەر بە تایبەتی کە کاك نەوشیروان مستەفاش لەوێ بوو و ئەو کاتە دەستی کردبوو بە خوێندنی دکتۆرا. من و کاك

نەوشیروانیش لە قۆناغی ناوەندی و دواناوەندییەوە هاوڕێیەتیمان هەبوو، ئەو و فوئاد ڕێبازێکی جیایان هەبوو لە من بەڵام فیکر و نیشتیمانپەروەریی و دڵسۆزیی هاوڕێیەتی وای کردبوو زۆر نزیك بین لە یەکتری.

کە لە فرۆکەخانە دابەزیم فوئاد بە دوو شت زۆر پێکەنی و هەروەها خۆیشم. گوتی با بڕۆین جانتەکەت وەرگرین. پێکەنیم و گوتم ئەوەتا بە دەستمەوەیە. گوتی جانتای جلوبەرگەکانت ئەڵێم. گوتم هەر ئەمەم پێیە! بە دەستمەوە بوو لە فڕۆکەکەدا و بیجامەیەك و تاقمی تەراش و دوو کراس و پانتۆڵێکی تێدایە. گوتی تۆ هاتویت بۆ گەڵاڵە یان ڤیەننا!! ئەو جانتا بچووکەش هەر ئەوە بوو کە بە کۆڵ هەڵم ئەگرت لە هاتوچۆی کاری سیاسیی دەرەوەی شار و پێشمەرگایەتیی ئەو ساڵانەدا.

دووهەم، گوتی ئەی پارەت چەند پێیە؟ گوتم فوئاد گیان بەشی خۆم پارەم پێیە و دوو سێ شەو لای تۆ ئەبم حسابی نووستنی ماڵی ئێوە و خواردن و خواردنەوەشم کردووە کە ئامۆزا و هاوڕێیەکی نەجیبی وەك تۆ ناهێڵێت دەست بکەم بە گیرفانمدا. ئەوەتا ١٠٠ دۆلارییەکم پێیە و بلیتی تەیارەی بەلگرادیشم پێیە بۆ تیرانا. زۆر لای سەیر بوو و بێگومان ئەو بلیتی شەمەندەفەری لە (ڤیەنناشەوە) بۆ بڕیم و تا ناو شەمەندەفەرەکە خواحافیزی لێکردم و بەرەو بەلگرادی پایتەختی یۆگۆسلاڤیا کەوتمە ڕێ.

بۆ سبەینێ لە بەلگراد پەیوەندیم بە کونسوڵخانەی ئەلبانیاوە کرد و بلیتی فرۆکەیان دامێ و بەڕێیان کردم بۆ تیرانا.

چەند ڕووداوێکی خۆش و مێژوویی بوو لام کەوا لە تیرانا دائەبەزم و بۆ یەکەمجار لە ژیانمدا بە ڕەسمی حیزبێکی شیوعیی ئەوروپا ئەبینم کە ئێمەی قیادەی مەرکەزی بە هۆی دژایەتیی کردنی ڕیڤیژنیستەکانەوە پەیوەندیی حیزبایەتیی ئومەمیمان زۆر کەم بوو.

بیروباوەڕ و هێڵی سیاسیی جوڵانەوەی شیوعی لە جیهاندا چەند ڕێبازێکی دیاری تێدا جیا بووبووەوە. بێجگە لە ڕێبازی سۆڤێتی کە ئێمە بە ڕێبازێکی

یەمینی و ریڤیژنیستمان (تەحریفی) هەڵسەنگاندبوو و مێژووش ئەو ڕا و بۆچوونەی ئێمە و زۆر حیزبی دیکەی جیهانی سەلماند. ڕێبازی ماو تسیتۆنگ کە بە ماویزم یان بە زمانی خۆمان بە ماوی ناسراو بوو، لە سەرانسەری جیهاندا پەرەی سەندبوو.

ڕێبازی شۆرشگێڕیی ئەلبانیای ئەنوەر خواجەش ڕۆڵێکی دیار و نیمچە جیاوازی لە ڕێرەوی ماو تسیتۆنگ هەبوو، گیڤارا و بەدوای ئەویشدا (دوبریە) بووبوونە رەمزێکی گەورەی کۆمۆنیزم و شۆرشگێڕیی لە جیهاندا.

ئێمەی قیادەی مەرکەزی نزیك بووین لە هێڵی ماو و لە ئەلبانیاوە. ئەمەندەمان لە کلکایەتیی (ح.ش.ع) چەشتبوو، ئەلبانیای ئەنوەر خواجە کە سەربەخۆیی هەبوو لە ڕێبازی چینی ماو تسیتۆنگیشەوە، نمونە و بلێسەیەکی نوێ بوو بۆ بزووتنەوەی کۆمۆنیزمی جیهان. یەکێك لە هەڵسەنگاندنەکان بۆ مەزنیی شۆرش و فیکری حیزبی کاری ئەلبانی ئەوەبوو کە بە شۆڕش و بەرهەڵستیکردنی داگیرکەرە ئەڵمانی و ئیتاڵییەکان خۆیان وڵاتەکەیان رزگار کرد نەك بە هۆی سوپای سووری سۆڤێتەوە وەك زوربەی وڵاتەکانی خۆرهەڵاتی ئەورووپا.

من کە هەشت ساڵێك لە ژیانی خۆشاردنەوە و شاخدا ئەژیام، هەلێکی زۆر خۆش و گرنگم دەستکەوت کە بە شێوەیەکی رەسمی لەلایەن حیزبی خۆمانەوە نێردرام یاخود بانگکرام بۆ سەردانێکی یەك مانگی ئەلبانیا و کۆبوونەوە لەگەڵ سەرکردایەتیی حیزبی کاری ئەلبانی.

لە فرۆکەخانە هاوڕێیان (پێرو) و (ئاکیمی) کە ئەندامی مەکتەبی سیاسیی حیزبی کاری ئەلبانی بوون پێشوازییان لێکردم. پێرو پێش چەند مانگێك وەزیری دەرەوەی ئەلبانیا بوو و ئێستاش لە وەزارەت هاتبووە دەرەوە و گەڕابووەوە بۆ کاری حیزبی.

حیزبی کاری ئەلبانی بەسەرکردەیی ئەنوەر خواجە سیستمێکی تایبەتیی خۆیان هەبوو. هەموو کادرێك ئەبوو ساڵی مانگێك بگەڕێتەوە بۆ سەر کاری پێشووی پێش هاتنە سەر حوکمیان. محەمەد شیخۆ کە سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران بوو ساڵی مانگێك ئەگەڕایەوە بۆ کاری پێشووی خۆی کە لە کێڵگەیەکی کشتوکاڵدا کاری کردبوو.

ئەلبانیا تاقە دەوڵەت بوو کە ئاینی تێدا قەدەغە کرابوو. لەوەپێش زوربەی خەڵکی وڵاتەکە موسوڵمان بوون و کەمایەتییەکی مەسیحیی تێدا بوو. زوربەی مزگەوت و کڵێساکانیان کردبوو بە قوتابخانە و نەخۆشخانە و مۆزەخانە. لەم رووەوە هەڵەیەکی مێژوییان کرد چونکە رێگرتن لە ئایین بە زۆرەملێ کاریگەریی پێچەوانەی ئەبێت وەك روویدا.

لەجیاتی ئوتێل لە میوانخانەیەکی حیزبیدا دابەزێنرابووم کە گوتیان ماوەیەك لەمەوبەر ئەو حیزبە ئێرانییە لێرە بوون کە هەموویان دکتۆر بوون، تێگەیشتم کە برادەرانی (سازمانی ئینقیلابیی تودەی ئێران) بوون کە یادیان هەر زیندووە لە لام، دکتۆر جەلال و دکتۆر ئیبراهیم و کاك ئیسماعیل ..تاد.

ئەلبانییەکان زۆر شانازییان بە پاڵەوانێکی نیشتیمانپەروەری خۆیانەوە ئەکرد کە لە جوانترین گۆڕەپانی تیرانادا پەیکەرێکیان بۆ کردبوو بە سواری ئەسپ و شمشێرێکی بەرزەوە بە دەستییەوە. عوسمانییەکان چوارسەد ساڵ ئەلبانیایان داگیرکردبوو، بەڵام دواجار ئەسکەندەر بێگ بۆ ماوەی ٢٥ ساڵ دەرییەڕاندبوون و یەککگرتنی ئەلبانیای هێنابووە دی.

من لە ئەلبانیا بووم کاتێك شەڕی عەرەب و ئیسرائیل لە ٦/٥ /١٩٧٣دا هەڵگیرسا و لە کۆتایی ئەو سەفەرەدا بووم کە سوودی زۆری فیکری و سیاسیم لێ وەرگرت، لەو ماوەیەدا گوێم لە چەند وتار و موحازەرەی هاوڕێ ئاکیمی گرت کە پێیان ئەگوت فەیلەسوفی حیزب. سەردانی چەند شارێکی وەك (شکۆدرا) و (دۆریس)م کرد هەروەها چەند گوندێکم بینی کە ئەوەیان نیشان ئەدا جیاوازیی لادێ و شار ناهێڵرێت لە رووی شوێنی خوێندن و تەندروستی و ئیشوکارەوە و لە هەموو رووەکانی دیکەی خزمەتگوزاریی وەك پرۆژەکانی ئاوو ئاوەڕۆ و کارەباوە، ئەمە وەك پەیڕەوێکی سۆشیالیزمی بیروباوەری مارکسیزم – لینینیزم بوو. پاش تەواو بوونی ماوەی سەفەرەکەم بە ڕێگای بولگاریادا بەرەو تورکیا گەڕامەوە بۆ سوریا و گەیشتمەوە شام.

هەر بۆ بیرەوەرییش لە سۆفیای پایتەختی بولگاریا بە رێکەوت جەلال مەزهەرم بینی، پاش یەکترناسینەوە پێم گوت گرفتێکی گەورەم هەیە لە سەفارەتی تورکیا لە سۆفیا، من ئەمەوێت بە تورکیادا بڕۆمەوە بۆ شام بەڵام ڤیزەم نادەنێ و ئەڵێن ئێمە پەیوەندیمان نییە بە وڵاتی ئێوەوە. جەلال گوتی چۆن پەیوەندییان نییە گوتم ئاخر من پاسپۆرتی یەمەنی خواروووم هەیە نەك عێراقی. كاك جەلال زۆر بە ئاسانی كارەكەی بۆ چارەسەركردم، لەگەڵمدا هاتەوە بۆ كونسولخانەی توركیا، گوتی من زۆر شارەزام تۆ كابرا بە قسەوە خەریك بكە و مۆری ڤیزەكەیان لەسەر مێزێكە لە تەنیشتییەوە. من مۆرەكەی لێ ئەدەم و ئیمزاكانیشیان ئەزانم. بەوجۆرە جێبەجێی كرد بۆم و خزمەتێكی گەورەی كردم.

لەم سەردانەدا بۆم دەركەوت كە من یەكەم كوردی سیاسیم ئەلبانیا ببینم و ئەمەشم لە دەفتەری بیرەوەرییەكانی یەكێك لە مۆزەخانەكانی تیرانادا نووسی.

## چەند وێستگەیەکی هەمەڕەنگ لە سالانی ژیانمدا لە ناوچەی باڵەك

رۆژێك هەردوو شێرکۆ، هاوڕێم شێرکۆ بێکەس لەگەڵ شێرکۆی هەژار مۆکریانی لە بنکەی حیزبمان لە ناوچەی باڵەك سەردانیان کردم. من بیرم کەوتەوە کە کاك شێرکۆی هەژارم چەند جارێك لە بەغدا دیوە، بەڵام شێرکۆ بێکەس هاوڕێی زۆر نزیکم بوو.

شێرکۆی هەژار بەیاننامەیەکی (کاژیك)ی دامێ، و هەردووکیان داوایان کرد بیخوێنمەوە و رای خۆمیان پێ بڵێم، بۆ راستییش شێرکۆی هەژار بە رەسمی بە ناوی کاژیك و خاوەندارێتیی ئەو بەیاننامەیە قسەی ئەکرد و شێرکۆ بێکەسیش لایەنگری ناوەڕۆکەکەی بوو. کە خوێندمەوە بەبێ راوەستان پێم گوتن ئەم بەیاننامەیە لە رووی هێڵی سیاسییەوە زۆر باشە و گۆڕانکارییەکی بنەڕەتیی تێدایە لەگەڵ ئەو پەیڕەو و بیروباوەڕانەی من بیستبووم لەسەر کاژیك.

بەیاننامەکە چەند خاڵێکی سەرەکیی تێدا بوو کە سەرنجی منیان راکێشا:

– تاوانبارکردنی ئەو کەسانەی تاوانەکانی کانی ماسییان ئەنجامدابوو لە کوشتنی ئەو پۆلە شیوعییەی شەهیدکران هەروەها تاوانبارکردنی ئەو کەسانەشی تێدا بوو کە لە پشت کردەوەکەوە بوون.

– بەیاننامەکە بە روونی داوای بەرەی نیشتمانیی کردبوو لە نێوان کاژیك و پارتی دیموکراتی کوردستان و حیزبی شیوعیی عێراق – قیادەی مەرکەزیدا.

– باسی برایەتیی کورد و عەرەبی تێدا بوو.

دەربارەی ناوخۆی کاژیك، ژمارەیەکی زۆریان دەرکردبوو لە ئەندامێتیی کاژیك کە زوربەیان لە سەرکردە ناودارەکانیان بوون بە تۆمەتی ترسنۆکی و خیانەتکاریی جۆراوجۆر.

ئێمە هێڵە سیاسییەکەیمان لەلا باش بوو و بە رەزامەندی و پێخۆشبوونی خۆیان ژمارەیەکی زۆرمان لە بەیاننامەکە چاپکردەوە.

جەمال نەبەز لە نووسینێکدا لەم باسە دوواوە و من بە بەشدار ئەزانێت لە کارەکەدا. هەرچەندە خۆی ئەڵێت شێرکۆی هەژارم لە ئەڵمانیا دی و گوتی فاروق

بەشدار نەبووە لە نووسینی بەیاننامەکەدا بەڵام قسەکانی جەمال نەبەز جۆرێکی تر ئەگەیەنێت. من بەڕاشکاوی بە جەمال نەبەز ئەڵێم من هێڵی سیاسی ئەو بەیاننامەیەم پێ خۆش بوو و ژمارەیەکی زۆرم لێ بڵاوکردەوە.

هەر لەو ڕۆژانەدا بوو کاك مەسعود بارزانی پرسیاری ئەو بەیاننامەیەی لێکردم، بەهەمان شێوە وەڵامم دایەوە.

❊ ❊ ❊

## شەڕی سەرچیا

پێکدادانێك لە نێوان پێشمەرگە و جاشەکانی سەرچیا ڕووی دا. پاش ئەوەی پێشمەرگە بەسەریاندا سەرکەوت، جاشەکان پاشگەز بوونەوە و بەر بڕیاری لێبوردنی شۆرش کەوتن و گەڕانەوە ریزی شۆرش. جارێکیان لەلای کاك ئیدریس بووم خەریکی پارە و ئازۆخەپێدانی بەرپرسێکی ئەو تاقمە بوو. پاش ڕۆیشتنی کابرا گوتم کاك ئیدریس من پێشنیارێکم هەیە! گوتی چییە؟

گوتم بۆچی پارە و چەك و هەموو پەیوەندییەکانتان لەگەڵ ئەم جۆرە کەسانە ڕاستەوخۆ ناکەن لەگەڵ چەکدارەکانیان کە هەموویان فەلاحن و دووریان بخەنەوە لە سەرۆکەکانیان. چونکە کە لای حکومەت بوون و ئێستا و ئەوساش ئەم سەرۆکە جاشانە بە رازقی رزقی خۆیان ئەبینن و ئیتر لێیان جیانابنەوە!!

❊ ❊ ❊

بیرەوەریی ئەو ساڵانەم ئەمەندە زۆرە بە خۆشی و ناخۆشییەوە هەموو کات لە یادما دێن و ئەچن و ئەڵێی ئێستاش لە بنکەکەی کانی سپینداردا لەگەڵ ئەو هاوڕێ خۆشەویستانەدا ئەژیم. لە کۆبوونەوەکان و موناقەشە و کتێب خوێندنەوە و مەشقی هەمەجۆرە و گاڵتەوگەپی ناو هاوڕێیان لە هۆڵە گەورەکەی بارەگادا و چنینی پیتەکان لە ژووری چاپخانە و لێکۆڵینەوە لە جاسوسەکان و بەڕێکردنی دەستە دەستە پێشمەرگەکانی حیزب بۆ بەرەکانی شەڕ، دیمەنی ئەو چادرە بچووکەی خۆم لە سەرووی

بارەگاكە كە كانییەكی جوان و دەورگیراو بە سەوزایی و داری زۆر و دیمەنی مێزە تەختە پچووكەكەم كە تایپ رایتەرێكی لەسەر بوو لەگەڵ هەندێ كتێب و كاغەز و قەڵەم.

رۆژێك بۆردومانێكی خەست كراین و ئێمەش تەقەمان لە فڕۆكەكان ئەكرد. موشەكێك دای لەو تەلارە جوانە خنجیلانەیەی منیش. دوای بۆردومانەكە تەماشامان كرد چادر و مێز و تایپ رایتەر پارچە پارچە بوون و گڕ و دوكەڵیان لێ هەڵئەستا.

هەر لەو یادانەی شەڕو بۆردومان، ئێمە نزیك چیای زۆزك بووین و لە هێرشێكی دوژمندا، فرۆكەكان بۆردومانیان ئەكرد و ئەمەندە نزم ئەبوونەوە وامان ئەزانی بە ئەرزەوە نووساون. سامی شۆرش ئەو كاتە ئەندام بوو لە حیزبدا و تازە هاتبووە دەرەوە لە هەموو برادەرانی دیكە بێتاقەتتر بوو، لەو كاتەدا مستەفا چاوڕەش هاواری لێكرد كە بچێتە ناو كونە تەیارەكەی من و مستەفاوە، كە سەری پیاكرد گوتم بەس ئاگادار بە مارێكی تێدایە، بەڕاستی وەهاش بوو. ئەگەر بۆردومانەكە تەواو نەبووایە سامی گیانی دەرئەچوو. ئیتر بۆ رۆژی دوایی ناردمان بۆ بارەگای یەكێتیی ئەدیبانی كورد لە ناوچەی دەربەندی رایات كە هاوڕێ حسێن عارف ئەیبرد بەڕێوە و دوور بوو لە شەڕ و بۆردومانی رۆژانەی فرۆكە جەنگییەكان.

هەر لە باسی (كونە تەیارە) و لە نزیك ئەو شوێنانەی ئێمەوە كە هەڵمان ئەكەند، دەركەوت ئەو شوێنە ئاساری زۆری كۆنی تێدایە: كەوتینە گەڕان بەدوای ئەو پارچە زۆرانەی هەندێكیان لە قوڵایی خاكدا بوون و نزیكەی پەنجا پارچەیەك لە هەردوو جۆری دروستكراو لە كانزا و لە گڵ دۆزرانەوە.

هەموو ئەمانەمان دا بە كاك دارا تۆفیق چونكە چ وەك شتەكان و چ وەك ئەو شوێنەی كە تا ئەوكاتە لە ریزی شوێنەوار و ئاساردا ناوی نەهاتبوو گرنگییان هەبوو، پاش بە دواداگەڕانی زۆری هاوڕێ ئیبراهیم عەلاوی كە ساڵانێكی زۆر خەریكی ئەم لێكۆڵینەوەیە بوو بۆ پشكنین بە دوای زمانێكی نەزانراودا كە لە هێڵێكی نێوان هیند و كوردستانی هەزارەها ساڵ لەمەوبەر لەسەر ئەم هێڵە بازرگانی و هاتووچۆیە بەكار هێنراوە.

رەشنووسی ئەم لێكۆڵینەوە گەورەیەی ماوە و برا و هاوڕێیانی هاوڕێ ئیبراهیمی كۆچكردوومان هەوڵ ئەدەین بە هۆی چەند شارەزایەكی گەورەوە لیكۆڵینەوەكان بخەینە روو.

كە ئەو دۆزراوانەمان دا بە كاك دارا كە ئەمینی گشتیی رۆشنبیری و راگەیاندنی شۆڕش بوو و خەریكی رێكخستنی پێشانگایەكی گەورە بوون بۆ دەرخستنی رووی گەشی كوردستان، ئەوەبوو پێشانگاكە لە چەند مانگی پێش رێككەوتنی شوومی جەزائیری ١٩٧٥دا كرایەوە و منیش بانگ كرابووم بۆ ئاهەنگی كردنەوەكەی، تەماشام كرد ئەو ئاسارانەی من دابووم بە شەهید دارا تۆفیق هەمووی دانراوە لە پێشانگاكەدا كە دەیان خەڵكی بێگانە لە سیاسی و رۆژنامەنووسیان تێدابوو، سەیریان ئەكرد و وێنەیان ئەگرتن، یەكە یەكە لێیان نووسرابوو: دیاریی مامۆستا فاروق مەلا مستەفا بۆ مۆزەخانەی شۆڕش.

هەر لەوێدا بە كاك دارام گوت من ڕازیم بەوە بەڵام لە جێیاندا چەكمان بدەنێ چونكە بە دیاریی نەمداونەتێ و موڵكی شەخسیی من نین.

هەزار سڵاو لە گیانی پاكی شەهید دارا تۆفیق.

## كتێبخانەی ئازادی لە گەڵاڵە

لە ساڵانی دوای ١١ی ئازاری ١٩٧٠دا بۆ یەكەمجار لە مێژووی ناوچەی گەڵاڵە و باڵەكایەتی كتێبخانەیەكمان لە گەڵاڵە كردەوە، كتێب و گۆڤاری ماركسی و پێشكەوتنخوازمان تێدا ئەفرۆشت و بڵاو ئەكردەوە، كتێب و ناميلكەكانی ماو تسیتۆنگ بەشی سەرەكیی ئەو كتێبخانەیە بوو، زوربەیمان لە بەغداوە ئەكڕی لە كتێبخانەی (بیری نوێ)ی شەهید شەهابی شێخ نوری، بە هەرزان و هەندێ جاریش نامەی ئەنارد، من بۆم ئەنووسییەوە كە ئێمە ئەو بیروباوەڕە لەم ناوچەیەدا بڵاوئەكەینەوە بە هاوڕێ چینییەكان بڵێ ئەمانە لە حسابەكەی ئێوە داشكێنێت. لەگەڵ شەهید شەهابدا سوعبەت و قسەی خۆشمان لە نێواندا هەبوو.

لە چاپخانەکەی خۆشمان هەندێ ناميلکەمان چاپ ئەکرد، لەگەڵ ژمارەکانی (رێگای کوردستان) کە زمانحاڵی لقی کوردستانی حیزبی شیوعیی ئێمە، واتە قیادەی مەرکەزی بوو، هەروەها ژمارەکانی (طريق الشعب)یش زمانحاڵی سەرکردايەتيی حيزب بوو بە ژمارەی زۆر لە کتێبخانەکەدا بڵاو ئەکرانەوەو رۆژ لە دوای رۆژ سەردانکردنی خەڵك بۆ ئەم سەرچاوە گەشەدارە روو لە زیاد بوون بوو. ئەو ساڵانە گەلاڵە وەك پايتەختی شۆڕشی ئەيلول وابوو.

## عەلی زەردەشتی : دیاردەیەکی لەبیرنەچوو
## - لە ١٩٦٩وە تا ١٩٧٥ -

**لە کەسايەتييە ناسراو و دەگمەنەکانی ئەو ساڵانەی ناوچەی باڵەك ... (عەلی زەردەشتی)**

هەر لە رۆژانی يەکەمەوە کە گەيشتمە ناوچەی باڵەك لە زۆر کەس ناوی عەلی زەردەشتيم ئەبيست وەك پياوێکی بە هەمەجۆرە خاوەن باسوخواس.

هەندێك بە قسەخۆش و هەندێك بە تەعليقدەر و شێت و هێرشبەرە سەر هەموو کەس ناويان ئەبرد. هەرکامێکيان بەتەنيا نابێت بە وەسفێکی تەواو بۆ ئەم پياوە کە ئەتوانم بڵێم لەم جۆرە پياوە هەر عەلی زەردەشتيم ديبوو تا ئەو رۆژە. پياوێکی بەتەمەنی تێکەڵ لە راستی و راستگۆيی و زمانزان و دنياديدە، خۆهەڵکێش و جنێو فرۆش، شێت و دانا.

کەسانێکی دیکەش بە خاوەن ئەزموون و خوێندەوار و زمانزان باسيان ئەکرد. زۆر بەپەلە بووم بۆ گەيشتن بەم پياوە بەتەمەنەی کە ئەوانەی باسيان ئەکرد کەسيان نەيانئەزانی عەلی زەردەشتی خەڵکی کوێيە ! ناوکێلەکان و گەلاڵە بە ئۆتومبيل نيو سەعات رێ بوو. کە چوومە خزمەتی خۆمم پێ ناساند زۆری پێخۆش بوو، منيش لەيەکەم چرکەوە خۆشەويستيی مامۆستا زەردەشتيم تێدا دروستبوو. پياوێکی بەتەمەن و رووخۆش. بێجگە لە زمانی خۆمان، عەرەبی و توركی و فارسی و ئينگليزی و هينديی ئەزانی. ئەوەی پێش هەموو شتێك سەرنجی راکێشام

دوکانەکەی بوو، کە لەسەر شەقامە سەرەکییەکەی گەلاڵە دوکانێکی گەورەی هەبوو. دوکان جێگای کاسبیی زەردەشتی بوو و بەشێکیشی بە پەردەیەك جیاکردبووەوە و کردبووی بە ماڵ و تێیدا ئەژیا. دوو جۆرە بابەت لە دوکانەکەدا هەبوو: کاغەز و قەڵەم و دەفتەر و لاستیکی خەت کوژاندنەوە، و بابەتی دووهەم: وایەر و تیپ و پلاك و پلایس – هەموو پێداویستییەکی کارەبا.

زەردەشتی تاقە کەس بوو لە گەلاڵە چاکەت و پانتۆڵی لەبەر ئەکرد، چەند کورسییەکی بچووك لەم دیوەخانەدا هەبوو لەسەریان دائەنیشتین، کە میوان زۆر ئەبوو، لەبەردەم دوکان و شوستەکەی بەردەمیدا کۆئەبوونەوە و مامۆستا قسەی بۆ ئەکردن. قسەکانی تێکەڵ بوون لە ئامۆژگاری و مێژوو، سیاسەت، رەخنە لە خەڵك و لە کاربەدەستان و بەسەرهاتەکانی خۆی. هەر لە دامەزراندنیەوە وەك کرێکاری نەوت لە کەرکوك هەتا کارکردنی لە هندستان. بەشداربوونی لە کۆماری مەهاباد و هەندێك جاریش قسەکانی بە شیعرێکی خۆی کۆتایی ئەهات.

گەلاڵە پایتەختی شۆڕش بوو. هەموو سەرکردە سیاسی و سەربازییەکانی پێشمەرگە و کەسانی ناسراوی ئەو رۆژانە سەریان لە مامۆستا عەلی زەردەشتی ئەدا.

هەر لە سەرەتاوە لێم پرسی ئەم ناوی (زەردەشتی)یە لە کوێوە و لە چییەوە هاتووە؟ گوتی یەکەم زەرتەشتی‌یە نەك زەردەشتی، دووهەم هەموو ئەدیانم تاقی کردەوە هیچیانم بەدڵ نەبوو، ئەسڵەن من باوەڕم بە هیچ دینێکیش نییە!

زۆری پێ نەچوو من بوومە قوتابییەکی گوێڕایەڵی زەردەشتی و پاش ماوەیەك روتبەی (خەلیفە)ی خۆی پێ بەخشیم و ئەیگوت میللەت لە سەدا پێنج لە ئەفکاری من تێئەگات، فاروق لە سەدا نەوەد و پێنج. کاك حەمە عەلی موفەتیشی پەروەردە بوو لە گەلاڵە و خەڵکی هەولێر بوو، گوتی ئەدی من چەند لە ئەفکاری جەنابت تێ ئەگەم؟ زەردەشتی گوتی تۆ لە سەدا (سفر) چونکە تۆ لە گەلاڵە لەگەڵ رانکوچۆغەدا بۆینباغ ئەبەستیت، ئیتر چی لە من تێئەگەیت بێ ئەقڵ!!

ڕۆژێك لـه گەلاڵـه خوالێخۆش بـوو ڕەفیـق چـالاكم دی، تۆزێـك قسـەمان كـرد و پیاسەیەكی كورت. گوتم كاك ڕەفیق تۆ عـەلی زەردەشـتی ئەناسـیت؟ گـوتی بـەڵێ قوربان. گوتم دەبا سەرێكی بدەین. گوتی نایەم! گوتم بۆچی؟ كـاك ڕەفیـق گـوتی عالەم لە زمانی من خۆی ئەپارێزێت كەچی من لەم سەگبابە ئەترسم. ڕەفیق چـالاك گوتی دەبا بۆت بگێڕمەوە: ئەوا من لە ئێستگەی شۆڕشم و نەڕەم ئەگاتە عاسمان، ئەمبیست كابرایەكی دوكانـدار لـه گەلاڵەیـە نـاوی عـەلی زەردەشـتییە و باسـی مـن ئەكات و ئەڵێت ئەو سـاڵە ڕەفیـق چـالاك هاتووەتـە سـەرم بـۆ ماڵـەوە بمگرێـت لـه دەرگاكەی ترەوە ڕامكـردووە. منـیش چـەند پێشـمەرگەیەكم لەگـەڵ خـۆم بـرد بـه بەرگی پێشمەرگەوە و پوزەوانە و كلێتەوە. چـووم بـۆ لای، دە پـانزە كەسـی لـەلا بوو، هەر دەركەوتم هاواری كرد (ئای ڕەفیق بەسەر باسی خۆتدا هاتیت، بـیرت دێ هاتیت بمگریت لە دەرگاكەی ترەوە ڕامكرد؟) باوەڕت هەبێت ئەمەندەم قسە حـازر كردبوو پێی بڵێم: كام دەرگا و كام كۆڵان و كام شار هەی بێ ویژدان! كە ئـەو ئـاوا دەستی پێكـرد دەمـم وشـك بـوو، زمـانم لاڵ بـوو، وەڵامـم بـۆ نەدرایـەوە!! تـۆش ئەتەوێت بمبەیت بۆ لای ئەم شێتە!

زۆرم لە كاك ڕەفیق كرد و بردم.

كە گەیشتینە بەر دوكانەكەی پڕ بوو لە خەڵكی گـوێگر و موریـدی زەردەشـتی. كاتێك كە ئێمەی دی سڵاوێكمان لێكرد یەكسەر گوتی باشە برادەرینە ئەمە ڕەفیـق چالاكە. با پرسیارێكی لێبكەم. كاك ڕەفیق گوتی فەرموو. پرسـی ڕەفیـق، حیزبـی شیوعیی عێـراق كـێ دایمەزرانـد؟ ئـەمیش گـوتی هـاورێ فەهـد. عـەلی زەردەشـتی گوتی نەتزانی، حسـێن كەربـەلایی بـوو. چـالاك گـوتی مامۆسـتا زەردەشـتی ئەمـە مێژووە و ناتوانم بڵێم وایە. ئیتر زەردەشتی دنیایەك قسـەی لەسـەر ڕەفیـق چـالاك كرد هەر لە باسی فەهدەوە بۆ چەندەها تۆمەت بۆ كـاك ڕەفیـق. ڕەفیـق چـالاكیش گوتی مامۆستا ڕاست ئەكەیت بەزاتی خوا بـیرم چـوو ئـەو كەربەلاییـە بـوو كـە تـۆ ئەیلێیت و سەیری منی كرد، گوتی ئەمە باشە جەنابی كاك فاروق؟!

## زەردەشتی و کاك نوری ئەحمەد تەها

کاك نوری ئەحمەد تەها تێکۆشەری دێرین و ناسراوی گەلی کورد ئەو ساڵانە لە گەلاڵە ئەژیا. ئەو کە یەکێك بوو لە ئەفسەرەکانی سوپای عێراق، لە ساڵی ١٩٤٦ەوە سوپای عێراقی بەجێهێشت و چووە ریزەکانی سوپا و کۆماری مەهابادەوە. دوای ئەوە چەند ساڵێك لە عێراق لە زینداندا وەك رۆڵەیەکی ئازا ژیانی بردە سەر و لە پاشدا یەکێك بوو لە سەرکردەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان. لێرەدا نامەوێت لە مێژووی کاك نوری بدوێم چونکە باس باسی عەلی زەردەشتییە، بەڵام ئەم پێشەکییم نووسی بۆ نەوەی تازە کە کاك نوری ناناسن. ئەو ساڵانەی دوای ١١ی ئازاری ١٩٧١ کاك نوری لە کاری سیاسیی راستەوخۆی پارتیدا نەمابوو، لە گەلاڵە و ناوچەی باڵەك ژیانی ئەبردەسەر. یەکێك بوو لە هاتووچۆکەرانی دوکان یاخود بڵێین یانەکەی عەلی زەردەشتی و دۆستایەتییان خۆش بوو.

لە پڕ تێکچوون! ! !

رۆژێك لە گەلاڵە کاك نوریم دی زۆر بێتاقەت بوو. بە پێچەوانەی رووخۆشی و قسە خۆشەکانی و تەعلیقی زۆر لە خەڵك و رووداوی زۆر، گوتی فاروق یارمەتی تۆم ئەوێت و فریام کەوە. من وام زانی لەگەڵ یەکێك لە سەرکردەکانی شۆڕش یا زیاتر لەوە لەگەڵ بارەگای سەرەکیی شۆڕش تێکچوونێکی تازەی هەیە. گوتم چی بووە کاك نوری؟ گوتی لەسەر ئەوەی کورد (بزن)ە یا (کەو)ە لەگەڵ ئەم عەلی زەردەشتی‌یە سەگبابە تێکچووم! ! ئەیٚ کاك نوری هاتووچۆی مەکە و بڕایەوە. گوتی کاکە لەوەدا نەماوە هەموو رۆژێك تاقم تاقم خەڵك کۆ ئەکاتەوە و شیعری لە هەجووی مندا داناوە و لەوسەر جادەیە بۆیان ئەخوێنێتەوە.

باشە کاك نوری بۆچی ئەم تێکچوونە روویدا؟ گوتی: ئەو ئەڵێت کورد لە تەبیعەتی بزندایە، ریشی بگرن بۆ کوێی بەرن ئەڕوات، من گوتم نەخێر وەك کەو وایە، لەسەر کانی‌یەکان ئەخوێنێت هەتا کەوی تر بێن و راوچی راویان بکات! ! !
ئەم سوعبەتەی لیٚ بووە بە راست و هەزار شیعری قۆڕی پڕ جنێوی لەسەر داناوم.

بە پەلە خۆم گەیاندە مامۆستام! عەلی زەردەشتی و پرسیاری ئەم بەزمەم لێکرد و باسی مێژووی کاك نوریم هێنایەوە بیری، بەلاّم قسەی لێ وەرنەگرتم و گوتی جاریێ با پێت بلێم من گوتوومە تۆ خەلیفەی منیت، خۆ نەمگوتووە تەداخول لە کاروباری عائیلیی ئێمەدا بکەیت. زۆر سەرم سوڕما و گوتم عائیلی چی؟! گوتی ئەی نازانیت نوری ئەحمەدی تەها مێردی نەجیبەی کچی عەبدەی ئوتومبیلچییە؟ گوتم ئینجا تۆ هەقی ئەوانەت چییە؟ گوتی عەبدە کوڕی پووری منە!! لەوێوە زانیم کە ئەم مامۆستا زەردەشتییە خەلکی سلێمانییە و لە گەڕەکی پیرمەسوور هاتووەتە دنیاوە. هەرچۆنێك بوو شیعرەکانم لێسەند کە ١٢٠ بەیت بوو و هەجووی خراپ و دوور لە راستیی کاك نوری تێدا بوو.

* * *

زەردەشتی لە گەلاّلەوە گواستیەوە یان راستتر بلێم گواسترایەوە بۆ چۆمان. ئەو کاتە چۆمان بووە ناوەندێکی گەورەی بازرگانی و سیاسی و کۆمەلاّیەتی.

رۆژێك حەبیب محەمەد کەریم هات بۆ لای ویستی بە گالتە پێکردنەوە لەگەلێ زەردەشتی بدوێت، زەردەشتی گوتی تۆ واز لەم قسانە بهێنە جاریێ با من کۆمەلێك پێشنیارم هەیە بتدەمێ. حەبیب سوعبەتچی بوو و هەرچەندە سکرتێری پارتی بوو و لە کوردە فەیلییەکانی بەغدا بوو، کوردی ئەزانی بەلاّم لەو پایە بەرزەشدا بوو، هەر بە عەرەبی قسەی ئەکرد. بە زەردەشتیی گوت: هسه مو وكتـه هذا.. خليليا بتنكة و درزليا للمكتب السياسي: واتە ئێستا کاتی ئەوە نییە و هەموو قسەکانتم بۆ بکەرە تەنەکەیەکەوە و بۆم بنێرە بۆ مەکتەبی سیاسی.

زەردەشتی پێی گوت دەباشە تەنیا گوێ لەم تۆزە قسەیە بگرە کە هی منالێی ئێمەیە.. منالاّنی گەڕەکی پیرمەسوور لە سلێمانی کۆئەبوونەوە و چێشتەقوولێمان ئەکرد. حەبیب گوتی شنو هذا؟ گوتی منالاّن هەریەکە لە مالەوە شتێکیان ئەهێنا.. یەکێك مەنجەلێ، یەکێکی تر تۆزێك برنج، ئەویتر نەوت و چیلکە.. ئەویتریان نان و خویێ و منالێکی دیکە تۆزێك رۆنی ئەهێنا.. بە منیان

گوت ئەی عەلی تۆ چی ئەهێنیت؟ گوتم مـن فـووم لەسـەرە. گوتیـان فـوو؟! گـوتم بەڵێ کە ئاگرەکە ئەکەینەوە خۆ ئـەبێت یـەکێك فـووی لێ بکـات تـا دائەگیرسـێت و ئەگەشێتەوە.. ئەی چۆن! ئینجا جـەنابی کـاك حـەبیب تـۆش لـەم پلەوپایەیەتـدا، لەم شۆڕشە گەورەیەدا وا دیارە هەر فووت لەسەرە و هیچی تر!!

## زەردەشتی و ماو تسیتۆنگ

عەلی زەردەشتی سەردانی بارەگـا سیاسـی و عەسـکەرییەکانی نەئـەکرد، بـەڵام بنکە و بارەگاکانی ئێمە لەو ناوچەیەدا شانسی میواندارێتی مامۆسـتا زەردەشـتییان هەبوو. بێگومان هۆی سەرەکی پەیوەندیی بە دۆستایەتیی منەوە بوو.

ڕۆژێك هات بۆ ناوکێلەکان. هاوڕێ سەبری کە سەر لقی هێزەکـەی ئێمـە بـوو لـە ناوچەی شوان لەوێبوو، گوتی مامۆستا زەردەشتی رات چییە لە هاوڕێ ماو تسیتۆنگ؟ لە وەڵامدا گوتی من پرسیارێکت لێ ئەکەم، ئەگەر چل سەر مەڕ و بزنت لـە ڕەوانـدز بدەمێ ئەتوانیت بە تەنیا هەموویان بگەینیتە ئەم بارەگایە لە ناوکێلەکان؟

سەبری عەرەب بوو بەڵام بە باشـی فێـری کـوردی بووبـوو، گـوتی نـەوەڵڵا بـەم هەموو شـاخ و داخ و شـیو و دارسـتانە بەیەکاچـووەدا زۆر زەحمەتـە! زەردەشـتی گوتی ماو تسیتۆنگ ملیارێك بەڕێوە ئەبات و هیچیشیانی لێ ون نابێت، ئەوەیـە رای من، من و ماو تسیتۆنگ یەك جیاوازییمان هەیە: ئـەو خـۆی ئاقڵـە و میللەتەکەشـی ئاقڵە و بە قسەی ئەکات.. من خۆم ئاقڵم بەڵام میللەتەکەم بە قسەم ناکات.

## زەردەشتی و عەزیز

**عەزیزی حاجی ئەحمەدی جۆلا.. هاوڕێ و قسەخۆش و نوکتەبازی کۆچکردوومان**

عەزیز یەکێك بوو لـە کەسـە هـەرە قسـەخۆش و سوعبەتچییەکانی تـا ئـەمڕۆی سلێمانی، هاوڕێ و دۆستی زۆر بوو، نزیکترینیان کاك مولازم عومەر و بەندە بووین.

بـە پێشـمەرگایەتی هـاتبووە دەرەوە، ڕۆژێـك لـە دوکانەکـەی زەردەشـتی کـە

هاتبووە چۆمان ئەم حیوارە لەنێوان عەزیز و زەردەشتیدا رووی دا. عەزیز کوڕێکی قـۆز بـوو، رانکوچـۆغە و جامانـە و پشـتێنی ئەسـتووری ئەبەسـت، کلاشـینکۆف و دەمانچـە و دووربینێکـیش لـە ملیـدا بـوو، بـەم شـێوەیە هاتـە خزمـەت! عـەلی زەردەشتی. زەردەشتی باسـی تێکۆشـان و کوردایـەتیی خـۆی ئـەکرد کـە تووشـی گرتن و راونـان و لێـدان بـووە و تۆرانییـەکانیش لـە کـەرکوك تێزابیـان کـردووە بـە دەموچاوی دایکیدا و شەهید بووە. عەزیز گوتی: ئینجا ئەوانە چیە لەچاو ئـەوەی بەسەر مندا هات! گوتی: چیت لیّ بەسـەر هـاتووە؟ عـەزیز: تـۆ نازانیـت چـیم لـیّ بەسەر هات و هەر بێزیشم نایەت باسی بکەم و فشەی پێوە بکەم.

– دە بڵیّ بزانم چیت لیّ بەسەر هات.

× بیّ قەزا بیت پیاو لە رێی کوردایەتیدا هەرچی لـیّ بێـت نابێـت باسـی بکـات.. عەیبە بۆ تۆ!

– دە بڵیّ چی بووە هەتیو.. دڵم شەقی برد!

عەزیز گوتی: من لە حیزبدا بووم.

– چاوت دەر بێت، حیزب چیە!!

× نە لە پرۆگرام و نە لە نیزام داخلیی حیزبیشدا ئـەوەی کـە بـاس نـەکرابوو لـە رێگای تێکۆشاندا بەسەرت دێت، من ئازایانە شانم دایـە بـەری.. تـۆ چـیت کـردووە هەر لە خۆتەوە خۆت هەڵئەکێشیت؟

– دە بڵیّ کوڕم چیت لیّ کرا؟

عەزیز گوتی: لە ئینزیباتخانەکەی سلێمانی گرتیانم، پاش ئەوەی هەموو ئازایـان شکاندم بە شەق و بە لێدان.. شـەش عەسـکەری چـەتەوڵی زرتـەبۆز یـەکی شـەش جاریان (گ..)م. تۆ شتی وات لیّ بەسەر هاتووە فشەکەر؟

زەردەشتی واقی وڕما و ئەبڵەق بوو.. گوتی: نەوەڵڵا.

پـاش ئـەوە کـە عـەزیز دیـار نەئـەبوو، مامۆسـتا زەردەشـتی بـە پێکەنینـەوە ئەیگووت: حیزەکە دیار نییە!!

**لە کۆتاییدا ئەبێت وەسیتەکەی بەو شێوەیەی خۆی بۆی کردم بنووسمەوە:**

"کە مردم دە بار دار لە زەویدا رابخەن.. تەرمەکەی منی بخەنە سەر، ئینجا دەبار داری تر بەسەر تەرمەکەمدا بڵاوبکەنەوە و ئاگری تێ بەربدەن." دوا جاریش کە عەلی زەردەشتیم بینی لە رۆژانی شکستەکەی ئازاری ١٩٧٥دا بوو، لە چۆمان، خواحافیزی لە من کرد و گوتی بەرەو سەردەشتی ئێران ئەڕۆم. فرمێسك بە خوڕ بە چاویدا ئەهاتە خوارەوە و منیشی هێنایە گریان.

## دیداری میدیا و رۆژنامەنووسان

ساڵانی ١٩٧٣–١٩٧٥ رۆژنامەنووس و نووسەر و کەسانی سیاسیی سەردانی ناوچە ئازادکراوەکانی شۆڕشیان ئەکرد بۆ کوردستان، بێگومان زوربە یاخود هەموویان ئەهاتنە ناوچەی سەرکردایەتیی شۆڕش بۆ بینین و نووسینی وتار و ریپۆرتاج.

بارەگای ئێمەش یەکێك بوو لەو شوێنانەی ئەم کەسانە سەردانیان ئەکرد و بە حوکمی لێپرسراویی من لە حیزبدا، زوربەی ئەو دیدارانە لەگەڵ مندا ئەنجام ئەدران.

ئەوانەی لە رێگای پارتییەوە ئەهاتنە لای ئێمە یان یاوەر یاخود وەرگێڕێکیان لەگەڵدا ئەهات.

جارێك لە کانی سپیندار خەریکی قوڕەکاریی بینا دروستکردن بووین. رۆژنامەنووسێکی ئەوروپایی لەگەڵ کاك چیای عەباس بەگی ساحێبقڕاندا هاتن بۆ لامان. چیا کوڕێکی رۆشنبیری چەپخواز بوو. زۆر لایان سەیر بوو کە ئێمە بەبێ جیاوازی لە بینا دروستکردنەکەدا بەشدارین، کە یەکێکیان من بووم و لێپرسراوی یەکەمی ئەو بارەگایەی سەرکردایەتیی حیزبی خۆمان بووم.

جارێکی دیکە رۆژنامەنووسێکی فەڕەنسی هات بۆ بینینمان. تەماشام کرد وەك وەرگێڕ دکتۆر ئەحمەد عوسمانی لەگەڵدایە. دکتۆر ئەحمەد عوسمان سەردەمێك لە پاش شۆڕشی ١٤ی تەموزی ١٩٥٨ کرابووە لێپرسراوی ئێستگەی رادیۆی کوردیی بەغدا وەك کەسێکی سەر بە حیزبی شیوعی. پاش ئەوە لە سۆڤێت

دکتۆرای لە مێژووی کورددا وەرگرتبوو و بووە مامۆستا لە کۆلیجی ئادابی زانکۆی بەغدا. تەبیعەتێکی تایبەتی هەبوو لە پەیوەندییەکانیدا کە حەزی نەئەکرد خەڵکی لە خۆی بچووکتر لە تەمەن و لە خوێندندا سەلامی لێ بکەن چ جای ئەوەی لەگەڵیدا دانیشن و گفتوگۆی لەگەڵ بکەن.

جارێك کە هێشتا لە بەغدا بووین لێیان پرسیبوو بۆچی فاروق سەلامی لێ کردوویت وەڵامت نەداوەتەوە؟ گوتبووی ئەوە "طەلەبەی طەلەبەی منە.. ئەوە چییە سەلام لە من بکات."

کاتێك دانیشتین لە بارەگا و من لێپرسراوی حیزبێکم و ئەویش تەنیا وەرگێڕە لەگەڵ رۆژنامەنووسێکی فەڕەنسیدا، زۆر سەری سوڕما، منیش پێم گوت مامۆستا لەلات سەیر نەبێت و هیچ گرژ مەبە کە ئێستا ناچاریت نەك تەنیا قسەم لەگەڵ بکەیت بەڵکو ئەبێت موتەرجیمی من بیت. ئەگەر طەلەبەی تۆ پێشکەوێت بۆ تۆ عەیب نییە بەڵکو سەربەرزییە!

گوتی لەسەری مەڕۆ و ئەم قسانە بۆ ئەم پیاوەش مەکە. دوای تۆزێك لە باس و خواس و دەمەتەقێی سیاسەت کابرا تێگەیشت فەڕەنسییەکەی د. ئەحمەد زۆر باش نییە، لێی پرسی ئینگلیزییەکەت چۆنە؟ گوتی زۆر باشترە. ئیتر دەستکرا بە قسەکردن بە زمانی ئینگلیزی. رۆژنامەنووسەکە پرسیاری ڕای حیزبی ئێمەی لە من ئەپرسی دەربارەی جیاوازییەکانی نێوان یەکێتیی سۆڤێت و چینی میللی، منیش لەگەڵ بۆچوونەکانی چیندا بووم و باوەڕی زۆرم بە بیروباوەڕ و هێڵی سیاسیی حیزبی شیوعیی چین هەبوو بە ڕابەرایەتیی هاوڕێ ماو تسیتۆنگ و دژی هێڵی سیاسیی حیزبی شیوعیی سۆڤێت بووم. بە درێژی لەو باسە ئەدوام. دکتۆر ئەحمەد عوسمان هەندێکی وەك خۆی و زوربەی بە پێچەوانەوە وەرئەگێڕا.

پێم گوت مامۆستا بۆ وا ئەکەیت؟ من ئینگلیزی ئەزانم تۆ وەرگێڕیت لێرەدا نابێت ڕا و بۆچوونی خۆت ئاوەها دەربڕیت. گوتی بەسەری برات قسەکانی من لەوەی تۆ راسترە!

کە ئەم کەینوبەینـەم بـۆ رۆژنامەنووسـە فڕەنسـییەکە گێڕایـەوە زۆر پێکـەنی و گوتی دەفەرموو پێویستمان بەم برادەرە نییە با خۆمان بە ئینگلیزی قسە بکـەین. ئەم گێڕانەوەیە بۆ ناسیاوانی دکتۆر ئەحمـەد عوسمـان لـە مامۆسـتایانی هـاوڕێی و قوتابییەکانی تامی خۆی هەیە.

* * *

## چاو پێکەوتنێك لەگەڵ رۆژنامەنووسێکی سویدی

بە سوپاسێکی زۆرەوە لە برای خۆشەویستم دکتۆر ئەحمەد بامەڕنییەوە کاتێـك سەفیری عێراق بوو لە سوید و زووتریش بەشداری کاری سیاسـی و شۆڕشـیش بـوو ئـەم چـاوپێکەوتنەم پێگەیشـت کـە لـە مـانگی کـانونی یەکـەمی ١٩٧٥دا لـە رۆژنامەیەکی سویدییەوە بۆی پاراستبووم.

ئەمە نووسینەکەیە بە وێنەیەکی منەوە لەگەڵ وەرگێڕانی بۆ سەر زمانی خۆمان:

**جێگای سوپای عێراق (جۆلان)ە نەك کوردستان**

فاروق ئەڵێت:

یەکێتی سۆڤێت کار بۆ بەرژەوەندییەکانی خۆی ئەکات لەسەر حسابی میللەتانی تر.

فاروق سەرۆکی لقی کوردی حیزبی شیوعیی مارکسی — لینینی، قیادەی مەرکەزییە.

یۆران لوندین چاوپێکەوتنێکی کردووە لەگەڵ هاوڕێ فاروق دەربـارەی بۆچـی لیژنـەی مەرکەزی حیزبی شـیوعی جیابوونـەوەی تیـادا دروسـت بـوو و لـە نێـوان گۆڕانخـوازان دەربارەی تۆیژینەوەی بارودۆخی عێراقەوە تێڕوانین بۆ سۆشیال ئیمپریالیزم.

- بۆچی لە ساڵی ١٩٦٧دا لە حیزبەکەتان حیزبی شیوعی جیابوونەوە؟

ئـــەرکی ســـەرەکیی هـــەموو پـــارتێکی کۆمۆنیســـت هەڵگیرســـاندنی شۆڕشـــە و دەستبەسەرداگرتنی دەسەڵاتە بۆ کرێکاران و جووتیاران.

ئێمە شانازی بە پارتەکەمانەوە ئەکەین کە لـە سـاڵانی ٤٠ — ٥٠ کانـدا ئـەو کـات ئێمـە گەورەترین قەوارەی سیاسی بووین و گەورەترین دەرفەتمان هەبوو دەسەڵات بگرینە دەست لە

ڕێگەی هەڵبژاردنی ئازادەوە، بەڵام سەرکردایەتیی حیزبی شیوعی لەلای واوو هەندێك تێگەیشتنی جودایان هەیە بۆ گۆڕانکارییەکان. ئەوان نوێنەرایەتیی هێڵێکیان گرتبووەبەر کە پشتگیری ئەو دەسەڵاتانە بکرێت کە لە لایەن بۆرجواکانەوە دائەنران بۆ نموونە رژێمی قاسم لە ساڵی ١٩٥٨ تا ١٩٦٣ و ئێستاش حیزبی بەعس، حیزبی شیوعییی عێراق لەگەڵ ئەوەدایە و بە شێوەیەکی ئاشکرا لای داوە لە بۆچوونی زۆرینە و بیروباوەڕی مارکسی — لینینی.

ئەمڕۆ ئەجێندای حیزبەکە وەك نوێنەرایەتییەکی یەکێتی سۆڤێت کار ئەکەن نەك بۆ خەڵك، بۆ نمونە تێڕوانینی حیزبی شیوعی (ل. م) لەسەر پرسی کورد پشتگیری کردنی دەسەڵاتە بۆ لەناوبردنی کورد. ئەوەش بە پێی بەرنامەی یەکێتی سۆڤێتە و پاراستنی بەرژەوەندییەکانیێتی.

- بەرژەوەندییەکانی یەکێتی سوڤێت چییە لە عێراق؟

ئەو بزووتنەوە نیشتیمانییەی کە لە هەموو جیهاندا سەری هەڵداوە پێشبڕکێیە. سۆڤێت بەرژەوەندییەکانی خۆی ئەپارێزێت لەسەر حسابی میللەتانی تر، بە ڕوونتر مانای ئەوەیە سۆڤێت ئەیەوێت کۆنترۆڵی نەوتی عێراق بکات لەڕێگەی کەنداوی عەرەبی/ فارسییەوە.

- چ نارەزاییەك هەیە لە عێراق؟

حیزبی بەعس دەسەڵاتی تەواوی خۆی هەیە و نوێنەرایەتی چینی بۆرجوازییەکان ئەکات لە عێراقدا. بۆرجوازییەکان خاڵی هاوبەشیان هەیە لەگەڵ سۆشیال ئیمپریالیزم و ئیمپریالیزمی ئەمریکا. نارەزایی و ناکۆکی سەرەکی لە ولاتی ئێمەدا لە نێوان بۆرجوازە بیرۆکراتەکان و هاوکارەکانیاندایە بەرامبەر میللەت. خەڵك بە گشتی ڕێکخراو نین، بەڵام ئۆپۆزیسیون هەیە، ئەویش پارتی دیموکراتی کوردستان لە ئێستادا سەرۆکایەتی ئەکات. جگە لەو پارتە، ئێمەش لێرەین کە پێکەوە چالاکانە کاری خەباتی چەکداری ئەکەین لەگەڵ سێ تا چوار گرووپی نیشتیمانی و حیزبە سۆشیالیستەکان. زۆرداری وخراپەکاریی حیزبی بەعس وای کردووە خەڵك بە گشتی لە عێراق نەتوانن سەرهەڵدان بکەن. بەعسییەکان نوێنەرایەتیی بەرژەوەندیی بۆرجوازییەکان ئەکەن لەسیاسەتی دەرەوەدا، ئەمەش بە سەیروسەمەرە ئەبینرێت کاتێك عێراق بە ئاشکرا پشتگیری خۆشی بۆ پرسی فەلەستین نیشان داوە.

ئەبێت لە بیرمان نەچێت بەعسییەکان سیاسەتی کورت خایەن پەیڕەو ئەکەن بۆ ئەوەی هەمیشە کێشەی گەورە لە ئارادا بێت.

ئێمە با بچینەوە بۆ چەند ساڵێك لەمەوبەر کاتێك سوپای ئەردەنی قەسابخانەیەکی دروستکرد لە دژی چەکدارە فەلەستینییەکان، لە ئەردەن لەوکاتەدا سوپای عێراقی هەبوو فەلەستینییەکان پەنایان بردە بەر سوپای عێراقی بەڵام سوپاکەی عێراق بەهیچ شێوەیەك فەلەستینییەکانی نەپاراست و هیچ گرنگییان پێ نەدان. ئەگەر عێراق بیەوێت پەیڕەوی سیاسەت بکات نابێت سوپاکەی بەکاربهێنێت لە دژی برا کوردەکان بەڵکو بیاننێرێت بۆ جۆلان و سینا.

- تێگەیشتنی تۆ چییە دەربارەی ناکۆکییەکانی عێراق و ئێران لەسەر کەنداوی عەرەبی / فارسی؟

بەرنامەی ئێران ئاشکرایە، شای ئێران ئەیەوێت کۆنترۆڵی دەروازەی هەناردەی نەوت زامن بکات.

- بە چ شێوەیەك بەعس ئەڕوخێنرێت؟

تەنها بە شۆڕشی چەکداری لە هەموو عێراقدا، ئێستا ئەم شۆڕشە تەنها لە کوردستان هەیە و بۆیە ئەبێت پاڵپشتی لێ بکەین.

هەردوولامان دژی بەعسی فاشستین و هەوڵ ئەدەین دەسەڵاتێکی دیموکراتی پێك بهێنین لە ڕێگای هەڵبژاردنەوە لە لایەن خەڵکەوە، کە ئۆتۆنۆمی بۆ کوردەکان دابین بکات. ئەو پارتە سیاسیانەی کە لەگەڵماندان دژی بەعس بێجگە لە پارتی دیموکراتی کوردستان، ئەمانەن: بەعسییە چەپەکان، سۆشیالیستی عەرەبی، کۆنگرەی نیشتیمانیی عەرەبی، حیزبی یەکێتی عەرەبی، و حیزبی سۆشیالیست.

دەسەڵاتی سەربازی عێراق یەکێکە لە دیارترین هێزەکان لە عێراقدا هەتا ئێستا بۆ مەرامی تایبەتی بەکارئەهێنرێت بەڵام ئەبێت ئەوەمان لە بیر نەچێت سەربازەکان بە زۆر ئەو کارەیان پێ ئەکرێت و هەموویان کوڕی جووتیار و کرێکارن و ئەفسەرەکانیش نوێنەرایەتی بۆرجوازەکان ئەکەن.

بەعسییەکان هەمیشە ئەناڵێنن بە دەست نەخۆشــی گومانکردنــەوە لــە بەشــێك لــە سوپای عێراق و بژاردەیان ئەکەن، ئەفســەرەکان ئەخەنــە بەندیخانــە یــان لــە ســێدارەیان ئەدەن، ئەوەش کاری کردووەتە سەریان و هاندەرە بۆ تەقینەوەی شەڕ لەناو سوپادا. بەڵام خەڵکی بەتوانا لەوێ نییە.

- ئایا جەنراڵ بارزانی سەرکردەی بەهێزی شۆڕشەکەیە؟

بەڵێ. ئەمڕۆ ئێمە پێکەوە خەبات ئەکەین بۆ هەمان مەبەست چـونکە بەرژەوەنـدیی هاوبەشمان هەیە، خەبات ئەکەین بۆ دەسەڵاتیکی دیموکراتی لە عێراق ئێمە ئاوڕ لە دواوە نادەینەوە کە چی ڕووی داوە.

ئەمەوێت نموونەیەکت پێبڵێم، کاتێك ڕێکـەوتنی ١١ی ئـازاری ١٩٧٠ بـوو، نـاکۆك بووین، ئێمە باوەڕمان وابوو خەباتی چـەکداری ئـەبوو بـەردەوام بێـت، هـەلێکی زێـڕین هەبوو بۆ لەناوبردنی بەعسییەکان، سەرکەوتنی تەواو هەبوو بەسەر سـوپای عێـراق دا و زیانی زۆریان پێگەیشتبوو لە چیاکاندا، بەڵام ڕێکەوتنەکە هەلێکی دا بە بەعسیەکان بۆ ئەوەی خۆیان کۆبکەنەوە بۆ دەستپێکردنەوەی شەڕ. تێگەیشـتنمان بـۆ ئـەم بابەتـە وەك خۆی ماوە. رێکەوتن لەگەڵ بەعسییە فاشستەکان ناکرێت و هەموو هەوڵێك لەگەڵ ئـەوان شکست دێنێت.

لەناو بەعسییەکاندا ئێستا بیروڕای جیاواز هەیە، ئەگەر شەڕ بـەردەوام بێـت ئەبێتـە هۆی ئەنجامدانی کودەتا لەناو سـەرکردەکانی بەعسـدا و لەبـەر ئـەوە بەعسـییەکان بـۆ ئەوەی دۆخەکە ئارام بکەنەوە و لەو کێشانە دەرباز بن گفتوگۆیان لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستان دەست پێکردووە، ئەوەش وا ئەکات بزووتنەوەکەمان لە مەترسیدا بێـت بۆیـە ئەبێت زۆر بە ئاگا بین.

6



# "Irakarméns plats är på Golan Inte i Kurdistan"

**— Sovjetunionen företräder sina egna intressen på andra nationers bekostnad, säger Faruk, ordförande för den kurdiska grenen av det marxist-leninistiska kommunistpartiet — Centralkommandot.**

**Göran Lundin har intervjuat kamrat Faruk om varför Centalkommandot bröt med revisionismen, om partiets analys av läget i Irak och synen på socialimperialismen.**

**• Varför bröt ert parti med Irakiska kommunistpartiet 1967?**

— Varje kommunistpartis huvuduppgift är att göra revolution och överta makten åt arbetarna och bönderna. Vi är väldigt stolta över vårt partis utveckling under 40- och 50-talen då vi var det största partiet i landet och hade stora möjligheter att vinna makten i fria val.

Men i partiet hade insmugit sig personer med revisionistisk uppfattning. Dessa förespråkade i stället en linje som gick ut på att stödja olika regimer rekryterade från bourgeoisin, bl a Kassems regim 1958-63 och nu senast Baath-partiet. Därmed har IKP på ett tydligt sätt fjärmat sig från massorna och från de marxist-leninistiska idéerna.

Idag är revisionistpartiet ett språkrör för Sovjets intressen, inte folkets. Titta t ex på partiets ställningstaganden i den kurdiska frågan. IKP kollaborerar öppet med en regim som bedriver terrorkrig mot kurderna. Det gör man i den sovjetiska revisionismens intresse.

**• Vilka intressen har Sovjet i Iran?**

— Den nationella kampen i hela världen är en del av klasskampen. Sovjetunionen företräder sina egna intressen på andra nationers bekostnad. Konkret innebär detta att Sovjet vill kontrollera oljan i Irak och utfarten i Arabiska/persiska viken.

**• Vilka är motsättningarna idag i Irak?**

— Baath-partiet, som innehar den egentliga makten, är representanter för bourgeoisibyråkratklassen i Irak. Bourgeoisin har gemensamma intressen med socialimperialismen, men också med USA-imperialismen.

Huvudmotsättningen i vårt land går mellan byråkratibourgeoisin — med vilka revisionisterna är lierade — och det övriga folket.

Folket är till stora delar oorganiserat men ett visst motstånd existerar. KDP — Kurdiska Demokratiska Partiet — går f n i spetsen för detta motstånd. Utöver KDP finns vårt eget parti, som bl a också aktivt deltar i den kurdiska väpnade kampen, och tre — fyra andra nationella och socialistiska partier. P g a Baath-partiets effektiva förtryckarapparat är det dock mycket svårt att föra kampen i Irak.

Baath representerar bourgeoisins intressen även i utrikespolitiken. Detta kan synas konstigt då Irak gjort sig känt för att stödja den palestinska saken. Men vi måste komma ihåg att Baath för en kortsiktig politik med inslag av värsta opportunism. Vi behöver bara gå tillbaka några få år då den jordanska armén genomförde slakten på den palestinska gerillan. I Jordanien fanns vid denna tidpunkt en stor kontingent irakiska soldater. Palestinierna sökte skydd bakom irakierna men dessa rörde inte ett finger för att understödja eller skydda dem.

Om Irak försökte praktisera sin politik skulle man inte låta sin armé döda kurdiska bröder utan placera den på Golanhöjderna och i Sinai.

**• Vilken uppfattning har ni beträffande den iransk-irakiska konflikten i Arabiska/persiska viken?**

— Irans syften är klara. Shahen vill kontrollera utloppet för att trygga sin egen oljeexport. Samtidigt bekämpar han befrielserörelserna i Dohfar och Oman.

Men det står samtidigt klart att den härskande klassen i Irak långt ifrån gör allt för att försvara det irakiska folkets intressen i viken. Genom att sluta fred på ett demokratiskt sätt med kurderna skulle landet mycket bättre kunna motstå den iranska imperialismen i området. Idag använder Baath konflikten som ett slagträ mot kurderna och som en förevändning att föra kriget.

**• På vilket sätt kan Baath störtas i Irak?**

— Endast genom väpnad kamp i hela Irak. Idag är denna kamp begränsad till Kurdistan och då är det vår plikt att understödja den.

Vi är båda emot det fascistiska Baath och strävar efter att upprätta en demokratisk regering, *vald* av folket. Och ge det kurdiska folket en verklig autonomi.

De partier som ingår i vår front mot Baath är förutom vårt eget parti, KDP, vänsterflygeln av Baath, arabiska socialistiska rörelsen, Nationella arabiska kongressen, Arabiska unionistpartiet och socialistpartiet.

Den irakiska krigsmakten är en av de betydelsefullaste krafterna i Irak. Fram till nu har den tjänat huvudsakligen reaktionära syften. Men vi måste skilja mellan soldaterna, som ofta är tvångskommenderade och själva söner till bönder och arbetare, och officerarna, som representerar bourgeoisin.

Baath lider dock av sjuklig misstänksamhet även mot denna del av armén och företar titt som tätt ordentliga utrensningar. Officerare spärras in eller avrättas. Detta har bl a lett till en utarmning av krigspotentialen i den irakiska armén. Man saknar helt enkelt kunnigt folk.

**• Har general Barzani alltid företrätt en progressiv linje i kampen?**

— Idag samarbetar våra båda partier därför att vi har gemensamma intressen: att upprätta en demokratisk regering i Irak. Vi tittar inte tillbaka på vad som varit tidigare.

Men som exempel kan jag nämna att vi var oense med Barzani och KDP om 11:mars-överenskommelsen 1970. Vi ansåg att den väpnade kampen skulle ha fortsatt. Det fanns ett utmärkt läge för att fullständigt krossa Baath. Deras militärapparat var totalbesegrad och armén hade lidit svåra nederlag i bergen. Men nu gav överenskommelsen Baath det andrum det behövde för att kunna återuppta kriget.

Vår uppfattning står fast idag: Det finns inte plats för överenskommelser med Baath-fascisterna. Alla förhandlingar leder till nederlag. Inom Baath råder f n stora motsättningar. Om kriget fortsätter tillräckligt länge kommer motsättningarna att resultera i kuppförsök och komplotter mot olika ledande personer inom partiet. För att få andrum då, är det inte otänkbart att Baath försöker få igång förhandlingar med KDP igen.

Det blir då som vår rörelse sätts på prov. Det är då det gäller att vara på sin vakt.

دەقی چاوپێکەوتنەکە بە زمانی سویدی

## بە ڕێگاوە: هەندێك دەمەتەقێ لەگەڵ خۆم

شیوعی ئەبێت شۆڕشگێڕ بێت. شۆڕشگێڕیش تەنیا چەك و ڕاپەڕینەکان نییە بەڵکو تێگەیشتنیشە لە هەڵوێستی سیاسی و لەوەی بە چ جۆرێك بەشداری لە هەڵبژاردنە جیاجیاکاندا بکات، هەر لە نەقابەکانی کرێکارانەوە تا نەقابە پیشەییەکان و ڕێکخراوە سیاسییەکان، لەسەر چ پرۆگرامێك لەگەڵ لایەنەکانی دیکەدا ڕێك ئەکەوێت کە ئەبێت بە هەموو حاڵێك ڕێگای بەرەو پێشچوون بێت و ڕوون و ئاشکرا و دوور لە تەمومژ و سەرلێشێواوی.

ئەبێت ئەوە بڵێم کە من لە هەموو ژیانی حیزبیمدا هەر لە ڕۆژانی یەکەمی چوونە ناو یەکیتیی قوتابیانەوە کە لە نێوان پۆلی شەشەمی سەرەتاییەوە تا پۆلی یەکی ناوەندی کە زۆر بە تەمەنی منداڵییەوە چوومە ناو ڕێکخستنەکانیانەوە و هەر لە قۆناغی ناوەندیدا چالاکیی حیزبیم دەستپێکرد، هەر لەو کاتانەوە هەستی ڕاستەقینەی چەپڕەوی و شۆڕشگێڕیم تێدابوو. لەو تەمەنەوە بێجگە لە هەڵسوکەوتی ڕۆژانەی سیاسی لە سنورێکی کەمیشدا بێت دەستم کرد بە خوێندنەوە بە گوێرەی ئەو توانا و زانینە سەرەتاییە و ئەو نامیلکانەش کە لەبەردەستدا بوون. بە مانایەکی تر ئەوەم ئەزانی و باوەڕم وابوو کە ئەبێت شیوعی و حیزبی شیوعی پێش هەموو کەس و گشت حیزبێکی دیکە ئازاتر و شۆڕشگێڕتر بن. من زۆر دژی ئەو تێگەیشتنە بووم کە زوربەی جار حیزب یاخود کادرەکان دوو شتیان تێکەڵ ئەکرد: ئاشتی لە جیهاندا و ڕێگرتنەبەری ئاشتی لە تێکۆشاندا.

هەر لەو تەمەنەشەوە هەستم ئەکرد کە حیزبی شیوعی یاخود ڕاستتر وایە بڵێین هێڵی خاوەن دەسەڵاتی ناو حیزب لە هەڵەدایە بەرامبەر ئەم تێگەیشتنە. هەروەها من ئەگەر ئەو کاتانە بە سادەیی لە ڕێرەوی حیزب و لە کەمترین ئاستدا بووم لە تێگەیشتن لە تیۆریی مارکسیزم — لینینیزمدا، پاش ماوەیەك زۆر بەڕوونی و بەوردی لەوە گەیشتم کە هەڵەی هەرە گەورە ئەوەیە حیزبی شیوعی لە مەسەلە نەتەوەییەکانی کورد بە ڕێبازێکی ڕاستدا ناڕوات.

ئــەبوو بــە گــوێرەی زانســتی ئــەم ڕێگایــە خــۆی مەســەلەی چەوســاندنەوەی نەتــەوەیی بــە بەشــێك دابنرێــت لــە چەوســاندنەوەی چــینایەتی و ســەرکردایەتیی مەســەلەی نەتــەوەیی نەداتــە دەســت حیزبــە وردە بۆرجواکــان و بــە پێچــەوانەی ئەوەوە ئەبوو بەرگریکاری و رابەریکردنی ئەم بوارە گرنگە بـە دەسـت حیزبێکـەوە بێت کە دژی چەوساندنەوەی مرۆڤە بـۆ مـرۆڤ و لـە هـەموو چـین و توێـژەکانی نـاو کۆمەڵ زیاتر بە تەنگ مافی مرۆڤ و مافی گەلانەوە بن لە چارەنووسی خۆیاندا.

هەڵگرتنی دروشمی بەرگریکردن لە مافە رەواکانی گـەلی کـورد ئـەبوو بـە دەسـت شیوعییەکانەوە بێت پێش نەتەوەییەکان، نەك وەك تاکتیکی رۆژانە یاخود قۆناغێك بەڵکو ئەبوو بە باوەڕێکی پتەوەوە ئەوە ڕێنمایی بکرایە و لە ستراتیژی حیزبدا بووایە.

من لێرەدا مەبەستم ئـەوە نییـە حیـزب دەسـتبەرداری مەسـەلەی کـورد و مافـە رەواکانی گەلی کورد بووە لە عێراقدا بەڵکو بۆ ئەوەی خوێنـەری ئـەم ڕایانـەی مـن لێیان تێك نەچێت مەبەستم لە سەرکردایەتییە بەهەڵەچووەکانی حیزبە.

ئـەگینا حیزبـی شـیوعی کـە لـە سـاڵی ١٩٣٤دا دامـەزراوە، لـە سـاڵی ١٩٣٥دا دامەزرێنەری حیزب هاوڕێ فەهد لە رۆژنامەی (کیفاح ئەلشـەعب) دا دانـی نـاوە بـە مافی گەلی کورد لە سەربەخۆییدا و دوابەدوای ئەوەش بە هەڵوێست و بـە پـەیڕەوی دیار ئەوەی دەربڕیوە. من مەبەستم سەرکردایەتیکردنی مەسـەلەی نەتەوەییـە تـا گەیاندنی بە ئامانجە رەواکەی لە سەربەخۆیی و دامەزراندنی حـوکمی دیموکراسـیی میللییەوە و بەرەو سۆشیالیزم.

لێـرەدا ئەمـەوێت ئـەوە دەربخـەم کـە مـن هـەموو کاتێـك پـێم وابـووە کـە شیوعییەکان ئەبوو لە تێکۆشانیاندا باوەڕیان بە بەرپەچدانەوەی توندوتیـژ بووایـە بەرامبەر هەموو دەستدرێژییەك بۆ سەر هاوڕێکانیـان و رێکخسـتنەکانیان کـە ئەمـە بەشێکە لە تێگەیشتن و لەسەر رۆیشتنی بیروباوەڕە شۆرشگێڕییەکانیان.

لــە کوردســتان دەســتدرێژیی لێــدان و کوشــتنی نــاڕەوا روویــدا، لــە بەغــداد و ناوەڕاست و خوارووی عێراقیشدا هەر بەو شێوەیە بوو، ئەمە شـاڵاوێکی داڕێـژراوی

دوژمنەکانی حیزب بوو. بەبێ هیچ روودانێك یاخود کردەوەیەکی نائاسایی لە ساڵی ١٩٥٩دا چەند کەسێکی ناسراو پەلاماری (ئەحمەد غەفور)ی لێپرسراوی رێکخستنەکانی حیزبی شیوعیی سلێمانییان دا کە تێکۆشەرێك بوو پتر لە دە ساڵ لە ژێر ئەشکەنجەدا لەناو زیندانەکانی فەرمانڕەوایی پاشایەتیی عێراقدا خۆڕاگر و سەربەرز بوو.

ئەم زنجیرە دەستدرێژییەیان گەیاندە ئەوەی کە چەند تاوانبارێك بتوانن بە ئاشکرا چەند رۆڵەیەکی تێکۆشەری کورد و شیوعیی سلێمانی لە کانی ماسیی سلێمانیدا بکوژن و سەرکردەیەکی کرێکاریی وەك ئەوڕەحمانی ساڵحی خلە بکوژن و تەرمەکەشی بسوتێنن.

هەروەها لە بەغدا بەعسی و نەتەوەچییە عەرەبەکان بە لێدانی خەڵك و کوشتنی هەندێکی دیکە چەند گەڕەکێکی بەغدا پاکتاو بکەن لە دۆستەکانی حیزبی شیوعی بۆ ئەوەی ئەو گەڕەکانەی وەك ئەعزەمیە و جعێفر لە کەرخ لە ناو بەغدا قۆرخ بکەن بۆ تەراتێنی سیاسیی خۆیان. بەڵێ، باڵێکی گەورە و بەتوانا لە ناو حکومەتدا پشتگیریی ئەکردن بەڵام حیزبیش ئەو ساڵانە زۆر لەوە بەهێزتر بوو کە نەتوانێت ئەم شاڵاوە دڕندە کۆنەپەرستییانە بشکێنێت و ڕاویان بنێت بە هەمان شێوەی توندوتیژیی ئەوان.

ئەم نموونە بچووکانە رەنگدانەوەی سیاسەتێکی ترسنۆکانە و مەیدان چۆڵکردن بوو بۆ هێزەکانی دیکەی ئەو مەیدانە. تا گەیشتە ئەوەی لەو قۆناغەدا شیوعی بە ناسك و ترسنۆك بناسرێت و هەموو دەستدرێژییەك قبوڵ بکات، بەوەش جەماوەرێکی زۆریان لێ دوورکەوتەوە و ئەمە هۆیەکیش بوو لە لاواز بوونی حیزب و کەمبوونەوەی ئەندامەکانیشی.

هەر لەو رۆژانەوە دوو رێبازی جیاواز لە یەك لە ناو حیزبدا دروست بوو کە لە دواییدا وەك بینیمان بوو بە دوو ڕێگای جیاواز: شۆڕشگێڕ و ناشۆڕشگێڕ کە جوانترین ناو لە ناو کوردستاندا ناوبرا بە شۆڕشگێرەکان و سیلمییەکان، بەو

مانایەی لایەنی یەکەم ئەیویست بە ڕێگای شۆڕشدا کاروانی خۆی بەرەو پێش ببات بەرەو وەرگرتنی دەسەڵاتی سیاسی و لایەنی دووهەمیش بە ڕێگای ئاشتی و سیلمی و سەلامەتیدا و بە رازیبوون بە سەرکردەیی حیزبە نەتەوەییە بۆرژوازییەکان و تا گەیشتە ئەوەی هێڵی یەمینیی ریڤیژنیست هەوڵ بدات حیزب هەڵبوەشێنێتەوە و بیخاتە ناو ڕێکخستنێکی نەتەوەیی عەرەبی عەبدولسەلام عارفی ئەو کاتەدا کە ناوی (ئیتیحادی ئیشتیراکی) بوو.

ئاوەها ئەو حیزبە فراوانە تێکۆشەرەیان گەیاندە ئەم ئەنجامەی ئێستا کە بە شەرەشەق و سواڵکردنی دەنگ لە هێزەکانی دیکە ئینجا بتوانێت لە هەڵبژاردنەکانی کوردستان و عێراقدا یەك نوێنەری هەبێت لە ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراقدا کە کاکەی سکرتێریش خۆی حەزی لێیەتی و خۆی پێش ئەم دەورەیە چووە ئەو پۆستەوە و لە کوردستانیشدا تەنیا یەك نوێنەری هەیە ! !

* * *

پاش ئەم ماوەیە کۆششی من هەوڵدان بوو بۆ ڕێگرتنە بەری پتەوکردنی ئەو ڕێکخستنانەی منی تێدابووم و لەو ڕێڕەوشدا هەوڵی پەرەپێدانی گیان و هەستی شۆڕشگێڕییم دا لە ناو ئەو ڕێکخستنانە و لە ناو جەماوەردا.

بە نووسینمەکانمەوە دیارە کە من لە هەموو ژیانی حیزبیمدا لە بەرەی چەپ و شۆڕشگێڕییدا بووم، دژی ملکەچی و هەڵاتن و ترسنۆکی بووم. هەر بۆیە لەو چەند ڕێگایەی کە لە ناو ڕێکخستنەکانی حیزبدا هەبوو، لە ساڵانی دوای ١٩٦٣ و کودەتا خوێناوییەکەی بەعسدا، من بە هەموو توانایەکمەوە لەگەڵ بەرەی شۆڕشگێڕیدا مامەوە و گوێشم نەئەدایە ئەو شیکردنەوە و لێکۆڵینەوە تیۆرییانەی هاوڕێ پێشکەوتوو و سەرکردەکان ئەیانکردن، بۆ سەلماندنی ئەم قسانەم کاتێك لە ساڵانی دوای ١٩٦٣دا کە وەك لە لاپەرەکانی پێشووی ئەم یادەوەرییانەمدا باسم کردووە ڕا و بۆچوونی ناو حیزب سێ ڕێچکەی جیاوازیان گرتبوو، لە نێوان راپەرینی میللی و کودەتای سەربازی و تێکۆشانی چەکداردا، من کە ئەندامی

لیژنەی سوپای عێراقی حیزب بووم و پێش ئەوەی بشگەمە ئـەو پلـە حیزبییـە کـە هەر لە ریزەکانی ئەو هێڵـەدا کادرێـك بـووم، بـە هـەموو توانایەکمـەوە لەگـەڵ ئـەو رایەدا بووم و بڕواشم بە سەرکەوتنی هەبوو، لە هەمان کاتیشدا کە من یەکێك بـووم لە سەرکردەکانی (تیمی کادر) و باوەڕی ئەم کوتلەیەش تێکۆشانی چەکدار بوو بـە دەستپێکردن لە زۆنگاوەکانی خوارووی عێراقەوە، کە دوو بۆچوونی جیـاوازن، بـێ دوو دڵی کارم بۆ ئەم ڕێگایەش کـرد لەسـەر بنـەرەتی ئـەو بـاوەڕەم کـە شـۆڕش و شۆڕشگێڕێتی لە کوێدا و لە چ کاتێکدا بێت من لەگەڵیدا بووم.

هـەروەها لـەو شـاڵاوانەی کرایـە سـەرمان بـە لێـدان و کوشـتن هـەر لـە سـاڵی ١٩٦٣ەوە من بە توندی لەگەڵ بەرپەرچدانەوەی ئـەو تاوانانـە بـووم کـە بەرامبـەر هاوڕێیانی ئێمـە ئـەکرا. هـەر لـە سـلێمانییەوە تـا کـەرکوك و تـا بەغـدا لـە هـەموو سـەردەمەکاندا و خۆیشـم نـەك بـە ڕادەربـڕین بـەڵکو بـە بەشـداریکردن لـە هـەموو چـالاکییەکانی بـەرگری لــە خۆمــان و یــاخود هێــرش بردنــە ســەر دوژمــن و نەیارەکانمان، بەو تێگەیشتنەوە کە شیوعی ئەبێت شۆرشـگێر بێـت نـەك بـە نـاوی ئاشتیخوازییەوە ڕێگای ترسنۆکی و سەرشۆڕی بەرامبـەر نـەیارە چـینایەتییەکان و سیاسییەکانیش بە گشتی بگرێت.

بە داخەوە و پاش ئەو هەموو قوربانییـە گـەورە و گرانانـەی شـیوعییەکان دایـان هەر لە سەرەتای دامەزراندنییەوە تا ئێستا، ڕۆڵـی حیزبـی شـیوعی و بـوونی لـە نـاو کۆمــەڵگای کوردســتان و عێراقــدا زۆر بچــووکە، بــەڵام دنیــا ئــاخر نــەبووە و بــە تێگەیشـتنێکی شۆڕشـگێرانە لـە هـەموو بـار و لایەنەکانـدا دواڕۆژی سۆشـیالیزم هـەر ڕووناکە و من گومانم نییە لەوە ئەگەر نەوەی ئێستا و دواڕۆژ لە ململانێـی چـینایەتی و نەتەوەیی بە باشی تێبگەن و زۆرانبازیی سیاسی لەبـەر ڕوونـاکیی زانسـتی پێشـکەوتووی ئێستا و بەستنەوەی بە مێژووی پێشـووەوە ببەسـتن، هـەزاران کـادر و سـەرکردەی نـوێ پەیدا ئەبن و ئەتوانن دواڕۆژی پڕ بـەختیاری و شارسـتانێتی لـە نیشـتمانێکی ئـازاددا فەراهەم بکەن و چەوساندنەوەی مرۆڤ بۆ مرۆڤ ئەبێتە مێژوویەکی کۆن.

## هەرەسی شۆڕشی ئەیلول لە ساڵی ١٩٧٥دا[١]

لە کۆتایی ساڵی ١٩٦٨ەوە تا سەرەتای بەهاری ساڵی ١٩٧٥، لەنێوان خۆشاردنەوە و کاری نهێنی حیزبایەتی، لەناو شارەکانی سلێمانی و کەرکوك و هەولێردا و لەنێوان ئیشکردن لە ناوچە رزگارکراوەکانی کوردستاندا ژیانم بردەسەر.

ئەو بیرەوەرییە پڕشانازییانەی قەرەداغ و گەرمیان و قەد پاڵی بەمۆ و بناری کوڕەکاژاو و دۆڵی شەهیدان و سەفرە و زەروون و شاخەڕەش و ناوکێلەکان و گوێزان و ناوپردان و قەسرێ و دیلمان، هەریەکەیان شایەنی ئەوەن چەند یادگار و چەند چیرۆکێکیان لەسەر بنووسم.

ئەو ساڵانەی لە ناوچەی باڵەکدا ئەژیام، زوربەی بنکە و بارەگاکانی سەرکردایەتیی شۆڕشی ئەیلول و سیاسییە کوردەکان لەو نزیکانەدا بوون منیش زۆر کاتی ئەو ساڵانە لێپرسراوی پەیوەندیی حیزبی شیوعی عێراق – قیادەی مەرکەزی بووم لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستاندا، بەو هۆیەوە زوربەی سیاسییەکانی ئەو رۆژانەم ئەناسی و لە نزیکەوە ئاگاداری رووداوەکان بووم.

ئەو کاتانە شۆڕشی کورد بە قۆناغێکی یەکجار ناسکدا تێئەپەڕی. هەڵسەنگاندن و هەڵوێستوەرگرتن لێی زۆر کەس و حیزب و دەوڵەتی خستبووە گێژاوەوە و سەریان لەو هاوکێشانە دەرنەئەکرد کە باری سیاسیی ئەوکاتەیان پێك هێنابوو.

شۆڕش رێبازێکی روونی نەبوو، یان راستتر وایە بڵێین ئاسۆیەکی روونی لەبەردەمدا نەبوو، کۆمەڵێك هۆکاری جیاجیا هەبوون کە نەهێڵن سەرکردایەتیی شۆڕش دەسەڵاتیان بشکێت بەسەر لێکدانەوە و شیکردنەوەی ئەو بارودۆخە سیاسییە ئاڵۆز و ناوخۆییانەی تێیی کەوتبوون.

هەندێك مێژوونووس و چەندەها نووسەر یەکێك لە هۆکارە کاریگەرەکانی سەرنەکەوتنی بزووتنەوەی نەتەوەیی کوردیان بە نەزانینی دیبلۆماسییەت دائەنا و

---

[١] پێشتر ئەم نووسینە شیکارییەم لە ژمارە (٣)ی مانگی ئازاری ١٩٩٥ی (گۆڤاری دوارۆژ)دا بڵاوکردووەتەوە.

بەدەنگەوە نەهاتنی کێشەی کوردیان لەلایەن هێزە گەورەکانی جیهانەوە ئەگێڕایەوە بۆ نەفامیی و نەزانینی سیاسیەکانی کورد لە چۆنێتی پەیوەندی لەگەڵ هێزە گەورە جۆراوجۆرەکانی جیهاندا و هەموو ئەو ڕا و بۆچوونانەشیان لە سەرئەنجامی کێشەکە بنیاد ئەنا و سەرنەکەوتن و نەهاتنەدیی ئامانجەکانی شۆڕشیان بە بەڵگەی ئەوە دائەنا.

لێرەدا هەندێك بیرەوەریی ئەگێڕمەوە و هەندێك تیشك ئەخەمەسەر چەند لایەنێکی شۆڕشی ئەیلول بەتایبەتی دەربارەی ئەو شکستە گەورەیەی لە ئازاری ١٩٧٥ دا بەسەریدا هات، لەو باوەڕەوە کە لێکۆڵینەوە لە مێژووی هەر جوڵانەوەیەك یان شۆڕشێك نەگەیشتبێتە ئاکامی خۆی، سوودبەخشتر و پێویستترە لەوەی بەئەنجام گەیشتبێت، توێژینەوە و لێکۆڵینەوەی پلەبەپلەی سەرکەوتنەکان، هەنگاوە راستەکان و هەنگاوە چەوتەکان هەندێك راستی و رووناکی ئەخەنە سەر رێگای ئایندە و درز و کەلێنی کارە ناتەواوەکان پڕئەکەنەوە. توێژینەوەی رەخنەگرانە یارمەتی ئەو کەس و بزووتنەوانە ئەدات و لەکاتی دروستبوونی بارودۆخی سیاسیی هاوجۆری ئەوانەی پێشوودا سوودی خۆی ئەگەیەنێت، بەتایبەتی بۆ ئەوانەی بیانەوێت پەند لە تاقیکردنەوەی خۆیان و گەلانی تریش وەربگرن.

❊ ❊ ❊

پاش یەکەم جەنگی جیهانی، دەوڵەتە ئیمپریالیستەکان لەسەر بنچینەی دابینکردنی بەرژەوەندییە هاوبەشەکانی خۆیان و دەوڵەتە هەرێمییەکانی ناوچەکە، کوردستانیان بەسەر عێراق و تورکیا و ئێران و سوریادا دابەشکرد. سیستەمی سەرمایەداریی جیهانی ئەو سەردەمە داوای گەلی کوردیان بۆ دامەزراندنی قەوارەیەکی نەتەوەیی لەگەڵ بەرهەڵستیکردنی ئەم داوایانە لەلایەن حکومەتەکانی عێراق و تورکیا و ئێران و سوریاوە خستە تەرازووەوە و گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە بەرژەوەندییان لەگەڵ ئەو دەوڵەتانەدا بەهای زیاترە بۆ خۆیان لە مافی رەوای گەلی کورد بۆیە دابەشکردنیان بەسەر کوردستاندا سەپاند.

هەر لەوکاتەدا ئەو چوار دەوڵەتەی کە کوردستانیان بەسەردا دابەشکرا کێشەی کوردیان بە گرفت و مەترسیی هاوبەش دانا و هەموویان لەسەر ڕێگەگرتن لە سەرهەڵدان و سەرکەوتنی شۆڕشی کورد لەگەڵ یەکدا گونجاون و ئەگەر بەگوێرەی بارودۆخی تایبەتیی یەك یا دوو دەوڵەتیان ئاوڕێکیان لە کێشەی کورد دابێتەوە، تائێستا هەر بۆ بەکارهێنانی گەلی کورد و بزووتنەوەکانی بووە دژی دوژمنەکانی خۆیان و لەئەنجامدا سازشیان لەسەر گیروگرفتەکە کردووە و بزووتنەوەی کوردیش قۆچی قوربانیی ئەو ململانێیە بووە، بۆ ئەمەش نمونە زۆرە و پێویست بە ئاماژە بۆکردنیان ناکات.

نۆکەرەکانی ئەوسای ئینگلیز و هەندێك خوێندەوار و مێژوونووسی ساکار، شێخ مەحمودی نەمریان بەوە تاوانبار ئەکرد کە نەیزانیوە مامەڵە لەگەڵ ئینگلیزدا بکات بۆیە (حکومەتی کوردستانی باشوور) لەژێر سێبەری ئاڵای ئینگلیزدا نەچەسپا و ڕووخێنرا.

ئەمە زوڵمێکی بێویژدانانەیە نەك را و ڕەخنەی هەڵە لە قەوارەی حکومەتەکەی بەڵکو هاواری بۆ حکومەتی شورەویش برد، کە هێشتا دوو ساڵی تەواو بەسەر شۆڕشی ئۆکتۆبەردا تێنەپەڕیبوو، تا یارمەتی گەلی کورد بدات. بەڵام ئینگلیز لە سیاسەتیدا نەبوو دەوڵەتێك بۆ کورد دروست بکات دەنا ئەیتوانی یەکێك لە ئینگلیزخواهەکان بهێنێتە پێشەوە و حوکمی کوردستانی بداتە دەست وەکو چۆن لە پلە و پایەی بەرزی حکومەتی عێراقدا جێی بۆ کردنەوە.

قازی محەمەد دوای ئەو گێژاوەی پاش دووەم جەنگی جیهانی هاتە ئاراوە، ویستی سوود لەو بارە نێودەوڵەتییە وەربگرێت و کۆماری مەهاباد بەردەوام بێت، بەڵام لەیەك ئاڵۆزانی باری ئەوسا و بەرژەوەندییەکانی هێزە گەورەکانی جیهان، کۆمارەکەیان خلتانی خوێن کرد و خۆیشی ڕێگای سێدارەی هەڵبژارد.

مەلا مستەفای بارزانی، بە درێژایی هەموو ئەو ساڵانەی سەرکردایەتیی شۆڕشی کوردی کرد، بۆ پەیداکردنی پشت و پەنایەکی بەهێز بۆ شۆڕشەکەی، بۆ وەرگرتنی یارمەتی و هاوکاریی سیاسیی و دارایی، دەرگا نەما لێی نەدا و حکومەتێك نەما پەیوەندیی پێوەنەکات.

راستە هۆکارە ناوخۆییەکان بۆ دامەزراندن و پتەوکردن و پاشان سەرخستنی هەر بزووتنەوەیەك یان شۆڕشێك کۆڵەکەی سەرەکییە، بەڵام هەندێك جار هۆکارە دەرەکییەکان رۆڵی زۆر کاریگەر ئەبینن.

کوردستانیش وەك خاکێکی زەوتکراو و دابەشکراو بەسەر چەند دەوڵەتێکدا و لەوبارە جوگرافییە ئالۆزەدا کە تیایدایە، تا ئەمڕۆ لە بەرژەوەندیی هێزە گەورەکاندا نەبووە، سەربەخۆیی یان شێوەیەك لە حوکمڕانی خۆیی، تەنانەت لە چوارچێوەی هەریەکێك لەو دەوڵەتانەی پێیانەوە لکێندراوە بۆ بسەلمێنن.

لێدوان و شیکردنەوەی لاپەڕەکانی مێژووی شۆڕشی کورد و سەرجەم جوڵانەوەی سیاسیی کورد لە هەموو کوردستاندا و بەتایبەتی لەم کاتە ناسکەدا و بەراوردکردنی هەندێك ئەزموونی سیاسی و هەڵسەنگاندن و تێگەیشتن و دەرکردنی ئەو هۆکارانەی ئەبنە مایەی توندوتۆڵی و پتەوی لە بەرەوڕووبوونەوەی ئەم تاقیکردنەوە نوێیەی کوردی تێدایە و ئەنجامی زانراو نییە، ئەرکێکی دڵسۆزانەیە و کارێکی یەکجار پێویستە.

## خۆشباوەڕی بە گفت و پەیمانی ئێران

لە زستانی ١٩٧٤ دا پرسیارێکم لە دکتۆر مەحمود عەلی عوسمان، ئەندامی مەکتەبی سیاسیی پارتی دیموکراتی کوردستان کرد، دەربارەی ئەگەری رێککەوتنی عێراق و ئێران و چی روودەدات و ئایا پارتی چی ئەکات؟

لە وەڵامدا گوتی: ئەوە قەت روونادات!

منیش بۆ جەختکردنەوە لە پرسیارەکەم هەواڵێکی رۆژنامەیەکی لەندەنیم پێ گەیاند کە نووسیبووی (وەزیرانی دەرەوەی عێراق و ئێران بە نهێنی لە جنێف کۆبوونەتەوە).

بەڵام دکتۆر مەحمود گوتی: هەرچییەك رووبدات ئێرانییەکان بۆمان ئەگێڕنەوە و بەبێ ئاگاداری ئێمە هیچ رێککەوتنێك روونادات!

ئەم قسانە رەنگدانەوەی ئەو خۆشباوەڕییە بێ بنەمایە بوو کە سەرکردایەتیی شۆڕشی کورد لەوکاتەدا بە ئێرانی هەبوو، بەڵام رووداوەکانی دواتر هەمووی بەباکرد.

## باری نێودەوڵەتیی ناوچەکە پێش ڕێککەوتنی ٦ی ئازاری ١٩٧٥

حیزبی بەعس بۆ جاری دووهەم لە ١٧ی تەموزی ١٩٦٨دا فەرمانڕەوایی عێراقی گرتە دەست. کودەتای ١٧ی تەموز، وەك خۆیان ئاشکرایان کرد، بە هاوکاریی حیزبی بەعس و گەورە ئەفسەرانی سەردەمی عارفی ئەنجام درا. لە ٣٠ی تەموزی ١٩٦٨دا، حیزبی بەعس کودەتایەکی دیکەی کرد و ئەفسەرەکانی وەك سەرۆك وەزیران عەبدولڕەزاق نایف و وەزیری بەرگری (ئیبراهیم داود)یان لە حوکم دوورخستەوە و گوتیان ئەمانە نۆکەری ئەمریکان. کودەتاکان هەردووکیان برایانە و بێ تەقە و بێ خوێن ڕشتن برایەوە.

وەك لەدواییدا پەردە لەسەر نهێنییەکانی کودەتاکە هەڵماڵرا، هۆی سەرەکی بۆ بەرپاکردنی کودەتاکە ترس و لەرزی ئەمریکا و بریتانیا لە لاوازیی حکومەتی عەبدولڕەحمان عارف و پەرەسەندنی تێکۆشانی شیوعییەکان بوو بەتایبەتی لەپاش راپەڕینی ١٧ی ئەیلولی ١٩٦٧ و سەرهەڵدانی یەکەم راپەڕینی چەکداریی (قیادەی مەرکەزی) لە زۆنگاوەکانی خوارووی عێراق، ئەو راپەڕینەی کە چەند ئیمپریالیزم و کۆنە پەرستانی عێراقی ترساند، ئەوەندەش دڵی سەرکردەکانی یەکێتی شورەویی ئەوسا و حیزبی شیوعی لیژنەی مەرکەزی (ل. م)ی باوەڕپێکراویانی لە عێراق خستە مەراقەوە و هەر لەوکاتەی حکومەتی بەعس دەستی بە کوشتن و بڕینی قیادەی مەرکەزی کرد و زیاتر لە ٥٠ سەرکردە و کادری پێشکەوتووی لە چەند رۆژێکدا، لەژێر زەبری ئازاردان و ئەشکەنجەدا پارچە پارچە کرد، سۆڤێت رۆژ لەدوای رۆژ لە حکومەتە نیشتمانییە روو رەشەکەی! بەعس نزیکتر ئەبووەوە، حیزبی شیوعیی (ل. م)یش، بە پەلە هەنگاوی هاوکاریی لەگەڵ ئەم رژێمەدا هەڵئەنا.

لەو هەڵچوون و داچوونانەی پەیوەندییەکانی عێراق بە خۆرئاوا و خۆرهەڵاتەوە و لە ئەنجامی سیاسەتی بەعس بۆ سازشی گەورە و ئەمبەر و ئەوبەری نێوان هەردوولادا، لەپێناو مانەوە و بەهێزکردنی خۆیدا، دانی بە حکومەتی ئەڵمانیای خۆرهەڵاتدا نا و ئەم دانپێدانانە دەهۆڵ و زوڕنالێدانێکی زۆری بۆ بەعس تێدابوو،

سەبارەت بەوەی یەکەم حکومەتی دەرەوەی حکومەتە (سۆشیالیستەکان) بوو کە ئەو (هەنگاوە مێژووییە) بنێت. دواتریش عێراق پەیمانی هاوکاری و دۆستایەتی و بەرگریی هاوبەشی لەگەڵ یەکێتی سۆڤێتدا مۆر کرد. هەروەها لە حوزەیرانی ١٩٧٢یشدا حکومەتی عێراق بڕیاری خۆماڵیکردنی نەوتی دا.

ئەم هەڵوێست و گۆڕانکارییانەی سیاسەتی عێراق لە مەیدانی سازشکردنە نێودەوڵەتیەکاندا وەهای لە خۆرئاوا کرد، پەیوەندی بە دۆستە دێرینەکانییەوە پتەو بکات و نەهێڵێت تەرازووی بەرامبەربوونی ئەم دۆستایەتییە بەرەوپێشچووە بەلای سۆڤێتدا سەنگینتر بێت. ناوچەی کەنداو، کە زوربەی زۆری یەدەکی نەوتی جیهانی تێدایە، ئەوساش و ئێستاش ناوەندی ناکۆکی گەورە و گۆڕەپانی بەیەکدادانی مۆنۆپۆلە سەرمایەدارییەکان بووە.

ئێرانیش وەك هێزێکی هەرێمیی گەورە لە ناوچەکەدا و لە سایەی (شاهنشاهی ئاریامیهر)دا بە سەرەڕمی خۆرئاوا و سەگی پاسەوانی کەنداو ناوئەبرا بۆ خۆیشی کەوتبووە هەوای ئەوەوە ببێت بە ئیمپراتۆری ناوچەکە و ئێران بەرەو پەرەسەندنێکی سەرمایەداریی باڵا بەرێت و تەلاری ئیمپراتۆرییەتێکی گەورە بنیاد بنێت کە لەناو دەوڵەتە هەرە گەورەکانی جیهاندا دیار بێت.

خۆرئاوا بە سەرکردایەتیی ئەمریکا، لەو روانگەیەوە کە ئێران پاشکۆی سیستەمە جیهانییەکەی خۆیەتی، خۆیشی هاوکار و ڕێ نیشاندەری سیاسەتی ئێران بوو لە ڕەنگڕشتنی سیاسەتی هەرێمی و نێودەوڵەتیدا.

ناکۆکی نێوان عێراق و ئێران لەسەر (شەتول عەرەب) و هەندێك شوێنی سنوورەکان بەشێکی دیکەی ئەو ناکۆکی و ناڕێکییە مێژووییەی نێوان ئەم دوو دەوڵەتە بوو کە لەگەڵ شەڕی سارد و داگیرکردنی سێ دورگەکەی کەنداو ئاڵۆزاوتر و کڵپەدارتر بوو.

لەم بارودۆخە تازەیەدا ئێران زیاتر لە سەرکردایەتیی بزووتنەوەی کورد نزیك ئەبووەوە و لەوکاتەدا کە هەندێك درۆ و دەلەسەی نەژادی ئاریایەتی کورد و فارسیش ئەخرایە سەرخوان، لەناو ئێراندا داپڵۆسێنی بزووتنەوەی کورد لە

گەرمەیدا بوو، مافەکانی گەلی کورد لە کوردستانی ئێراندا بە توندی پێشێل کرابوو، بەڵام ڕێبازی بەکارهێنانی کێشەی کورد بۆ مەرام و بەرژەوەندیی خۆیان بووە سیاسەتی شای ئێران و لەپشت ئەویشەوە سیاسەتی ئەمریکا و هەموو خۆرئاوا.

شۆڕشی کوردیش وەك بزووتنەوەیەکی مێژوویی گەلێکی چەوساوە و زۆرلێکراو، کەوتبووە نێوان ئەم بەرداشە هەرێمی و جیهانیانەوە. ئاسۆی دۆستایەتی هیچ لایەکی تری بەدی نەئەکرد و مەترسیی پلیشاندنەوەی لەلایەن حکومەتی بەعسەوە مەترسیەکی گەورەبوو.

لەنێوان دان پێدانان بەو پلانەی بەعس دانابوو بۆ جێبەجێ کردنی ڕێککەوتننامەی ١١ی ئازاری ١٩٧٠، کە لەڕاستیدا ئەویش پلان نەبوو بەڵکو پیلانێکی دووربینانە بوو بۆ ئیحتیوای مەسەلەی کورد و پوکاندنەوەی ناوەڕۆکە نەتەوەیی و دیموکراسییەکەی و لەنێوان گفت و پەیمانی ئێران و ئەمریکا بۆ پشتگیریی مافەکانی گەلی کورد، ئەو گفت و پەیمانانەی بەدەم ئەدران و نەئەچوونە سەر کاغەز. ئەو دوودڵی و ڕاڕاییەی لەناو ریزەکانی سەرکردایەتیی شۆڕشی کورددا هەبوو، پاش گفتوگۆیەکی نهێنی و پاشان ئاشکرا لەگەڵ حکومەتی بەغدادا بە پێداگرتن لەسەر جێبەجێکردنی مەرجەکانی شۆڕش بڕایەوە و بە پشتی پەیمانەکانی ئێران و ئەمریکا، پابەندی گفتەکانی حکومەتی بەعس نەبوو.

حکومەتی بەغداش بەهۆی چاکبوونی ئابووریی خۆی لەپاش خۆماڵیکردنی بەرهەمهێنانی نەوت و پڕچەك کردنی نوێی سوپاکەی کە دوای پەیمانی دۆستایەتیی و هاوکاریکردنی عێراقی – سۆڤێتیدا هاتە ئەنجام، زۆر لە جاران سەرچڵتر و سەرکێشتر بوو. ئەو مل نەدانەی شۆڕشی کوردی کرد بە هەلێکی مێژوویی و لەبار بۆ هەڵگیرساندنەوەی شەڕ و پاکتاوکردنی شۆڕشەکە. بێگومان بەعسییەکان بێ پلان نەهاتنە مەیدانی جەنگەوە، بەڵکو لەگەڵ شەڕدا، دوو چەکی کاریگەری تریان بەدەستەوە بوو، یەکەمیان: هەوڵ و کۆششی جەمسەریی دیبلۆماسی و سازشکردنی نێودەوڵەتی. دووهەمیان: سیاسەتی چەواشەکردن و دیماگۆگی (تضلیل) سەبارەت

بە (گوایە) دانپێنان بە مافی گەلی کورد دا بە دامەزراندنی دوو ئەنجومەنی راپەڕانـدن و یاسـادانان (تـەنفیزی و تەشـریعی) و شانبەشانیشـیان پڕوپاگەندەیـەکی سیاسـیی گەورە و فراوان، بۆ ئەم سیاسەتەی لە ناوەوە و دەرەوەی عێراقدا.

## شکستی ئـازاری ١٩٧٥

شۆڕشی ئەیلول (١٩٦١–١٩٧٥) بە یەکێك لە شۆڕشە گەورە و درێژخایەنـەکانی کورد ئەژمێردرێت لە سەرانسەری مێژووی کورد دا.

ئەم شۆڕشە بەشـێکی زۆری کوردسـتانی عێراقـی لـە ژێـر دەسـەڵاتی حکومـەت دەرهێنا و رزگاری کرد و چوارده سـاڵ دەسـەڵاتی خـۆی بەسـەر لادێکـان و چـەند شارۆچکەیەکی ئەو ناوچانەدا گرت کە ژمارەی دانیشتوانیان لە ملیۆنێك تێئەپەڕی. تائەوکاتە هیچ شۆڕشێکی کورد نە ئەوەندە چـەکداری لـە ریزەکانـدا هـەبووە و نـە ئەوەندەش پشتگیریی و بەشداربوونی جەماوەری گەلی بەخۆوە دیوە.

شۆڕشی ئەیلول لـە سـاڵی ١٩٦١ ەوە تـا سـاڵی ١٩٦٩ تـوانی بەربەسـتی پێـنج شاڵاوی سوپای حکومەت بکات، دوای کودەتاکەی بەعس لە ساڵی ١٩٦٣ دا تـوانی هێرشی دڕندانەی هێزە هاوبەشەکانی عێراق و سوریا بشکێنێت.

لە سەردەمی شۆڕشی ئەیلولدا و پاش چەندین شـەڕ و گفتوگـۆ لـە ١١ی ئـازاری ١٩٧٠ دا، حکومـەتی عێـراق شـێوەی ئۆتۆنـۆمی (حـوکمی زاتـی) بـۆ کوردسـتانی عێراق سەلماند. هەرچەندە ئەم سەلماندنە لە چوارچێوەی پلانێکی بەعسدا بوو بـۆ کپکردنی دەنگی بزووتنەوەی کورد و بچـووك کردنـەوەی ئامانجـەکانی و لەدواییـدا هێنانەوەی بۆ ژێر رکێفی خۆی، بەڵام رێککەوتننامەی ١١ی ئازار هەر بە قۆنـاغێکی نوێ لەبەرەو پێشچوونی یاسایی مەسەلەی کورد لە عێراق ئەژمێردرێت.

ئەم شۆڕشە فراوانەی کە هەڵگری ئامانجی رەوای نەتەوەیی گەلی کورد بـوو، بۆچـی لەپڕ لەکاتێکی چاوەڕوان نەکراودا شکستی هێنا و ئەو کارەساتە گەورەیەی لـە ئـازاری ١٩٧٥ دا بەسەرداهات؟

زوربەی نەتەوەییە کوردەکان هەموو هۆکارەکانی ئەو کارەساتەی بەسەر شۆڕشی کورددا هات بۆ هۆکارە دەرەکییەکان ئەگێڕنەوە و هۆکارەکانی دیکە ئەخەنە پشت گوێ.

راستە پیلانەکەی ٦ی ئازاری ١٩٧٥، لەنێوان عێراق و ئێراندا، دەمێك بوو رەنگی بۆ رێژرابوو، ریشەی هەبوو، فراوان بوو، چەند دەوڵەتێك لە نەخشەکێشانیان بەشداربوون، بەڵام ئەوە یەکەم پیلان نەبوو دژی ئەو شۆڕشە بکرێت و لەبەردەم پتەویی جوڵانەوەی کورددا چەندین پیلان و شالاوی ناوخۆ و نێودەوڵەتی خۆیان نەگرت.

ئەمجارە هۆکارە ناوەکیەکان بوونە درز و قڵیشی گەورە لە ریزەکانی شۆڕشدا و لەگەڵ توندیی گورزی رێککەوتنی ٦ی ئازاری ١٩٧٥ دا، سەرکردەکانی شۆڕش تووشی هەژانێکی گەورە بوون و هەردوو هۆکە یەکیان گرت و ئەو کارەساتە جەرگبڕەیان لێکەوتەوە.

## بڵاوبوونەوەی هەواڵی رێککەوتنی ٦ی ئازار

دەنگوباسی رێککەوتنی جەزائیر لە ئێستگەکانی رادیۆی جیهانەوە بڵاوکرایەوە، ئەو رێککەوتنەی شای ئێران و سەدام حسێن بە دەڵاڵیی سەرۆکی جەزائیر هواری بۆمدیەن، مۆریان کرد و بوو بە مۆرکێك بە تەویڵی دوژمنان و پیلانگێڕە هەرێمی و جیهانییەکانەوە، ئەو پیلانگێڕانەی بۆ بەرژەوەندیی ئابووری خۆیان ملیۆنەها ئادەمیزادی وڵاتانی ژێردەست ئەخەنە ژێر پێ و ژێر خاکەوە.

کاتی بڵاوبوونەوەی هەواڵەکە لە بنکەی سەرکردایەتی حیزب بووم لە بناری شاخی رەشی نزیك دێی گوێزان و دراوسێی لوتکەی چیای سەری حەسەن بەگ. هەر بە بیستنی، زۆر بەپەلە بەرەو بارەگای مەکتەبی سیاسیی پارتی دیموکراتی کوردستان کەوتمەڕێ.

کە گەیشتمە (م. س)ی پارتی نە کاك حەبیب محەمەد کەریم – سکرتێری پارتی و نە دکتۆر مەحمود عەلی عوسمان کە کارگێڕی مەکتەبی سیاسی بوون و بە

جووته کاریان بەرپێوه ئەبرد، لەوێ نەبوون، خوالێخۆشبوو نوری شاوەیس لە جێگای ئەوان دانیشتبوو.

کاك نوریش مەترسیی لە رێککەوتنەکە هەبوو، ئەترسا ئێران نەهێڵێت بارزانی بە ئاسانی بگەڕێتەوە بۆ کوردستان. لە قسەکانی ئەو تێگەیشتم کە بارزانی پێش ئاشکراکردنی رێککەوتنەکەی جەزائیر بانگکراوە بۆ ئێران و دکتۆر مەحمودیشی لەگەڵدایە.

ئەو رۆژە ژمارەیەکی زۆر کادر و لێپرسراوانی پێشمەرگەم دی، زوربەی خەڵکەکە سەریان لەو رووداوە سوورمابوو، بە ترس و گومانەوە ئەیانڕوانییە هەڵوێستی ئایندەی (دۆستەکان) و هەریەکە چەند ئەگەرێك لەبەردەمیدا بوو[1].

## هەڵوێستی حیزبی شیوعیی عێراق - قیادەی مەرکەزی

حیزبی شیوعیی عێراق (قیادەی مەرکەزی) یەکێك بوو لە هێزە بەرهەڵستکارەکانی بەعس و لە ناوچە رزگارکراوەکاندا بنکە و چەکداری خۆی هەبوو.

لە یەکەم چرکەی بیستنی هەواڵی رێککەوتنامەی جەزائیرەوە، هەڵوێستی روون و ئاشکرای وەرگرت و بە نووسین و شێوەی جۆراوجۆری تر بڵاوی کردەوە، هەڵوێستی بەردەوامبوونی شۆڕش و بەرهەڵستکردنی شاڵاوی حکومەت و رەتکردنەوەی رێککەوتنامەی ٦ی ئازاری وەك رێگای راستی شۆڕشگێڕانە راگەیاند.

شۆڕشی کورد پێویستی بە بەخۆدا چوونەوەیەکی قووڵ و فراوان هەبوو بۆ ئەوەی گۆڕانکاریی بنەڕەتی لە رێباز و فیکر و رێکخستنیدا بەدیبهێنێت. لەوکاتەدا قیادەی مەرکەزی جاڕی بۆ هەڵوێستی خۆی بە هەموو لایەکدا ئەدا و دەستنیشانی کەموکوڕییەکانی ئەکرد و پێشنیاری بۆ چارەسەرکردنیان ئەخستەڕوو، دەنگوباسی قارەمانێتیی پێشمەرگە لە چەند بەرەیەکی شەڕدا ئەوەی ئەچەسپاند کە بەرهەڵستکردنی سوپای بەعس لە بارودۆخی کشانەوەی هێزەکانی ئێراندا و

---

[1] ئەو ساڵانە، بەتایبەتی دوای ١١ی ئازاری ١٩٧٠، زاراوەی (دۆست)یان لەبری ناوهێنانی ئێران بەکارئەهێنا.

پشت بەخۆبەستن، گیانی نیشتمانپەروەری و تەوژمی شۆڕشگێڕێتی، دەماری پێشمەرگە ئەبزوێنێت و فیداکارییان زیاتر جۆش ئەدات.

ح. ش. ع – قیادەی مەرکەزی هەر لە یەکەم رۆژی جیابوونەوەی لە هێڵی راستڕەوی تەحریفیی حیزب لە ئەیلولی ١٩٦٧دا، کەوتبووە بەر شالاوێکی چەند جەمسەریی جۆراوجۆرەوە، حکومەتی بەعس بە کوشتن و بڕین و راونان و (ل. م)یش بە پڕوپاگەندەی سەرکێشی و سەرچڵی و چەپڕەویی مەترسیلێکراوی هەڵوێستی قیادەی مەرکەزی، بۆ پاڵ پێوەنانی بەعس بۆ خەستکردنەوەی شالاوەکەی، هێرشی بەردەوامی حیزب و حکومەتە بەناو سۆشیالیستەکانی خۆرهەلاتی ئەوروپا و لەسەروو هەموویانەوە یەکێتیی سۆڤێت، بە چەند شێوەی جیاجیا.

لەو کاتانەدا قیادەی مەرکەزی کە رێگای تێکۆشانی سەختی خوێناویی چەکداریی هەڵبژاردبوو بۆ بەرەنگاربوونەوەی فاشیزم، لە کوردستاندا رێگای راستی بەردەوامبوونی لە هاوکاریی پارتی دیموکراتی کوردستاندا گرتبووەبەر، رێگای بەشداریکردن لە شۆڕشی کورد دا نەك دوژمنایەتیکردنی. ئەڵێم لەو سالانەدا قیادەی مەرکەزی بێجگە لە یارمەتی ئەندام و لایەنگرانی خۆی هیچ سەرچاوەیەکی تری دارایی نەبوو، لە کوردستانیشدا لەو رۆژەوە (موسلێح مستەفا)ی ناپاك لە حیزب دەرکرا، بێ ئەو یارمەتییە بچووکەی چەکدارەکانی حیزب، ئەوانەی لە ریزی پێشمەرگەدا بوون، مانگانەیان بۆ ژیانی خۆیان هەبوو، هیچ جۆرە پەیوەندییەکی داراییمان بە پارتی و دەزگاکانی شۆڕشەوە نەمابوو.

ئەو رۆژەی رێککەوتننامەی ٦ی ئازاری ١٩٧٥ی تێدا بلاو کرایەوە، قیادەی مەرکەزی لە کوردستاندا خاوەنی کەمتر لە دوو هەزار دینار بوو! کاتێك ویستی چەکەکان و کتێبخانەی حیزب بگوێزێتەوە، ئەم پارەیە ئەمەندەی ئێستر، کە تاقە هۆی گواستنەوە بوو، پێ نەدەکڕدرا کە ئەو مەبەستەی پێ مەیسەر بێت.

من وەك لێپرسراوی قیادەی مەرکەزی لە کوردستان، لەسەرەتادا لەگەڵ کاك ئیدریس بارزانیدا لەو رووداو و بارە سیاسییە تازەیە دواین و داوامان لێکرد سەرۆك

بـارزانی ببیــنین. ئــەو رۆژە قســەکانی کــاك ئیــدریس جێــی دڵخۆشــی بــوون، بــۆ بەرهەڵستیکردنی دوژمنـانی گەلەکـەمان، هیوایـەکی زۆری تێـدابوو. هـەر ئـەو رۆژە لـە زمانی یەکێك لە لێپرسراوەکانی پێشمەرگە، کە کاك عیزەت سلێمان بەگی دەرگەڵە بوو بیستم کە سەرۆك بارزانی لە ئێران گەڕاوەتەوە و رای وایە کە (ئێمـە شـۆڕشمان بـە ٣٠ کەسەوە دەست پێکردووە، ئێستا بەم هەموو هێزو توانایەوە چۆن واز لە شۆڕش دێنین).

## کشانەوەی هێزەکانی ئێران

ئەوەی ئێمە ئاگاداری بووین و ئەمانبینی، ئێرانییـەکان چـەند کەتیبەیـەکی دژە ئاسمانییان هێنـابووە ئەمـدیوی حـاجی هۆمەرانـەوە، هـەروەها تۆپخانـەکانیان لـە ناوچــەکانی نزیــك بــەرەی شــەڕدا بڵاوکردبــووەوە، بــوونی ســوپای ئێرانــی و موخابـەراتی ئێرانـی لـە زۆر شـوێنی کوردسـتاندا شـتێکی ئاشـکرا بـوون، لەگـەڵ بڵاوکردنەوەی رێککەوتننامەی جەزائیردا ئـەم هێزانـەی ئێـران بـەبێ خواحـافیزی! خۆیان و تۆپ و تۆپخانەکانیان پێچایەوە و بەرەو ئێران گەڕانە دواوە.

ئەم شێوە کشانەوەیەی ئەوان بوو بەهۆی ترس و لەرز و رەشبینی بـۆ ئەوانـەی باوەڕیان بە دۆستایەتیی شای ئێران هەبوو. رق و کینەشی لە دڵـی ئەوانـەدا زیـاتر ئەکرد کە باوەڕیان وابوو ئێرانی کۆنەپەرست و دوژمنـی دیموکراسـی و مـافی گـەلی کورد، تەنیا بۆ بەرژەوەنـدیی خـۆی، بـە نـاوی یارمەتییـەوە دەسـتی یارمـەتی بـۆ شۆڕشی کورد درێژکردووە.

## بە یەکگەیشتنەکان بۆ بەرهەڵستیکردن

بێجگە لە ئێمە کە پێشـەنگی بانگـدانی بەرهەڵسـتیکەر بـووین، شـەهیدان عـەلی عەسکەری و تاهیر عەلی والی بەگ لە ریزی پێشەوەی ئەو تێکۆشەرانەدا بـوون، کـە هەوڵی بەرهەڵستی (مقاومە)یان ئەدا. ناسیاوێتی ئینجا برادەرێتی کـاك عـەلی و مـن لـە سـاڵی ١٩٧٠ ەوە دەسـتی پێکـرد، ئـەو چـەند سـاڵە برادەرێتییـەکی بـەتینمان

هەبوو، بەڵام لەگەڵ کاك تاهیر هاوڕێی منالّی بووین و لـە سـالّی ١٩٥٥دا شـانەیەکی یەکێتی قوتابیانی سەر بە حیزبی شیوعی لە خوێندنگەی ناوەندیی سـلێمانی کـۆی کردبووینەوە و هەمیشە هاوڕێی یەك بووین.

من هەڵوێستی حیزبم بۆ ئـەوان روونکـردەوە و کەوتینـە هەڵسـەنگاندنی هـەموو رووداوەکان و ئەو هێز و توانایانەی پشتیان پێئەبەسترێت لە بەرهەڵستیکردندا.

هاوکات لەگەڵ ئەو بینینانەدا، لەگەڵ هاوڕێیانی کۆمەڵـەی مارکسـی – لینینیـی کوردستان کە بە نهێنی کاریان ئەکرد، یەکترمان دی و ڕاوبۆچوون و پێشبینی ئـەو رۆژە و داهاتوومـان ئەگۆڕییـەوە. شـەهید شـەهاب شـێخ نـوری و کـاك فەرەیـدون عەبدولقادر هەڵوێستی کۆمەڵەیان بۆ ئێمە دەربڕی و رێککەوتین رۆژانە یەك ببیـنین و کار بۆ بەرهەڵستی و شۆڕش بکەین.

لەگەڵ هەردوو شەهید تاهیر و شەهاب دا چەند جارێك لە مالّی کاك بابـا تـاهیری شێخ جەلالی حەفید لە ناوپردان کۆبووینەوە کە ئەویش لایەنگریی بەرهەڵستیی ئەکرد.

یـەکێکی تـر لـەو کەسـە ناسـراوانەی هەڵوێسـتی دیاریـان هـەبوو بـۆ هەوڵـدانی بەرهەڵستیکردنی شالاوی حکومەت و بەردەوامبوونی شۆڕش و ئێمـە پەیوەنـدیمان پێوەی هەبوو، شەهید نوری حەمە عەلی بـوو، شـەهید نـوری کۆمـەڵێك لێپرسـراو و پێشمەرگەی لەگەڵدا بـوو کـە ئامـادەبوون بـۆ بەشـداربوون لـەو شـێوە شۆڕشـەی داهاتوو کە لێی ئەدواین.

هەر لە بەسەراچـوونەوەی ئـەم بیرەوەرییانـەدا ئـەبێت هەڵوێسـتی جوامێرانـەی کاك نوری مەلا مـارف لـەیاد نـەکرێت کـە بـە پەرۆشـەوە هـانی هـەمووماني ئـەدا و ئامادەیی خۆی بۆ بەرهەڵستیکردن نیشان ئەدا.

کاك نوری یەکێك بوو لـە ئەفسـەرە سـەربازییەکانی شۆڕشـی ئـەیلول و ئـەویش وەك زۆر ئەفسەر و کادری دیکە لە شاخ پێی وابـوو رۆڵـی پێویسـتی پـێ نـەدراوە. رۆژێکیـان کـاك نـوری پێـی گـوتم: "چـوومەتە لای بـارزانی و پـێم گوتـووە ئێمـە کۆمەڵێك ئەفسەرین کە هیچ رۆڵێکمان پێ نەدراوە و بەدڵنیاییشەوە ئەگـەر رێگـەی

کارمان پێ بدرێت، کودەتا ناکەین!" دواتر کاك نوری گوتی: "بارزانی فەرمانێکی بۆ ئیمزا کردم و منی کرد بە (فەرماندەی هێزی بەرگریی میللی).. ئەوەش یەعنی هیچ!"

لە بادینانیش پەیوەندیمان بە کاك رەشید دۆسکییەوە کرد زۆر بەگەرمییەوە پەیمانی هاوکاریکردنی پێداین.

## پێ راگەیاندنێکی چاوەڕواننەکراو

لە تاریك و لێڵی ئێوارەیەکی ئەو رۆژانەی ئازاردا، لەگەڵ چەند هاوڕێیەکدا گەڕابووینەوە بنکەکەی خۆمان، دڵمان بە بەرهەمی چالاکیی ئەو رۆژە خۆش بوو.

فڕۆکەکانی حکومەت بۆردومانیان ئەکرد و تۆپەکانیان زەوییەکی زۆریان ئەکێڵا و گرمە و زرمەی هەموویان بۆ ساتێك بێدەنگ نەئەبوون، بەڵام ئەو گیانە شۆڕشگێڕییە مەردانەیەی لە زۆر کەسدا بەدی ئەکرا، بەسەر هەموو ترس و ماڵوێرانی و خوێنڕژاندا زاڵ بوو، هیوای ئەوەمان هەبوو کە پاش کشانەوەی ئێران لە کوردستان شۆڕش بە بەژنێکی بەرزتر و بەرگێکی جوانتر و ناوەڕۆکێکی نوێترەوە هەنگاو بەرەو سەرکەوتن هەڵئەهێنێت.

ئەو ئێوارەیە لەپڕ شەهید دارا تۆفیق سەری لێداین و راسپاردەیەکی کاك ئیدریس بارزانی پێ راگەیاندین کە ئەوەی لە بینینەکانی پێشوودا لەسەری رێککەوتبووین، نایەتەدی و پارتی بڕیاری کشانەوەی داوە بۆ ئێران، با قیادەی مەرکەزیش هەوڵ بدات خۆی بگەیەنێتە سوریا.

لەو چرکە مێژووییە پڕ ناسۆرەدا، شەهید دارا بەخەم و پەژارەیەکی زۆرەوە ئاماژەی بۆ ئەوەکرد کە ئەمە یەکەم شۆڕش نییە و دوا شۆڕشیش نابێت کە ئیمپریالیزم بۆ بەرژەوەندییەکانی خۆی ئەیکاتە قوربانی. هێزە نێودەوڵەتییەکان ئەمە پیشەیانە. هەر شەهید دارا کاتی خۆی مامەڵەی سۆڤێتی بۆ باس کردبووم کە چۆن لە ساڵی ١٩٦٣ دا پۆناماریۆف، کە ئەوکاتە پاڵێوراوی مەکتەبی سیاسیی حیزبی شیوعی سۆڤێتی و لێپرسراوی پەیوەندییەکانی دەرەوەی حیزب بوو، بەمدا

راسپاردەیەکی بۆ بارزانی ناردبوو کە دژی بەعس شەڕ بکات و یەکێتی سۆڤێت هەموو پشتیوانییەکی لێئەکات تا رادەی چەك و بەرگ و خواردن فرێدان بەهۆی فڕۆکەوە، بەڵام کاتێك لەگەڵ بەعسدا رێك کەوتن لە بەڵێنەکانیان پاشگەز بوونەوە و هاوپەیمانێتی بەعسیان لە هاوپەیمانێتی گەلی عێراق و بزووتنەوەی کورد بەلاوە پەسەندتر بوو.

## چاوپێکەوتنی بارزانی

مەلا مستەفای بارزانی سەرکردەی هەرە دیاری رزگاریی نەتەوایەتی کورد بوو لە نیو سەدەی رابردوودا. لە سەردەمی بارزانیدا بزووتنەوەی کورد و شۆڕشی کوردی بەڕادەیەك گەیشت لە هیچ سەردەمێکی پێشووتردا پێی نەگەیشتبوو، بارزانی نەمر پیاوێکی بەهەیبەت و خاوەن کەسایەتییەکی بەهێزیش بوو، لە رووخساریدا سالآنێکی دوور و درێژ خەبات و ماندوێتیت بەدی ئەکرد. ئەو شەوە من بۆ چاوپێکەوتنی چووم و چەند سەعاتێك بە ئامادەبوونی زوربەی ئەندامەکانی لیژنەی ناوەندیی پارتی لەگەڵیدا دانیشتم، ئێش و ئازار و حەسرەتێکی زۆر لە رەنگ و دەنگ و چاویدا دیاربوو. هەرچەند ئەیویست بە ئازایی و زاڵیی کەسایەتیی خۆی، لەو تەنگوچەڵەمە و کارەساتە گەورەیەدا، ئەو هەستەی ناخی دابپۆشێت، بەڵام یەکێکی وەکو من کە چەند جار لەکاتی خۆشی و ناخۆشیدا دیبووم، هەستم بەو ئازار و حەسرەتە قووڵەی ناو دڵ و دەروونی ئەکرد.

بارزانی رووی تێکردم و داوای بیروڕای دەربارەی رووداوەکان لێکردم. منیش بیروڕای حیزبم پێ ڕاگەیاند بەوەی کە رێککەوتننامەی جەزائیر رووداوێکی زۆر سەیر نییە بەلامانەوە، سەیر هەڵوێستی ئێوەی (قسەکە رووی لە بارزانییە) خاوەن مێژووی ئازایەتی و تێکۆشانن واز لە بەردەوام بوونی شۆڕش بهێنن و بکشێنەوە بۆ ناو ئێران، بۆ ژێر دەسەلآتی پیلانگێڕەکە !

بارزانی گوتی: راست ئەکەن ئەمە پیلانێکی گەورەیە، بەڵام هەرچۆنێکی لێك ئەدەینەوە، ناتوانین ئێستا بەرهەڵستیی شالآوی عێراق و دوژمنایەتیی ئێران

بکەین. ئەم شەڕە لەمەودوا زۆر ئەکەوێت لەسەرمان. من لەم بارەی دێتە پێشەوە بە مەسڵەحەتی نازانم لەمە زیاتر کوڕی کورد بەکوشت بدەین. دنیاش زۆری بە بەرەوەیە، ئێران کە کەوتە بەری دوژمنایەتییەوە، وەزعی کورد زۆر ترسناك ئەبێت، ئەم هەموو بەرەی شەڕانە.. دابینکردنی چەك و تەقەمەنی و خواردن بۆیان، بەڕێوەچوونیان مەحاڵ ئەبێت.

من بە درێژی لەسەر مەترسیی وازهێنان و چوونە ناو ئێران دوام و بەشێوەیەکی تر باری داهاتووم بۆ شی ئەکردەوە، ئێمە باوەڕمان وابوو سەرلەنوێ بە شۆڕشدا بچینەوە و لەسەر بنەمایەکی تر ناوەڕۆکەکەی بگۆڕدرێت و لەسەر بنچینەیەکی شۆڕشگێڕانەتر و پشتبەستووتر بە جەماوەری چەوساوە و زەحمەتکێشی کوردستان دابمەزرێتەوە و لەسەرەتاوە لە شێوەی شەڕی بەرەیی (جبهوی)یەوە بگۆڕێت بە شەڕی پارتیزانی، ئەوا مەترسیی ئەو گەمارۆدانە ترسناکەی کە ئیمپریالیزم و نۆکەرەکانی و عێراق ئەیکەنە سەر شۆڕشی کورد، کەم ئەبێتەوە و شێوان و پشێوییەکی بەربڵاو ئەکەوێتە ناو ئێرانەوە، بەتایبەتی ئەوکاتە، دوو مانگ ئەبوو زانکۆی تاران مانگرتنێکی گشتی و سەرکەوتووی دژی حکومەتی شای تێدابوو، بزووتنەوەی دژ بە شا و فەرمانڕەواییەکەی لە پەرەسەندندا بوو.

ئێمە رامان وابوو کە دامرکاندنەوەی گڕی ئەم شۆڕشە کارێکی گەورە ئەکاتە سەر گەلی کورد و پلانی تەعریب و تەبعیس هەموو کوردستان ئەگرێتەوە.

کاك رەشید سندی یەکێك بوو لە سەرکردە ناودارەکانی پارتی و پێشمەرگە، بەشداری کرد لە مشتومڕەکاندا و بۆچوونەکانی منی بە رەشبینی لەقەڵەم دا و وەهای مەسەلەکە خستەڕوو کە بارزانی کاتی خۆی بەناو سێ دەوڵەتدا کشایەوە و رووی لە یەکێتی سۆڤێت کرد و شۆڕشی هەڵگیرساندەوە. لە وەڵامدا من ئەوەم گوت کە کات و شوێن جیاوازە و نابێت بە هیوای دواڕۆژ، هەلی ئەمڕۆ لەدەست بدەین و قوربانیی زیاتر بدەین.

پاشان و دوای بەشداربوونی چەند کەسێك لەو باسانەدا، ساڵح یوسفی و کاك سامی عەبدولڕەحمان و دکتۆر مەحمود، من بەناوی حیزبمانەوە ئەم بەرنامەیەم پێشکەش کرد:

١– ئیعلانکردنی بەردەوامبوونی شۆڕش.

٢– تاوانبارکردنی هەڵوێستی ئێران و ئەمریکا و جەزائیر.

٣– دامەزراندنی بەرەیەکی نیشتیمانی لە کوردستاندا.

٤– پارتی دیموکراتی کوردستان بێتە ناو (التجمع الوطني العراقي)یەوە، کە حەوت حیزبی عێراقی تێدا کۆبووبوونەوە و قیادەی مەرکەزی لایەکی سەرەکی بوو تیایدا.

٥– دەست بەسەراگرتن و شاردنەوە و گوێزانەوە و دابەشکردنی چەك و تەقەمەنی بەسەر ئەو ناوچانەدا کە ئەبنە بنکەی سەرەکی لە ئایندەی شۆڕشدا.

٦– زۆر بەپەلە و سەرلەنوێ، هێزەکانی پێشمەرگە بەو شێوە و پێکهاتەیەی بۆ شەڕی چەتەگەری بگونجێن، دابمەزرێنەوە و ئەو حیزب و گروپانەی لە بەرەی داهاتوودا ئەبن، لە هەموو کاروبارەکانیدا بەشدار بن.

پاش ئەوەی هەندێك مشتومڕ و بیروڕا گۆڕینەوەی سادە لەسەر بەرنامەکە کرا، داوام لە بارزانی کرد لە حاڵەتی مانەوە و بەردەوامبوونمان لەسەر شۆڕش، پێویستیی مانەوە و بەردەوامبوونمان بۆ دابین بکەن.

بارزانی لەو پێویستیانەی پرسی، منیش بە پارە و چەك دیارییم کرد. رووی کردە شەهید ساڵح یوسفی و سامی عەبدولڕەحمان و داوای رەئیانی کرد لەسەر داواکانی ئێمە، ئەوانیش هەردووکیان لایەنگریی داواکەیان کرد. کە باس لە چەند و چۆنی کرا، خوالێخۆشبوو ئیدریس بارزانی پێشنیازی کرد ئەوە بە کۆمەڵ باس نەکرێت و بخرێتە بەینی خۆی و منەوە و پێکەوە لەسەر وردەکارییەکان رێك ئەکەوین.

دەربارەی پارە، کاك ئیدریسیش وەك بارزانی خۆی لەوەپێش باسی ئەکرد دەری خست کە باری داراییان زۆر خراپە و چەند مانگێکە یارمەتی پێشمەرگەش دابەش نەکراوە، لە ئەنجامدا بەرەو رووی کاك محەمەد عەزیز کرایەوە، ئەویش نامەیەکی کاك ئیدریسی نیشانی نوێنەرەکەی ئێمە دابوو کە نوسراوە ٦٠٠ دیناریان بۆ سەرف بکەن، ئەویش نووسراوێکی نارد بۆ ئەمانەتی دارایی و پارەکە کە

هاتەوە، لەباتی شەش سەد، هەزار دینار بوو، ئیتر نەمانزانی کاك محەمەد عەزیز ئەو زیادەیەی خستبووە سەر یاخود کاك عەلی عەبدوڵڵا کە ئەمینی گشتی دارایی بوو.

دەربارەی چەکیش لەوێ هیچیان نەداینێ، کاك ئیدریس لەگەڵ یەکێك لە لێپرسراوەکانی خۆیاندا رێك کەوتبوو کە لەپشتی قەڵادزێوە بەیەك بگەین و برێك چەکی هەمەجۆرەیان لێ وەربگرین، کاتێك هێزەکەی ئێمە لە کشانەوەدا بووین، لە ناوچەی باڵەکەوە بۆ شارباژێڕ، بڕیار وابوو لەو شوێنەی رێك کەوتبووین لەسەری چەکەکان وەربگرین، بەڵام پێش گەیشتنی ئەو هێزەی ئێمە بۆ ئەو شوێنە تاقمێك چەکدار رێگایان پێگرت و شەڕێك روویدا، یەکێکیان لێ بریندار کرا و دوو کەسیشیان لێ دەستگیرکرا، ئەوەبوو بەهۆی گۆڕینی رێگا و بێ ئەنجامیی ئەو مەوعیدە بەهۆی ئەو رووداوەوە. پاش ساڵانێکی درێژ بۆمان دەرکەوت کە ئەو لێپرسراوە چاوەڕێی ئێمەی کردووە و کە نەیگەیشتووینێ، لەگەڵ هێزەکەیدا بەرەو ئێران کشاوەتەوە، ئەویش عەریف دەروێش بوو.

دوای ئەو کۆبوونەوەیە لەگەڵ بارزانی و سەرکردەکانی پارتیدا، دوا پزیسکی هیوای بەرهەڵستی و پەرەپێدان بەو شۆڕشە کوژایەوە. پاش ئەو چاوپێکەوتنەی بارزانی کە دواجار بوو لە ژیانمدا بینیم، بەرەبەیان بوو لە یەکێك لە ژوورەکانی میوانخانەکەی بارزانی لە حاجی هۆمەران، نووسەری بەناوبانگ جەرجیس فەتحوڵڵام دی، خەوی زڕابوو و بۆڵە بۆڵ و ئاخ و داخی بوو، دەمێك بیروڕامان ئاڵوگۆڕ کرد و دواقسەی ئەمەبوو: (انتم قاوموا... وانا فی الخارج اكتب عنكم). (ئێوە بەرگری بکەن .. منیش لە دەرەوە دەربارەتان ئەنووسم).

سەرباری ئەو کەشوهەوای بێ ئومێدییە، دەستمان کرد بە پەیوەندی گورجوگۆڵ و بەپەلە بە هەموو لایەن و لێپرسراو و ئەو کەسانەی رێککەوتبوین لەسەر بەردەوامبوونی شۆڕش.

شکستیی جوڵانەوەکە ئەمەندە گەورەبوو کە سەعات لەدوای سەعات و رۆژ لەدوای رۆژ دەنگوباسی تازە ئەبیسترا و دوودڵی ئەخستە ناو ریزی ئاڵا

هـەڵگرەکانی شۆڕشـی داهـاتووەوە. دوای گفتوگـۆ لـەنێوان قیـادەی مەرکـەزی و کۆمەڵەی مارکسی – لینینی و ئەو کەس و هێزانەی شـەهید تـاهیر عـەلی والی بـەگ سەرکردەیان بوو، کە لە دەربەندی رایات بەیەك گەیشتین، بڕیارمان دا لە پێنجـوێن یەك بگرینەوە و لەوێوە دەست بکەین بە پلان دانان و کەوتنە خـۆ بـۆ رێکخسـتنی بەرەنگاری و پەرەپێدانی بزووتنەوەی چـەکداری. شـەهید تـاهیر ئەوکاتـە جێگـری فەرماندەی هێـزی خـەبات بـوو، پێشـتریش فەرماندەی هێـز بـوو، بارەگاکـەی لـە پێنجـوێن بـوو، بۆچـوونیش وابـوو کـە لەسـەرەتادا کردنـی ناوچـەی شـارباژێڕ بـە مەڵبەنـدی هێـز و چـالاکییەکانمان راسـتترین هـەنگاوە. قیـادەی مەرکـەزیش لـە ناوچەی شارباژێڕدا لقێك پێشمەرگە و بنکەی هەبوو. جگـە لەمانـەش نزیکیمـان لـە سلێمانییەوە کە مەڵبەندی هێز و چالاکییەکانی کۆمەڵـە و قیـادەی مەرکـەزی بـوو، ئەبوونـە بنکەیـەکی شۆڕشـێگڕی لـە ناوچـەکەدا. ئێمـە وەك قیـادەی مەرکـەزی دەسـتمان کـرد بـە گوێزانـەوەی، ئـەوەی توانیمـان بیگوێزینـەوە، بـۆ ناوچـەی سلێمانی، ئـەوەی نـەشمانتوانی بـەهۆی نـەبوونی تەنانـەت پـارەی کڕینـی هەنـدێ ئێستر بۆ ئەو مەبەستە خستمانە ژێر خاکەوە و بەهیوای دەرهێنانەوەی، لە داهاتوودا.

لەسـەر بڕیارەکـەی دەربەنـدی رایـات، ئێمـە گەیشـتینە پێنجـوێن، لـە گشـت ئەوانەی بڕیار بوو یەك بگرینـەوە، تـەنیا کـاك تـاهیر عـەلی والی بـەگ لـەوێ مـابوو. برادەرانی دیکە گەیشتبوونەوە سلێمانی.

ئەو ئێوارەیەی گەیشتینە پێنجوێن، پاشماوەی کۆگاکانی شۆڕش تالآن ئـەکرا و تەقە لە هەموو لایەکەوە ئەبیسترا، تاقم تاقمیش پێشمەرگە بـەرەو ئێـران و بـەرەو عێراق رێچکەیان بەسـتبوو. شـەهید تـاهیر پێشـوازییەکی گـەرمی لێکـردین و پێـی راگەیاندین کە هەر ئەو ماوەتـەوە و ئـەویش چاوەڕێی ئێمـە ئـەکات. کـە کەوتینـە گفتوگۆ، ئەویش هاتبووە سەر ئەو ڕایە کە ئومێدی هەڵسانەوە لەو بـارە ناکرێـت و ئەبێت بزووتنەوەی شۆڕشگێڕی خۆی بـۆ هەلومـەرجێکی تـر ئامـادە بکـات، گـوتی باوەڕم وایە من ئەگەر بگەڕێمەوە بـۆ عێـراق ئیعـدام ئـەکرێم، بۆیـە ناچـارم بـەرەو

ئێران بڕۆم، ڕاشم وایە ئێوەش بە تەنیا بە هیچ جۆرێك توانای شەڕتان نییە و چاکتر وایە ئێوەش بەرەو عێراق بڕۆنەوە و قوربانیی بێ حساب نەدەن. ئێمە لەوکاتەدا، زۆر دلگیر بووین بەو هەموو گۆڕانەی بەسەر دوا هەولّ و کۆششماندا هات بۆ بەرهەلّستکردنی شالاوی دوژمن، بەیانی زوو بەرەو کوڕەکاژاو کەوتینەڕێ، کاك تاهیر و چەند پێشمەرگەیەك هەتا (راوگان) بەڕێیان کردین و لەگەلّ ئازاری زۆری لەیەك جیابوونەوەدا، خواحافیزیمان لەیەك کرد، تفەنگێکی زیادی لامابوو بەدیاری دای بە ئێمە و خۆی گەڕایەوە بۆ دواوە، ئێمەش بە ڕێگای حاجی مامەند دا بەرەو بەرزنجە و ئینجا بەرەو گوندی کاژاو کەوتینەوەڕێ.

لە کاژاو، ئەو ئەندامانەی سەرکردایەتیی حیزب کە لەناو کوردستاندا بووین، لەگەلّ چەند ئەندامێکی سەرکردایەتی لقی کوردستان و چەند کادرێکی تری پێشکەوتوو، بەدرێژی لە هەموو بارودۆخی کوردستانمان کۆلّییەوە. پاش لێکۆلّینەوە لەم باسانە:

١- مانەوەی ئێمە بەتەنیا لە مەیدانی شەڕدا

٢- توانای عەسکەریمان

٣- خراپیی زۆری باری داراییمان

٤- توندو تیژی هەرەس کە کاری کردبووە سەر جەماوەری کوردستان و تەنانەت سەر ئەو ناوچە و دێیانەش کە بنکەکانمانی تێدایە

٥- هاتنی دەنگوباسێك کە هێزێکی گەورەی تازە تەسلیمبوو، ئامادەکراوە بۆ لێدانی ئێمە

٦- ئەگەری گەیشتنی کۆمەکی مالّی، لە دەرەوەی ولاتەوە پێمان کە زۆر زەحمەتە و هەشبێت جێگای هیچ ناگرێت بۆمان.

گەیشتینە ئەو ئەنجامەی کە تەنیا بە ئێمە، کە حیزبێکیی (مارکسی - لینینی) ین و حیزبی (ش. ع) لیژنەی مەرکەزیش لەوبەرمانەوە لە بەرەی سیاسی و عەسکەری بەعس دا راوەستاوە، هەموو هێزەکانی شۆڕشی کورد، یان

گەیشتوونەتە خاکی ئێرانەوە یان رازی بوون بەو لێبوردنە گشتییەی کە حکومـەتی بـەعس دای بـە هـەموو بەشـدارانی جوڵانـەوەی چـەکداریی کـورد، تـەنیا بـە ئێمـە بەردەوامبوونی شۆڕش و بەرهەڵسـتیکردنی شـاڵاوی حکومـەت، ناکرێـت، بـەهیوای خۆڕێکخستنەوەی نوێ و هاتنە پێشەوەی هەلومەرجێکی تـر، پـەیمانمان بەیـەك دا لە گەڕانەوەماندا سەری حیزب و شەهیدانمان و خۆمان بەرز راگرین، و وەك بەشێك لە جوڵانەوەی نیشتیمانی سوپا شکاوی ئـەو رۆژانـە ئێمـەش دوا لایـەن، دواکـەس، ئەو بارەمان کەوتە سەرشان.

## هەڵسەنگاندنی پەیوەندیی پارتی و قیادەی مەرکەزی

حیزبی شیوعیی عێراق (قیادەی مەرکەزی) تەنها حیزب بوو لـە کوردسـتاندا بـە ئاشکرا چالاکی بنوێنێت و پەیوەندی بە پـارتی دیمـوکراتی کوردسـتانەوە هـەبێت، هەرچـەندە ئـەم دوو حیزبـە لـە بەرەیـەکی نیشـتیمانیدا یـان پـەیمانێکی نـاوخۆیی نووسراودا کۆنەبووبوونەوە، بەڵام هاوکاری و دۆستایەتی لەسەر ئاسـتی سیاسـی و عەسکەری بەیەکییەوە بەستبوون.

باوەڕی تەواوی حیزبی شیوعیی عێراق، قیادەی مەرکەزی بە مـافی گـەلی کـورد لــە بڕیــاردانی چارەنووســی خۆیــدا و گەیشــتنی بــە ئامانجــە نەتــەوەیی و دیموکراســیەکانی، بــاوەڕی بــەوەی چەوســاندنەوەی نەتــەوەیی بەشــێکە لــە چەوسـاندنەوەی چـینایەتی، زەمینــەی پەیوەندییــەکی مەبـدەئیی لەگـەڵ پـارتی دیموکراتی کوردستاندا رەخساندبوو.

قیادەی مەرکەزی پێنج بنکەی لـە کوردسـتانی رزگـارکراودا هـەبوو، لـە هـەموو ناوچەکاندا بەشداریی شەڕی دژی سوپای عێراق ئـەکرد. لـە شارەکانیشـدا چـالاکی زۆری سیاسی و شۆڕشگێڕی هەبوو.

لـەدەرەوەی وڵاتـیش، دەنگێکـی دلێـر بـوو، لـەو کاتانـەدا کـە هەنـدێك هێـزی سیاسـیی عێراقـی ئەیانویسـت لەسـەر مینبـەرەکانی بزووتنـەوە رزگاریخوازەکـانی

فەلەستین و یەمەنی دیموكراتی و سوریا و لوبنان و ئەوروپاوە هـەوڵی ئابلۆقـەدانی شۆڕشی كورد بدەن و رووە رزگاریخواز و دیموكراسییەكەی لەو هێز و جووڵانەوانـە بشارنەوە و، تەنیا لایەنی پەیوەندیی بـە ئێـران و ئـەمریكاوە بخەنـە ڕوو، قیـادەی مەركەزی لەسەر ئەو مینبەرانەوە و لـەناو ئـەو وڵاتانـەدا بـە هـەموو توانـا و گشـت شێوەیەك بەرگری لە شۆڕشی كورد و پارتی دیموكراتی كوردستان ئەكرد.

قیادەی مەركەزی یەكێك بوو لە هێزە سـەرەكیەكانی (التجمـع الـوطني العراقـي) كە لە شام دامەزرا و لەو بەرە فراوانە عێراقییـەدا چەسـپێنەری داوا و ئامانجـەكانی گەلی كورد بوو، ڕێگای دۆستایەتی و هاوكـاریی ئـەو ڕێكخسـتنەی لەگـەڵ شۆڕشـی كورد دا تەخت و ئاسان كرد.

لە ساڵی ١٩٧٤دا خوالێخۆشبوو ئیدریس بـارزانی داوای لێكـردین پـەیوەنـدی بـە حیزبی شیوعیی چینەوە بكەین و هەوڵ بدەین بەیەكیان بگەیـەنین. حیزبمـان ئـەو داوایەی پێ باش بوو، هەوڵی دا بیهێنێتە دی، چین بە چاوی گومانـەوە ئەیڕوانییـە پەیوەندییەكانی شۆڕشی كورد بە ئێرانەوە و داواكەشیان بە جۆرە یارییەك دا ئـەنا لە گۆڕەپانی سیاسەتی ئەو ڕۆژانـەدا، بـەڵام قیـادەی مەركـەزی تـوانی هەنـدێك لـە باری سەرنجیان بگۆڕێت و ئەگەر ئەو هەرەسـەی لـە ئـازاری ١٩٧٥دا دوابكەوتایـە، هاوڕێ چینییەكان پێشوازیان لە وەفـدێكی هاوبەشـی قیـادەی مەركـەزی و پـارتی دیموكراتی كوردستان ئەكرد.

حیزبی كاری ئەلبانیش لەهەمان روانگەوە تەماشـای شۆڕشـی ئـەكرد، مـن وەك نوێنـــەری قیـــادەی مەركـــەزی لـــە ســـاڵی ١٩٧٣دا، ســـەردانی ئـــەلبانیام كـــرد. گفتوگۆیەكی زۆرم لەگەڵ سەركردە كۆمۆنیستەكانی (تیرانا)دا كرد و بـاوەڕم وابـوو كە هەندێك لە سەرنجەكانیان لەمەڕ شۆڕشی كورد، گۆڕانی دیاری بەسەرداهات.

پارتی دیمـوكراتی كوردسـتان بـەو هێـزە گـەورە و جـەماوەرە فراوانەیـەوە كـە هەیبوو وە ئێمە پشتگیرییمان ئەكرد، لەباتی ئەوەی بەرەو هاوكاری راسـتەقینە و دامەزرانــدنی بەرەیــەكی فــراوان و پەیوەنــدیی دیموكراســی هــەنگاو هــەڵبنێت،

ئـارەزووی دەسـەڵاتداری و پـاوانکردنی گۆڕەپـانی سیاسـیی تـەنیا بـۆ خـۆی، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ تێدا قووڵتر ئەبووەوە، دووربینانە تەماشای هاوکاری خۆیانیـان لەگـەڵ قیادەی مەرکەزیدا نەئەکرد، بگرە بە پێچەوانەوە پلان دائەنرا بۆ تەسك کردنـەوەی جموجوڵ و بنکەکانمان و لەکاتی دروستبوونی بچووکترین کێشـەدا گـورزی خۆیـان ئەوەشاند و دڵخۆشیی خۆشیان بە دەرەنجامەکانی نەئەشاردەوە.

ئەتوانین هۆکاری ئەو ڕەفتارانە لەم خاڵانەدا کۆبکەینەوە

یەکەم: ئارەزوو و بڕیاری پەیڕەوکردنی سیاسەتی دەسەڵاتداریی تاکە حیزب لـە کوردستاندا.

دووهەم: پاراستنی هاوکێشەی پەیوەندییەکانی پارتی بە ئێـران و هاوکارەکـانی ئێرانەوە و بوونی حیزبێکی شیوعی کە هاوپەیمان و دۆستی پارتی بێت لەناو شۆڕشدا.

سێیەم: کزی یا نەبوونی پەیوەندیی حیزبی شیوعیی عێراق، قیـادەی مەرکـەزی – بە مەڵبەندێکی نێودەوڵەتیی کاریگەرەوە.

ئەمانە جگە لـە هەنـدێك هـۆی ئایـدۆلۆجی و چینایەتیی قـووڵ. سـەرەڕای ئـەو هەموو هەوڵەی دامان بـۆ دروسـتبوونی بەرەیـەکی نیشـتمانیی لـە کوردسـتاندا بـێ ئەنجام بوو، هیچمان بە هیچ نەئەکرد و ئاسنی ساردمان ئەکوتا.

## هۆیەکانی شکستی ١٩٧٥

پـاش ئـەم ڕابوردنـە بەسـەر سـاڵانی پـێش شکسـتی ١٩٧٥ دا و ئـەو بارودۆخـە سیاسـییانەی پـێش ئـەم ڕوودا‌وە، ئـەتوانین هۆیـەکانی شکسـتەکە بکـەین بـە دوو بەشی سەرەکییەوە: هۆکارە ناوەکییەکان و هۆکارە دەرەکییەکان. ئەم دوو هۆیـە بوونە ئـەنجامێکی بەیەکـەوە بەسـتراو، بـە هـەردووکیان کاریـان کـردە سـەر بـاری چـۆنایەتی شۆڕشـەکە و لـە ڕوودانـی ڕێککەوتننامـەی جـەزائیردا هـەردوو هۆیەکـە پێکـەوە نووسـان و پێکـەوە گـورزی بـەهێزی خۆیـان لـە جەسـتەی ئـەو شۆڕشـە گەورەیەی گەلی کورد وەشاند و بەو ئەنجامەیان گەیاند.

## هۆکارە ناوەکییەکان

١- کزی و نزمی رادەی هوشیاری سیاسیی و رۆشنبیری.

ئەندامانی رێکخستنە سیاسی و پێشمەرگایەتییەکانی شۆڕش، کە لە بنەڕەتدا هەستی نەتەوەیی و نیشتیمانی پاڵی پێوەنابوون بۆ ناو ریزەکانی پارتی و شۆڕش، بە ئومێدی گۆڕانکاری لە باری ژیانیاندا لە هەموو روویەکەوە. ئەبوو رۆژ لەدوای رۆژ بە پەیڕەوکردنی بەرنامەیەکی نوێی شۆڕشگێڕانە گۆش بکرێن و هۆشیارییان بەرەوپێش ببەن و تێگەیشتنیان لەدەوروپشتی خۆیان و لە دنیا قووڵ بکەنەوە و کادرەکان و لێپرسراوەکان بەرەو چارەسەری ئەم کەموکوڕییانە ببەن و لەگەڵ لاوازیی رێکخستنی سیاسی و سەربازی و کزبوونی زەبت و رەبت لە ریزەکانیاندا. بەتایبەتی لەدوای رێککەوتننامەی ١١ی ئازارەوە ئەو هۆیانە رێکخستنەکانیان بەرەو پوکاندنەوە ئەبرد و نەیانئەهێشت بە رێگایەکی راست و تێگەیشتووتردا رێی پێ بگرنە بەر.

٢- گۆڕانی هێزی پێشمەرگە، لە هێزێکی شۆڕشگێڕییەوە بۆ لەشکرێکی نیزامی بە بێ راهێنان.

ئەو جوتیارانەی بە ئارەزووی خۆیان و بۆ جێبەجێکردنی ئەرکی نەتەوەیی و نیشتمانی هاتبوونە ریزەکانی هێزی پێشمەرگەوە و لەسەرەتادا بە نانە رەق و ساوەر و تۆزێك شەکر و چا قایل بوون، بەرەبەرە بەتایبەتی لەپاش رێککەوتننامەی ١١ی ئازاری ١٩٧٠وە، گۆڕان بەرەو دروستکردنی سوپایەکی نیزامی و باری سەربازی و ئابوورییان چووە ئاستێکی ترەوە.

لەسەرەتادا (پاسەوانی سنوور)یان لێ پێکهێنرا، پاشان هەموو هێزی پێشمەرگە وەك سوپا مانگانەیان بە گوێرەی پلەی هەرکەسێك لە لەشکردا بۆ بڕایەوە.

وەك ئەم گۆڕانکارییەی روویدا، ئەبوو ئەو لەشکرە راهێنانی سەربازیی گونجاوی پێ بکرێت لەگەڵ باری پێکهاتووی خۆیدا، لە هونەری شەڕ و پلان و توانای دوژمن بەئاگا بکرێن و چۆن لە لەشکرێکی نیزامیدا سەرباز و ئەفسەر فێری

بـەکارهێنانی چـەك و پلانـی شـەڕ ئـەکرێن و بـە خوێنـدنی ڕۆژانـەی هـەموو وانـە سەربازییەکان گۆش ئەکرێن، ئـەبوو لـەم حاڵـەدا هێزەکـانی پێشـمەرگەش ئاوەهـا ڕابەری بکرانایە.

٣- سـەرهەڵدانی جیـاوازیی چـینایەتی لـەنێوان سـەرکردە و لێپرسـراوان و پێشمەرگەدا، هەر بەهۆی ڕێککەوتنی ١١ی ئازار و ئـەو جـێ و ڕێیـەی کـە شۆڕشـی تێکـەوت، بـاری دارایـی شـۆڕش گـۆڕانی بەسـەردا هـات. زۆر بـە ڕوونـی ئەوانـەی سـوودیان لـەو بـارە تازەیـە وەرگرتبـوو لـەوانیتر جیـا ئەکرانـەوە. سـەرکردە و فەرماندەی هێز و بەتالیۆن، خواردن و جلوبەرگ شێوەی ژیانیان زۆر بەپەلـە گـۆڕا و زوربەیان لەو کاتی نەبوونیەدا بوون بە خاوەن ئۆتومبێلیش.

دروسـتبوونی ئـەو جیاوازییـە چـینایەتییە، بێزارییـەکی زۆری خسـتە نـاو پێشمەرگە و دانیشتووانی ناوچە ڕزگـار کراوەکانـەوە. ئـەوجۆرە بێزارییانـە ئەگـەر لەکاتی ئاشتیدا یـان لـە بـارودۆخی ئاسـاییدا زۆر کارنەکەنـە سـەر ئـەوبارە، ئـەوە دەرکەوت لەکاتی شکست و تێك شکاندا ئەبنە هۆیەکی کاریگـەر لـە کەمکردنـەوەی تـەوژمی شۆڕشـگێڕانە لـە گیـانی پێشـمەرگەکاندا بەتایبـەتی و لـەناو هـەموو جەماوەردا بەگشتی.

٤- پەنابەرەکانی ئێران. ئەو بڕیارەی پێش دەستپێکردنەوەی شەڕ، لە ئـازاری ١٩٧٤دا درا بۆ هاندانی هەموو هاوڵاتیـان بـۆ شـار بەجێهێشـتن و ڕووکردنـە ناوچـە ڕزگارکراوەکان وەك فشارێك بۆسەر حکومەتی عێراق و دەرخسـتنی جـەماوەرێتیی شۆڕش، کۆمەڵێك ئەنجامی ڕەچاونەکراوی لێ پەیدا بوو. زوربـەی ئەوانـەی شـاریان بەجێهێشت، بە خۆپیشاندانێکی کاتییان ئـەزانی و حسـابی مانـەوە و کەوتنـە بـەر بۆردومان و تۆپ بارانیان نەکردبوو، ژمارەیەکی زۆریان بە خاووخێزانەوە هاتبوونـە دەرەوە. ئەمـە خـۆی لـە خۆیـدا دڵسـۆزی و قوربانیـدانی زۆری تێـدابوو، بـەڵام ژمارەیەك گیروگرفتی ئاڵۆزکاوی هێنایـە کایـەوە. سـەرکردایەتیی شـۆڕش کـە ئـەم بانگەوازەی بۆ هاوڵاتیانی دڵسـۆز بـڵاو کـردەوە، خۆیشـی حسـابی بـۆ دابینکردنـی

شــوێن و ژیــانی ئــەو ژمــارە زۆرە نــەکردبوو، بەتایبــەتی کــە ئەگــەر شــەڕ هەڵبگیرسێتەوە، وەك رووی دا، لەبەرئەوە پەنابرایە بەر ئێران بۆ چارەسەرکردنی ئـەم کێشـەیە. ئـەوەبوو لـەدوای بۆردومـانکردنی هەڵەبجـە و قـەڵادزێ و توندوتیـژ بــوونی شــەڕ بەگشــتی، ژمــارەی پەنابــەرەکان بــەرزتربووەوە، هــەژارەکان لــە ئۆردوگاکانــدا ژیــانی چەرمەســەرییان بەســەر ئــەبرد و خێزانــی دەوڵەمەنــد و لێپرسراوەکانیش لـە شـارەکاندا، بـەگوێرەی پلـەی ئـەوانیش، لـە شـاری بچووك و گەورەدا دابەش بووبوون.

ئــەم ئۆردوگایانــە بــارێکی گــران بــوون لــە گیروگرفتــی بەڕێوەچــوون و بەڕێوەبردنیاندا و لەدواییشدا بوونە یەکێك لەو هۆیانەی ئەژنۆی هەزاران پێشمەرگە و لێپرسراویان هێنایە لەرزین، کە ئەگەر پەیڕەوی رێککەوتننامەی جەزائیر نـەکرێت و شۆڕش بەردەوام بێت، بە پێچـەوانەی ویسـتی شـای ئێـران، ئـەوا ئـەو هـەزارەها خێزانە بە ژن و منداڵەوە لای رژێمی پیلانگێڕی چەپەڵی شای ئێران بارمتە ئەبن.

٥- مانەوەی پەیوەندییە عەشایەرییەکان و نەبوونی پێشکەوتنی کۆمەڵایـەتی. لەگەڵ ئەو ژمارە زۆرە جوتیـار و زەحمـەتکێش و قوتابییـەی هاتبوونـە ریزەکـانی پێشــمەرگە و لایــەنگیری زۆری جــەماوەری شــارەکانیش بــۆ شــۆڕش، هێشــتا پەیوەندیی عەشایەری و خێڵەکی لەناو شۆڕشدا باو بـوو وە لـە زۆرکاتـدا لەسـەروو گشت پەیوەندییە حیزبییەکانی خۆیشیانەوە بوو. بێگومـان ئەمـە رێکـەوت نـەبوو، بـەڵکو پەیوەنـدی هـەبوو بـە سروشـتی چینایەتی و کۆمەڵایـەتیی سـەرکردایەتیی شۆڕشـەوە، تەنانـەت کـە کۆمەڵـە جاشـێك لـە تۆبەکارییەکـدا بهاتنایەتـەوە ریـز، مانگانـە و ئازۆخـەی چـەکدارەکانیان لـەڕێی سـەرۆکەکەیانەوە ئـەدانێ، لەکاتێکـدا هەڵوێستی راست ئەوەبوو سەرۆکەکانیان کارکەناربخەن و راستەوخۆ پەیوەندی بـە چەکدارەکانیانەوە بکەن، تا وردە وردە ئەو پەیوەندییەیان هەڵبوەشێتەوە.

ئــەبوو ســـەرکردایەتیی شــۆڕش ئــاوڕی لــە بەرژەوەنــدیی جوتیــاران و زەحمەتکێشـانی کوردسـتان بدایەتـەوە و بـیری لـە هەنـدێك چارەسـەری کێشـە

کۆمەڵایەتی و چینایەتییەکان بکردایەتەوە و بەرەو پێشی ببردنایە، بەرەو پچڕانی پەیوەندیی خێڵەکی و دروستکردنی پەیوەندیی نوێی کۆمەڵگای ئاڕاستە بکردایە.

سەرکردایەتیی شۆڕش ڕێبازی قووڵکردنەوەی ناوەڕۆکی شۆڕشەکەی نەبوو، بۆیە لەکاتی نوشوستیدا ئەو جۆرە پەیوەندی و پێکهاتانەی ناو ریزەکانی شۆڕش بوون بەهۆیەکی لاوازی و پساندنی نەك خۆڕاگرتن و بەرەوپێشبردنی.

٦- نەبوونی بەرنامە و هێڵی سیاسیی دیاریکراو و ڕۆشن. پێکهاتنی پارتی دیموکراتی کوردستان لە چەند چینی کۆمەڵایەتیی جیاواز و نوێنەرایەتییان بۆ ئەو چینانە ناکۆکیی فیکری و سیاسی بەردەوامیان لەسەر هەموو پەیڕەو و هەڵوێست و پەیوەندیی سیاسی ناو وڵات و دەرەوەیدا، ریزەکانی پارتیی خستبووە ململانێیەکی هەمیشەییەوە. شۆڕشی کوردیش هەر لەسەرەتایەوە و بەهۆی ئەوەی پارتی سەرکردایەتی ئەکرد رەنگدانەوەی ئەو راستیە بووە. هەر لە ڕۆژانی جیاوازی و ناکۆکیی هەردوو باڵی هەمزە عەبدوڵڵا لەلایەك و ئیبراهیم ئەحمەد و مام جەلال لەلایەکی ترەوە، ئینجا دروستبوونی دووبەرەکی بەهێزی نێوان هێڵی ئیبراهیم ئەحمەد - مام جەلال و هێڵی مەلا مستەفای بارزانی هەمیشە پارتی و شۆڕشی کورد گۆڕەپانی ناکۆکی و بەیەکدادانی بەردەوامی توندوتیژیی نێوان ئەودوولایەنەدا بوو، ئەو ناکۆکیانە تا ئەمڕۆ بەردەوامن و بنچینەی سەرهەڵدانی و ئامانجەکەشی دەستگرتنە بەسەر سەرکردایەتی شۆڕشی کورد و دەسەڵاتی سیاسی لە کوردستاندا.

توندوتیژیی ئەم ناکۆکییە وای کرد، کە هەرچی کارێك لایەکیان بیکات، کاردانەوەیەکی لەلایەن ئەولاوە ببێت، کە تەواو بەپێچەوانەی کارەکەی ئەمیان بێت. ئەم هۆیە و دروستبوونی چەند هۆیەکی تر لە ئەنجامیدا، ڕێگای بەرەوپێشچوون و گەشەکردنی چەند لایەنی پارتی و شۆڕشی گرت و هۆیەکی کاریگەر بوو لە پەیدا نەبوونی بەرنامەی دیاریکراو و هێڵی سیاسیی ڕۆشن لەبەردەم سەرکردایەتیی شۆڕشدا.

ئەمە جگە لەوەی هەر لەسەرەتای بەرپابوونی شۆڕشی ئەیلولی ١٩٦١یشەوە، هەڵچوون و داچوونێکی زۆر لە دروشم و داواکارییەکانی شۆڕشدا هەبووە. هەر لەدوای جێبەجێکردنی مافی گەلی کورد، لامەرکەزی، حوکمی زاتی، حوکمی زاتیی راستەقینە، هەتا فیدراڵی.

لەم داواکاریانەدا روانگەی روون و بەرنامەی لێکۆڵراوە و سنوور و چوارچێوەی یاسایی تیایاندا روون نەبووە. تەنانەت لە گفتوگۆکانی نوێنەرانی شۆڕش و حکومەتی عێراقدا، زۆرجار داواکارییەکان بڕیاری تەواویان لەسەر نەدراوە و لەکاتی گفتوگۆدا شتی تازە لەلایەن حکومەتەوە هێنراوەتە سەر مێز و بەری ئەمبەر، واتە شۆڕش دەربارەیان هیچی پێ نەبووە.

لە گفتوگۆکانی ساڵانی ١٩٧٠-١٩٧٤ و پێش شەڕ دەست پێکردنەوە داوا و دروشمەکانی کورد ئاڵۆزییەکی زۆری تێدابوو. بەرنامە و هێڵی سیاسیی پارتی دیموکراتی کوردستان لەنێوان گفتوگۆ لەگەڵ حکومەتی عێراق و پەیوەندی بە حکومەتی ئێران و کامیان هەڵبژێرن، کەوتبووە گێژاوێکی سیاسی گەورەوە. هەڵنەسەنگاندنی واقعییانەی ئەو بارودۆخە و نادیاریی رێبازی سیاسی رەنگکێشراوی پارتی، شڵەقان و شێوانی زۆری خستبووە ریزەکانیەوە.

لە رۆژانی دوایی مانگی ئازاری ١٩٧٥دا، کاتێك کە بەرەکانی شەڕ بەهۆی بڕیاری کشانەوە بۆ ئێران، تووشی هەژان و شکست بووبوون، مەکتەبی سیاسیی پارتی دیموکراتی کوردستان نامەیەکی کراوەی بۆ حکومەتی عێراق و حیزبی بەعس بڵاوکردەوە تیایدا داوای گفتوگۆی ئاشتیانەی کرد! ئەمە لەوکاتەدا نەك هەر تاکتیکێکی سەرنەکەوتووبوو، بەڵکو ئەو بڕیارە ئاوێنەی شڵەژانی سیاسی و نەبوونی روانگەی روون لە بەرنامە و رێباز و هێڵی سیاسیدا بوو.

## هۆكارە دەرەكییەكان

كوردستان بە چەند دەوڵەتێك ئابلۆقە دراوە كە ئێستا گشتیان دژی سەربەخۆیی كوردستانن و ئەو سەربەخۆییە ئەژنۆی هەموویان ئەهێنێتە لەرزە و بەرژەوەندییان ئەخاتە مەترسییەوە. بە درێژایی شۆڕشی ئەیلول، توركیا سنووری لە شۆڕش داخستبوو، ناوبەناو و بەگوێرەی سیاسەتی هەرێمیی خۆی دوژمنایەتیی سوپاییشی ئەكرد.

سوریا لەساڵی ١٩٦٣دا، كە ئەوكاتە هەردوو رژێمی بەعس ماوەیەكی كەم تەبا بوون، لەشكری خۆی نارد و هاوكاری لەگەڵ سوپای عێراقدا كرد بۆ لێدانی شۆڕشی كورد. پاش تێكچوونی پەیوەندی هەردوو بەعس و سەرهەڵدانی ناكۆكیی توندوتیژی لەنێوانیاندا كەوتنە پیلانگێڕان لەیەكتری، نە ئەوساو نە دوای ئەوەش هاوكاری سورییەكان بەڕادەی پێویست نەگەیشت و تەنیا لە داڵدەدانی هەندێك سیاسی و پڕوپاگەندە و رێگادان بە هاتووچۆدا مایەوە. لە ساڵانی پێش ١٩٧٥یشدا و لەگەڵ ئەو هەموو هەوڵ و كۆششەشدا كە (التجمع الوطني العراقي)یش دای و كە خۆیشیانی تێدا بوون، سوریا رادەی ئەو پەیوەندییانەی بەرز نەكردەوە.

ئێران بەهۆی سەركەوتنی شۆڕشی ١٤ی تەموزی ١٩٥٨ەوە و پچڕاندنی ئەڵقەیەكی گرنگی پەیمانی سەنتۆ لە عێراقدا، كەوتە دوژمنایەتیكردنی عێراق. پێش هەڵگیرساندنی شۆڕشی ئەیلول، ئێران پەیوەندیی بە هەندێك دەرەبەگ و عەشایەری كوردەوە كردبوو.

كە شۆڕشی ئەیلول بەرپا بوو، ئێران بە هەلی زانی پەیوەندی بكات و دەست بخاتە ناو كار و رێبازییەوە. شۆڕشی كوردیش هەر لەوكاتەوە، لە بێ دۆستی و بە هەڵسەنگاندنی ئەو هاوكێشەیەی ئەڵێت (دوژمنی دوژمنم دۆستمە) سەرەتای دۆستایەتیی لەگەڵ ئێراندا دامەزراند. ئێرانی شا، نە دۆستایەتی و نە پەیوەندیی دیبلۆماسی، نەیبەستەوە بە مەسەلەی كوردەوە، تەنیا بۆ بندەستخستنی شۆڕشی كورد و سوود لێوەرگرتنی لەكاتی پێویستدا، ئەو جۆرە پەیوەندییەی ئەكرد.

هەڵوێستی ئێران پاش چواردە ساڵ دۆستایەتیی و هاوکاریکردن، بە ڕێککەوتنی جەزائیر هاتەسەر:

١- کشانەوەی کتوپڕی هێزەکانی لە کوردستانی عێراق.

٢- بڕینی هەموو یارمەتیی چەك و تەقەمەنی و پارەیەك لە شۆڕش.

٣- ڕێ بڕین لە هێنانی خواردەمەنی و هاتووچۆی بازرگانی و مرۆیی.

٤- هەڕەشەی داخستنی سنوور بەڕووی شۆڕشدا ئەگەر بەردەوام بێت.

٥- هەڕەشە یان لێدانی هەموو جموجۆڵێك لە نزیك سنووری خۆیەوە.

٦- هەڕەشەی بەبارمتەدانانی هەزاران خێزانی پێشمەرگە و هاوڵاتیانی پەنابەری کورد لە ئۆردوگاکانی ئێراندا.

٧- دروستکردنی پشتێنێکی ئەمنی هاوبەش بە هاریکاری حکومەتی عێراق لەمدیو و ئەودیوی سنووری دەوڵەتیی نێوان عێراق و ئێراندا.

هەر لەوکاتەدا ئەمریکاش پاشەکشەی لەسەرتاپای مەسەلەکە کردو بەو هەڵوێستە، دوژمنایەتیی بێ پەچەی ئیمپریالیزمی ئەمریکی بۆ گەلی کورد ئاشکراکرد.

لێکۆڵینەوە لە هەڵوێستی ئێران و ئەمریکا بەرامبەر شۆڕشی ئەیلول، تەنیا بەسەراچوونەوەیەکی مێژوویی نییە. بەڵکو بۆ ئەمڕۆی کورد کە بە ئەزموونێکی یەکجار ناسکدا تێئەپەڕێت، گرنگییەکی زۆری چەند سەرەی هەیە پێویستە بە وردی و قووڵی سوود لەو تاقیکردنەوە جەرگبڕانە وەربگیرێت.

هەروەها لەم دنیایەدا کە ڕۆژانە ڕووداوی گەورەی سیاسیی تێدا سەرهەڵئەدات، ئەبێت بە چاوی پشکنینەوە بەدوای ڕاست و ڕەوانیی هەڵوێستدا بگەڕێیت و لەو سازشە نێودەوڵەتییانەی پێش ئێستا بکۆڵینەوە. بۆ ئەوەی ڕەش و سپی لەیەکتری جیابکەینەوە و چیتر چەواشە نەکرێین.

با چاوێك بەم بەڵگەنامە گرنگەدا بگێڕین و چەند ئەزمونێکی لێ وەربگرین[١]:

لەساڵی ١٩٧٦ دا کومیتەیەك بۆ لێکۆڵینەوە لە چالاکییە نهێنییەکانی دەزگای هەواڵگریی ئەمریکی بە سەرۆکایەتی (ئۆتیس پایك) دامەزرا و راپۆرتی کۆمیتەکە بەناوی سەرۆکەکەیەوە بڵاوکرایەوە. لەبەرئەوە دەوڵەتی ئەمریکا غەدرێکی گەورەی لە بزووتنەوەی کوردی کردبوو، بۆیە بە هیچ چەشنێك نەیئەویست راپۆرتەکە بڵاوبکرێتەوە.

راپۆرتەکە ساغی کردووەتەوە کەوا لە مانگی ئابی ١٩٧١ دا مەلا مستەفای بارزانی پەیوەندی بە سەرکردایەتی هەواڵگریی ناوەندیی ئەمریکییەوە لە تاران کردووە و داوای کۆمەکی دژی عێراق کردووە. ئەم نامەیە وەڵامی نەبووە. لە ئازاری ساڵی ١٩٧٢دا دیسان داواکە دووپات کراوەتەوە ئەم جارەیان هەردوو نامەکە کە ئاڕاستەی (کۆمیتەی چلەی) کراوەکە سەرپەرشتی سەرجەم چالاکییە نهێنییەکانی موخابەراتی ئەمریکا ئەکات. ئەوساش کێسنجەر سەرۆکایەتی ئەکرد.

زانیارییەکە لە راپۆرتی (ئۆتیس پایك)دا دوای لێکۆڵینەوە بەمجۆرە گەڵاڵە کراوە:

ئەو بەڵگانەی لای کۆمیتەکە کۆکراونەتەوە ئەیسەلمێنن کە بڕیارەکە لە پلەی یەکەمدا وەکو دڵنەوایی ئێرانی هاوپەیمان دواوە کە دڵسۆزانە هاوکاری ئەکرێن و پێشیان وایە لە عێراقی دراوسێیانەوە مەترسی هەڕەشەیان لێئەکات. دوژمنایەتیی نێوان هەردوولاش دێرینەیە، لە بنەڕەتیشدا جیاوازییەکانیان رێبازی عەقیدەیی نییە بەڵام لەوکاتەدا پەیوەندی بە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاوە هەیە. هەروەها لە راپۆرتەکەدا هاتووە کە: ئامانجی ویلایەتە یەکگرتووەکان لە یارمەتیدانی کورد بۆ ئەوە نەبووە بتوانن سەربکەون و تەنانەت مافی ئۆتۆنۆمی

---

[١] ئەم دەقانە لە کتێبی (شۆڕشی کوردستان و گۆڕانکارییەکانی سەردەم – خەباتی شاخەکان یان راپەڕینی شارەکان) لە نووسینی حیکمەت محەمەد کەریم (مەلا بەختیار)ەوە وەرگیراوە.

سـەربەخۆش وەربگـرن، ئەگـەر کـورد لـە عێراقـدا مـافی وا وەربگـرن بـۆی هەیـە کاربکاتە سـەر کوردەکـانی ئێـرانیش. ئەمـە کێشـە بـۆ شـا دروسـت ئـەکات.. هـەر لەبەرئـەوەی سـەرکردایەتیی شۆڕشـیش بـەکرێگیراویان نـەبووە بۆیـە تـەنیا بـە رادەیەکی ئەوتۆ یارمەتیان داوە کە سەرکەوتنی گەورە وەدەست نەهێنێت نەوەك کار بکاتە سەر کوردی ئێرانیش. ئەگـەر وانـەبا واتـە ئەگـەر سـەرکردایەتی بـارزانی خۆی بە ئەمریکا و ئێران فرۆشتبا، بێگومان ئەو کاتە بێ ترس وەکو بزووتنەوە بـە کرێگیراوەکـان یارمـەتیان ئـەدا و لـەوەش نەئەترسـان کـە سـەرکەوتنی گـەورە وەدەست بهێنێت.

دوا بەشـی راپۆرتەکـە کـە راسـتییەکی مێـژوویی، یـان بـا بڵـێین دانپیانـانێکی غەدرلێکردنە گەورەکەی تێدایە کە ئەمریکا لە کوردی کردووە، بە راشکاوی ئەڵێن:

سیاسەتێکی بێ رەوشتانەمان بەرامبەر کورد هەبووە، نە یارمـەتیمان دان و نـە لێشیان گەڕاین کێشەکانیان لەگەڵ حکومەتی عێراقدا چارەسەر بکەن، هانمـان دان و پاشان وازمان لێهێنان.

ئەم دانپیانانەی ئـەمریکا ئەمەنـدە روون و بـێ غـەل و غەشـە، کـە هـیچ درێـژە پێدان و تەئکیدکردنی ناوێت، کە چەند بێ رەوشت بوون و چییان بە گەلی کورد کردووە.

دەبا بزانین شای ئێران خۆی ئەڵێت چی و چۆن هەڵوێستی خۆی دەرئەبڕی، ئەوەتا بەبێ چەندوچوون و بـێ دڵنـەوایی لـە چـاوپێکەوتنەکەیدا لەگـەڵ (محەمـەد حەسـەنێن هەیکەل) کە لە رۆژنامەی (الانوار)ی بێروتـی لـە ١٩٧٥/٢/٩ دا بـڵاوی کـردەوە ئـەڵێت: "بەڵێ، یارمەتی شۆڕشی کوردمان دا و لە ماوەی دواییـدا ئێمـە هێـزی کاریگـەر بـووین پشتییەوە، کە لایەنگیریمان لێ راگرت، ئەوە رووی دا کە دیمان. ئەمەوێت ئەوە بڵێم کە مـن شۆڕشـی کـوردم دروسـت نـەکردووە، بـەڵام تەماشـام کـرد خـۆی وەك راسـتییەك دروست بووە و هەیە .. سـاڵانێك بـوو رژێمـە فـەرمانڕەواکانی عێـراق دوژمنایـەتییان ئەکردین .. هێرشی پڕوپاگەندەی ئاشکرا و دوژمنایەتیی نەشاراوە و تێکدەرەکانیان بە سنوورماندا ئەکردە ژوورەوە. هەندێجاریش پێکدادانی چەکدارانە رووی ئەدا.

لە شۆڕشی کورد دا هەلێکم بەدی کرد. بە خۆمم گوت: بۆچی بەکاری نەهێنم؟ ئەوەبوو بەکارم هێنا .. بۆچی نا؟ ئایا من ئەمەوێت کێشەی کورد هەڵبگیرسێنم؟ بەدڵنیاییەوە نا .. بیرت نەچێت من لە ئێراندا کەمایەتییەکی گەورەی کوردم هەیە!"

**راپۆرتەکەی کۆمیتەی ئۆتێس پایك زۆر بە راشکاوی راستیی پەیوەندییەکانی ئەمریکا بە شۆڕشی کوردەوە ئەخاتەڕوو کە بریتی بووە لەم چەند خاڵە:**

١- مەسەلەی کوردیان ئەمەندە بچووك هەڵسەنگاندووە تەنانەت هەوالگریی ئەمریکی وەلامی رەتکردنەوەشی نەداوەتەوە بە مەلا مستەفا بارزانی، کە لە ئابی ١٩٧١دا داوای کۆمەکی لێکردوون دژی عێراق.

٢- دواجار کە ئەمریکا هەنگاوێکی بچووکیشی ناوە بەرەو کێشەکە، بۆ دڵنەوایی ئێرانی هاوپەیمان بووە کە لە عێراقی دراوسێیانەوە مەترسی هەڕەشەیان لێئەکات.

٣- زۆر بە ئاشکرا راپۆرتەکە ئەو راستییە رۆشن ئەکاتەوە کە، ئامانجی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە یارمەتیدانی کورد بۆ ئەوە نەبووە بتوانن سەربکەون و تەنانەت مافی ئۆتۆنۆمی سەربەخۆ وەربگرن، ئەگەر کورد لە عێراقدا مافی وا وەربگرن بۆی هەیە کار بکاتە سەر کوردەکانی ئێرانیش، ئەمە کێشە بۆ شا دروست ئەکات.

ئەمە خۆی هیچ شیکردنەوە و لێکۆڵینەوەی قووڵی ناوێت، خۆی بەبێ پێچ و پەنا هەڵوێستی ئەمریکا لەسەر مەسەلەی کورد پیشان ئەدات. تەنیا بەرژەوەندیی ئەمریکا خۆی بڕیاری چەند و چۆنێتی هەڵوێستی بەرامبەر گەلانی دنیا ئەدات و هیچ پەیڕەوکردنێکی دیموکراتی و مافی مرۆڤ لەکایەدا نییە و ئەو مافانە لەلای ئەوان زاراوەی روونتر و لە بەرژەوەندییەکانی سەرمایەداریی ئەمریکادان بۆ هەڵێنجانی دوا تنۆکی نەوتی ئەم وڵاتانە، بۆ گەشە پێکردنی ئابووریی خۆیان و مانەوەی دەسەڵاتیان بەسەر زوربەی جیهاندا.

شای ئێرانیش لەو لێدوانەی لەگـەڵ (هەیکـەل)دا ئـەو راسـتییە ئەچەسـپێنێت و هەرچـی تەمومـژ هەیـە بەسـەرییەوە ناهێڵێـت کـە شۆڕشـی کـوردی بـۆ ئامانجـە گڵاوەکانی خۆی بەکارهێناوە لەوکاتەدا کە بە بەرژەوەندیی خۆی زانیوە.

## دوو هۆکار کاتی دەستبەرداربوونەکەیان یەکلا کردەوە

یەکەم:

ئەو تێکشکانانەی لـە شـەڕی پـاییزی ١٩٧٤دا بەرامبـەر سـوپای عێـراق بەسـەر شۆڕشی کورد دا هات کە سوپای عێراق چـەند ناوچـەی رزگـارکراوی گرتـەوە و بـۆ شۆڕش نەئەگیرایەوە، ئێران لەوە ئەچێت زۆر لەم ئەنجامە ترسابێت کە شەڕ بگاتە سەر سنووری خۆی. سوپای ئێرانیش هەرچەندە زۆر چەکدار و گـەورە بـوو، بـەڵام لەوسـەردەمەدا، لـە هـیچ شـەڕێکدا بەشـداری نـەبووبوو تـا بتوانێـت بـە کـردار و تاقیکردنـەوە توانـای خـۆی هەڵبسـەنگێنێت، بەرامبـەر سـوپایەك کـە لـە سـاڵی ١٩٦١ەوە بەرامبەر شۆڕشی کورد ئەجەنگا.

دووەم:

حکومەتی عێراق ملی بۆ سازشی سەرشۆڕی بەرامبەر ئێران کەچ کـرد، وازی لـە مافی عێراق لە ئاو و خاك و سەروەریی نیشتیمان هێنا. ئەمە هەلێکی مێژوویی بـوو کە شا بە تیرێك دوو نیشان بپێکێت:

أ- ئەوەی لە ناکۆکیی عێراق و ئێرانی ئەخوازێت، بە رێککەوتنێکی نێودەوڵەتی باوەڕپێکراو بۆی هاتە دی.

ب- لەو شەڕوشۆڕە و لە مەترسیی گەیشتنی بۆ ناو ئێران رزگاری بوو.

لەکاتێکدا سـەرکردایەتیی شـۆڕش هۆشـیارانە حسـابی بـۆ پەیوەندییـەکانی بـە حکومـەتی ئێرانـەوە نـەکردبوو، ئـەزموونی کۆمـاری کوردسـتان لەگـەڵ حکومـەتی ئێـران و هــەمان (شــا)دا بیرچــووبووەوە، بــۆ بــەتینکردنی پەیوەنــدی خــۆی و حکومـەتی ئێـران کەوتـە هەڵـەی گـەورە و کوشـندەی دوژمنایـەتیکردنی تونـدی

جولانەوەی کورد لە کوردستانی ئێراندا و کار گەیشتە گرتن و راونان و کوشتنی چەندەها سەرکردە و کادری شۆڕشگێڕی کوردستانی ئێران و بە ساغی یان بە کوژراوی رادەست بە حکومەتی ئێرانی کردن.

کەریم سەعید مەسیفی لە کتێبەکەیدا ٣٠ ساڵ خەبات و ولاتێکی وێران – چاپی سوید، ئەڵێت (ئەو سەوداگەرێتییەی سەرکردایەتیی شۆڕش، زۆر بە گران لەسەری کەوتەوە هەم لەلایەن جەماوەری ولاتپارێزی کوردستانی بندەستی ئێران، بوو بە مایەی بێزاری لەناو شۆڕشدا.) هەروەها ئەم نووسەرە ئەڵێت (سەرکردایەتی شۆڕش لە ساڵی ١٩٧٢دا کە تەواوی روویان لە ئێران کرد، هەر لەو ساڵەدا شا پەیامی بۆ سەرانی رژێمی عێراق ناردبوو، داوای لێکردبوون، کە ئەگەر ئەوان ئامادەبن داخوازییەکانی ئێران لەسەر سنوور لەگەڵیاندا جێبەجێ بکەن، ئێرانیش ئامادەیە یارمەتی خۆی لە کورد ببڕێت. رژێمی عێراق لەپێشدا گوێی بۆ ئەو داخوازییە شل نەکرد. بەڵام کە شەڕ دەستی پێکردەوە، بۆی دەرکەوت کە هێزی سوپا دەرەقەتی کوردان نادات، ئینجا پێشنیارەکەی شای بەبیرداهاتەوە و لەئەنجامدا لە جەزائیر ئەو رێککەوتنە مۆرکرا) (بڕوانە لاپەڕە ٥٥–٥٩ی کتێبی ناوبراوی سەرەوە).

سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلول نەیتوانی و نەیزانی تەرازووی هاوکاریکردن لەگەڵ ئێران وەك دەوڵەت و لەگەڵ بزووتنەوەی نەتەوەیی و نیشتمانیی کوردی ئێران بۆ بەرژەوەندیی خۆی رابگرێت، ئەوانی دوای خۆی پێ لاوازکرد و ئەنجامی ئەوەش لە دوای رێککەوتنی ٦ی ئازاری ١٩٧٥دا بە رۆشنی دەرکەوت و کاری کردە سەر شۆڕش لە کوردستاندا.

دوا رەخنەی مێژوویی لە سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلول بەلای منەوە شێوەی کۆتاییهێنانە بەو بزووتنەوە گەورەیە و کشانەوەیان بۆ ناو خاکی ئێران بە بێ دەنگی و بە بێ دەرکردنی بەیاننامە یان روونکردنەوەیەك بۆ جەماوەر و تەنانەت بۆ پێشمەرگەش کە هۆ و ئەنجامەکانی ئەو کارەساتەی تێدا شی بکاتەوە و باسێکی دواڕۆژی زانراویشیان بۆ بکات.

ئەو پیلانە گەورەیەی ئـازاری ١٩٧٥ دژی گـەلی کـورد و، بـە کـارتێکردنی هۆیـە ناوەکییـەکانی لاواز بـوونی شـۆڕش لـە پـێش ڕێککەوتنەکـەدا، بوونـە دوا هۆکـاری سەرگرتنی پیلانەکە و ئـەو شکسـتە گەورەیـەی بەسـەر شۆڕشـی ئـەیلول دا هێنـا، کۆتایی بە یەکێك لە بزووتنەوە هەرە بەهێزەکانی کـورد هێنـا و ڕژێمـی فاشسـتیی بــەعس بــاڵی ڕەشــی بەســەر کوردســتاندا کێشــایەوە و لــە هــەموو عێراقیشــدا ڕەگوڕیشەی خۆی قایمتر کرد.

لەگەڵ ئەو ڕەخنە و سەرنجانەدا ئەبێت گەلی کورد بە چـاوی ڕێـزەوە تەماشـای قارەمـانێتی و قوربانیـدانی هـەزارەها شـەهید و کۆڵـەواری مـاڵ وێـران و ئـێش و ئازارکێشان و هیلاکبووانی ساڵانی دوورودرێژی ١٩٦١–١٩٧٥ی شۆڕشی ئەیلولەوە بکات.

لەگەڵ دەربڕینی هەموو ئەو ڕەخنە و کەموکووڕیی و هەوڵە گەورانەدا، شۆڕشـی ئەیلول هێشتا هەر بە یەکێك لە شۆڕشە گەورەکانی گەلی کورد ئەژمێردرێت، کە بـۆ هاتنەدیی ئامانجە نەتەوەییە ڕەواکانی گەلی کوردستان خەباتی خوێناوی و درێژی کرد.

ئەنجامی تێکشکاندنی ئەو ڕۆژانـە و بەڵگەنامـەکانی دوای شکسـتەکە، ئـەوەیان ئاشـکراکرد کـە سـەرکردایەتی شۆڕشـی ئـەیلول هەڵـەیان کـردووە، کـەموکووڕییان هەبووە، بەڵام نۆکەری هیچ هێزێك و هیچ دەوڵەتێك نەبوون.

## دوای هەرەس

رۆژانێکـی یـەکجار نـاخۆش بـوون، دڵ تـەنگ و پـڕ لـە ئـازار و تەمومـژی ئایندەیـەکی ناڕۆشـن. هەسـتکردن بـە شکسـتی بزووتنەوەیـەکی پـڕ قارەمـانێتیی گەلێکی چەوساوە بە دەستی پیسترین و دڕندەترین رژێمی دیکتاتۆریی فاشستی.

بەڵام زوربەی ئەو هاوڕێ و برادەرانەی لە شۆڕشەوە گەڕانەوە بۆ نـاو شـارەکان سەربەرز بوون و بێجگـە لـەو بوومەلەرزەیـەی کـە لـە ئـەنجامی ئـەو پیلانـە گـڵاوە نێودەوڵەتییـەدا روویـدا، هـەموو بـە شـانازییەوە باسـی سـاڵانی نـاو شـۆڕش و قوربانیدانەکان و هێرش و هەڵمەتە ئازایانەکانی پێشـمەرگەی کوردسـتانمان ئـەکرد تاکە تاکەیەك نەبێت کەسم نەئەدی چاوشۆڕ بێت بەرامبەر کوردە خۆفرۆشەکان بـە بەعس بەڵکو بەپێچەوانەوە بە سووکی تەماشایان ئەکرا و قێزمان لێیان ئەهاتەوە.

دوای شکستەکەی ١٩٧٥ و گەڕانەوەمان بـۆ ناوشـار، دامودەزگاکـانی حکومـەت زۆر بە هێمنی لەگەڵ ئەو کەسـایەتی و پێشـمەرگانەدا هەڵسـوکەوتیان ئـەکرد و بـە هەموو شێوەیەك ئەیانویست دڵی خەڵك رابگرن بە ئومێدی ئـەوەی حیزبـی بـەعس ببێت بە جێگرەوەی حیزبە سیاسییەکانی کوردسـتان. ئەمـە لـە کاتێکدا بـوو کـە ح.ش.ع (لیژنەی مەرکەزی) لە حکومەتی عێراق و لیژنەی تەنفیزیی حوکمی زاتیدا، ئەوان و چەندین کەسایەتیی سەربەخۆ لەو دامودەزگایانـەدا بـوون، حیزبـی بـەعس سەرکردەیی بەرەی نیشتمانی! و ئەو چەند حیزبەی ئەکرد کـە لـە واقیعـدا هـەموو دەسەڵاتەکان بە دەست خۆیانـەوە بـوون و هـەوڵیان ئـەدا کـە ئـەو کەسـانەش کـە پاش شکستەکە چـوونەتە ئێـران بگەڕێننـەوە و پـەیتا پـەیتا وەفـدیان بەشـوێندا ئەناردن، ئەم هەوڵەیان تا رادەیەکی دیار بۆ چووە سەر.

لەسەر داوای هاوڕێیانمان لـە دەرەوەی وڵات و بـە ئاگـاداری و ڕا و بڕیـاری ئـەو چەند کادرە پێشکەوتووانەی حیزب من و هاوڕێ ئیسـماعیل (عـەفان چـلمیران) کـە ئەندامی سەرکردایەتیی حیزب (ق.م) بوو، چووین بۆ لوبنان بـۆ بینـینی سـکرتێری حیزب هاوڕێ ئیبراهیم عەلاوی کە لە پـێش روودانـی پیلانـی ٦ی ئـازاری ١٩٧٥ەوە

لە لوبنان بوو. زۆر بە درێژی لێکدانـەوەمان بـۆ بـاری سیاسـیی ئـەو رۆژانـە کـرد و گەیشتینە ئـەو ئەنجامـەی مـن و ئیسـماعیل بگەڕێینـەوە بـۆ کوردسـتان و بڕیـاری حیزب بە هاوڕێکانمان بگەینین کە بریتییـە لـەوەی حیـزب لـە دەرەوەی وڵاتـدا لـە پاراستنی ئەم رێکخـراوەی کـە هەیـە بـەردەوام ئـەبێت و ئێمـەش لێـرە پـاش ئـەو شکستە گەورەیە کە ئێمەشی گرتبووەوە بە هێمنی هەوڵی خۆپاراستن بدەین و بـە شـێوەیەك کـە وا دیـار بێـت چـالاکیی رێکخسـتنمان نییـە و بتـوانین ئـەو ژمـارە هاوڕێیانەی ماومانە بە هیوای ئەوەی لە دواڕۆژێکی تردا و پاش پاراسـتنی شـەرەفی سیاسیی خۆمان رێك بخەینەوە.

لە ساڵانی ١٩٧٥ بە دواوە تا ١٩٩٠ چوار جار سـەفەرم بـۆ درەوەی وڵات کـرد و هـەر جـارەی لـە شـوێنێك: لوبنـان، ئـەڵمانیا، فەرەنسـا، بـەریتانیا لەگـەڵ هـاوڕێ ئیبراهیم دا یەکمان ئەدی. چەند جارێکیش هاوڕێیانی بێجگە لە مـن، بـە ئاگـاداریی من، بۆ هەمان مەبەست سەردانیان هەبوو.

* * *

دوای شکسـتی ١٩٧٥ و ئـەو بـارەی بەسـەر قیـادەی مەرکەزیـدا هـات، چـەند کەسێك لە ئەندامانی ئێمە کە لە دەرەوەی وڵات ئەژیان و لە راستیشدا دوو کەسـی یەکەمیان لە دوو حیزبی جیاواز لە جوڵانەوەی شیوعییەوە هاتبوونە ناو حیزبـەوە، بەڵام نەگەیشتبوونە هیچ پلەیەکی حیزبی و تەنیا ئەنـدام بـوون، بانگـەوازێکیان بـە ناوی (یەکگرتنی قاعیـدە – وحـدة القاعـدة)وە بڵاوکـردەوە و بوونـە رێکخسـتنێکی جیاواز ، بەڵام بێجگە لە یەك دوو هاوڕێی خواروو رێکخستنەکان، کەسی دیکـەیان بۆ ڕانەکێشرا تەنیا چەند کەسێك نەبێت کە پێش هاتنە ناو قیادەی مەرکەزییـەوە برادەریـان بـوون. ئـەم جووڵانەوەیـە نـەیتوانی فـراوان ببێـت: ئـەم کـردارەی ئـەو برادەرانــە زیــانێکی زۆری دا و کەوتنــە ناوهێنــان و قسەوباســی هەرزەکارانــەی سیاسەت. ئەنجامیش پاش ماوەیەك بەسەرلێشیواوییەوە وازیان لە جموجـۆڵی ئـەو رێگایە هێنا و ئەو چەند کەسە پێشکەوتووەیان بەرەو رێکخستن و بزووتنەوەیـەکی

دوور لــە فیکــری مارکســی و عەلمانییــەتیش رۆیشــتن و بــوون بــە بەشــێك لــە بزووتنەوەی ئیسلامی.

* * *

پــاش ئــەو کارەســاتەی ١٩٧٥ کــە بەســەر شۆڕشــی کــورددا هــات، قیــادەی مەرکەزیی ئێمەش لەو شکست و شکاندنە گورزی گەورەمان بەرکەوت.

لەکاتێکدا کە ژمارەیەك لـە ئەنـدامانی سـەرکردایەتیی حیـزب ماوەیـەك بـوو لـە دەرەوەی وڵات بوون، ئەوانەی لەناویشەوە بووین هەموو لەیەك رادەی تێگەیشتندا نـەبووین بەرامبـەر ئـەو رووداوە گەورەیـە، مـن کـە کەسـی یەکـەم بـووم لـە پلـەی حیزبیی کوردسـتاندا و چـالاکترین کەسـیش بـووم لـە هـەموو حیزبـدا، ئـەو کاتـەی هــاوڕێ ئیــبراهیم لــە دەرەوەی وڵات ئــەبوو، زوربــەی کــار و پەیوەندییــەکانی بەشەکانی دیکەی عێراقیش بە من ئەسپێردرا.

لەو تەنگوچەڵەمە قووڵەدا من پێش هەموو هاوڕێیانی حیزب ئیعلانـی بـەرگریکردنم کرد و بەئاگایی هەموو سیاسییەکانی ئەو ناوچانە، جموجـوڵی فـراوانم دەسـتپێکرد و لەگەڵ هاوڕێیانی تردا دیدار و کۆبوونەوەی زۆرمان بەم ئاراستەیەدا کرد.

هاوڕێ ئیبراهیم بەپەلە رای خۆی بۆ من نارد کە ئەو (موقاوەمە)یەی تـۆ ئاڵایـت هەڵگرتووە کارێکی گەورە و ئازایانەیە، بەڵام بـە رای ئێمـە و بـە لێکدانـەوەی ئـەم بارە سیاسییە، کارێکی سـەرکەوتوو نابێت. ئەمـە ئەمگێڕێتـەوە بـۆ سـاڵانی دوای ١٩٧٥ و هۆکارە سەرەکییەکانی سەرنەکەوتنی ئێمە (بەتـەنیا) لـە بـەردەوامبوونی ئـەو بەرگریکردنـە و ئینجـا ئەگەڕێمـەوە بـۆ سـەر ئـەو کەموکوڕییانـەی قیـادەی مەرکـەزیی هـەیبوو لـە سـاڵانی دوای شـاڵاوە توندوتیژەکـەی بـەعس لـە سـاڵی ١٩٦٨ەوە، شــەهیدبوونی ســەدان ئەنــدامان و دەیــان ســەرکردە و کــادری پێشکەوتووشمان لە ناو ئەم ژمارەیەدا. لە هەمانکاتدا رووخانی عـەزیز ئـەلحاج کـە سکرتێری حیزب بوو، پاش ئەو کوشتن و بڕین و سەرکوتکارییانە، بێگومان حیـزب زۆر لاواز بوو بوو لە رووی رێکخستنە فراوانەکانی و لە رووی جۆری کادر و هەنـدێك

سەرکردەشەوە کە لاوازیی فیکری و ڕێکخستنیان پێوە دیار بوو وە لە یەکەم ڕۆژی هەوڵدانی کۆکردنەوەی ئەندام و ڕێکخراوە لێك دابڕێنراوەکان لە ئەنجامی ئەم شاڵاوە چەپەڵانەی بەعس لەلایەك و لەلایەکی ترەوە حیزبی شیوعیی عێراق (لیژنەی مەرکەزی) وەك حیزبی شیوعیی ڕەسمییش لە بەغدا و گشت ناوچەکانی عێراقدا بە هاوکاریی ئاشکرا لەگەڵ بەعسدا لە گۆڕەپانی سیاسیدا هەبوون و دوژمنایەتیی قورسی قیادەی مەرکەزییشیان بە توندوتیژیی ئەکرد.

ئێمەی قیادەی مەرکەزی بەجۆرێك بێتوانایی داراییمان پێوە دیار بوو کە لە پەلوپۆی خستبووین بۆ هاتوچۆی کادر و ژیانی کادری خۆشاردووی شارەکان و بەڕێوەبردنی ئەو تیپە چەکدارانەی لە ناوەڕاست و خوارووی عێراقدا هەمانبوو، چەند هاوڕێیەکی پێشکەوتوومان شەهید بوون و فریای بەڕێوەبردنێکی گونجاوی داراییان بەباشی نەئەکەوتین. لەو ماوەیەدا چەند سەرکردەیەکی بەتوانامان وەکو ناجی سەبری (ئەبو موحسین) و رافیع کوبەیسی و زوهێر عەلاوی شەهید بوون ئەوەش بەشێك بوو لە شاڵاوی بەعس و نۆکەرەکانیان کە بووەهۆی لاوازبوونی ئەو ڕێکخراو و تێکۆشەرانەمان لە ناوەڕاست و خوارووودا.

ئەو هاوکاری و یارمەتییانەی ئەگەیشتنە حیزب هەندێکیان لە هاوڕێیانی دەرەوەی وڵاتەوە کە زوربەیان خوێندکارانمان بوون لە ئەورووپا و هەندێکی تریشی لە بەخشین و ئابوونەی ئەندام و دۆستەکانمانەوە لەناو وڵاتدا بۆ کۆئەکرایەوە کە لە نزمترین رادەی پێویستدا بوو.

هەموو هاوڕێیانیش لە دەرەوەی وڵات بۆ بەردەوامبوونی ئیشوکاری ناوخۆ لە پەیداکردنی چەك و تەقەمەنیدا بوون بۆ پێشمەرگەکانمان لە کوردستاندا و زیاتریش بۆ چەکدارەکانمان بوو لە ناوەڕاست و خوارووی عێراقدا کە زوربەی لە هاوڕێیانی حیزب و حکومەتی یەمەنی خوارووی دیموکراسییەوە دابین ئەکرا و بە زەحمەتێکی زۆر بۆمان ئەگەیەنرایە کوردستان. ئەو سەرچاوەیەشمان پاش تێکچوونی حیزبی ئیشتیراکیی یەمەنی و جیابوونەوەیان بۆ دوو باڵی سەرەکی و

پاشان رووخانی ئەو فەرمانڕەوا پێشکەوتنخوازە کە وەك (شۆڕشێکی شەهید) چووە مێژووەوە، بەوجۆرە ئێمە ئەو سەرچاوەیەشمان نەما کە دۆستی نزیکمان بوون.

لە کوردستانیشدا هەرچەند لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستان هاوکار و دۆست بووین و هەندێك یارمەتیمان تەنیا بۆ پێشمەرگەکانمان لێ وەرئەگرتن، ئەوانیش ناو بە ناو چەپۆکێکیان پیادا ئەکێشاین بۆ ئەوەی فراوانتر نەبین!

جیاوازیی سەرەکیی ئێمە و هێڵی ئەوبەری بزووتنەوەی شیوعی، باوەڕبوونی ئێمە بوو بە خەباتی چەکدار و راستگۆیانە و هەموو هەوڵ و کۆششێکمان لەپێناو ئەو باوەڕەماندا ئەدا. هەر لە راپەڕینی زۆنگاوەکانی خوارووی عێراق کە هاوڕێی زۆر نزیکی خۆم خالید ئەحمەد زەکی کە ئەندامی یەك لیژنەی حیزبیی بووین، سەرکردایەتی کرد و لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی دیکەیدا شەهید بوون، هەتا هەوڵی شۆڕشێکی چەکدارانەی سوپا و راپەڕین.

بەڵێ سەرنەکەوتین لە رووخاندنی ئەو رژێمەدا، بەڵام بیروباوەڕێکی نوێمان لە عێراق و کوردستانیشدا خستە ناو خەڵکەوە و بە گیانێکی فیداکاری و رۆشنبیریی شۆڕشگێڕانە هەزارەها گەنجمان پێگەیاند کە ئەمەیان سەرکەوتنێکی گەورەیە بۆ دواڕۆژێکی تر.

قیادەی مەرکەزی وەك رێکخستن ئەو کارەساتانەی بەسەردا هات، بەڵام سەربەرزین بە مێژوومان.. سەربەرزین بەوەی کە ئەو بڵێسەیە نەکوژاوەتەوە و ناکوژێتەوە. بەشدار بووین لە پەروەردەکردنی نەوەیەکی نوێدا کە ئێستا خەریکە کاروانی نوێی ئەو بیروباوەڕە و بە سەرکردایەتیی هەندێك لەو هاوڕێ تێکۆشەرانەمان کە لەسەر هەمان رێباز بەردەوامن و من هیچ گومانم نییە کە رێکخستنێکی نوێی شۆڕشگێڕ بەڕێوەیە و بەشدار ئەبێت لە هێنانە دیی نیشتمانێکی ئازاد کە پێشکەوتنخوازی و دیموکراسی و یاسا سەروەر ئەبێت تیایدا و چەوساندنەوەی مرۆڤی تێدا بەرەو نەمان ئەڕوات. من گەورەترین هیوام لە ژیاندا ئەوەیە بە تەواوییش نەبێت بەڵام سەرەتایەکی راست و رەوان بێت بۆ دامەزراندنی رێکخستنێکی فراوان کە باوەڕی بەو پەیڕەوانە هەبێت و کۆمەڵگەکەمان بەرەو شارستانێتی و دادپەروەریی بەرێت.

هەر لەم روانگەیەوە و بە هۆی سەرکەوتن لە کۆمەڵێك پرۆژەی ئابووری و بەکەڵکدا بۆ وڵات و میللەتەکەمان خۆی لەخۆیدا خزمەتێکی روون و دیارە و بەهۆیەوە توانای داراییشم پێشکەوتووە و لەسەر هەمان بیروباوەڕم، هاوکاریی ژمارەیەکی زۆر رێکخراوی چەپ و چالاکیی مەدەنی و سەدان قوتابی لە قۆناغی جیاجیادا و هەروەها هەزاران بووەتە پرۆگرامێکی هەمیشەیی لە ژیانمدا. پەیمانی ئەوەشم داوە کە هەتاهەتایە ئەو خۆشەویستییەی هەمە بۆ بیروباوەڕم، واتە بۆ گەل و نیشتمانم کەم نەکات و پەرە بسێنێت، خوێنی شەهیدەکانی هاوڕێشم بە هەموو ماناکانیانەوە لەیادما بمێنێت.

## خانووەکەی ماڵی باوکم و سەرەتای کار و کاسبی

وەك ژیانی خۆم، هەموو خێزانەکەمان خاوەنی خانوویەکی بچووك بووین کە لە باوکمەوە بۆمان بەجێمابوو. ئەو خانووەی کە من تیایدا لە دایك بووم و دواتر دایکم تیایدا ئەژیا و ناوبەناو یەکێك لە خوشکەزاکانمان بۆ هاودەنگی و هاوکاریی لە گەڵیدا ئەژیان، ئەو خانووەی تیایدا لە دایك بووم و گاگوڵکێم تیایدا کرد و پێم گرت و زمانم لەوێدا پژا، بیری هەموو سووچ و ژوور و حەوشە و مێوە جوانەکەی سەر سەکۆ خنجیلانەکەی و بەرسیلە و ترێی مێوەکەی سەری و کیسە هەڵدرووراوەکانی دایکم ئەیدروو بۆ ئەوەی هێشووە ترێ شۆڕبووەوەکانی لە زەردەواڵە پێ بپارێزێت، ئەو سەربانە خۆشەی دەوری بە چیغ گیرابوو لە هاویندا تیایدا ئەنووستین، هەر لەو سەربانەوە یاری و تەراتێنی خۆم و هاوڕێکانی منداڵیم لەیادە کە سنوور لە نێوان سەربانی ماڵەکاندا نەبوو. بەو سەربانانەدا گەڕەکا و گەڕەك بە بازبازێن بە سەریاندا و بە ئاشکرا و هەندێك جار بە دزییەوە توو و شاتو و بەرسیلە و ترێ و هەناری ماڵە دراوسێکانمان ئەخوارد، لەم خانووەدا زۆرترین یادگاریی باوکم و دایکم و برا و خوشکەکانم هەیە تا چوونە قوتابخانە و هەموو قۆناغەکان تا دەرچوون لە دواناوەندی و بەجێ هێشتنی سلێمانی بۆ بەغدا بۆ خوێندن لە زانکۆ.

لە پاش زیاتر لە حەوت ساڵ لە ژیانی خۆشاردنەوە و شۆڕش، گەڕاومەتەوە ئەم خانووە. ئێستاکە هەر دایکمی تیایە و منیش هاتوومەوە بێ ئیشوکار پلانی زۆرم لە مێشکدایە بۆ داهاتووی ژیان، بە داخێکی زۆرەوە ئەڵێم یەکەم پلان و پرۆژەم ئەوەیە کە ئەبێت ئەم خانووە بفرۆشم و هەوڵ بدەم ئیشێك بە پارەکەی بکەم. بەیانییەك خەریکی نان و چا خواردن بووین لەگەڵ دایکمدا لەپڕ شەمسە خانی دراوسێمان بە گریانەوە هاتە ژوورەوە، گوتی بیستوومانە خانووەکە ئەفرۆشن، توخوا ئەو غەدرە مەکە ئەم خانووە مەرقەدێکە بۆ هەموو گەڕەك!!

هیچ چارێکی تر نەبوو، پاش رازیکردنی دایکم و برا و خوشکەکانم کە گفتی ئەوەم پێدان لە داهاتوودا ئەو بەشانەیان بە زیادەوە بدەمەوە، برا و خوشك هەر یەکە لە ماڵی خۆیاندا بوون، من و دایکیشم خانویەکمان بەکرێ گرت مانگی بە ١٨ دینار.

خانوو فرۆشرا بە ٣٢٠٠ دینار، فۆڵکس واگنێکی کۆنم پێکڕی بە ٩٠٠ دینار و بەو پارەیەی لێی مایەوە دەستم کرد بە وردە ئیش.

لێرەدا ئەمەوێت بە راشکاوی مەبەست لە باسکردن و گێڕانەوەی کەوتنەکارەوە بە کاری سەربەست یاخود ئازاد و دوور لە وەزیفەی حکومی و بە درێژی بدوێم: دوو مەبەستم هەیە، یەکەمیان وەك بیرەوەری خۆم، دووهەمیان وەك ئەزمونێکی نوێی کەسێك کە ساڵانی پێشووی لە قۆناغەکانی خوێندنەوە هەتا دەرچوون لە زانکۆ و بینینی چەند کارێکی حکومی لە بانق و لە دەرەوە بەسەربردووە، بێجگە لەوەی ژیان بەرێوەبردنە، من زوربەی کاتم بە ئیشوکاری حیزبایەتیشەوە ئەبردە سەر و حەوت هەشت ساڵیش دوای ئەوە لە شاخ و شارەکان بە نهێنی ژیام وا دنیا بە جۆرێکی تر وەرچەرخاوە و کەوتوومەتە ناو ژیانێکی جیاواز و پێویستیی کارکردنی ئازادەوە.

ئەم ئەزموونەی من لەم رۆژانەوە دەستی پێکرد و بەرەو ژوور هەڵکشا و بوومە خاوەنی کار و پرۆژەی جیاواز کە خۆم هەمووی بە بەسوود ئەزانم بۆ خۆم و گەل و وڵاتەکەم، لە بارودۆخێکی پڕ رەنجکێشان و چاونەترسی و گیروگرفتی زۆردا.

با ئەم ژیانە و ئەم ئەزموونە ببێتە دەرس و چاولێکەریی نەوەی نویێ کە مرۆڤ بە توانای خۆی و بە ئیرادەیەکی پتەو و بە بەکارهێنانی ئەقڵی خۆی و ئەزمونی کەسانی تر ئەتوانێت سەرکەوتن بەدیبهێنێت، بیێ ئەوەی خۆی بە خەڵك یان حیزبدا هەڵبواسێت، یاخود ڕێگای هەلپەرستی و سەرشۆڕی بگرێتە بەر.

من کە دەرچووی کۆلێجی بازرگانیی زانکۆی بەغدا بووم نزیکەی چوار ساڵیش لە پاش دەرچوون، فەرمانبەر بووم لە بانقی بازرگانیی عێراق و لەو ساڵانەی دوای دەرچوون و کاری بانقی بازرگانیش لە بەغدا ئێواران ژمێریاری کۆمپانیایەکی ئەهلیش بووم کە دوو پیاوی چاك خاوەنی سەرەکیی بوون، حاجی جەلعوت هیتی و ئەندازیار خەلیل دووری، زانین و شارەزاییەکی باشم هەبوو لە زۆر لایەنی کاروکاسبی و بەڵێندەرایەتیدا. خەلیل دووری و حاجی جەلعوت گەورەترین بەڵێندەر و پیاوانی خاوەنکاری بەغدا بوون ئەو چەند ساڵە.

بانقیش جێگایەکی زۆر باش بوو بۆ فێربوون و بەو دوو شوێنی ئیشە، شارەزاییەکی چاکم پەیدا کرد کەتا ئێستا جێگەیان دیارە لە پێگەیشتنی مندا.

هەر لە سەرەتای دەستکردنم بە کاری سەربەستەوە باوەڕم بەوە هەبوو، کار بچووك بێت یان گەورە بەشی خۆیان پلاندانانی ئەوێت و لە دەستپێکردندا ئەبێت سووربیت لەسەر جێبەجێکردنی پلانەکە، لەوەش گرنگتر بەدواداچوونی ئەو جێبەجێکردنە لە پلانەکە گرنگترە. خاوەنکار ئەبێت باوەڕی بە راوێژکردنی لە خۆی شارەزاتر هەبێت و ئەزموونی سەرکەوتوویی کەسانی تر روناککەرەوەی ڕێگای ئەمیش بێت، بەبیێ ئەم پەیڕەوانە سەرکەوتن زۆر زەحمەتە.

لە دەوروبەری مانگی ئەیلول و تشرینی ١٩٧٥دا بە دوای کاردا ئەگەڕام. بیستم لە زانکۆی سلێمانی قۆنتەراتی چاککردنەوەی قەرەوێڵە و دۆڵاب و کورسی و مێزی بەشە ناوخۆییەکانی قوتابیان هەیە. بە گوێرەی راگەیاندنەکەی ئەوان لەگەڵ کاك شاسواری حەمە ئاغای برادەرمدا تەندەرمان وەرگرت و زۆر بە هەرزان پڕمان کردەوە، لە ئەنجامدا داواکەی ئێمەیان نەخستە ناو پێشبڕکێی کارەکەوە.

تێگەیشتم کە ئەو فەرمانبەرەی لێپرسراو بوو لەو کارە ترسابوو ئیشەکە بدات بە من! و ئەو ئیشە بچووکەشی پێ ڕەوا نەبینیم.

دووهەم هەوڵدان بۆ وەرگرتنی ئیشێکی تازە ئەوەبوو لە ئیدارەی محەلیی سلێمانی چاککردنەوەی دیوارێك و ئاو و ئاوەڕۆی خانویەك هەبوو بۆ من دەرچوو بە ١٤٠ دینار هەفتەیەکی پێچوو لام وابێ ٢٠–٣٠ دینارێکی قازانج کرد.

لە شارەوانیی سلێمانیش قۆنتەراتی دوو پانزە مەتر درێژیی دروستکردنی ئاوەڕۆی سنووقییان دامێ کە بایی ٨ هەزار دینار بوو، ١٥ مەتری لە کۆتایی شیوی قازی و ١٥ مەتری لە کۆتایی شیوی جولەکان بوو. ئیشەکە زۆر قورس بوو چونکە شیو و ئاوەکە بە بن دیواری خانوەکاندا تێپەڕ ئەبوو و خانوەکانیش هەموویان دیواری گڵ و خشتی قوڕ بوون و هەر داڕوخانێك ببوایە تووشی گێرەوکێشەی زۆر ئەبووم لەگەڵ خاوەن خانووەکاندا. کە دەستم کرد بە ئیش تێگەیشتم ئەم ٣٠ مەتر درێژییەی سەرۆکی شارەوانی داوێتی بە من و منەتی زۆریشی بەسەردا کردم، بەشێکە لە ٣٠٠–٤٠٠ مەتر ئاوەرۆی سندوقی کە دراوە بە دۆستێکی خۆیان، ئەم ٣٠ مەترەی گێڕاوەتەوە بۆ شارەوانی چونکە شوێنەکانیان شیوی قازی و شیوی جولەکان بوو مەترسیی لە داڕووخانی خانووەکانی ئەمبەر و ئەوبەری هەبوو. تەواوکردنی ئەم کارە چەند مانگێکی پێچوو، هەمووی پڕبوو لە دڵە ڕاوکێی خۆم و وەستا کەریمی حاجی کە ئیشەکەی بۆ هەڵئەسوڕانم. نزیکەی ٥٠٠ دینارمان قازانج کرد.

قەت لە بیرم ناچێت کە کارێکی بچووکی تازەم لە ئیدارەی محەلیی سلێمانی وەرگرت بایی ١٥٠٠ دینار بوو، کە دەستمان کرد بە هەڵکەندنی زەویی گردەکە، دەرکەوت بە هەڵەدا چووین و ئەندازیارەکەی هاوکاریی ئەکردم حسابی گڵ هەڵکەندنی کردبوو، کە ئەو شوێنە هەمووی بەرد بوو. خوالێخۆشبوو فەتاح بەگی ئەندازیاری ئیدارە محەلی زۆر یارمەتیی دام و بە کۆمپرێسەری خۆیان هەموو هەڵکەندنەکەی بۆ تەواو کردم، ئەمەش بووە ئەزموونێکی بچووکی نوێ. کوردیش ئەڵێ هەر ئەقڵە و لە خەسارێك.

بـە هـۆی هاتووچـۆی بەغـداوە و ناسـینی حـاجی جـەلعوت و خـەلیل دووری و هەندێك ناسیاوی دیکەم کە کار و پرۆژە و کارگەی گەورەیان هـەبوو، بـەرەو ئـەوە چووم کە بەردی موزاییك – مەڕمەڕ لە سلیمانییەوە ببەم بۆ بەغدا بۆ فرۆشـتن. تـا ئەو کاتە چەند کەسێك ئەو کارەیان هەبوو، کـە باسـم کـرد هـەردوو خوالێخۆشـبوو عومـەری حـاجی عەبـدولرەحمان و جـەمالی مـیرزا حەمـە سـەعید بـەردیان لـە پێنجوینەوە ئەبرد بۆ بەغدا. بووین بە هاوکار لەو ئیشـەدا و منـیش چـەند کارگـەی گەورەی کاشی و مەڕمەڕی بەغدام ئەناسی، ماوەیەك بـەو کـارەوە خـەریك بـووین، دوو پیاوی ڕاستگۆ و دەستپاك و خۆشەویست بوون.

پاش ماوەیەك بیرم لەوە کردەوە کە بۆچی ئەم بەردە بە هاڕڕاوی نەگەیینینە بەغدا.

بۆ یەکـەم جـار مـن کەسـارەیەکی هـاڕینی بـەردی مەڕمـەڕم لـە شـەقامی شـێخ عومـەر لـە بەغـدا کـڕی بـە هـەزار دینـار و لـە تانجـەرۆ دامنـا. ئـەم کـارەم زۆر سـەرکەوتوو بـوو، بـەردە هاڕڕاوەکـە پێـی ئـەوترێت موزاییـك، لـە بەغـدا و هەنـدێ کارگەی سلێمانیش ئەمفرۆشت مانگی پتر لە ١٥٠٠ دیناری قازانج ئەکرد.

ئەمە لە کاتێکدا بوو بە پارە و هاوکاریی هـاوڕێی خـاوەن هەڵوێسـت و دڵسـۆزم ماجیـد عـەلاوی خـەریکی هێنـانی کارگەیـەکی بلـۆکی کـۆنکرێتی بـووین کـە لـە چـوونێکی بەغـدادا باسـی ئـەو پرۆژەیـەم بـۆ ماجیـد و هـاوڕێی خۆشەویسـتی هەردووکمان فوئاد قاسم ئەلئەمیر کرد و گوتم ئەم کارگەیە کارگەیەکی سـەرکەوتوو ئەبێت و لە سلێمانیدا دوو کارگەی تێدایە، ئـەوەی مـن پێشـنیارم کـرد کارگەیـەکی مامناوەندی بوو کە بە هەڵسەنگاندنی خۆم چواردە هەزار دیناری تێئەچوو. ماجیـد گوتی من سبەینێ ئەو پارەیەت ئەدەمێ و دەسـت بـەکار ببـە، کارگەیـەکی زینیـت (Zenith)م لـە تانجـەرۆ دانـا کـە بـە مـاوەی ٢-٣ مـانگ شـوێنم بـۆ ئامـادەکرد و ئامێرەکانم لە ئەڵمانیاوە گەیاندە تانجەرۆ.

هەموو ڕۆژێك سەعات پێنجی بەیانی لـە خـەو هەڵئەسـتام بـەو پیکابـە دەسـتی دووەدا ئەچووم بە گوندەکانی زڕگوێز و سەدوبیست و بەردەکـەڕ و سـەماوات و تـا

دێی رەمەزان کرێکارەکانم کۆ ئەکردەوە و ئەمهێنان بۆ سەر ئیش لە تانجەرۆ. کە ئەو کارگەیەم لە ساڵی ١٩٧٦ لە تانجەرۆ دامەزراند، زەوییەکم لە کۆچکردووان عەبدوڵڵای کونجرینی و عوسمانی قادراغا بەکرێ گرتبوو. ئەوە یەکەم کارگە و بگرە ئاوەدانیی کار بوو کە لە نێوان پردە کۆنەکە و پردە تازەکەی ئێستا هەیە و ئەو کاتە تەواو نەبوو بوو، لەو ناوچەیەدا هاتە دنیاوە.

ئێواران کرێکارەکانم ئەگەیاندەوە بۆ گوندەکانی خۆیان و ئەهاتمەوە بۆ تانجەرۆ لەگەڵ خوالێخۆشبوو کاک عەلی سەعید کە هاوکار و سەرپەرشتیاری کارگەکە بوو ئەگەڕاینەوە بۆ ئۆفیسەکەمان لەسەر جادەی پیرەمێرد کە هەشت مەتر دووجایەك ئەبوو دوکانەکەم لە کاك یاسین خەلیلی هاوڕێی خۆشەویستم گرت بە کرێ مانگی بە دوو دینار، یادی ئەو عەلی سەعیدە دڵسۆزەم هەتا هەتایە لە بیر ناچێت کە نموونەی پاکی و دەستپاکی و دڵسۆزی بوو.

ئەوکاتە دانەی بلۆك ئەفرۆشرا بە ١٢٠ فلس، بەرهەمی کارگەکەمان وەك ئەوترا نەئەکەوتە ئەرز، بەهۆی چاکی و پتەوییەوە رۆژ بە رۆژ ئەفرۆشرا، وەك باسم کرد بە پارەی ماجید دروستکرا و منیش بەو جۆرە بەڕێوەم ئەبرد، قازانجیش بە نیوەیی بوو، پاش ساڵێك مایەی دەرهات و هەستم ئەکرد کە توانای ئیشی گەورەترم هەیە کارگەکەم لەگەڵ دامودەزگای کارگەیەکی دەستیی شتایگەر فرۆشت بە چل و دو هەزار دینار بە هەردوو برا کاك کەریم و کاك کەمالی سەعید تەها کۆیی، کە دوو پیاو چاك و کاسبی چالاك بوون، شوێنی کارگەکە و ئەو چەند ژوورەی تیایدا بوو تا ئێستا لەسەر کەناری ئاوی تانجەرۆ ماوەتەوە.

ئەمە سەرەتای قازانجێکی باش بوو بۆ ئەو رۆژە و ئەو سەرمایە بچووکەی من و هاوڕێکەم.

بەرەو کاری بەڵێندەرایەتی هەنگاوم نا و یەکەم ئیشم لەگەڵ کاك ئەکرەمی ساڵحی رەشە و کاك جەمیل نوریدا بە بینا یاخود تەلاری تەکیەی تاڵەبانی دەست پێکرد، ئەمە ناوە رەسمییەکەی بوو ئەگینا ئەم بینایە لەسەر جێگای مزگەوتی تەکیە رووتەدا بنیات نرا کە دائیرەی ئەوقافی سلێمانی خاوەنی بوو.

لەگەڵ کاری ڕۆژانە و تێگەیشتن لە بازار و بەڵێندەرایەتی، پەلی زیاترم هاویشت، بە پێناسی دوو بەڵێندەری بەغدا هەردوو ئەندازیار عەبدوڵڵا جابیر و ئەلیاس بوترس بینای ٦٠ شوقەی (فەرمانبەرێتیی ئاودێریی دوکان)م گرت بە شەریکایەتیی ئەوان کە پارە بدەن و کارەکەش ئێمە بیکەین، لەو کاتەدا ئەندازیار دڵشاد ڕەشیدی خزم و وەستا محەمەدی وەستا حەمە ئەمین (حەمەی حەپسە)ی هاوڕێم کرد بە هاوبەش. ئەو بینایانە ئێستاش ماون لە دوکان، دوو ساڵی پێچوو بە جوانی و سەرکەوتویی کارمان تەواو کرد، قازانجی زۆر باشمان لێکرد. من باوەرم بەوە هەبوو، لەگەڵ دەستکەوتی تازە و پەرەسەندنی کار و داهاتدا پیشە و کار بگۆڕم بە ئیشی گەورەتر، ئەم تێگەیشتنە و باوەڕ بوون بە توانای پەرەسەندووی خۆم بەرزە ئومێدی تیا دروستکردم.



لە ڕاستەوە: کەمال، شەهید ئەکرەمی وەستا حەمە ئەمین (ئەکرەمی حەپسە)، فاروق مەلا مستەفا، جەمیل نوری، ئەکرەمی مەحمودی ساڵحی ڕەشە، تەکیە رووتە، ١٩٧٩

لە ساڵی ١٩٨٥دا لە ڕێرەوی گەڕانمدا بە دوای کار و پڕۆژەی نوێدا بیستم کە وەزارەتی کشتوکاڵی عێراق چواردە مەجزەرەی مریشك سەربڕین و پاککردنی هاوچەرخ هاوردە ئەکات و هەر پارێزگایەکیش یەکێکی بەر ئەکەوێت. پاش بەدواداگەڕان و بەدواداچوونی هەواڵەکە و لێکۆڵینەوە لە قازانج و زیانی ئەم پرۆژەیە کەوتمە هەوڵدان بۆی. من بریارم لەسەر ئەوە لا دروست بوو، کە ئەمدی بازاڕی وڵاتەکە پێویستیی بە چەندەها سەربڕینخانەی مریشك هەیە چونکە زوربەی زۆری ئەم خواردنە گرنگە لە دەرەوەی وڵاتەوە و بە تایبەتی لە ئەمەریکا و بەرازیلەوە ئەگەیشتە دەست کڕیارەکان، بەرهەمێك کە فرۆشتنی مسۆگەر بێت یەکەم مەرجی سەرکەوتنی تێدایە، بۆیە کەوتمە گەڕان بە دوای ئەم پرۆژەیەدا.

لە کوردستان تەنیا مەجزەرەیەکی حکومی هەبوو لە هەولێر درا بوو بە کرێ بە ئەحمەد ئیسماعیل کە مەجزەرەیەکی بچووکی نیوە ئۆتۆماتیك بوو، لە سەرکەوتوویی ئەوەدا کاك ئەحمەد خەریکی بیناکردنی یەکێکی تازە بوو کە یەکێك بوو لەو چواردە مەجزەرەیەی هاتبووە ناو ناوانەوە. لە بەغدا مەجزەرەیەکی گەورەتری تێدا بوو کە بە مەجزەرەی ئەبو فارس ناوی دەرکردبوو وە خاوەنی مۆڵەتی ژمارە (١) ی ئەو کارە بوو لە عێراقدا. چووم بۆ لای ئەبو فارس کە ناوی (یەحیا یاسین) بوو زۆر پیاوانە ورد و درشتی ئەو کارەی بۆ باس کردم و من و دڵشادی بردە ناو مەجزەرەکەوەو زۆر هاوکاریی کردین بە پێدانی زانیاری و هانی داین لێی ڕانەوەستین و گوتی: (ئەگەر هاوکاریت ئەوێت ئامادەم.)

بەمجۆرە کەوتمە ناو کارێکی تازەوە، کارێکی گەورە و بە سەرمایەیەکی گەورەی ئەو کاتە کە ئەگەر خۆم لە ئیشی کارگەی بلۆك و کەسارە و هەندێك بەڵێندەرایەتی سەرمایەیەکی بچووکم هەبوو، بەڵام دڵشاد و وەستا محەمەد کە کردمن بە هاوبەش سەرمایەیەکی یەکجار کەمیان هەبوو. قۆڵمان لێ هەڵکرد دەستمان کرد بە بینای کارگەکە و ئامادەکردنی هەموو پێویستییەکانی ئامێر و دامودەزگاکانی لە هۆڵەنداوە، هەرسێکمان بەو ئامادەکارییەوە زۆر ماندوو بووین.

ئەی پارەی لە کوێ؟ خانووەکەی خۆم کە لە گەڕەکی توی مەلیك دروستم کردبوو خستە رەهنی بانکی کشتوکاڵەوە. ئینجا پەنام بۆ ماجید بردەوە کە هاوبەشیم بکات لەم کارە گەورەیەدا و ئەوە بوو بە دەنگمانەوە هات و خۆیشی قازانجی دیاری لەم پرۆژەیە کرد.

هەر بۆ ئەوەی کە هەموو کەس لە کار و سەرمایەم تێبگات، بەشێکی زۆری ئەو کەسانەی نەوەی ئێستام مەبەستە کە ئازایەتیی و ئیرادەی پتەوی مرۆڤ و دڵخۆشیی بە بەشداریکردن لە ئابووری وڵاتەکەدا زۆر کۆسپ تەخت ئەکات، پەیوەندیی باش و سەرراستی و دەستپاکیش خەڵك بە یەکەوە ئەبەستێت و کاری بە کۆمەڵیان سەرئەخات. بە ٣٠٠ سەد هەزار دیناری ماجید و ٧٠ هەزاری خۆم و رەهن کردنی خانووەکەم و وەرگرتنی دووسەد هەزار دینار قەرز لە بانق و، یەکی بیست هەزاری دڵشاد و وەستا محەمەد دەستمان کرد بە ئیش. ئەو رۆژە ئەو پرۆژەیەی ئێمە گەورەترین کارگە یاخود پرۆژەی بەرهەمهێنان بوو لە سلێمانیدا. پەیتا پەیتا دۆست و کەس و بازرگان و خاوەن کارەکان ئەهاتن بۆ سەیری ئەم پرۆژە جوان و گرنگە. هەر بۆ زانینی نرخی دینار و دۆلاریش، ئەوکاتە دینارێك ٢,٥ دۆلار بوو. پێشتر پتر لە سێ دۆلار بوو.

لە زنجیرەی ئیشوکارەکانمدا و گۆڕینی ئەم جۆرە بە جۆرێکی دیکەی ئیش، نامەوێت پەیوەندییە سیاسییەکان تێهەڵکێش بەم باسانە بکەم، لە کۆتاییی قۆناغێکیدا ئەگەڕێمەوە بۆ ئەو مێژووانەی باسیان ئەکەم.

بەڕێوەچوونی مەجزەرە لەو کاتەدا کۆمەڵێك کۆسپ و گیروگرفت ئەهاتە ڕێگای. ئەو ساڵانە بەهۆی شەڕی عێراق – ئێرانەوە بارێکی ئابووریی نوێ هاتبووە کایەوە نرخی کەرەسەی یەدەك و نەبوونی کادری هونەریی تەواو کاتێکی زۆری ئەویست بۆ بەڕێوەبردن و بەرەوپێشەوەبردنی کار و بەرهەم هێنان.

لە سلێمانی و دەورووپشتی کێڵگەی مریشك بەخێوکردن کەم بوو، لەگەڵ بەرەوپێشچوونی ئیشی ئێمە خەڵکێکی زۆر کەوتنە دروستکردنی کێڵگەی پەلەوەر (دەواجن) کە بە شێوەیەکی دیار ئەم پیشەیە پەرەی سەند و هاوڵاتیان سوودیان

لەم پیشەیە وەرگرت، و بەرە بەرە کارمەندی هونەرییشمان پەروەردە کرد. هەر بۆ راستی ئەم قسانە ئێستا کە کۆتایی ساڵی ٢٠١٦یە، باشترین کارمەندانی هونەریی کارەبا و میکانیکی کۆمپانیای ئاسیاسێڵ تاقمێکن لەو گەنجە تەمەن بچووکانەی ئەو ساڵانەی مەجزەرە کە لە کرێکاریی ئاساییەوە لەوێ پێگەیشتن و ئێستا لە رادەی هەرە بەرزی هونەرییدان لە ئاسیاسێڵ.

لەبەر ئەوەی پرۆژەکەی ئێمە کەوتبووە سەر سنووری نێوان ناوچەی دەسەڵاتی حکومەتدا لە نزیك گوندی ئەڵڵایی لە بازیان و دەسەڵاتی پێشمەرگە لەو ناوچەیەدا، ئەکەوتینە بەر هەڵسوکەوتی گرژی پشکنینی دامودەزگاکانی حکومەت. لەگەڵ ئەوەشدا کۆمەڵێك سەربازی راکردووشمان ئەشاردەوە و زۆر کاتیش وێستگەیەك بووین بۆ دەرباز بوونی کەسانێك لەوێوە بۆ ناوچەی ئازاد.

سەربڕینخانەی مریشکی بازیان بووە هۆی پەیدابوونی هەلی کار بۆ سەدان کەس و پێگەیاندنی کەسانێکی دیکەش بۆ پلەی بەرزتر لە کرێکاری ئاسایی و لەبەر ئەوەی کێڵگەکانی مریشکی سلێمانی بەشی بەرهەمهێنانی پرۆژەکەی نەئەکرد بەردەوام لۆرییە تایبەتییەکانمان بەڕێوەبوون بۆ موسڵ و بەغدا و هەندێ کات خوار بەغداش بۆ کڕینی مریشکی زیندوو و هێنانی بۆ سەربڕینخانەکە (مەجزەرە).

لە ئەنجامی سەرکەوتنی ئیشەکەدا بڕیارماندا فراوانی بکەین بە بنیادنانی کێڵگەیەکی گەورەی مریشك بەخێوکردن و پرۆژەی هەڵهێنانی هێلکە (مەفقەس) و کارگەی گەورەی ئالیکی پەلەوەر (عەلەف دەواجن). کە بەشێکی تەواوکرا و هەندێك بەرهەمهێنانی تیا هاتەدی و بەهۆی شەڕی عێراق و کوەیت و هێرشی سوپای عێراق بۆ سەر پرۆژەکانمان تەواو نەکرا.

ساڵی ١٩٨٨دا بەشداریم لە پرۆژەیەکی گەورەی مریشکی هێلکەکەردا کرد کە هاوبەشییەکی گەورە بوو لە نێوان من و هاوبەشەکانی خۆم بە رێژەی ١٥٪. کۆچکردووی لە یاد نەچووم دکتۆر رەوف عەزیز و برایان عومەر سەعید (وەستا عومەر) و حاجی جەمالی شانەگەر و جاجی کامیلی برای و جەمالی حەمە رەشید و تەلعەت نادردا.

ئـەم پڕۆژەیـەمان لـە هـەراج کردنـی پـڕۆژە حکومییەکانـدا کڕییـەوە کـە لـە وەزارەتی کشتوکاڵی عێـراق لـە بەغـدا کـرا بـە ٩٥٢٠٠٠٠ (نـۆ ملیـۆن و پێنجسـەد و بیست هەزار دینار) بە ٢٠٪ پێشەکی و ئەویتری بـە قیسـتی سـاڵانە بـە قـەرز. ئـەم پرۆژەیـە زۆر سـەرکەوت و لـە مـانگی یەکەمیـدا جیـاوازیی سـەرکەوتنی ئیـدارەی کەرتی تایبەت بەسەر ئیدارەی کەرتی حکومیدا بەڕوونی دەرکەوت.

عێـراق بڕیـاری دا گشـت پرۆژەکـانی دەواجـین (جووچـك هـەڵهێنان، ئـالیکی پەلـەوەر، مریشـك بـەخێوکردن، مریشـکی هێلکـە هەڵهێنـەر، و سـەربڕینخانەکانی مریشـك) لـە خـاوەنێتیی حکومەتـەوە بگۆڕێـت بـۆ کـەرتی تایبـەت، ئـەم بڕیـارەی سەرکەوتنێکیی دیار بوو لە ئابووریی عێراقدا لەم کەرتـە گرنگـەدا بـە تایبـەتی کـە پرۆژە حکومییەکانی بە شێوەی موزایەدەی ئاشکرا ئەفرۆشت.

دوای راپەرینی ١٩٩١ و داڕووخانی حکومەتی بەعس لە کوردسـتاندا و کشـانەوەیان لـە ئیـدارەی کوردسـتان، هەنـدێك هەڵسـوکەوتی سـەیر لـە دامودەزگاکـانی (بـەرەی نیشـتیمانی) و دوای ئـەوە راسـتەوخۆ لـە لایـەن هەنـدێ کـەس و لایـەنی یـەکێتیی نیشتیمانیی کوردستانەوە بە بڕوبیانوی دوور لـە یاسـا بەرامبـەر ئەوچـەند پڕۆژانـە کرا کە ئەمە چۆن هی ئێوەیە و لە کوێتـان بـوو. تەنانـەت ئـەو جـۆرە توندڕەوییـە بەرامبەر خاوەنـدارێتیی مـەجزەرەی بازیـان کـرا دژی مـن کـە زەویـی مـەجزەرە و هەموو ئامێر و داروبەردی موڵکی تایبەتی بوو و هیچ پەیوەندییەکی بـە حکومەتـەوە نەبوو. کار گەیشتە ئەوەی شەوێك (دوو ئار پی جـی)یـش نـرا بـەم پڕۆژەیـەوە کـە سلێمانی تەنیا ئەمـەی تێدا بـوو. لـە دواییـدا کـە دۆکیومێنتـەکانمان خسـتە ڕوو و بەسەر کەسان و لایەنەکانی ناو یەکێتیدا بڵاوم کردنەوە، و لەمانەش گرنگتر کاتێـك مام جەلالم ئاگادار کردەوە، ئیتر ئەم تەنگ پێ هەڵچنینە کۆتایی هات.

هەر لەم جۆرە کردار و رووداوانەی لەو ماوەیەدا هاتـە رێگـام کـە لـە هـەموویان توند وتیژتر و ناڕەواتر بوو، (پرۆژەی فێنك) بوو کە بریتی بوو لـە هەشـت خـانووی دروستکراو بۆ گەشت و گوزار کە من لە کەسانێکی دیکەم کڕیبووەوە و تازە تـەواو

بوو بوو، یەکێك لە سەرکردەکانی ئەوسای یەکێتی داوای لێکردم پێنج خانوویانی بدەمێ، کاتێك پێم گوت بۆچیتە؟ گوتی بۆ نیشتەجێبوونی خۆم. من زۆر بەنەرمی ویستم تێی بگەیێنم کە ئەمە تاقە شوێنی گەشتوگوزارییە لەم ناوچەیەدا و بگرە لە کوردستانیشدا کە مابێتەوە خەڵك بتوانێت سوود لە خانووەکان و باخە فراوانەکانی و مەلەوانگەکەی ببینێت و ئەگەر خانوویەکی خۆم بووایە پێشکەشم ئەکردیت، ئەو لە کەلی خۆی دانەئەبەزی و ئەیگوت ئەمەوێت و گەیاندییە هەڕەشە کردن بەوەی کە ئەگەر رازی نەبم بە زۆر داگیری ئەکات و یان لەگەڵ زەوی تەختی ئەکات یاخود ئەماندات بەر ئار پی جی ..تاد.

منیش بەرامبەر ئەو توندتر بووم و لە وەڵامدا پێم ئەگوت زۆر بەهەڵەدا چوویت ئەگەر وا بزانیت من لە هەڕەشەی تۆ یاخود هەر کەسێك لەم دنیایەدا ئەترسم، و کەسیش نییە بتوانێت ماڵی خۆمم لێ داگیر بکات. دواجار ئەم درامایەم بۆ هاوڕێی خۆشەویستم مولازم عومەر گێڕایەوە کە بە بەرچاوی خۆمەوە تەلەفۆنی بۆ کرد و پێی گوت کاك فلان، فاروق برادەری نزیکی مام جەلالە هەروەها هی کاك نەوشیروان و منیشە، ئەم پیاوە نیشتیمانپەروەرێکی ناسراوە و پێش ئێمەش پێشمەرگایەتیی کردووە چۆن بەم شێوەیە رەفتاری لەگەڵدا ئەکەیت؟

لە کۆتاییدا بە وەڵامی تری کاك عومەر و کاك نەوشیروان و دوای ئەویش بە هەڵوێستی توندی کاك نەوشیروان و کاك عومەر و مام جەلالیش کە پێی زانی زۆر توندتر وەڵامی بۆ نارد کە واز لەم رێگا چەوتە بهێنێت!! وازی هێنا و سوپاسی هەرسێ برای خۆشەویستم ئەکەم.

لە سەرەتای مانگی نیسانی ١٩٩١ کە سوپای عێراق هێرشیان هێنایەوە سەر کوردستان و شارەکانی سلێمانی و هەولێر و دهۆکیان داگیرکردەوە، هێزەکانی (حەرەس جمهوری) پەلاماری مەجزەرەی بازیانیان دا و هەرچی بەکەڵکی دزین هات دزییان، و هەموو لۆری و پیکاب و تراکتۆر و دەمپەڕەکان و هەرچی ئێرکۆندیشن و سیستمێك بگوازرێتەوە لە بنیان هەڵکەند و دزییان هەندێکیان تێکشکاند.

گەورەترین زیانی ئەو هێرشە بەر ئێمە کەوت. پاش شکاندنیان و پاشەکشەیان گەڕاینەوە سەر پرۆژەکە و بە هەوڵ و تەقەلا و سەرفکردنێکی زۆر سەربڕینخانەی بازیانمان پاش ٧–٨ مانگ بە چارەکە توانای جارانییەوە خستەوە کار، بەڵام نەچووەوە سەر باری خۆی و لە پاش ماوەیەك لەکار کەوت، بە داخراوی بەشەکانم لە هاوبەشەکان کڕییەوە و شوێنی مەجزەرە ئێستا پرۆژەیەکی دەرمانسازیی خۆمی تێدایە.

پرۆژەی دەواجینی هێلکەمان بەزوویی کەوتەوە کار وە پڕ بە توانای خۆی کەوتە بەرهەمهێنان. بەرهەمی هێلکەی بە گشتی لە ساڵێکدا گەیشتە رادەیەکی بەرز و بێجگە لە پێویستیی سلێمانی هێلکە ئەنێردرا بۆ بەغدا و پارێزگاکانی دیکەی عێراق.

ئا لەم کاتی پەرەسەندنەدا کە برەوی زۆری هەبوو و قازانجی دیاری بەدیهێنا، من بیرم لە زۆر کاری دیکە ئەکردەوە، کە پێویستیی بە سەرمایە هەیە و ئەنجامیشی باشتر ئەبێت لەم پرۆژەیە کە من ١٥٪یم هەیە و چەند بەشدارێکی بچووکیشم لەگەڵدایە لەم بەشەی خۆم. پاش وەرگرتنی رای هاوبەشەکانم کە کاك عومەر حسێنی هاوڕێم یەکێك بوو لەوانە و بەڕەسمییش بەرێوەبەری پرۆژەکە بوو، و وەك پەیڕەوی یاسایی و عورف و عادەتیش بە هاوبەشەکانی کۆمپانیام گوت من بەشەکەی خۆم ئەفرۆشم ئەگەر ئێوە بتانەوێت بەکەسی دیکە نالێم، قسەکەشم و کڕینەکەشیان پێ خۆش بوو، دوای چەند رۆژێك رێککەوتین  کە بەشەکەی خۆمیان پێ بفرۆشم بە دوانزە ئەوەندە و نیوی سەرمایەکەی خۆم، واتە یەك پشك کە نرخی یەك دینار بوو لێیان کڕیمەوە بە دوانزە دینار و نیو بۆ هەر پشکێك. ئەمە دەستکەوت و سەرکەوتنێکی گەورە بوو بۆ من.

هەروەها من و هاوبەشەکانی ئەم پرۆژەیە کە دڵم خۆشە بەوەی هەر سەرکەوتوون و لە بەرەو پێشچووندان و لە پەیوەندی خۆشداین، حاجی جەمال و حاجی کامیلی شانەدەر و وەستا عومەر سەعید فەتاح و هاوڕێکانیانن. لەوساشەوە هەر کە بەرهەمیان هەبووبێت ماڵی ئێمەیان بێ هێلکە نەکردووە.

## ژنهێنـان و قۆنـاغێكی نویٚ له ژیا نمدا

پاش ئەوەی كەوتمە سەر ئیشوكاری ژیان بەڕێوەبردن، تەمەنی ئەوەم هـاتبوو، یاخود ڕاستتر وایە بڵـێم لـە دواكـەوتن یـا بەسەرچـوون نزیـك ئـەبووەوە كـە ژیـانی خێزانی پێك بهێنم.

مـن كـە حـەوت هەشـت سـاڵ لـە نێـوان خۆشـاردنەوەی نـاو شـارەكان و پێشمەرگایەتی و كـاری سیاسـیی شـاخ بـووم، هـیچ پەیوەندییـەكی پـێش وەخـتم نەبوو بۆ دروسـتكردن و دامەزرانـدنی قۆنـاغێكیی نـوێی ژیـان، لەبـەر ئـەوە لەگـەڵ هـەموو خـەریكبوونم بـە دوای ئیشـوكار و بەڕێوەبردنیـدا ئـەم ئەركـەش پرسـین و گەڕان و ڕاوێژكردنی ئەوێت بۆ گەیشتن بە ئـەنجامێكی گونجـاو. خـۆ ئـەم كـارە لـە زوربەی كارەكانی دیكە قورسترە كە دوو كەس خێزانێكی نوێ پێكبهێـنن و شـەو و ڕۆژ هەموو تەمەن پێكەوە بە ئارامی و ئاسوودەیی بژین.

زوربـەی كـەس ئـەڵێن كـە ژنهێنـان لـە وڵاتـی ئێمـەدا و بـە تایبـەت لـەو سـاڵ و سەردەمەی ئێمە تیایدا بووین، وەك ئێستای سلێمانی و كوردسـتانیش نـەبوو، كـە كـچ و كـوڕ بـە سەربەسـتی لـە شـوێنە گشـتییەكاندا یـەكتر ببیـنن و لـە بـیروڕا و تەبیعەتی یەك بگەن و شارەزا ببن بۆ ماوەیەكی درێژ.

ئەگوترا ژن هێنان وەك یانسیب وایە و هات و نـەهاتی تێدایـە و كـەس ناتوانێـت لە ئەنجامەكەی دڵنیابێت.

باری دارایی من، پاش خانوو فرۆشتن و كاسبییەكی بچووك گەیشـتبووە ئـەوەی جۆرە روونییەكی تێدابێت. كە خانوویەكم گرت بەكرێ بە ١٨ دینـار و ١٧٠٠ دینـارم تـەرخان كردبـوو بـۆ (ژن و مـاڵ) وەكـو ئـەڵێن مـاڵ دروسـت كـردن و جلوبـەرگی بـوكێنی. بـەم پـارە كەمـە ماڵمـان پێـك هێنـا. ئینجـا ئـەبێت بڵـێم كـە هاوبەشـم (پەخشانی مستەفای موفتی) هیچ كۆسپێكی نەهێنایە ڕێگای ئەو ماڵ پێكهێنانـە و زۆر بــە بــەرزی هاتەپێشــەوە كــە بــیرم نەچــووە و ناچــێت. پەخشــان كــە لــە ١٩٧٧/٢/٢٢ بوو بە هاوبەشی ژیـانم نـە ئەوسـا و نـە ئێسـتا گـوێی نەدایـە چـەند و

چۆنێتی رادەی ژیان و ژنێکی زۆر بە تەنگەوەهاتوو بووە لە ناخۆشی و نەخۆشیمدا و کورد وتەنی دڵسۆز و بەڕەحم بووە بۆ من و منداڵانی هەردووکمان. من لە یادی ژنهێنانم دا ئەبێت چاکە و خۆشەویستیی سەبیحە خانی خوشکی پەخشان و کاکە ئەحمەدی میرزا غەفووری مێردیم بیرنەچێت. کاك ئەحمەد تەنها ئاوەڵزاوام نەبوو بەڵکو برایەکی گەورەی رەوشت بەرز و خاوەن ماڵی کراوەش بوو بۆ ئێمە.



سەرەتای ژن هێنان

سەرەڕای ناڕەزایەتیی هەندێك لە کەسوکاری پەخشان بە بیانووی ئەوەی من شیوعیم و فەرمانی لە سێدارەدانم لەسەر بووە، ئەم کاك ئەحمەد و سەبیحە خانە لە جێگای خوشك و برا و خەزوور و خەسووی بەرز و بەنرخی ئێمە بوون.

لەم خزمایەتییە تازەیەدا ئەبێت بەتایبەتی باسی مامۆستا محەمەد تۆفیق بکەم کە لەبەر ئەوەی تاقانە و خۆشەویستی دایکی بووە بە (حەمەی حەلاو) مەشهور بوو. مامۆستام حەمە ئەفەندی کە لە دووی سەرەتاییدا مامۆستام بوو، من بووم بە ئاوەڵزاوای واتە بە خزمێکی نزیك کە بەردەوام یەکترمان ئەدی. خۆی و

ئەختەرخانی ژنی کە هیچ کات لە خوشکەکانم دوورتر نەبوو لێمەوە جێگای خۆشییەکی تازەم بوون. مامۆستا لەساڵی ١٩٢٢ لە سلێمانی لەدایك بووبوو وە لە ٢٠٠٦/٩/٤ کۆچی دوایی کرد. مامۆستا یەکێك بوو لەو گەنجانەی شاری سلێمانی کە لە ساڵی ١٩٤٢دا لەگەڵ عەبدولواحید نوری و نەعیم بەدەوی یەکەم شانەی (ح.ش.ع) بوون لە سلێمانی. لە ساڵی ١٩٩٤ لە ژمارە ٥ی گۆڤاری دوارۆژدا چاوپێکەوتنم لەمبارەیەوە لەگەڵدا کرد و بە درێژی ئەو مێژووە رووناکەی ئەو ساڵانەی بۆ باس کردم.

ئێستا کە ئەم بیرەوەرییانە ئەنووسم، خاوەنی دوو کچ و دوو کوڕم: زینۆ، زەریا، زرنگ، زنوێر. زینۆ کوڕ و کچێکی هەیە: راسان و نارە. هەر چوار منداڵەکەم لە زانکۆ دەرچوون و زوربەیان خاوەنی شەهادەی بەکالۆریۆس و سەروو ئەوەشن لە بازرگانی و یاسا و ئەندازیاری و زانستە سیاسییەکان. جێگای دڵخۆشیشمە کە هەرچواریان رێگای خوێندنەوە و رۆشنبیرییان گرتووەتەبەر و بیروباوەڕی پێشکەوتنخوازیان هەیە و هەمووشیان زمانزانن. یەکێك لە ئاواتەکانی من لە بواری خێزانیدا ئەوەیە ئەم کوڕ و کچانەم رێك بن لەناو خۆیاندا و ئەو دایکە دڵسۆزەشیان بۆ هەموویان هەمیشە بە یەکگرتوویی ئەوان و منداڵیان دڵخۆش بێت. بۆ منیش ئاوات و ئامانجی گەورەم لێیان ئەوەیە بێجگە لە رێگای نیشتمانپەروەری و خۆشەویستییان بۆ هەژاران، ئەو پرۆژە گەورانەی من دروستم کردوون بەرەو پێشی ببەن و لە یەکیان نەترازێنن بەتایبەتی ئەوانەی بۆ قازانج نەکراون وەك پرۆژە خزمەتگوزارییە تەندروستی و پەروەردەییەکان. پەخشانیش هەر بە تەندروستیی باش و میزاج خۆشیی بپارێزن چونکە دایکێکی یەکجار دڵسۆزیانە.

هەروەها هیوام وایە لە دوارۆژدا پاراستنی ئەو کادر و فەرمانبەرە دڵسۆزانەی کارەکانمان کە پرۆژەکان لەگەڵ خۆمدا بەڕێوە ئەبەن و بەقەد پرۆژەکان ئەمانیش گرنگییان هەیە، بپارێزن و بە هەموو شێوەیەك دڵیان رابگرن بۆ وەفا بۆیان و بەردەوامبوون و پەرەپێدانی ئەم پرۆژانەی رۆڵی دیاریان هەیە لە پێشکەوتنی کوردستاندا.

# راپەڕینی ١٩٩١

من نامەوێت وەك مێژوونووسەکان درێژە بە هەموو لایەنەکانی راپەڕینی مەزنی ١٩٩١ی کوردستان بدەم چونکە دەیان و سەدان کەس لە بەشداربووانی و لە نیشتمانپەروەران لە زۆر لایەن و گۆشەیەوە لەسەریان نووسیوە. من کە بیرەوەریی خۆم لەم کتێبەدا ئەخەمە بەرچاوی خوێنەرەکانی لە چەند شوێنێکدا مەبەستی خۆمم لە بڵاوکردنەوەی ئەم بیرەوەرییانە دەرخستووە، بۆیە ئەمەوێت بە کورتییەکی پڕ مانا لە هەندێ هۆ و رووداوەکانی و ئەنجامەکانی بدوێم.

بۆ ئەوەی نرخی گەورەی ڕاپەرینەکە بە بەرزی و مەزنی ڕابگرم، کە تێڕوانین و سەرنجی خۆم لە چەند روویەکەوە باس ئەکەم، لە سەرەتاوە هەڵسەنگاندنی ئەو راپەرینە بە کارێکی پێویست ئەزانم ئینجا هەندێك سەرنجیشی لەسەر باس ئەکەم.

راپەرین ئەنجامی تێکۆشانێکی دەیان ساڵی پێش روودانێتی، هەر لە خەباتی سالآنی پێش و پاش دامەزراندنی حکومەتی کوردستان بە مەلیکێتیی شێخ مەحمودی نەمر، هەتا دامەزراندنی کۆماری مەهاباد لە کوردستانی ئێران و لە نێوان ئەو میژووانە و هەتا گەیشتن بە شۆڕشی ١٤ی تەموزی ١٩٥٨ی عێراق، کورد بەشدار بوو لە دەیان تێکۆشانی سەختی رووبەڕوو بوونەوەی چەوسێنەرەوەکانی چ بە شێوەی خۆپیشاندان و راپەڕین و مانگرتنی سیاسی و بەرهەڵستکردنی دامودەزگا حکومییەکان بە زۆر شێوەی جیاواز بۆ داوای ماف دیموکراسی و نەتەوەیی خۆی و بەبێ پشوودان و ملکەچ کردن بۆ دوژمنانی. لە سالآنی ١٩٦١یشەوە شۆڕشی کورد بە جۆرێکی نوێ هاتە کایەوە و قەڵەمبازێکی گەورەی تێدابوو لە چاو هەموو شۆڕشەکانی پێشوو لە رووی ناوەرۆکەوە چونکە ١١ی ئەیلولی ١٩٦١ لە سەرەتادا وەك بەرهەڵستیکردنی ژمارەیەك دەرەبەگ لە کوردستاندا بەرامبەر یاسای چارەسەرکردنی کشتوکاڵ پەیدا بوو، ئەو یاسایەی زەویی دەرەبەگەکانی بەسەر جوتیاراندا دابەش ئەکرد. لە هەمانکاتدا فەرمانڕەوایی نیشتمانیی عێراق بەسەرکردایەتیی عەبدولکەریم قاسم رێڕەوێکی

تاکڕەوی و نواندنی زەبروزەنگی گرتبووە بەر بەرامبەر بە هەموو ئەو دەنگانەی کە دیموکراسییان ئەویست بۆ عێراق و عەبدولکەریم قاسمیان لە ئەنجامی دواڕۆژێکی رەش ئاگادار ئەکردەوە کە ئەو رێبازەی بەرەو حوکمی دیکتاتۆریی دوور لە میللەتی ئەبات. ئەو کاتە عەبدولکەریم قاسم کەوتبووە سەرکوتکردنی جووڵانەوەی نیشتمانی و دیموکراسیی کوردستان کە خۆی لە هێز و لایەنگرانی پارتی دیموکراتی کوردستاندا ئەبینییەوە، لە هەمان کاتیشدا رێگای ئازادیی تەنانەت رۆژنامەگەریی لە حیزبی شیوعیی عێراقیش گرت و کەوتە راونان و گرتنیان.

پارتی دیموکراتی کوردستان کە مەلا مستەفای بارزانی سەرۆکی بوو و ئیبراهیم ئەحمەدیش سکرتێری بوو کەوتە ناو هەلومەرجێکی ئاڵۆسکاوی سیاسی و چینایەتی و کۆمەڵایەتییەوە، کە لە ئەنجامدا بەوە لێی هاتە دەرەوە کە ئەو جوڵانەوە چەکدارە سنووردارەی دەرەبەگ و عەشایەرەکان بگرێتە دەست خۆی و بیگۆڕێت بە بزووتنەوەیەکی داواکەری مافی میللەتی کورد لە چوارچێوەی عێراقێکی دیموکراتدا. ئیتر شۆڕشی ئەیلول بووە ئەو شۆڕشەی کە رووبەرێکی فراوانی لە ناوچەکانی کوردستانی عێراقدا گرتەوە.

دوای کودەتای ١٩٦٣ و ١٩٦٨ی بەعس، ئامانجی ئەم شۆڕشە فراوانتر بوو، لێدان و کوشتن و بڕین و تەختکردن و سوتاندنی دیهاتی کوردستانیش گەیشتە ئاستێك کە لە مێژووی کوردستان دا رووی نەدابوو. جگە لە هەندێك پشوودان بە هۆی گفتوگۆکانی حکومەتی بەغدا و سەرکردایەتیی شۆڕشەوە نەبێت تا ساڵی ١٩٧٥ی شکستی گەورەی شۆڕشی ئەیلول ئەم گەلی کوردستانە لەژێر زەبروزەنگی سوپای عێراق و جاشی کورددا لە ئازار و چەوساندنەوەو و کوشتن و بڕین و لەسێدارەدانی رۆڵەکانیدا بوو.

دوای شکستی ١٩٧٥ و سەرهەڵدانەوەی شۆڕشی نوێ بە هەموو لایەنەکانیانەوە جۆرێکی دیکە لە توندوتیژی دەستی پێکردەوە و بە تەختکردن و نەهێشتنی مرۆڤ و دارودرەخت و کشتوکاڵ و ئاژەڵ لە پتر لە ٤ هەزار گوندی کوردستاندا، شالاوە

دڕندە فاشستییەکان دەستی پێکردەوە و گەیشتە ئەو رادەیەی کە کیمیابارانی شار و شارۆچکە و دیهاتی کوردستان بۆ قەڵاچۆکردنی ژیان لە کوردستاندا بکرێت. هەڵەبجە بووە رەمزی ئەو تێکۆشانەی گەلەکەمان و حوکمی فاشستیی بەعسیش چووە دێڕی یەکەمی فاشستەکانی مێژووەوە.

نامەوێت باسی شەڕی ئێران و عێراق و شەڕی کەنداو بکەم چونکە لەمێژوودا بە دوێنێ ئەدرێتە قەڵەم و منیش وەك گوتم لێکۆڵینەوە نانووسم، بەڵام ئەبێت کاریگەریی شەڕی کەنداو بۆ رووداوەکانی دوای ئەو شەڕە هەمیشە لەبەرچاو بێت.

کاتێك سوپای هاوپەیمانان بە سەرکردایەتیی ئەمریکا هێرشی هێنایە سەر هێزەکانی عێراق و لە کوەیت دەرییەڕاندن و بەرەو بەغدا راوینان، لە شارەکانی خوارووی و ناوەڕاستی عێراقدا راپەڕین بەرامبەر بە دامودەزگا ئیدارییەکانی حکومەت دەستی پێکرد. ئەگەر تەرازووی باڵانسەکانی سیاسەتی ئەمریکا لاسەنگ نەبووایە و سازشی لەگەڵ سەدام حسێن نەکردایە، راپەڕین یان هەر ناوێکی دیکەی لێ بنێین بەغداشی ئەگرتەوە و حوکمی بەعس و سەدام لەو ساڵەدا تەفروتوونا ئەبوو.

ئا لەو بارودۆخە سیاسی و عەسکەرییەدا لە ناوچەکانی کوردستاندا شار لە دوای شار راپەرین دەستی پێکرد و بە هۆی ئەوەی سەرکردایەتیی راپەڕین ئاگادار و خۆ ئامادەکار بوون بۆ رووداني ئەم راپەڕینە و لە یەکەم چرکەوە هێرش کرایە سەر هێزەکانی حکومەتی بەعس لە کوردستاندا و لە چەند رۆژێکدا لە پەلوپۆ خران. رق و کینەی پەنگخواردووی گەلێکی چەوساوەی دەستی فاشستەکان و نۆکەرەکانیان بووە هێزێکی گەورەی شۆڕشگێرانە و ئەو رۆژانەی راپەڕینی کوردستان چووە مێژووی گەلەکەمان و گەلانی دیکەی چەوساوە و داپڵۆسراوی دەستی زۆردارانەوە.

سەرکەوتنی هاوپەیمانان بەسەر لەشکری سەدام حسێندا وای کرد راپەرین هەموو شارەکانی خوارووی و ناوەڕاستی عێراقیش لە هەمان کاتی راپەڕینی کوردستاندا بگرێتەوە، بەڵام لەگەڵ رێککەوتنی هاوپەیمانان بە سەرۆکایەتیی

هێزەکانی سوپای ئەمریکا لەگەڵ سەدامدا لە ١٩٩١/٥/٣ ڕاپەڕینەکانی خواروی عێراقی خستە بە هێرشی دڕندانەی سوپای عێراق و چەکدارانی حیزبی بەعسەوە و ئەو شارانەیان خلّتانی خوێن کرد.

ڕاپەرینی ١٩٩١ سەلماندی کە زۆرداران هەرچەندە بەهێز بن بەڵام کە دوور بوون لە جەماوەر و ژیانیان و سەربەستییان، لە ئەنجامدا هەر ئەڕووخێن و مێژووش بە پێچەوانەی ئەوانەوە کە سەربەرزی بۆ نیشتمانپەروەران و تێکۆشەرانی ڕێگای ئازادی ئەنووسێت، سەرشۆڕی و ناپاکی لەسەر دوژمنانی تۆمار ئەکات.

هێزەکانی جەماوەر بە سەرپەرشتی و سەرکردەیی پێشمەرگەکانی کوردستان زۆر بە گورجوگۆڵی و ئازایانە دامودەزگای حکومەت و حیزب و نۆکەرەکانیان لە کوردستاندا ڕامالّی.

نەمانی فەرمانرەوایی بەعس، نەمانی کوشتن و بڕینی بێ ویژدانانە، ئازار و ئەشکەنجە، قەڵاچۆکردنی مرۆڤی کورد بە پیر و گەنج و منالّەوە، ڕووخاندن و سووتاندنی زیاتر لە ٤ هەزار گوندی کوردستان بوو. بە واتایەکی کورتکراوە، بەعس بریتی بوو لە هەوڵی لەناوبردنی کورد و چۆڵ کردنی کوردستان وەك وڵات و کردنی بە کەلاوەیەکی تەخت کراو بەجۆرێك کە کوندەبەبووش هاواری لێ هەڵبسێت.

ئەو نەمان و ڕامالّینەی بەعس و نۆکەرانی و دامودەزگاکانی گەورەترین دەستکەوتی گەلی کوردە نەك لە سەدەی بیست دا بەلّکو لە سەرتاپای مێژووی گەلی کورددا چونکە هیچ دوژمنێکی کورد بەو جۆرە پاکتاوی خاك و مرۆڤ و داروبەردی نەکردبوو.

من بە هەموو ئەو ڕەخنانەی هەمە لە هەندێ ڕووداو و لایەنی ڕاپەڕین و دوای ڕاپەڕین و دامەزراندنی حکومەتی هەریمی کوردستان، لام وایە هەمووی بە گشتی بچووکترن لەو بوومەلەرزەیەی دوژمنی کوردی لە کوردستاندا هەژاند و تەخت و تاراجی ڕووخاندن.

## سەرنج و رەخنە دوای سەرکەوتنی را پەڕین

وەك چەندجار دووبارەم کردووەتەوە کە گەورەیی راپەڕین و کاریگەرێتیی بۆ سەر ئەوسا و دواڕۆژی کوردستان لە هەموو کەموکوڕییەکان و رووداوەکانی مەزنتر بوون، بە رامالّینی درندەترین هێزی دوژمن بە گەلی کورد لە هەموو مێژوویدا. بەلاّم ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە رەخنە لە هەندێك لایەن و لە هەندێك رووداو نەگیرێت کە رەخنەکان یەکەم شت بۆ دەرخستن و تۆمارکردنی رووداوە نائاسایی و نایاسابییەکانە و دووهەم بۆ دەرس وەرگرتنە لە هەڵەکان بۆ دووپات نەبوونەوە و رێگای راست گرتنەبەر بۆ بەرەوپێشچوونی کۆمەلاّیەتی و یاسایی و شارستانێتی.

ئەبوو سەرکردایەتیی راپەڕین رێگریی تەواوی بکردایە لەو هێرشە زۆرانەی خەڵك کردیە سەر دامودەزگا مەدەنییەکانی حکومەت کە لە راستیدا موڵکی میللەت خۆیەتی، وەك دائیرەکانی تاپۆ و دادگاکان و پەروەردە و ..تاد و تالاّنکردن و سووتاندن، لە زۆر شوێن کار گەیشتە دەستبەسەرداگرتنی ئامێری زۆر و رەوانەکردنیان بۆ ولاّتانی دراوسێ بۆ فرۆشتنیان کە لەوکاتەدا زاراوەی (ئاودیو کردن) چووە فەرهەنگی زمانەکەمانەوە. گەیشتە ئەوەی هەرچی کێبڵی گەیاندن هەیە لەنێوان شارەکاندا لەژێر زەوی هەڵبکەنرێت و تالاّن بکرێت.

ئەو هەموو شۆفڵ و ئامێری هەڵکەندن و ئوتومبیلانە بەنرخی هەرزانیشەوە بۆ ماوەیەکی دووروودرێژ ئەبرانە دەرەوەی ولاّت و ئەفرۆشران. بەڕاستی ئەمە گورزێکی گەورە بوو بازرگانە دەست و دڵ پیسەکان لە ئابووریی کوردستانیان دا و ئەو کارە ناهەموارانە چینێکی تایبەتییان لەو جۆرە کەسە دژ بە قانون و بەرژەوەندیی ئەم ولاّتە بەرپا کرد کە بووە بنەڕەتێکی نوێ بۆ ئەم گەندەڵییەی تا ئێستا بە چەند شێوەیەك لە ولاّتەکەماندا خۆیان ئەنوێنن هەر شوێنە و هەر کاتە بە بەرگێکی تازەوە. من وەك ئابووریناسێك بە ئەرکی سەر شانی خۆمی ئەزانم بێجگە لە بیرەوەریی، لێکۆڵینەوەیەك لەسەر ئەو قۆناغە بکەم لە دەرفەتێکی تردا، کە بەشێکی لەژێر ئەم ناونیشانە ئەبێت (لادێکان بەرەو شار و شارستانی بەرین یا شارەکان بەرەو لادێ و پەیوەندیی خێلاّیەتی).

## لە ڕێڕەوی ڕۆژنامەنووسی و میدیاگەریدا

بۆ یەکەمجار لە ژیانمدا لە ساڵی ١٩٥٩ کە لە پۆلی یەکەمی کۆلێجی بازرگانی و ئابووری بووم لە زانکۆی بەغدا، بەهۆی ئارەزووی زۆرم لە خوێندنەوە و نووسین، و کە دکتۆر عیزەدینی براشم لە ڕۆژنامەی (ئازادی) بوو وە خۆیشم ئەندامی حیزبی شیوعی بووم، چوومە ڕۆژنامەی (ئازادی)ی زمانحاڵی لقی کوردستانی حیزب کە لە هەمان بارەگای ڕۆژنامەی ڕۆژانەی ئیتیحاد ئەلشەعب (اتحاد الشعب)دا بوو، وەك هەڵەچن و وردبینی کۆتایی لە چاپخانەی (وەفا) ئەوە سەرەتای چوونە ناو کۆڕی چاپ و چاپخانە و ڕۆژنامەنووسی بوو بۆ من.

هەر لە ساڵی ١٩٦٠دا وەکو پیشەی ڕۆژانە کە لە وەزارەتی ئیرشادی عێراقی فەرمانبەر بووم، لە گۆڤاری (عێراقی نوێ)دا کە بە چەند زمانێك دەرئەچوو، کەسی سەرەکی بووم لە گۆڤارەکەدا و هەروەها لە کاروباری وەرگێڕانی کۆمەڵێك بڵاوکراوەی ئەو وەزارەتە.

لە ساڵی ١٩٦٠دا یەکێتیی لاوانی عێراق – لیژنەی کوردستان داوایان لە من کرد کە بەشدارییان بکەم لە هەندێك چالاکیی ڕاگەیاندندا. یەکێك لەو کارانە کە پێم سپێردرا پێشکەشکردنی بەرنامەی (لاوانی کوردستان) بوو لە ئێستگەی بەغدا بەشی کوردی. هەفتەی جارێك من و کاك فەرهاد ئەحمەد ئەم بەرنامەیەمان ئامادە ئەکرد و لە ئێستگەی بەغداوە بڵاومان ئەکردەوە. زوربەی بەرنامەکە لەسەر دەنگوباسی یەکێتیی لاوان و دەستکەوتەکانی ڕێکخراوەکە بوو بۆ لاوانی کوردستان و عێراق.

بەڕێوەبەری گشتیی ئیستگەی ڕادیۆی بەغدا زەعیم وەحید بامەڕنی بوو، پیاوێکی نەزان بوو لە رووی ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن و سیاسەتەوە. ئەبوو بەرنامەکان پێش پێشکەشکردنی بخوێنێتەوە و ئیمزای بکات ئەوسا ئێمە بیخوێنینەوە، هەرچی بەدڵ نەبووایە ئەیکوژاندەوە. منیش ئەمگوت باشە، بەڵام لە خوێندنەوەیدا لە ستۆدیۆ هەموو ئەوانەی ئەو بەدڵی نەبوو، ئەمخوێندەوە. کە بەوەی زانی بڕیاری دا ئیتر پێ نەکەینەوە بەو دامەزراوەیەدا و ئەو بەرنامەیە وەستێنرا.

لە ساڵانی ١٩٦٨ تا ١٩٧٥ نووسەر و وەرگێڕی سەرەکیی ڕێگای کوردستان و تەریق ئەلشەعب (طريق الشعب)ی قیادەی مەرکەزی بووم بە هەردوو زمانی کوردی و عەرەبی.

ئەم کارانە زیاتر مێشکیان کردمەوە و بەرەو خوێندنەوەی هەمەجۆرەی کتێب هانی دام، چونکە نووسەر یان وەرگێڕ ئەگەر رادەی خوێندەواری یا زیاتر بڵێین رووناکبیریی نەبێت، ئەوا لە مەیدانی رۆژنامەنووسی و راگەیاندندا سەرکەوتوو نابێت.

لە ساڵی ١٩٩٤دا و پاش پەیوەندیکردن بە چەند برادەری رۆشنبیر کە تێگەیشتنمان و بیروباوەڕمان زۆر نزیك بوو لە یەکەوە و تێڕوانینمان دەربارەی ئێستا و دواڕۆژی سیاسیی وڵات و بەتایبەتی باوەڕبوونمان بە ڕێگای راستی سۆشیالیزم بۆ هەموو مرۆڤایەتی وەك یەك وابوو، گەیشتینە ئەو ئەنجامەی کە (گۆڤاری دواڕۆژ) دەربکەین. لەگەڵ مامۆستای مەزنمان کۆچکردووی لەیادنەچووم هەتا هەتایە، کاك حەمە ئەمین حەسەن و مامۆستا فوئاد قەرەداغی کە هەردووکیان بە رۆشنبیری گەورە ناسرابوون و خاوەنی ئەزموونی دیار و بەنرخ بوون بڕیاری دەرکردنی گۆڤاری دواڕۆژمان دا. حسێن عارف هاوڕێی دێرینیشم بەشدار بوو لە هەندێ رووی ئەم بڕیار و چالاکییەماندا.



مامۆستا حەمە ئەمین حەسەن

لە ژمارە دووی دواڕۆژدا، نامەیەکی هاوڕێی ئازیزم د. ئیبراهیم عەلاوی – سکرتێری (ح.ش.ع) قیادەی مەرکەزیی تێدایە، لەبەر گرنگیی نامەکە و لەو کاتەدا دەرکەوتنی پەیوەندیی بەردەوامی هەردووکمان، بەباشم زانی دەقی تەواوی ئەو نامەیە لەم لاپەڕانەدا بڵاو بکەمەوە:

## برایانی دەستەی نووسەرانی گۆڤاری شکۆداری دوارۆژ

لەگەڵ دەرچوونی گۆڤاری دوارۆژ لە سەرەتای ساڵی ١٩٩٤دا، سڵاو و پیرۆزبایی خۆمتان پێڕادەگەیەنم. خوازیاری دەستکەوت و پێشکەوتنی گۆڤارەکەتانم لە ئەنجامدانی پەیامە پیرۆزەکەیدا، بە هەڵگرتنی ئاڵای بیری پێشکەوتنخوازانە و داکۆکیکردن لە مەسەلەکانی گەلی عێراق بە گشت نەتەوە و لایەنەکانییەوە، بەتایبەتی، مەسەلەی گەلی تێکۆشەری کورد. ئەم دەستپێشخەرییەتان مایەی خۆشحاڵی و پشتگیریی شەیدایانی ئازادی و پێشکەوتن و سۆشیالیزم و لایەنگرانی مەسەلەی رەوای گەلی کورد ئەبێت.

دوارۆژ لە بارودۆخێکی مێژوویی تایبەتی و لە وەرچەرخانێکی گرنگی رەوتی گشت مرۆڤایەتیدا، دەردەچێت.

ئاشکرایە ئەم چەند ساڵەی دوایی، هەرەسهێنانی سیستەمی سۆڤێتی و قەیران (ئەزمە)ی بیری سۆشیالیستی و، شڵەژانێکی گشتی لەو سیستەمە سیاسی و ئابوورییەی لە کۆتایی هەردوو جەنگی جیهانی یەکەم و دووەمەوە بەسەر جیهاندا زاڵبوو، بەخۆوە دی. دیارە ئەم رووداوانە، بە شێوەیەکی زۆر توندوتیژ، لە عێراقدا، زیاتر لە هەر وڵاتێکی دیکە، لە جەنگی ئەم دواییەی کەنداو و، لە ئاکامەکانیدا و لە ئەنجامە راستەوخۆکانی بارودۆخی نوێی جیهاندا رەنگیاندایەوە.

زۆر ئاساییە، ئەم هەژانە سیاسییانە لە جیهاندا گۆڕانکاری گەورە لە هۆشیاری و بیر و هەڵوێستی ملیۆنەها کەسدا بکەن؛ رامان و پرسیار و چەواشەیی فیکری بخەنەوە. بێگومان ئەم حاڵەتانە ماوەیەکی دوورودرێژ دەخایەنن؛ چونکە لەگەڵ ئەوەشدا کە زۆر لە سەلمێنراوەکانی ماوەی پێشوو بەلاوە نراون و ئەو خۆشخەیاڵییانەی بیرۆکراسیی رزیوی حوکمڕانیی بە ناوی سۆشیالیزمەوە پشتی پێئەبەستن رەوینەوە، بەڵام هێشتا ئەم هۆیانەی کێشەکەیان ناوەتەوە، نەك هەر لە ئاستی جەماوەری گەلدا بەڵکو بۆ زۆر کەس لەوانەی خۆیشیان بە هۆشیار دەزانن و لە مەیدانی خەباتی شۆڕشگێڕانەدا کاردەکەن، روون نین. بۆیە کاری فیکریی سۆشیالیستی و دیموکراتی ئەرکێکی بەپەلەیە و کەسانی خاوەن فیکری پێشکەوتوو دەخاتە بەردەم ئەرکێکی بنچینەیی وەها کە شیاوی کۆششێکی بەردەوام بێت.

لە نێوان مەسەلە فیکرییە نوێیەکاندا کۆمەڵێك مەسەلە دەردەکەون وەك مەسەلەی دیموکراسی، کە بۆ ئێستا و دواڕۆژیش بایەخیان هەیە. لەبەر ئەوە بەبێ زامنکردنی بەدیلی دیموکراسی کە توانای ژیان و خۆ راگرتنی لە بەرامبەر گوشاری دەرەکی و ناوەکیدا هەبێت، ناتوانرێت پشت بە رووخاندنی سیستەمە دیکتاتۆرییەکان ببەسترێت، هەروەها سادەترین مافی سیاسی و نەتەوایەتی زامن ناکرێت و، لە ئاکامدا هەر هەوڵدانێك بۆ گۆڕانکاریی سیاسی ئەبێتە کارێکی رووکەش و لەوە تێپەڕ ناکات کە تاقمێکی خوێنرێژ جێی تاقمێکی دیکەی خوێنرێژ بگرێتەوە و گەلیش لە ژێر سایەی سەرکوتکاری و حوکمی بەهەوەسدا بە بێبەشی لە مافە سەرەتاییەکانی مرۆڤ بمێنێتەوە.

ئەگەر چی چەندین لایەن مەسەلەی دیموکراسییان خستووەتە روو وە لە ناوەندە باڵاکانی دیپلۆماسیی نێودەوڵەتیدا دەگوترێتەوە، بەڵام هێشتا لە واقیعی سیاسیی وڵاتە دواکەوتووەکانەوە، لەوانەش لە واقیعی وڵاتە (سۆشیالیستەکان)ی جارانەوە، دوورە. بێگومان دیموکراسی بۆ وڵاتێکی وەکو عێراق لە جوغزی ئارەزوویەکی خەیاڵی دەرناچێت چونکە بە جددی و راشکاوی بەرەنگاریی حەقیقەتی ئەم کێشەیە ناکرێت ؛ هۆیەکانیش تەنها هەر زۆرداری و دەسەڵاتی تاکەکەسی رژێمە فەرمانڕەواکان نین لەو وڵاتانەدا یان بۆ جددی نەبوونی جووڵانەوەکانی ئۆپۆزیسیۆن (**معارضة**) ناگەڕێتەوە، بەڵکو پەیوەندیی بە لێڵیی کێشەی دیموکراسی و مەودای توانای بەدیهێنانی لە وڵاتێکی ناسەرمایەداری پەرەسەندوودا هەیە. ئەبێت سەرەتا ئەوەش بڵێین کە تەنها گەشەکردنی سەرمایەداری سیستەمێکی سیاسی لیبرالی ناسەپێنێت. مێژووی سەرمایەداری لە ئەڵمانیا و ژاپۆن و دیاردەی گەشەکردنی بێئەندازەی ئەمڕۆی پیشەسازی لە وڵاتانی رۆژهەڵاتی دووردا ئەوە دەردەخەن. ئەوەی کە دیموکراسی لە هەندێك وڵاتی رۆژئاوای وەك بریتانیا و فەرەنسا و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا بەدیهات، هۆیەکەی بۆ پێداویستییە ئابوورییەکانی گەشەکردنی سەرمایەداری لە نێوان کەرتە تایبەتییەکانی سەرمایە و بازاڕی سەرمایەداریی ئازادەوە گەشەی کرد. ئەمەش کێبڕکێی ئازادانەی، وەك هۆیەك بۆ بەدیهێنانی لێوەشاوەیی (کفائە) ئابووری، دەخواست.

سەبارەت بەو وڵاتانەی مێژوویەکی دێرینیان لە ناوەندێتی دەوڵەت و دەستڕۆیشتنی بەسەر کۆمەڵ و بەرهەمهێناندا هەبوو وەك چین و ژاپۆن و ناوچەی ئیسلامی و هەندێك وڵاتی ئەوروپایی دیار وەك رووسیا و ئەڵمانیا ...هتد، گەشەکردنی سەرمایەداری تێیاندا بە رۆڵی بنچینەی دەوڵەتەوە لە هەردوو کاری بەرهەمهێنان و دابەشکردندا، گیری خواردبوو. لەم وڵاتانەدا، لە چوارچێوەی سەرمایەداریدا، بەدیهێنانی دیموکراسی ئاسان نەبوو. سیستەمە پەرلەمانییەکانیشیان بەهۆی هۆکارە دەرەکییەکانەوە پێکهاتبوون. ئەم راستییە دوای هەرەسهێنانی سیستەمی سۆڤێتی لە رووسیادا بە ئاشکرا دیاربوو، کە نەبوونی بنەما کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانی سیستەمێکی سەرمایەداریی شێوە خۆرئاوایی هۆی راستەقینەی نابووتیی ئەو تاقمە سیاسییانە بوون، کە لە چەندین ساڵی رابردوودا ناوەندی دەسەڵاتیان لە مۆسکۆدا بەدەستەوە بوو. ئەم راستییە سەرەتاییە لەلای دەزگا سیاسی و ئەکادیمییە باڵاکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، تەنانەت یەکەم جار، دیار نەبوو ؛ بەڵام ئێستا دیارە و خەریکن جەنگێکی ساردی نوێ ئامادە دەکەن.

ئایا ئەمە واتای ئەوە دەگەیەنێت کە هەرگیز دیموکراسی لە وڵاتێکی وەکو رووسیا یان لە بارودۆخێکی نزیك لێمانەوە - وەك عێراق - بەدی نایەت؟

بڕوا ناکەم وەها بێت، بەڵکو من وەهای ئەبینم کە دیموکراسی لەم جۆرە وڵاتانەدا سیستەمێکی سۆشیالیستی دەخوازێت، نەك لە شێوەی سۆڤێتی، بەڵکو بە پێی ئەو هەلومەرجەی بارودۆخی مێژوویی ئێستا دەیڕەخسێنێت و لەلایەن ئەزموونی هەدوو شۆڕشی سۆڤێت و چینی لەخۆیدا کۆبکاتەوە و لەلایەکی دیکەوە ئەو شۆڕشە زانستییە ئێستا لە هەلومەرجی داڕووخانی هێزە سەرمایەدارییە گەورەکاندا پیادە بووە، لەبەرچاو بگرێت.

سەلماندنی ئەم بۆچوونە، ئەو پرسیارە بە مێشکدا دەهێنێت کە هۆی سەرنەکەوتنی سۆشیالیزمی سۆڤێتی و پەیڕەو نەکردنی رێبازی دیموکراسی لە ژیانی سیاسیدا چی بێت؟ بەڵێ ئەمە پرسیارێکی بەجێیە. لە دیدگای منەوە ئەوە بۆ مەحاڵبوونی سۆشیالیزم ناگەڕێتەوە بەڵکو بۆ پێنەگەیشتنی فیکری سۆشیالیستی دەگەڕێتەوە کە لە پێداویستی دیموکراسی وەك بنچینەیەکی پابەند بە سۆشیالیزمەوە تێنەگەیشتبوو لەبەر ئەوە وەها

بۆی دەچوون کـە دیکتـاتۆریی سیسـتەمی (سۆشیالیسـتی)ی فـەرمانڕەوا دیکتـاتۆریی پرۆلیتاریا دەرئەبڕێت و ئـەو راسـتییەیان فـەرامۆش دەکـرد کـە دەوڵـەتی خاوەنـداریی هۆیـەکانی بەرهـەمهێنان، جـا ئـەو دەوڵەتـە هەرچـۆنێك بێـت، دەوڵـەتی چـینێکی کۆمەڵایەتی ئەبێت یان لەجێی چینێکی خاوەندار و لە هەمان کاتدا فەرمانڕەوا ئـەبێت. لەم حاڵەتەشدا وازهێنـان لـە ئیمتیـازاتی سیاسـی و ئـابووری بـە حـوکمی بانگەشـەی راگەیاندنەکانی لە بەرژەوەندی ئەم دەوڵەتە نییە.

ئەمڕۆ ساویلکەیەتی لەوەدا خۆی ئـەبینێت کـە بـاوەڕ بـە بانگەشـەی (پوکانـەوە)ی دەوڵەت لەگەڵ بنیاتنانی سۆشیالیزمدا بکرێت، پاش ئەوەی مێـژووی شۆڕشـی سـۆڤێتی دەوڵەتێکی مەرکەزیتر و خۆسەپێنتری لە تزاریزم (القیصریە) بەخۆوە دی.

سەرەنجامی کاری دوو نـەوە پـتر لـە بنیادنـانی (سۆشیالیسـتیدا) گـەلانی سـۆڤێتی رووتکـردەوە لـە هەرچـی هـۆ و ئارەزووییـەك هەیـە بـۆ بـەرگریکردن لـە سۆشـیالیزم.. سۆشیالیزمێك کە نمونەی وەکو بیریا و بریجنێف و دوای ئەوانیش گۆرباچۆڤ و یەڵتسـینی لێڕسکا. لەبەر ئەوە مـن وەهـای ئـەبینم کـە جـەختکردن (تأکیـد) لەسـەر مەسـەلەی دیموکراسیی ئاوێتە بە دادی کۆمەڵایەتی وەك بنچینەی هـەر خـەباتێکی سۆشیالیسـتی، سەرکەوتن ئەنجامی ئەبێت و خزمەتی جەماوەری زەحمەتکێش دەکات.

### باری ئێستای عێراق چۆنە؟

بە پێویستی نازانم بارودۆخی ئێستا بخەمە روو و ئاماژە بۆ ئەو هۆکارانـە بکـەم کـە بەم بارودۆخەی گەیانـد، چـونکە ئـیتر سروشـتی سیسـتەمی فـەرمانڕەوا و ئـەو دۆخـە جیهانییەش کە هێشتوویەتییەوە و درێژە بە ژیـانی دەدات روون و ئاشـکران. هـەروەها رەنگە شیکردنەوەی ئەو سیاسەتە جیهانییە گونجاو نەبێت، کە لـە عێراقـدا، وەك خـاڵی یەکانگیربوونی زوربەی بەرژەوەندییە نێودەوڵەتییە جیهانییەکان، جێی خـۆی کردۆتـەوە. بەڵام پێویستە ئاماژە بە دوو خاڵی گرنگ بکەم: یەکەمیان ئەوەیە کە بارودۆخی ئێستای عێراق نائاساییە و لە هێمنی و دامەزراوی بـەدوورە، لەبـەر ئـەوە دەشـێت رووبـەڕووی

چەندین هەژانی گەورە ببێتەوە ؛ چەندین هەژان کە رەنگە بەپێی ئەو روالّەتانەی دیارن نەتوانرێت پێشبینی بکرێن، بە تایبەتی، هاوسەنگیی هێزەکان و ئەو پەیوەندییە دەولّەتییانەی بە بەردەوامی بارودۆخی ئێستایان راگرتووە، روو لە گۆڕان و داهێزرانە. دووەم خالّ، کە لە دیدگای منەوە گرنگترە، ئەوەیە بۆ کێشەکەی ئێستا چارەسەر بدۆزێتەوە دوای ئەوەی راستی بارودۆخەکە ئاشکرا بووە و هەموو گەل بەدەست باری گرانی ئەو بەشمەینەتی و برسێتییەوە دەنالێنن کە ئەم جەنگەی دوایی کەنداو، سەرەڕای داپلۆسین و تیرۆر و زەوتکردنی سادەترین ئازادی و مافی مرۆڤ، بۆیانی بەجێهێشتووە.

چی پێویستە؟ یەکەم: پێکهێنانی بەدیلێکی نیشتیمانیی دیموکراتی بۆ ئەم بارە، لەبەر ئەوەی گۆڕەپانی ئۆپۆزسیۆنی سیاسیی عێراق هێشتا هەر چۆلّە ئەبێت هەولّ و کۆشش بۆ پیادەکردنی ئەم بەدیلە بدرێت.

کە دەلّێین ئۆپۆزیسیۆنی عێراق لە ئارادا نییە مانای نکوولّیکردن لەو (ئۆپۆزسیۆنە) نییە کە دەزگاکانی راگەیاندنی دەولّەتان جاروبار باسی لێوە دەکەن. بەلاّم ئەم (ئۆپۆزسیۆنە) پابەندی ئەو بارودۆخە دەولّەتییەیە کە بوونی پێبەخشیوە. ئەو بارودۆخەش بە پێچەوانەی مانای وەزعی ئێستای عێراقەوە نییە، بۆیە ئەم (ئۆپۆزسیۆنە) لە هاوکێشەی سیاسیی عێراق دەچێتە دەرەوە و راگۆڕینەکانی ئەم دواییەی بوارە دیبلۆماسی و نەوتییەکان خەریکن ئەو پەڕی سوودی نێودەولّەتیی داواکراو، یان ئەوەندەی بە کەمترین خەرجی مومکینە بە دەستی دەهێنن و، هەلّوێستی توندی ئەمریکا رووبەرووی هەلّوێستی ئاشکرا ئەبێتەوە بەتایبەتی پاش ئەوەی بەرەی دیپلۆماسی نێو ئەندامە هەمیشەییەکانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نێو دەولّەتیی درزی تێبوو.

ئا لەم بارودۆخە نوێیەدا گەل ئەبێتە هێزی راستەقینە و گۆڕانکاری ئەبزوێنێت. بەلاّم بزووتنەوەی ئەنجامدەری گەل لە بۆشاییدا پێکنایەت بەلّکو پێویستی بە تەوەرەیەك هەیە لە دەوری کۆببنەوە. تەوەرەیەك باوەڕ پێکراو و شایەنی رێزی جەماوەر بێت، بۆیە ناتوانرێت پشت بەو توخم و جەستە ساردبووەوانە ببەسترێت کە لە سازشە نێو دەولّەتییەکاندا سواون.

ئـــەوەی مـــن بانگەشـــەی بـــۆ دەکـــەم پێکهێنـــانی ئیئتیلافێکـــی هێـــزە چـــەپ و پێشـــکەوتنخوازەکانە. ڕێکخســـتی کـــار و یـــەکبوونی تواناکانیانـــە لـــە پێنـــاوی بەرەیـــەکی نیشتیمانی یەکگرتووی فراواندا کە گشت ڕەوتە نیشتیمانییەکان بگرێتەوە بـە جیـاوازی فیکری و ناسنامەی نەتەوایەتی و ئاینییـەکان. بەمـە گـەلی عێـراق بـە گشـت لایەنـە سیاسی و نەتەوەیی و ئاینییەکانیـەوە دەتوانێـت بـە دیلـی سـەرکەوتوو بـۆ بـارودۆخ و سیاسەتی ئیمڕۆ دابین بکات.

بەبۆنـــەی دەرچـــوونی گۆڤـــاری دوارِۆژەوە جـــارێکی دیکـــە پیرۆزبـــایی ئـــەم دەستپێشخەرییەتان لێدەکەم. هیوادارم چرایەکی بیری پێشـکەوتنخوازی و دیموکراسـی و پشتیوانێکی نوێی خەباتی گەلی کوردی تێکۆشەر بێت.

**ئیبراهیم عەلاوی**

**١٩٩٤**

* * *

**گۆڤاری دواڕۆژ بەلای منەوە پێداگرتن و سووربوون بوو لەسەر ڕێبازی فیکـری و ئەخلاقیی خۆم کە بۆ هاوڕێیانم دەرکـەوێت ئێمـە لەسـەر هـەمان ڕێگـای تێکۆشـان بەردەوامین، هەروەها هـەردوو بـرا، مامۆسـتا حەمـە ئـەمین حەسـەن، بـە درێـژایی ژیـانی ئەنـدام بـوو لـە حیزبـدا و لـە جیابوونەوەشمانـدا کـادری ناسـراوی قیـادەی مەرکەزی بوو، هەورەها کاك فوئاد قەرەداغیش لەسەر هەمان ڕەوت و تێگەیشـتنی سۆشیالیزم بوو وە تێکۆشەرێکی بەئەزموونی ئەم ڕێبازە بوو.**

**گۆڤـاری دواڕۆژ وەك مێـژوو یەکـەم ژمـارەی لـە کـانوونی دووەمـی ١٩٩٤ دا دەرچـوو شەشـەم ژمـارەش لـە کـانوونی یەکـەمی ١٩٩٨دا گەیشـتە دەسـت خوێندەوارانی. هەرچەندە تەنیا شەش ژمارەی لیّ دەرچوو، بـەڵام وەك نـاوەڕۆك و هەوڵدانێکی تر لە بەردەوامبوونی بەرنەدانی ڕێبازی فیکری و سیاسیی خۆمانـدا لـە کتێبخانەی کوردیدا جێگایەکی بچووکی گرت.**

ئەم گۆڤارە پڕ بوو لە وتاری بەنرخی فیکری و سیاسی و بیروباوەڕی مارکسیزم – لینینیزم لەکاتێکی وەهادا بوو بە پێویستمان زانی خوێندەواران بزانن بەردەوامین لەسەر ئەو بیروباوەڕە بێجگە لە سوودی بۆ هەوادارانی ئەم ڕێگا بەنرخە. هەروەها ژمارەیەك نووسەری نزیك ئەم بیروباوەڕەشی هێنایەوە نزیك خۆی و چەندەها وتاری بەنرخیان تێدا بڵاو کردەوە.

هەر لەم چوارچێوەیەشدا ئەبێت چاپخانە بچکۆلەکەی (سەفوەت) لەیاد نەکەم کە بەناوی باوکمەوە ناوم نا، بێجگە لە شەش ژمارەی گۆڤاری دواڕۆژ، ژمارەیەك کتێبیشم پێ لەچاپ دا.

هەروەها وەك یادگارێکی خۆشی شاعیری گەورە و سیاسی و هونەرمەندی داهێنەر حەمە ساڵح دیلان هەر بەم بۆنەیەوە ئەخەمەوە یاد و بەرچاوی خوێنەرانی ئەم نامیلکەیەی خۆم کە لە ژمارە (٥)ی تەموزی ١٩٩٨ی گۆڤاری دواڕۆژدا بڵاو کرایەوە. ئەم هەڵبەستەی مامۆستا دیلان، کە لە هیچ شوێنێکی تردا بڵاو نەکراوەتەوە، لەسەر داوای من بە خەتی خۆی بۆی نووسیمەوە. لەگەڵ ڕا و بۆچوونی جیاواز لەسەر ستالین، هەڵبەستەکە شاکارێکی گەورەی دیلانە و نرخێکی مێژوویيشی هەیە:

**بۆ مەرگی ڕابەرێکی کۆمۆنیستی**

**محەمەد ساڵح دیلان**

پێشەوای بەرزی چینی کرێکار — قەڵای ئازادی
تیری ئاراستەی دڵی ستەمکار — مۆسیقای شادی
ئاڵا هەڵگری ئاشتیی جیهان — بەرامبەر بە شەڕ
چرای ڕزگاریی ڕێگەی میللەتان — گەنجی عیلم و فەڕ
باوکی دڵسۆزی ملیۆنەها کەس — کێوی زانیاری
ڕێ پیشاندەری ئایین و مەبەس — ئاشکرا و دیاری
تیشکی زێڕینت چرای کوردستان — بۆ شەوی تاری
ئەستێرە گەشەی ئاسۆی نیشتمان — جریوەداری

* * *

مردن لە ئاستت لێوە لەرەی بوو — پرس کەن لە مردن
بە رۆژ و بە شەو چەرمە سەرەی بوو — بۆ زەفەر بردن
چۆن وێرای توخنی چریسکە کەوێ — وا بە ئاسانی
یا وەك پەروانە رووناکی ئەدی — بۆ رێگاوبانی
ئەبێ مردنیش کە تێگەیی لێت — باڵی شکاوە
هەڵئەپڕووزێ بگاتە ناو جێت — خەیاڵی خاوە
بۆیە وا توانی بە کوڕنووش بردن — بگاتە بەر پێت
بگاتە راستت بە ئارەق رشتن — بگاتە ناو جێت

* * *

## هەنگاوێکی نوێ لە کاری راگەیاندن و رۆشنبیرییمدا

نوێترین هەنگاوی من لە کاری رۆشنبیری و راگەیاندندا، ئەوەتا زیاتر لە ساڵێکە دەرفەتێکی ترم دەستکەوت بۆ دامەزراندنی دەزگای (دواڕۆژ – بۆ رووناکبیری و راگەیاندن) کە ساڵێك بەسەر دامەزراندنیدا تێدەپەڕێت. ئەمجارەیان ئەم دەزگایە بەهاوکاریی سەرەکیی نووسەر و بیرمەندی ناسراو دکتۆر شێرکۆ عەبدوڵڵای هاوڕێم هاتە مەیدانەوە کە بریتییە لە سایتی دواڕۆژ و رادیۆی دواڕۆژ و بڵاوکەرەوەی کتێبی هەڵبژێردراو بۆ بەشدارییکردن لە گەیاندنی نوێترین بابەتی رۆشنبیری و چاوگێڕانەوە بە بابەتی مێژوویی تایبەت بە مێژووی کوردەوە کە تا ئێستا نەکەوتبێتە بەردەم خوێنەری کورد. بەهیوای پەرەپێدانی ئەم رێبازە نوێیە کە خزمەتی فیکری پێشکەوتنخواز بکات لەپێناو بەرەوپێشچوونی گەلەکەمان.

* * *





بەشێك لە کارمەندانی دەزگای ڕووناکبیری و ڕاگەیاندنی دوارۆژ، ٢٠١٧

# بەڵگەكان

**قەسام شەرعی كە پەیوەندییە خێزانییەكانی مەولانا خالیدی نەقشبەندی و حاجی مەلا رەسوڵی دێلێژە روون ئەكاتەوە:**

| العدد | محكمة الشرعية السليمانية | التاريخ: ١٩٤٨/٤/١٩ |
|---|---|---|
| ٩٤٨/١١٧ | | ٩٤٨/٩٨ |

ان من سكان محلة دركزين الشيخ فتاح ابن الشيخ محمد خان توفي منذ خمسون سنه بلا زوجة عن اولاده الشيخ عبدالرحمن و الشيخ عزيز و الشيخ قادر و الشيخ محمد امين و الشيخ عارف و امنه و حبسه ثم توفي المزبور الشيخ عبدالرحمن منذ خمس واربعون سنة عن اولاده الشيخ رشيد و الشيخ شريف و الشيخ محمد .. و خديجه. ثم توفي الشيخ عزيز منذ اربعون سنة بلا زوجه عن اولاده الشيخ توفيق و الشيخ صالح و الشيخ خالد ورعنا وامنه وسلمى وخورشيده ثم توفي المزبور الشيخ قادر في عين السنة بلا زوجه عن اولاده أحمد وتمينة و ايساف و امنه و مينا و رعنا و غونجه. ثم توفي المزبور الشيخ محمد أمين منذ ثمانية وثلاثون سنة عن أولاده الشيخ سعيد و الشيخ كريم و الشيخ احمد و رعنا و بيروز، وامنه و شيرين و صافيه، ثم توفيت المزبوره، صبيحه شيخ فتاح منذ خمسة وثلاثون سنة عن اولادها ملا

توفيق المتولد من زوجها المتوفي حمه آغا سليمان و عطيه من زوجها المتوفي الاخر الشيخ سعيد وفهيمه من زوجها المتوفي الاخر خضر، ثم توفي المزبور الشيخ امين الشيخ فتاح في عين السنة عن اولاده الشيخ عبدالله الشيخ جلال و رعنا و خورشيدة، ثم توفيت المزبورة خورشيدة بنت الشيخ محمد ابن الشيخ فتاح بلا زوجة من ابنها المنفرد حمه رشيد ابن ملا توفيق بن سليمان. ثم توفيت امينة بنت الشيخ عزيز ابن الشيخ فتاح في عين السنة بلا زوجة عن ولديها محمد و رحمة من زوجها السابق رستم. ثم توفيت المزبورة خورشيدة بنت الشيخ عزيز ابن الشيخ فتاح منذ ثلاثين سنة عن زوجها الحاج عارف بن مصطفى واولادها منه محمد اديب واحمد و عاصمة، ثم توفيت المزبورة سلمة بنت الشيخ عزيز ابن الشيخ فتاح من عين سنة عن انبها المنفرد محمد بن زوجها المتوفي شريف، ثم توفي المذكور الشيخ خالد ابن الشيخ عزيز ابن الشيخ فتاح في عين السنة بلا زوجة و ولد عن اشقائه المزبورين الشيخ توفيق و الشيخ صالح و رعنا. ثم توفي المزبور الشيخ توفيق ابن الشيخ عزيز منذ ثمان وعشرين سنة عن شقيقه المزبورين الشيخ صالح و رعنا. ثم توفيت المزبورة رعنا بنت الشيخ عزيز ابن الشيخ فتاح في عين السنة عن زوجها الحاج ملا رسول واولادها منه ملا محمود و ملا مصطفى و نجم الدين و حفصة. ثم توفي المذكر الشيخ صالح ابن الشيخ عزيز منذ خمس و عشرون سنة عن ولديه الشيخ رشيد و عطية، ثم توفي المزبور الشيخ شريف ابن الشيخ عبدالرحمن في عين السنة عن ابنه المنفرد جاسم. ثم توفيت المزبورة غنجة بنت الشيخ قادر ابن الشيخ فتاح في عين السنة عن بنتها المنفردة امينة المتولدة من زوجها المتوفي احمد بن حسن ويس واشقائها المزبورين الشيخ احمد و تمينة و ايساف و امنة و مينا و رعنا. ثم توفي المزبور الشيخ احمد أبن الشيخ قادر في عين السنة بلا زوجة و ولد عن اشقائه المزبورات وعمه المزبور الشيخ عارف ابن الشيخ فتاح ثم توفيت المزبورة عطية بنت الشيخ محمد امين ابن الشيخ فتاح منذ اثنين وعشرين سنة عن اولادها حسن وحمه غريب و رعنا المتولدين من زوجها السابق محمود بن شيخة. ثم توفي المزبور حسن بن محمود

شيخة في عين السنة عن زوجته خديجة بنت الشيخ عبدالرحمن و ولديه فائق وبهيه بلا زوجة و ولد عن اشقائه المزبورين الشيخ كريم و الشيخ سعيد رعنا وابنة و شيرين. ثم توفي المزبور الشيخ كريم ابن الشيخ محمد امين بلا زوجة و ولد في عين السنة عن اشقائه المزبورين الشيخ سعيد و رعنا و آمينة و شيرين. ثم توفيت المزبورة شيرين بنت الشيخ محمد امين ابن الشيخ فتاح منذ عشرين سنة عن ابنها المنفرد رسول بن حسين. ثم توفيت المزبورة امينة بنت الشيخ فتاح في عين السنة عن زوجها أمين بن جاسم بك واولادها. منهم خسرو و ثم توفي المزبور خسرو بن امين بك تسعة عشر سنة عن والده المزبور امين بك و زوجته بهيه بنت جميل ابنه المنفرد منها محمد نجيب ثم توفيت المزبورة اجى بنت امين بك عن والدها المزبور امين بك و بنتها المنفردة آتوله المتولدة من زوجها السابق حسن آغا ثم توفي المزبور امين بك في عين السنة عن ولديه المزبورين خالد و جميلة ثم توفي المزبور الشيخ محمد ابن الشيخ عبدالرحمن منذ ثمانية عشر سنة عن زوجته رحمة بنت الشيخ سعيد وابنه المنفرد الشيخ لطيف. ثم المزبور الشيخ عارف ابن الشيخ فتاح في عين السنة من زوجته امينة بنت نور محمد واولاده نجم الدين و عاصمة و حصفة و عطية و صبرية و فاطمة ثم توفي المزبور الحاج ملا رسول عن زوجته عطية بنت الشيخ سعيد المزبورة واولاده ملا احمد و ملا محمود و ملا مصطفى و نجم الدين و حفصة ثم توفي المزبور ملا توفيق بن سليمان مذ عشرين سنة تقريبا عن زوجته سلمة بنت الحاج عزيز واولاده حمه رشيد المزبور و عبدالله و محمد و احمد و جميلة و خانم، ثم توفيت المزبورة مينا بنت الشيخ قادر عن زوجته حمه امين منصور وابنها المنفرد منه صابر، توفي المزبور صابر بلا زوجة و ولد عن والده المزبور حمه امين بن منصور ثم توفيت المزبورة رعنا بنت الشيخ محمد ابن الشيخ فتاح ثمان سنين بلا زوجة ولد عن شقيقيها المزبورين الشيخ عبدالله و الشيخ جلال ثم توفي المزبور الشيخ عبدالله الشيخ محمد منذ سبعة سنين عن زوجته فهيمة بنت ملا غفور و شقيقة المزبور الشيخ جلال ثم توفيت المزبوره فهيمة بنت ملا غفور منذ ست سنين عن شقيقها

محمود ملا غفور ثم توفي المزبور الشيخ رشيد ابن الشيخ عبدالرحمن ابن الشيخ فتاح منذ اربع سنين عن شقيقته خديجة وابن اخيه الشيخ لطيف ابن الشيخ محمد ابن الشيخ عبدالرحمن و جاسم ابن الشيخ شريف ابن الشيخ عبدالرحمن ثم توفي المزبور الشيخ سعيد ابن الشيخ محمد و امين ابن الشيخ فتاح عن زوجته حنيفة بنت حمەی بكر و عائشة بنت حسين بك و اولاده عثمان و على و فهيمة و خاور و صبيحة ثم توفيت المزبوره فهيمة بنت مام خضر منذ سنة واحدة بلا زوج و ولد عن اخيه من الاب صابر بن مام خضر و اخته من الام عطية بنت الشيخ سعيد و ليس له وارث شرعى آخر عدا من ذكر سواء كان حاضرا او غائبا منهم ذلك من البيان المعطي من قبل هيئة اختيارية محلة دركزين المؤرخ ١٩٤٨/٣/١٨. والاخبار الشرعي الوارد من قبل الشاهدين ملا عارف بن محمد و عبدالقادر مصطفى الساكنين في محلة سرشقام والمؤدين للبيان المذكور وعليه بموجب الفرائض الشرعية تصحح المسألة الارثية — ..... من (ثلاث وعشرون مليونا ومائتين واربعه وثمانون الف و ثمانمائة اسهم).

منها للمزبور خالد بك بن امين بك (ثمنمائة وثمانية آلاف وخمسمائة اسهم) والمزبورة جيملة بنت امين بك (اربعمائة واربعة آلاف ومائتان و خمسون سهما) والمزبورة بهيه بنت جميل (واحد وخمسون الفا وتسعمائة و خمس و سبعون سهما) والمزبور نجيب بن خسرو بن امين بك (مائتان واربعة وتسعون الفا وخمسمائة و خمسة وعشرون سهما) والمزبوره (آتوله بنت حسن آغا) (مائة وثلاثة آلاف وتسعمائة وخمسون منهما) ولكل واحدة من المزبورات (تمينه و ايساف و آمنة و رعنا) بنات شيخ قادر (خمسمائة واربعة و ستون آلاف وثلاثمائة اسهم) والمزبورة امينة بنت احمد من غنجة بنت الشيخ قادر (مائتان وسبعة آلاف وتسعمائة اسهم) وللمزبور حمه امين بن منصور (خمسمائة واربعة وتسعون الفا وثلاثة اسهم) وللمزبور نجم الدين ابن الشيخ عارف ابن الشيخ فتاح (تسعمائة و خمسة الاف و ثمانية وخمسون سهما) ولكل واحدة من المزبورات امينه بنت محمد و عطيه و حفصة و صبرية و فاطمة و عاصمة بنات الشيخ عارف ابن الشيخ فتاح (اربعمائة .... وخمسون الفا وتسعمائة وخمس و عشرون سهما) وللمزبورة خديجة بنت

الشيخ عبدالرحمن ابن الشيخ فتاح (مليون واحد وعشرة الاف وثمانمائة وثمانون سهما) وللمزبور جاسم ابن الشيخ شريف ابن الشيخ عبدالرحمن (مليون واحد ومائة و ثمانية و ثمانون الفا اسهم) وللمزبور الشيخ لطيف ابن الشيخ محمد مليون واحد وتسعة و ستون الفا ومائتا اسهم) وللمزبورة رحمة من زوجتي الشيخ سعيد ابن الشيخ محمد امين (ثلاثة وستون الفا سهم) ولكل واحد من عثمان و علي ابن الشيخ سعيد ابن الشيخ محمد امين مائتان واثنان وخمسون الفا اسهم) ولكل واحدة من خاور و فهيمه و صبيحة بنات الشيخ سعيد ابن الشيخ محمد امين (مائة وستة و عشرون الفا اسهم)، ولكل واحدة من رعنا و بيروزة و امينه بنات الشيخ محمد امين و رسول ابن حسين من فراش شيرين بنت الشيخ محمد امين (خمسمائة و اربعة الاف اسهم) وللمزبورة رعنا بنت محمود شيخه (ستون الفا وخمسمائة وثمانون سهما). وللمزبورة حمه غريب بن محمود شيخه (مائة وعشرون الفا وتسعمائة و ستون سهما) و للمزبور فائق ابن حسن سبعون الفا وخمسمائة و ستون سهما و للمزبورة بهية بنت حسن (خمسة و ثلاثون الفا ومائتان و ثمانون سهما) و للمزبور حاجي ملا عارف بن مصطفى (ثلاثة وثمانون الفا ومائة وستون الفا) ولكل واحد من محمد اديب و احمد امين المزبور الحاج ملا عارف مصطفى (تسعمائة وستون الفا و سبعمائة و اثنان وتسعون سهما) وللمزبورة عاصمة بنت حاجي ملا عارف مصطفى (تسعة واربعون الفا وثمانية مائة و ستة وتسعون سهما). ولكل واحد من المزبورون ملا مصطفى و ملا محمود و نجم الدين ابناء الحاج ملا رسول مائتنان واربعة الاف و خمسون سهما وللمزبور حفصة بنت الحاج ملا رسول (مائة والفان وخمسة وعشرون سهما) و للمزبور ملا احمد ابن حاجي ملا رسول (سبعة و ثلاثون الفا وسبعمائة و ثلاثون سهما) وللمزبور الشيخ رشيد ابن الشيخ صالح ابن الشيخ عزيز (مليون واحد واربعة و ثلاثون الفا وثنمائة و ثمانون سهما) و للمزبورة عطية شيخ صالح (خمسمائة و سبعة عشرة الفا واربعمائة واربعون سهما) وللمزبور محمد ابن رستم (مائتان و واحد وعشرة الف وسبعمائة و ستون سهما) وللمزبورة رحمة بن رستم (مائة وعشرون الالف وثمانمائة وثمانون سهما) وللمزبور محمد بن شريف (ثلاثمائة واثنان و

ثلاثـون الفـا وسـتمائة واربعـون سـهما) وللمزبـوره عطيـه بنـت شـيخ سـعيد (خمسـمائة وتسعة الاف وثمنمائة و خمسة و خمسون سهما) وللمزبور صابر بن مـام خضـر (ثلاثمائـة وستة واربعون الفا وخمسـمائة اسـهم). وللمزبـورة سـلمى بنـت الحـاج عزيـز (مائـة وثلاثـة الاف وتسعمائة وخمسون سهما) وللمزبور حمـه رشـيد بـن مـلا توفيـق سـليمان (سـتمائة وتسـعة وتسـعون الاف و تسـعمائة و ثلاثـون سـهما) و لكـل واحـد مـن عبـدالله و محمـد و احمد ابناء ملا توفيق بن سليمان (مائة و خمسـمائة و اربعـون الفـا و خمسـمائة وثلاثـون سهما) ولكل واحدة من المزبورين جميلة و خانم بنتي ملا توفيـق (اثنـان و سـبعون الفـا و خمسة و ستون سهما) و للمزبـور شـيخ جـلال ابـن الشـيخ محمـد امـين ابـن الشـيخ فتـاح (مليونان و اربعمائة و خمسة و عشرون الفا و خمسمائة اسهم). وللمزبور محمـود ابـن مـلا غفور (ثلاثمائة و ستة و اربعون الفا و خمسـمائة اسـهم) وعلـى طالـب الـوارث المزبـور مـلا محمود ابن الحاج ملا رسول .... هذا القسام الشرعي تسجيلا في ١٩٤٨/٤/١٩ ..

عدد الاضبارة                محكمة شرعية السليمانية    م/ تصحيح القسام الشرعي

المدعي/ احمد مجيد مولود الساكن في محلة دركزين

المدعي عليه/ ملا محمود حاجي ملا رسول الساكن في محلة الاسكان اضافة للتركه

لقد نظم المدعي عليه القسام الشرعي الرقم ٩٤٨/١١٧ و المؤرخ ١٩٤٨/٤/١٩. الصادر من محكمة شرعية السليمانية لمورثنا المدعو الشيخ محمد امين شيخ فتاح ولكنه كتم اربعة بنات من ورثة صافية بنت شيخ محمد امين ابن شيخ فتاح حيث كان للمتوفيه صافيه المذكورة اعلاه ولدان هما حسن و حمه غريب محمود شيخه و خمسة بنات هن امنه و سلمى و سلطانة و خورشيدة لم يذكر اسم اربعة بناتها وهن كل من امنه و سلمى و سلطانه و خورشيدة بنات صافيه بنت شيخ حمه امين شيخ فتاح. بل ذكر ولديها و بنتها رعنا والمذكورين اعلاه وان وارث بنات الصافية المذكورين اعلاء والذين لم يذكر اسمائهم في القسام الشرعي المذكور هم ١. امنه توفت بلا زوج عن اولادها كل من احمد و حمه صالح و صابر و مينا و بهية اولاد مجيد مولود ٢. سلمى توفت بلا زوج عن ولديه حمه صالح عزيز ٣. سلطانة توفت بلا زوج عن بنتها امينه بنت حسن ٤. خورشيدة توفت بلا زوج عن اولادها حمه صالح و مجيد و شمسه اولاد قادر خسرو و سبب المدعي عليه من حرمان هذه الورثه المذكورة من التصرف بالدار التسلسل ........ ١١١٥ الواقعة في محلة دركزين عليه جلب المدعي عليه الى المحكمة والحكم عليه بتصحيح القسام الشرعية المذكور اعلاه ............. هذه الدعوة و تحميله كافة مصاريف المحاكمة اضافة للتركه ... حصتي في الدار المرقمة المذكورة تسلسل ١١١٥ محلة دركزين

المدعي                                 المدعي                                 القاضي

**یەکەم بەیاننامەی شۆڕشی ١٤ی تەموز:**

البيان رقم واحد

صادر من القائد العام للقوات المسلحة الوطنية

بسم الله الرحمن الرحيم

أيها الشعب الكريم

بعد الإتكال على الله وبمؤازرة المخلصين من أبناء الشعب والقوات الوطنية المسلحة، أقدمنا على تحرير الوطن العزيز من سيطرة الطغمة الفاسدة التي نصبها الاستعمار لحكم الشعب والتلاعب بمقداراته وفي سبيل المنافع الشخصية

إن الجيش منكم وإليكم، وقد قام بما تريدون وأزال الطبقة الباغية التي استهترت بحقوق الشعب، فما عليكم الا أن تؤازروه. وأعلموا أن الظفر لا يتم إلا بترصينه والمحافظة عليه من مؤامرات الاستعمار وأذنابه وعليه فإننا نوجه إليكم نداءنا للقيام بإخبار السلطات عن كل مفسد ومسيء وخائن لاستئصاله. ونطلب منكم أن تكونوا يداً واحدة للقضاء على هؤلاء والتلخص من شرهم. حركة تموز ١٩٥٨

أيها المواطنون:

إننا في الوقت الذي فيه نكبر فيكم الروح والوطنية الوثابة والأعمال المجيدة، ندعوكم الى الإخلاد والسكينة والتمسك بالنظام والتعاون على العمل المثمر في سبيل مصلحة الوطن.

أيها الشعب:

لقد أقسمنا أن نبذل دماءنا وكل عزيز علينا في سبيلكم، فكونوا على ثقة واطمئنان بأننا سنواصل العمل من أجلكم وان الحكم يجب أن يعهد إلى حكومة تنبثق من الشعب وتعمل بوحي منه وهذا لا يتم إلا بتأليف جمهورية شعبية تتمسك بالوحدة العراقية الكاملة وترتبط برباط الأخوة مع الدول العربية والإسلامية وتعمل بمبادئ الأمم المتحدة وتلتزم بالعهود والمواثيق وفق مصلحة الوطن وبقرارات مؤتمر باندونغ. وعليه فإن الحكومة الوطنية تسمى منذ الآن (الجمهورية العراقية). وتلبية

لرغبة الشعب فقد عهدنا رئاستها بصورة وقتية الى مجلس سيادة يتمتع بسلطة رئيس الجمهورية ريثما يتم استفتاء الشعب لأنتخاب الرئيس. فالله نسأل أن يوفقنا في أعمالنا لخدمة وطننا العزيز انه سميع مجيب

بغداد، في اليوم السادس والعشرين من شهر ذى الحجة سنة ١٣٧٧ هجرية، الموافق لليوم الرابع عشر من شهر تموز سنة ١٩٥٨م.

العقيد الركن عبدالسلام محمد عارف

القائد العام للقوات المسلحة الوطنية وكالة

١٩٥٨/٧/١٤

دەستوری کاتیی دوای شۆڕشی ١٤ی تەموز

الدستور المؤقت لعام ١٩٥٨

بعد قيام ثورة ١٤ تموز ١٩٥٨ أُعلِن عن سقوط القانون الأساسي العراقي لسنة ١٩٢٥ وتعديلاته كافة، وتطبيق الدستور المؤقت لعام ١٩٥٨ رغبة في تثبيت قواعد الحكم وتنظيم الحقوق والواجبات لجميع المواطنين، وقد أشار هذا الدستور المؤقت إلى أنه واجب التطبيق في فترة الانتقال إلى أن يتم تشريع دستور دائم.

وقد أشار الدستور المؤقت لعام ١٩٥٨ إلى احترام حقوق المواطنين وصيانة حرياتهم، وأنّ العرب والأكراد شركاء في هذا الوطن، ويقرّ هذا الدستور حقوقهم القومية ضمن الوحدة العراقية، كما ركّز الدستور على حرية الاعتقاد والحريات الشخصية وحرمة المنازل وحرّية الأديان وأن تسليم اللاجئين السياسيين محظور، كما نصّ الدستور على أن يتولى رئاسة الجمهورية مجلس سيادة يتألف من رئيس وعضوين، ويتولي مجلس الوزراء السلطة التشريعية بتصديق مجلس السيادة، كما أكّد الدستور على استقلالية القضاء وأنّ القضاة لا سلطان عليهم في قضائهم لغير القانون، ولايجوز لأية سلطة أو فرد التدخل في استقلالية القضاء أو في شؤون العدالة، وينظم القانون الجهاز القضائي ولأول مرة اعتبر نظام الحكم جمهورياً بعد أن كان ملكياً مقيداً بدستور.

وإليكم النص الكامل للدستور العراقي المؤقت لعام ١٩٥٨:

لما كانت الحركة الوطنية التي قام بها الجيش العراقي بمؤازرة الشعب وتأييده في ١٤ سنة ١٩٥٨ تهدف تحقيق سيادة الشعب والعمل على منع اغتصابها وضمان حقوق المواطنين وصيانتها ولما كان الحكم السابق في البلاد الذي تم التخلص منه قائماً على أساس من الفساد السياسي إذ اغتصب السلطة افراد حكموا على خلاف إرادة الأكثرية وضد مصلحة الشعب إذ كان هدف الحكم تحقيق منافعهم وحماية

مصالح الاستعمار وتنفيذ مآربه كما جاء ذلك في البيان الاول الذي أعلن للشعب في يوم ١٤ تموز سنة ١٩٥٨ في بدء الحركة الوطنية وتضمن سقوط نظام الحكم الملكي وقيام الجمهورية العراقية.

فإننا باسم الشعب نعلن سقوط القانون الأساسي العراقي وتعديلاته كافة منذ ١٤ تموز سنة ١٩٥٨ ورغبة في تثبيت قواعد الحكم وتنظيم الحقوق والواجبات لجميع المواطنين نعلن الدستور الموقت هذا للعمل بأحكامه في فترة الانتقال إلى أن يتم تشريع الدستور

الباب الأول

الجمهورية العراقية

المادة (١): الدولة العراقية جمهورية مستقلة ذات سيادة كاملة.

المادة (٢): العراق جزء من الأمة العربية.

المادة (٣): يقوم الكيان العراقي على أساس من التعاون بين المواطنين كافة باحترام حقوقهم وصيانة حرياتهم ويعتبر العرب والأكراد شركاء في هذا الوطن ويقر هذا الدستور حقوقهم القومية ضمن الوحدة العراقية.

المادة (٤): الإسلام دين الدولة.

المادة (٥): عاصمة الجمهورية العراقية بغداد.

المادة (٦): يعين العلم العراقي وشعار الجمهورية العراقية والأحكام الخاصة بهما بقانون.

الباب الثاني

مصدر السلطات والحقوق والواجبات العامة.

المادة (٧): الشعب المصدر السلطة.

المادة (٨): الجنسية العراقية يحددها القانون.

المادة (٩): المواطنون سواسية أمام القانون في الحقوق والواجبات العامة ولايجوز التمييز بينهم في ذلك بسبب الجنس أو الأصل أو اللغة أو الدين أو العقيدة.

المادة (١٠): حرية الاعتقاد والتعبير مضمونة وتنظم بقانون.

المادة (١١): الحرية الشخصية وحرمة المنازل مصونتان ولايجوز التجاوز عليهما إلا حسب ما تقتضيه السلامة العامة وينظم ذلك بقانون.

المادة (١٢): حرية الأديان مصونة وينظم القانون أداء وظيفتها على أن لا تكون مخلة بالنظام العام ولا متنافية مع الآداب العامة.

المادة (١٣): الملكية الخاصة مصونة وينظم القانون أداء وظيفتها الاجتماعية ولا تنزع إلا للمنفعة العامة مقابل تعويض عادل وفقاً للقانون.

المادة (١٤):

أ. الملكية الزراعية تحدد وتنظم بقانون.

ب. الملكية الزراعية مصونة بموجب القوانين المرعية إلى حين استصدار التشريعات واتخاذ التدابير الضرورية لتنفيذها.

المادة (١٥): لا يجوز فرض ضريبة أو رسم تعديلهما أو إلغاؤهما إلا بقانون.

المادة (١٦): الدفاع عن الوطن واجب مقدس وأداء الخدمة العسكرية شرف للمواطنين وتنظم أحكامها بقانون.

المادة (١٧): القوات المسلحة في الجمهورية العراقية ملك للشعب ومهمتها حماية سيادة البلاد وسلامة أراضيها.

المادة (١٨): الدولة وحدها هي التي تنشأ القوات المسلحة ولا يجوز لأية هيئة أو جماعة إنشاء تشكيلات عسكرية أو شبه عسكرية.

المادة (١٩): تسليم اللاجئين السياسيين محظور.

الباب الثالث

نظام الحكم

المادة (٢٠): يتولى رئاسة الجمهورية مجلس السيادة ويتألف من رئيس وعضوين.

المادة (٢١): يتولى مجلس الوزراء السلطة التشريعية بتصديق مجلس السيادة.

المادة (٢٢): يتولى مجلس الوزراء والوزراء كل فيما يخصه أعمال السلطة التنفيذية.

المادة (٢٣): القضاة مستقلون لا سلطان عليهم في قضائهم لغير القانون ولا يجوز لأية سلطة أو فرد التدخل في استقلال القضاء أو في شؤون العدالة وينظم القانون الجهاز القضائي.

المادة (٢٤): جلسات المحاكم علنية إلا إذا قررت المحكمة جعلها سرية مراعاة للنظام العام والآداب.

المادة (٢٥): تصدر الأحكام وتنفذ باسم الشعب.

المادة (٢٦): تنشر القوانين في الجريدة الرسمية ويعمل بها من تاريخ نشرها إلا إذا نص فيها على خلاف ذلك، وإذا لم يذكر فيها تاريخ تنفيذها تنفذ بعد عشرة أيام من اليوم التالي ليوم النشر.

الباب الرابع

أحكام انتقالية

المادة (٢٧): يكون للقرارات والأوامر والبيانات والمراسيم الصادرة من قائد القوات المسلحة أو رئيس الوزراء أو مجلس السيادة في الفترة من ١٤ تموز ١٩٥٨ إلى تاريخ تنفيذ هذا الدستور الموقت قوة القانون وهي تعدل ما يتعارض مع أحكامها من نصوص القوانين النافذة فبل صدورها.

المادة (٢٨): كل ما قررته التشريعات النافذة قبل ١٤ تموز سنة ١٩٥٨ تبقى سارية المفعول ويجوز إلغاء هذه التشريعات أو تعديلها بالطريقة المبينة بهذا الدستور الموقت.

المادة (٢٩): ينفذ هذا الدستور المؤقت من تاريخ نشره في الجريدة الرسمية.

المادة (٣٠): على وزراء الدولة تنفيذ هذا الدستور.

كتب ببغداد في اليوم التاسع من محرم الحرام سنة ١٣٧٨ هـ الموافق لليوم السابع والعشرين من شهر تموز سنة ١٩٥٨م.

| | |
|---|---|
| محمد نجيب الربيعى<br>رئيس مجلس السيادة | محمد صالح محمود<br>وزير الصحة |
| محمد مهدي كبة<br>عضو مجلس السيادة | |
| خالد النقشبندي<br>عضو مجلس السيادة | |
| عبدالكريم قاسم<br>رئيس الوزراء ووكيل وزير الدفاع | الدكتور إبراهيم كبة<br>وزير الاقتصاد |
| عبدالسلام محمد عارف<br>نائب رئيس الوزراء<br>ووزير الداخلية | فؤاد الركابي<br>وزير الاعمار |
| الدكتور عبدالجبار الجومرد<br>وزير الخارجية | بابا علي الشيخ محمود<br>وزير المواصلات والأشغال |
| الزعيم الركن ناجي طالب<br>وزير الشؤون الاجتماعية | محمد حديد<br>وزير المالية |
| مصطفى علي<br>وزير العدلية | هديب الحاج حمود<br>وزير الزراعة |
| الدكتور جابر عمر | وزير المعارف |
| محمد صديق شنشل | وزير الإرشاد |



بردنی تەرمی حاجی مەلا رەسوڵ بۆ گۆڕستانی سەیوان، ١٩٢٧



مەلا مستەفای سەفوەت

لوبنان، ١٩٤٢



مەلا مستەفای سەفوەت، ١٩٤٤



مەلا ئەحمەد حاجی مەلا رەسوڵ (ئەحمەد فائز)



مەلا مەحمود حاجی مەلا رەسوڵ ، ١٩٦٩



**نەجمەدین ئەفەندی حاجی مەلا رەسوڵ (ن. ئاری) ، ١٩٦٨**



**مەلا مستەفای سەفوەت**




لە چەپەوە:

دوو کەسی خوارەوە: کەمال محەمەد سەعید، نەوشیروان فوئاد مەستی

ریزی خوارەوە: جەمال حسێن ئاغا، حەسەن وەستا ئەمین دەلاك، ئەكرەم حاجی حەملان، ئەنوەر مەحمود، جەمیل گورون، عومەر حاجی عەلی، جەبار ئەحمەد سابر، ئیسماعیل حاجی سەعید حەڵواچی

ریزی سێ: مامۆستا: داود ئەفەندی مامۆستای وەرزش، عومەر ( )، ( )، قادر حاجی محەمەد مسگەر، مامۆستا عەبدوڵڵا، بەهزاد جەمیل سائیب، عومەر حاجی حەمە ساڵح، ئەنوەر ئەحمەد سەیفوڵڵا، نەزهەت کەریم.

بەڕێوەبەر: مامۆستا جەلال محەمەد سەیفوڵڵا

سەری سەرەوە: فاروق مەلا مستەفا، نوری حاجی شێخ کەریم، سەلاح جەلال سائیب، سامال حەمە ئاغا، جەمال عومەر مێوژە، عەبدوڵڵا سەبری سابونچی، نەوزاد حەمە سەعید عەنبەر، محەمەد مەحمود، رەمزی ئیسحاق، بەکر سەعید، چالاك ئەحمەد فەهمی

پۆلی ٣، مەکتەبی فەیسەڵییە، ١٩٤٩



لە چەپەوە:

ریـزی خـوارەوە: فـاروق مـەلا مسـتەفا، نەوشـیروان فوئـاد مەسـتی، کـەمال حەمـە سەعید خەیات، نەوزاد جەلال محەمەد، عومەر محەمەد سالّح بەگ، سـەفوەت رەشـید، ئیحسان غەفور، چالاك ئەحمەد فەهمی

ریزی دوو: سەلاّح شێخ رەوف نـەقیب، عومـەر محەمـەد، محەمـەد عەبـدوللاّ نـازێ، بورهـان مەسـرەف، سـالار حەمـە ئاغـا، کـەمال عیـزەت، جـیران قـەزەرۆس، ئـەنوەر مەحمود، بەهزاد جەمیل سائیب.

ریزی سێ: مامۆستا حسێن سالّح ئاغا، نەزهەت کەریم بەگ، جـەبار ئەحمـەد سـابر، سالار ئەمین، ئەفراسیاب مەجید یـاوەر، محەمـەد مـەحمود، جـەمال قـادر، (.......)، ئیسـماعیل حـاجی سـەعید حەلّواچـی، جـەلال ئیـبراهیم سـنگەر، ئـەنوەر ئەحمـەد سەیفوللاّ، بەڕێوەبەری مامۆستا جەلا محەمەد سەیفوللاّ

ریـزی سـەرەوە: یـونس، نەناسـراوەتەوە، نەناسـراوەتەوە، فـەرەج حـاجی سـالّح، عومەر محەمەد حەمامچی، جەمال سنگەر، نەناسراوەتەوە، نەناسراوەتەوە

مەکتەبی فەیسەلّییە، ١٩٥٠-١٩٥١



فاروق مەلا مستەفا، سەربانیماڵەوە لە دەرگەزێن، ١٩٥١



دانیشتوو: فاروق مەلا مستەفا

لەڕاستەوە: زولال مەجید سەلیم ئاغا، عیزەدین مستەفا رەسوڵ، عەلی حاجی قادر، سەرەتای پەنجاکان



ریزی یەکەم

لەڕاستەوە: نەناسراوە، محەمەد جاسم، محەمەد مەحمود، حەسەن حسێن، فائق محمد سالّح، ئەحمەد محەمەد سەڵتە، ئەوەی پشتەوە نەناسراوە، ڕەئوفی حاجی عەلی، نەناسراوەتەوە، نوری ئەحمەد کەریم ، محەمەد محێدین

دانیشتوەکان: عەتا ڕەشید، سەردار بەهادین، عیزەت ڕەشید، فاروقی مەلا مستەفا، جەلال ئەمین سامسون، محەمەد فەتاح، ندیم شوکت، عوسمان محەمەد



لەڕاستەوە: جەلال مەلا ئەحمەد حاجی مەلا رەسوڵ (هاوسەری ئەختەر خان)، ئەختەر خان (خوشکی فاروق مەلا مستەفا)، فاروق مەلا مستەفا، خانەقین ١٩٥٤



قادر مەلا ئەحمەد حاجی مەلا ڕەسوڵ، ١٩٥٦/٢/٢




ناوەکان: ١. مامۆستا عـەزیز محەمـەد، ٢. محەمـەد سـەید جاسـم، ٣. فـاروق مـەلا مستەفا، ٤. کەمال رەشید مەلا ئیبراهیم، ٥. جەلالی ساماغا، ٦. عیزەت رەشید
دەشتی تەیارە خانەکە (گەڕەکی عەقاری)، ١٩٥٥/١٢/٢٣



لەڕاستەوە: سالّح عەلی، فاروق مەلا مستەفا، جەمیل نوری، ناوەندیی سلێمانی



فاروق مەلا مستەفا،
١٩٥٦/٥/٥



فـاروق مـەلا مسـتەفا بـە جلـی کەشـــافەوە، قوتـــابیی ناوەنـــدیی سلێمانی، سەرچنار ١٩٥٦/٣/٢١



لەڕاستەوە: جەمیلە سالّح قادر (دایکی فاروق مەلا مستەفا)، فاروق مەلا مستەفا، مەلا مستەفای سەفوەت، تەلعەت مەلا مستەفا، کانی خان، ١٩٥٨/٣/١٣



ناوەڕاست: فاروق مەلا مستەفا، خۆپیشاندان، بەغدا، ١٩٥٨



دانیشتووەکان لە راستەوە: ئەنوەر عوسمان، حسێن عارف، قادر میرزا کەریم، فاروق مەلا مستەفا، ١٩٥٩



لە راستەوە: فاروق مەلا مستەفا، عوسمان شێخ کەریم، عەلی مەلا عەبدوڵڵا، مزگەوتی حاجی مەلا رەسوڵ، ١٩٦١



لە راستەوە: حسێن عارف، فەرەج ئەحمەد، ئەنوەر عوسمان، فاروق مەلا مستەفا، کامیل نوری، شارع رەشید – حەیدەرخانە – بەغدا ١٩٦١/١/٧



(وەستاوەکان لەڕاستەوە: حسێن فەتحوڵڵا، د. فەیسەڵ حەبە، جەلالی ساماغا، فاروق مەلا مستەفا، سەردار مستەفا مەزهەر)، گەشت بۆ ناوچەی صدور لە بەغدا ١٩٦٢/٢/٢١



لەڕاستەوە: شەهید مەحمود کەریم، فاروق مەلا مستەفا، ئیحسان غەفور، باخی گشتی سلێمانی



دانیشتوەکان لە راستەوە: فەوزی مەلا مـەحمود، فـاروق مـەلا مسـتەفا، نەجمـەدین حاجی مەلا رەسوڵ، حیکمەت بەحرانی، رۆستەمی حەمەی رۆستەم، فەرەیدون

وەسـتاوەکان لەڕاسـتەوە: فـازیڵ مـەلا مـەحمود، ئـازاد نەجمـەدین حـاجی مـەلا رەسوڵ، سەرچنار، ١٩٦٢



فاروق مەلا مستەفا، محەمەد سەعید خەیات، بە رێگەی بەغداوە، ١٩٦٢



لەڕاستەوە: سەردار مستەفا مەزهەر، جەلالی ساماغا، فاروق مەلا مستەفا، گەشت بۆ سەدی هندیە – حلە، ١٩٦٢



وەستاوەکان لەڕاستەوە: پێنجەم (فاروق مەلا مستەفا)، تیپی فتبۆڵێنی کۆلێجی ئیحتیات، ١٩٦٤



فاروق مەلا مستەفا

دەرچوون لە زانکۆ، ١٩٦٤




قوتابییە کوردەکانی کولێجی بازرگانی بەغدا، ١٩٦٤



وەرگرتنی خەڵاتی فتبۆڵێن لە عەمید سەعدون حسێن – فەرماندەی کۆلێجی ئیحتیات، ساڵی ١٩٦٥

